# ناوەڕۆک

# پێشەکی

ئەم کتێبە، ئەڵقەی یەکەمە لە زنجیرەیەکی پێنج ئەڵقەیی، کە چیرۆکەکانی دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی ساڵانی ١٩٧٥ - ١٩٩٦ ی کوردستانی عێراق ئەگێڕنەوە. ئەگەر خوای گەورە یار و عومری شیرین یاری بێ، بە دوای یەک دا بڵاویان ئەکەمەوە.

*

ڕووداوەکانم لە ڕوانگەی خۆمەوە بە شێوەی «ڕیپۆرتاجی ڕۆژنامەوان» نووسیوەتەوە. تێکڕای گشت هەواڵ و دەنگوباسەکانی، ئاگاداری و زانیارییەکانی، بیر و بۆچوونەکانی، سەرنج و تێبینییەکانی، گێڕانەوە و هەڵسەنگاندنەکانی ـ بە تەنیا لە ئەستۆی خۆم دایە.

بێگومان من لە نووسینەکەم دا ناتوانم بێلایەن بم، چونکە خۆم لە کێشەکان دا لایەن بووم، بۆیە لە باتی ئەوەی خوێنەر ڕەخنەی بێلایەن نەبوونم لێ بگرێ، باشترە داوا لە کەسانی پەیوەندیدار بکا ئەوانیش بیرەوەرییەکانی خۆیان لە باری سەرلەبەری خۆیانەوە بنووسنەوە.

*

کاتێ خۆی من جێگایەکی ئەمینم نەبوو نامە و نووسراو و بەڵگەی تێ دا هەڵبگرم، لە بەر ئەوە زۆر کەم شتم هەڵئەگرت، بەتایبەتی پەنهان و بڵاوکراوە و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەش. وا، ئەوەی هەڵیشم گرت بوو ساڵی ١٩٩٠. هەمووم تێکەڵاوی ئارشیفە دەوڵەمەندەکەی مام جەلال کرد. ئەو ماوەیەی خەریکی نووسینی ئەم ئەڵقەیە بووم، دەستم نەیانگەیشتێ. نەمئەویست بەو هۆیەوە دوای بخەم. کێ ئەزانێ چەند ئەژی و، چۆن و کەی و لە کوێ ئەمرێ؟! ویستم تا خۆم زیندووم و، زۆر لەوانەی ناویان لەم پێنج ئەڵقەیەدا دێ زیندوون، بڵاو ببێتەوە.

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم لە ناخی دڵەوە سپاسی هەردوو دۆستی بەڕێزم: د. فوئاد مەعسووم و، د. لەتیف ڕەشید بکەم. هەردووکیان بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئارشیفەکانی خۆیان خستە بەردەستم بۆ ئەم نووسینە کەڵکیانی لێ وەربگرم. ئەگەر چاکەی ئەو دوو جوامێرە نەبوایە ئەم کارەم بەمجۆرە بۆ تەواو نەئەکرا.

لەندەن، ١ ی شوباتی ١٩٩٧

نەوشیروان

# ڤییەننا: بوکی رازاوە

*

مارتی سالی ١٩٧٥ کە ئاشبەتال بو، ٣ سال زیاتر بو من لە ڤییەننا بوم.

ئەوسا کوردی عیراق لە ئەورووپا بە گشتی و، لە نەمسە بە تایبەتی زور کەم بون. ئەوانەی لە ڤییەننا بون بە پەنجەی دەس ئەژمێردران:

کونتەرپنەیـان د. وریا رەواندزی بو کـە لە سەرەتای پەنجـاکانەوە لەوێ جیگیـر بوبو پزیشکی پسپوری نەخوشییەکانی هەناو بو. عومەر دزەیی لە سەفارەتی عیراق کاروباری وەرگیــرانی روژنامـەوانی ئەکـرد. وریای ئەحـمـەدی قـازی و بەختـیـاری برای. وریا لشستەکانەوە لەوێ ئەژیا و کاری ئەکرد. فوئادی مەلا مەحمود سەرەتای حەفتاکان چوبوە ڤییەننا. فوئاد هاورییەکی زور نزیک و خوشەویستم بو، بە خوشیی ئەوەوە منیش چو بوم بو ئەوێ. دوایی‌تر یەکدوکەسی تریش هاتن.

ژمارەی کوردی ئیران لە کوردی عیراق کەمتر بو. لە ناو ئەوان دا کەریمی پەروتی دیار بو، کە تیکەلاوی کوردەکانی تر ئەبو.

ژمارەی کوردەکانی سوریاش لە پەنجەی دەس تیپەری نەئەکرد.

ژمارەیەکی زور کریکاری کوردی تورکیا لە نەمسا بون. بەلام هیشتا جولانەوەی سیاسییان تی نەکەوت بو. زور کەم بەشداری چالاکی سیاسی ئەبون.

لە ناو ئەم کومەلە کوردییە بچوکەدا چەند کەسی لە کوردەکانی سوریا لە هەموان چالاکتـر بون. هەندیکیـان بوبون بە ئەندام و بەرپرس لە پ د ک ی عیـراق و کـومـەلەی خویندکاران دا. کاریان بو ئەوان ئەکرد.

ئیمە: کوردەکانی عیراق، ئەگەرچی ناوبەناو یەکتریمان ئەبینی و ئەچوین بو گەران و پیاسـە و سـەیران و، هەمـو ئەورووزی ئاهەنگـمـان ئەگـیـرا و، ئەگـەر بونەیەکی گـرنگ بهاتایەتە پیشەوە کو ئەبوینەوە، بەلام هەر کەس خەریکی کار و ژیانی تایبەتی خوی بو. یەکیکی تازەی وەکو من ئەبو بو راپەراندنی کارەکانی خوی پشت بە خوی ببەستی. هەول بدا بە زویی زمان فیر ببی و، شارەزایی پەیدا بکا، ناسیاو بو خوی بدوزیتەوە.

بە من و تە کیچکام لە کوردەکانی عیراق ئەوسا نەبوبون بە پەنابەری سیاسی پەنابەری سیاسی لە ناو کوردەکانی عیراق دا هەر نەبو، یان ئەگەر بوبی زور دەگمەن بو.

من خویندکار بوم لە زانستگای ڤییەننا، کە یەکیکە لە زانستگا کونەکانی

ئەورووپا. وەزارەتی خوێندنی باڵا موافەقەتی بۆ کرد بووم لە یەک کات دا دوو خوێندن تەواو بکەم: زانستی سیاسەت لە «فاکولتێتی فەلسەفە» و، پەیوەندی ناودەوڵەتان لە «فاکولتێتی قانون». مامۆستای سیاسەتم پرۆفیسۆری زانستگا «هاینریک شنایدەر»، سەرۆکی ئینستیتوتی پۆلیتۆلۆگی و، مامۆستای پەیوەندی ناو دەوڵەتانم پرۆفیسۆری زانستگا «شتیفان ڤیروستا»، سەرۆکی ئینستیتوتی قانونی ناودەوڵەتان بوو. دۆستایەتیم لەگەڵ هەردوو پرۆفیسۆر و، هەندێ لە مامۆستاکانی تر و، لەگەڵ زۆر خوێندکاری نەمسایی دامەزراند بوو. وا باوە کە نەمسایی گیانی خۆبەزلزانینیان تێ دایە و، بە چاوی سووک سەیری بێگانە، تەنانەت، هی ئەورووپاییش ئەکەن، بەڵام کە تێکەڵاویان ئەبی ئەم قسەیە هیچ مەعنایەکی نامێنی. ئاسک و قسەخۆش و میواندۆستن. لە دۆستایەتی دا دڵسۆز و سەرڕاستن. لە پەیوەستی دا بە پێ ی توانا بە دەنگتەوە دێن.

سەرەتا چەند جاری جێگۆڕکێم کرد لەم ژوورەوە بۆ ژوورێکی تر. پاشان جێگیر بووم. ساڵی زیاتر لە قەڵاتێکی سەر شەقامی گشتی «گوێرتل» و، پاشماوەی ماوەی مانەوم لە ڤیەننا لە ژوورێکی «خانووی جیهانیی خوێندکاران» بووم لە شەقامی «شتارکفرێدگاسە». خانووەکەمان هی ژووری بازرگانی بوو، جێگاکەمان تا بڵێ ی خۆش و، کەشی ناو خانووەکە بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە نموونەیی بوو. هەموو خوێندکارێک ژوورێکی سەربەخۆی هەبوو. تەوالێت و شوێنی دروستکردنی خواردنی هەر ۱۰ خوێندکار پێکەوە بوو. باخی گەورە، تەستیلی مەلە، مەیدانی یاری، هۆڵی ئاهەنگ، شوێنی تایبەتی تەماشای تەلەفزیۆن، قاوەخانە و ڕێستورانتی تێ دا بوو. ئوتێلێکی ڕێکوپێکی پچووکیش لە ناو بلۆکی ئەم خانووانەدا تەرخان کرا بوو بۆ میوانی خوێندکارەکان. کاتی وچانی هاوینەی زانستگا هەموو خانووەکانیان ئەکرد بە ئوتێلی تووریستی. کاتی خۆی کە لە زانستگای بەغداد ئەمخوێند ماوەیەکی کورت لە «مدینە الرشاد» بووم، خۆمم پێ نەگیرا، بە جێم هێشت، دوا ساڵی لە «دار الطلبە» بووم، گوایە ئەمە باشترین خانووی خوێندکاران بوو، تەرخان کرا بوو بۆ خوێندکارانی دوا پۆلی زانستگا، ٦ خوێندکار پێکەوە لە یەک ژووردا بووین.

زانستگای ڤیەننا وەرزشی بۆ هەموو خوێندکارەکانی لە هەر تەمەن و، پلەیەکی شارەزایی و، لە هەر بابەتێکی خوێندن دا بوایە، دابین کرد بوو. من بە منداڵی وەرزشکار نەبووم. باوکیشم هەرگیز هانی نەدابووم بۆ یاری و وەرزش. بەڵام لە نەمسا تێگەیشتم وەرزش بەشێکی پێویست و گرنگی ژیانە.

دارستانی ڤیەننا «ڤینەر ڤالد» زۆر دوور نەبوو لە خانووەکەمانەوە. زۆر جار بۆ پیاسەی درێژ ئەچووم بۆ ئەوێ. لێڕەوارێکی چڕوپڕ و فراوان بوو. بە پێ ی ڕووشتن وەرزشێکی

باو بو، زور کەس بو ئەم وەرزشە ئەهاتن بو ئەوی و، هەندیکیان بە دریژایی روژەکە لەوی ئەمانەوە. جگە لەمەش لە زانستگا چو بومە کورسی دو جور وەرزشی خوشەوە: جومناستیک و شاخەوانی.

بو هەردو باری جلوبەرگ و کەلوپەلی تایبەتی خوی پیویست بو.

جومناستیک لە هولەکانی ناو زانستگا و، لە روژانی خویندن دا بو، بەلام شاخەوانی لە روژانی کوتایی هەفتە و، لە شاخەکانی دەوروبەری قیەننا بو. زور جار شەوانی یەکشەممە لە شاخ ئەمایەنەوە. لەو ولاتە شاخاوییانە، لە کونەوە خیرومەندەکان خانوی زوریان لە چیاکان دروست کردوە. ریبوار و راوکەر و شوانەکان بە شەو وەکو «دنیا» یەکی گەرم و ئەمین تیایان دا ئەحەسێنەوە.

شاخەوانیش لە ئەمسا باو بو. چەندین یانەی هەبو. راهینەرەکانی ئیمە هەر یەکەیان مەشقی بە گروپیکی ٦ کەسی ئەکرد و، ئیمان کردبین بە تاقمی دوکەسی. هەردوکەس پیکەوە بە شاخ دا هەلئەگەران بو ئەوەی لە کاتی پیویست دا یارمەتی یەکتری بدەن. هەندی لەو شوینانەی مەشقمان لی ئەکرد گوری ئەوانەی لی بو کە لە شاخەکە هەلدیرا بون. راهینەرەکانی ئیمە هەمو کەسانی لیهاتوی شارەزا و، لەوانە بون بە هیمالایادا هەلگەرا بون.

لە هەردو وەرزش دا من نەشارەزا بوم. لە سەرەتاوە دەستم پی کرد و، تا گەیشتمە قوناغی ناوەنجی رویشتم، ئیتر وازم لی هینان.

سواری یەکیکە لە وەرزشە ئاریستوکراتیەکانی خەلکی ئەمسا. لە کونەوە قیرگەیەکی سواری بە ناوبانگی لی یە ناوی: «قیرگەی سواری ئیسپانی» یە و، رەسەنیکی تایبەتی ئەسپیشیان هەیە. هاورییەکم هەبو حەزی لە سواری ئەکرد. جاریکیان پیکەوە چوین بو یانەیەکی سواری بو چەند سەعاتیک ولاخیان لی بە کری بگرین. کابرای ولاخدار لە منی پرسی: «سواری ئەزانیت؟». وتم: «بەلی». ئەسپیکی بو هینام وتی: «سواری بە!». منیش یەکسەر خوم هەلدایە سەر پشتی. هیشتا بە سەر پشتی ئەسپەکەوە نوم لی ی پرسیم ئەگەر ویستم غاری پی بکەم چی لی ئەکەم.

منیش وتم: «بە پاژنەی پیلاوەکانم لە ورگی ئەژەنم».

کابرا یەکسەر وتی: «دابەزە!». دابەزیم. وتی: «هەرگیز ولاخ بە تو نادەم سواری بیت».

قسەکەیم پیلاوە سەیر بو وتم: «بوچ؟»

وتی: «من ولاخەکانم بە نوقل و پسکیت بە خیو ئەکەم، جەنابیشت لی یان

ئەدەی، لیرە لە ولاخ نادەن بە رەشمەکەی نیشارەتی ئەدەنی»
چەندی لە گەلی خەریک بوم کابرا ئەی سەلماند، وتی: «تو بە لیدانی راهاتویت، تازە ناتوانی شیوەی سواری خوت بگوری»
*
ڤییەننا یەکیکە لە شارە هەرە خوشەکانی دنیا.
ناوەندیکی گرنگی دیپلوماسی و موسیقا و فەلسەفە بوە و، ئیستاش ناوەندیکی خوشیی توریزمە. سەدان فەیلەسوف، زانا، سیاسی، موسیقار، ئەدیبی گەورەی تی دا هەلکەوتوە کە ناوبانگیان بە هەمو دنیادا بلاو بوتەوە. تەنانەت هیتلەریش نەمسایی بوە.
خەلکی ڤییەننا ئیستاش شانازی بەوەوە ئەکەن کە دو جار ئوردوی زەبەللاحی تورکیان لە بەر دیوارەکانی شارەکەیان دا شکاندوە و، نەیانهیشتوە شارەکەیان داگیر بکری. یەکی لە موزەخانەکانی بو ئەم شەرانە تەرخان کراوە. دەواری ئاغاکانی کوردیشی تی دایە کە لە ئوردوگای تورک دا، دوای شکاندنیان، بە تالان گیراوە.
بارەگای ریکخراوی «ئوپیک» و، چەندین ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەوانە «دەزگای جیهانیی وزەی ئوتوم» لە ڤییەننایە. نەتەوە یەکگرتوەکان شاریکی تایبەتیان لە ناو ڤییەننادا هەیە.
ڤییەننا دەیان کوشکی دیرینی شاهانە و، دەیان موزەخانەی جوراوجور و، دەیان پارکی رەنگینی خوشی تی دایە. بورگ تیئاتر، شتاتس ئوپەر، کونسیرت هاوس... ۳ جیگای کەم وینەن لە دنیادا. رازاندنەوەی دەرودیوار و بنمیچی بیناکان و، کورسی و پەردە و کەلوپەلی ناوی. تەماشاکەران: ئافرەتەکان، هەمو جوانترین و گرانترین جلوبەرگیان لە بەر کردوە و، پیاوەکان هەمو بە قاتی رەش و کراسی سپی و بوینباخەوە، لە وچانەکانی نیوان پەردەکان دا، هیمن و بیدەنگ، لەسەر خو و، بە ریز و سەربەرزییەوە بە یەک دا دین و ئەچن. من کە ئەچوم بو ئەم شوینانە وام ئەزانی لە دەرباری قەیسەر دام. لە ناو ئەو پارچانەدا کە ئەو سەردەمە بو تەماشا کردنی چوم: «ئایدە» و، «زەماوەندی شای قەرەجەکان»ی شتراوس بو.
لە سەر جادەی بەناوبانگی «رینگ»، باخی شار هەیە. دەرگایەکی سەفارەتی عیراقی بەرامبەر بە دەرگایەکی ئەم باخە بو. تیپیکی موسیقا لەم باخەدا تایبەت بو بە دوبارەکردنەوەی ئاوازەکانی شتراوس. من هەندی جار بە تایبەتی بو گوی گرتن لەم ئاوازە خوشانە بە تایبەتی پارچەی «دانوبی شین» ئەچوم بو باخی شار.
«پراتەر شتیرن» کە شاری یارییە و، باخی «شونبرون» کە کوشکی قەرالیچە

ماریا تریزا بوه و، «تیمبر گارتن» کە بیشەلانی درندە و مەلی کیوییە، لە شوینە خوشەکانی گەران و سەیران بون.

زورم حەز لە دانیشتنی روژانەی قاوەخانەکانی ڤییەننا بو. دانیشتنی قاوەخانەکانی تام و لەززەتیکی تایبەتی هەیە. شیرینی و کاری هونەری ناپاییان تی دا دەس ئەکەوی. ریکوپیک و هیمن و جوانن، سەرەرای ئەوەش زوربەی روژنامە و گوڤارەکانی نەمسا و ئەلەمانیا و، هەندی جار هی ئەمریکاو بەریتانیاشی بە تازەیی لی داتراوە بو خویندنەوە. لەو شوینە خوشانەی کە حەزم ئەکرد شەوان لە گەل دوست و هاوری و، میوان بچم «ئوگوستینە کیلەر» و «۱۲ ئەپوستل کیلەر» بە زستان و، میخانەکانی «گرینسینگ» بە هاوینان. ئەو جورە میخانانە شتی تایبەتی ڤییەننان. زور جار شەوان لە گەل ئوئاد و عومەر ئەچوین بو ئەم شوینانە.

زور شوینی ناو ڤییەننا شارەزا بوم و، زور شار و ناوچەی نەمسە گەرام. چەند جاری چوم بو بورگنلاند، شتایەرمارک، تیرول و، شارەکانی لینتز، سالسبورگ، لەمەش دا بە زوری ئەمزاری دوستیکی لینتزی؛ گیردا ماوکس بوم. جگە لەوەی زوری یارمەتی دام بو فیر بونی زمانی ئەلمانی، زوریش یارمەتی دام بو شارەزا بونی ژیانی کومەلایەتی و روشنبیری و هونەریی خەلکی نەمسا.

هەمو سالی زوری بازرگانی یەکی لە هەریمەکانی نەمسا، خویندکارە بیانیەکانی خانوەکەی ئیمەیان بانگهیشتان ئەکرد بو سەردانی ناوچەکە و، پیشان دانی نیشانە پیشەسازی و بازرگانی و توریستی و روشنبیرییەکانی. جاریکیان منیش لە گەلیان چوم بو «شتایەرمارک» حەفتەیەک مایەوە. لەو شوینانەی پیشانیان داین؛ کارگەی دروستکردنی تفەنگ، کوتال، مەکینەی کشتوکال، ئیستگای بەرهەمهینانی کارەبای... بو. چیاکانی کوردستان شوینی زور و لەباری لەو بابەتەی لی یە بو دامەزراندنی ئەو جورە ئیستگانەی لەم ناوچەیەدا بو بەرهەمهینانی کارەبا دایان نا بو.

گەلان بە جوری جیا جیا ریز لە پیاوە هەلکەوتوەکانیان ئەگرن. لە مەیدان و شەقام و باخ و کوشک و زانستگاکان دا بە سەدان پەیکەری پیاوە هەلکەوتوەکانیان داناوە و، شەقام و کولانیان بە ناوەوە ناو ناون. خانوی هەندیکیان کردوە بە «موزەخانە» بو تەماشاکردنی گشتی. ستالین ماوەیەک لە ڤییەننا ژیاوە. یاسە بە ناوبانگەکەی لە سەر «نەتەوە» لەوی نوسیوە. پلەیتیک بە دیواری ئەو مالەدا هەلواسراوە لە سەری نوسراوە ستالین فلان سال لەم خانوەدا ژیاوە و، باسەکەی لە سەر نەتەوە لیرەدا نوسیوە.

سالسبورگ پایتەختی هاوینەی ئیمپەرەکانی نەمسا بوە. شاریکی بچوکی خوشە.

هەمو ساڵی ئاهەنگی جیهانیی موسیقای لی ساز ئەکرا. تیپە بەناوبانگەکانی فیلهارمونیکا بەشداریان تی دا ئەکرد و، ئاوازە کلاسیکییەکانی موزارت، بیتهوڤن، هایدن، باخ، دڤورشاک... تی دا دوبارە ئەکرایەوە. هاوری یەکی سالسبورگیم: توماس کراوس، چەند جاری بانگی کردم بو ساڵی خویان میوانی ئەو ئەبوم. ئەو فلاتەی کاتی خوی «موزارت» ی تی دا ژیا بو کرا بو بە موزەخانە. هەندی لە کەلوپەلەکانی و نوتەکانی و ئامرازە موسیقییەکانی لی دانرا بو.

*

ئەو ماوەیەی من لە ڤییەننا بوم هەندی لە کوردە ناسراوەکان بو گەشت و گەران سەردانی ڤییەننایان ئەکرد لەوانە: مامجەلال کە تازە ژنی گواست بوەوە، رەحمانی زەبیحی، رەشید عارف، سامی حسین ناظم، د. محمد باقر و، د. ئومید مەدحەت مبارەک، د. موراد عەزیز.

د. موراد چاکەی تایبەتی بە سەر منەوە هەبو. کاتی خوی لە بەغدا گیرم خوارد بو نەمئەتوانی دەربچم چونکە چەندین «مەنعی سەفەر» ی کون و تازەم لە سەر بو. د. موراد، بە هوی زەبیحییەوە، یارمەتی دام لە بەغدا دەرباز بوم.

سەرهەنگ نەوائی کە یەکی بو لە ئەفسەرانی بەشداری رووداوەکانی ئازەربایجان و، ماوەیەکی دریژی لە سوڤییت و چین بە سەر برد بو. ماوەیەکیش لە بەغدا بو. لە گەڵ خیزانەکەی هاتە ڤییەننا. هاوسەرەکەی ناساغ بو. زەبیحی فوئاد و منی راسپارد بو یارمەتی بدەین. نەوائی پیاویکی روشنبیر و نەجیبزادە بو.

*

زەبیحی دو ساڵ لە سەر یەک بو گەشتوگەران هات بو ڤییەننا. بەشیکی لە خوشی فوئادی مەلا محمود و من بو. هەردوجار زوری کاتەکەی لە گەڵ من و فوئاد بە سەر ئەبرد.

لیرەدا بە پیویستی ئەزانم لە ئاستی ئەم پیاوە گومناوەدا ئیستیک بکەم.

هەرچەندە تەمەن و بیروبوچونمان لە زور لایەنەوە جیاواز بو بەلام رەحمانی زەبیحی دوستیکی خوشەویست و دلسوزم بو. تیکوشەریکی کولنەدەری ریگەی کوردایەتی بو. زەبیحی لە سابلاغی موکریان لە دایک بوبو. بە گەنجی تیکەلاوی جولانەوەی کورد بوبو. یەکی بو لە دامەزرینەرانی کومەڵەی «ژ ک» و، تا هەلوەشانەوەی سیکرتیری بو. دوای ئەوە بو بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان. دامەزرینەری گوڤاری نهینی «نیشتمان» بو. زور وتاری سیاسی لە گوڤاری «نیشتمان: بلاوکەرەوەی بیری

کۆمەڵەی ژ ک» و ڕۆژنامەی «کوردستان: بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان» دا بڵاو کرد بوەوە. دوای ڕوخانی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد بە نهێنی هاتبوە عێراق. پاش ماوەیەک لە عێراق ئاشکرا ئەبێ ئەچێ بۆ سوریا. لە سوریا بە عەرەبی نامیلکەیەکی نوسی بوو بە ناونیشانی «الرد على الكوسموپولیتیه» ویست بوی تیا بسەلمێنی کورد بە گوێرەی تێگەیشتنی ستالین نەتەوەیە. لە سوریا بەشداریەکی کاریگەری کرد بو هاندانی دامەزراندنی «پارتی دیموکراتی کورد». پاشان گەڕایەوە کوردستانی عێراق لە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان کاری نەکرد. ماوەیەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی بو. لە دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول دا لێپرسراوی لقی کەرکوک و، دوایی‌تر لێپرسراوی لقی بەغداد بو.

زەبیحی خوێنەویست و دڵ و دەرون فراون و نەفس بەرز بو. هەتا بڵێ ی نەرم بو. ڕوداوەکانی ژیانی سیاسی و ئەدەبی خۆی باس نەئەکرد. تەنانەت ئەوەی ماوەی زۆریشی بە سەردا تێ پەڕی بو.

زەبیحی نوسەر و ئەدیب و ڕۆژنامەوان بو. چەندین زمانی ئەزانی. زۆر شارەزای زمان و ئەدەب و مێژوی کورد بو. لە مێژ بو خەریکی نوسینی فەرهەنگی کوردی - کوردی بو. لە کۆتایی شەستەکان دا منی ڕاسپارد لە سلێمانی «فەرهەنگی مەردوخ» و هەندێ شتی تری لەو بابەتەی بو پەیدا بکەم. زۆر جار ساخکردنەوە و لێکدانەوەی وشەی سلێمانی و دەوروبەری لێ ئەپرسیم.

دوەم جار کە بینیم زۆری لە گەڵ خەریک بوم لە ئێمەدا بمێنێتەوە تا خەریکی تەواو کردنی فەرهەنگەکەی بێ. فوئاد و من پێشنیارمان بو کرد بو خو خەریک کردن و دابینکردنی ژیانی، دوکانێکی کتێبفرۆشی کتێبی عەرەبی و فارسی و تورکی دابنێ و، ئێمەش یارمەتی بدەین. ئەوسا کتێبفرۆشی وەها لە ئەوروپا نەبو، یان ئەگەر هەشبوبی بە ناوبانگ نەبو. زەبیحی پێشنیارەکەی قبوڵ نەکرد و سور بو لە سەر گەڕانەوەی بو عێراق. هەندێ بیانوی هێنایەوە بو من قانعکەر نەبو. بە تایبەتی زەبیحی خێڵکی کوردستانی عێراق نەبو، ژن و منداڵ و خزم و کەسوکاری لەوێ نەبو. هەتا مردیش هەر ڕەبەن بو.

مەلا مستەفای بارزانی ڕێزی لێ ئ بو، چونکە ئەو وەکو هەژار، خۆی بە لای ئەودا نەخست بو.

سەرانی دیموکرات، بە تایبەتی د. قاسملو، حەزیان لە چارەی نەئەکرد، چونکە کاری لە گەڵ ئەوان نەکرد بو. زەبیحی باوەڕی وابو هەر کوردێ کەوتە هەر پارچەیەکەوە پێویستە خزمەت بەو پارچەیە بکا.

حیزبی بەعس قینیان لی ی بو. چونکە بە دوستی مامجەلال و ئیبراهیم ئەحمەدیان دائەنا. جارێک گیرا و چەند مانگی لە زیندان دا بی سەروشوێن بو. ئەشکەنجەی زۆریان دا. هاوسەرەکەی جەنەراڵ تەیموری بەختیار بوی تی کەوت لە گرتن و مردن رزگاری کرد.

لە دوا ساڵەکانی تەمەنی دا هەڵەیەکی سیاسی گەورەی کرد، چوە ناو یەکی لە حیزبە کارتونیەکانەوە، لە کاتێک دا نە ئەو پێویستی بە مە هەبو، وە نە لەو رێگایەشەوە ئەیتوانی خزمەتێکی کورد بکا.

دوای روخانی شا، زەبیحی سەردانی کوردستانی ئێرانی کرد. لە گوندی شینی جارێکی تر بینیمەوە. پێشنیارە کونەکەم بو دوبارە کردەوە؛ کە لەوی بمێنێتەوە و خەریکی تەواو کردنی فەرهەنگەکەی بی. بە تایبەتی لەو کاتەدا تایپرایتەری تازە بابەت داهات بو، کومپیوتەر پێشکەوت بو، ئەیتوانی کەڵکیان لی وەربگری. دیسان ئەمی سەلماند. مانەوەی پروژەی فەرهەنگەکە بە ناتەواوی خەسارەتێکی گەورە بو بو زمانی کوردی. زەبیحی زۆرتر خوی بە تێکوشەر و سیاسی ئەزانی تا زمانەوان و ئەدیب، لە کاتێک دا کەم کەس زەبیحی وەکو تێکوشەری سیاسی ئەناسی، کەچی زۆر کەس وەکو زمانەوانێکی گەورە سەیری ئەکەن.

زەبیحی دو بەرگی لە فەرهەنگەکەی بلاو کردەوە. هەرچی دیویەتی بە شاکارێکی زمانەوانی دائەنی. فریا نەکەوت بەرگەکانی تری بلاو بکاتەوە لە هەلومەرجێکی ئالوزدا لە ناوچەیەکی سنوری نێوان کوردستانی ئێران و عێراق بی سەروشوێن بزر بو. وەکو ئەڵێن مسودەی بەرگەکانی تری فەرهەنگەکەی کەوتوتە لای دەزگا ئەمنیەکانی عێراق، چونکە ماڵەکەی لە بەغدا بو.

*

لەو کاتەوە کە چو بوم بو لیبەنان هەولم ئەدا خوم لە رووداوە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق دور رابگرم. بەشداری هەندی لە کوبونەوەکانی خوێندکاران ئەبوم بەلام کەم تێکەڵاوی چالاکی پارتایەتی ئەبوم. بە درێژایی ئەو ماوەیەی لەوی ئەمخوێند هاوبەشی هیچ کونگرەیەکی خوێندکاران نەبوم و، بو هیچ کونفرەنسێکی پارتی نەچوم. زۆرتر لە گەڵ چەپەکانی ئێران تێکەڵاو بوم. لەبەرئەوە عەرەبەکان وایان ئەزانی من ئێرانیم و، ئێرانیەکانیش، چونکە فارسیەکەم «غەلیز» بو وایان ئەزانی من ئەفغانیم.

ئەوسا لە نێوان کورد و حکومەتی بەعس دا هێشتا ئاشتی بو. ئێرانی ئێمەش لە گەڵ سەفارەت ئاسایی بو. بو ئاهەنگە رەسمیەکانیان بانگیان ئەکردین. بە رێکوپێکی روژنامەکانی بەغداد: «الثورە» و «الجمهوریە» یان بو ئەناردم. بە هوی پارتیشەوە جاروبار

«الشاخی» م ئەبینی. شازاد صاحب و بەختیاری برام بە ڕێکوپێکی گۆڤار و کتێبە کوردییەکانیان بۆ ئەناردم.

*

خوێندکارێکی کوردی سوریا نامیلکەیەکی کورتیلەی بە زمانی ئەڵمانی لە ژێر ناوی: «کورد: گەلێکی بێ دەولەت» نوسی بو. هەندی زانیاری سەرەتایی و گشتی لە سەر کورد و نیشتمانەکەی تێ دا بو. بۆ ناساندنی کورد بە کەسێکی ئەشارەزا شتێکی باش بو. نەخشەیەکی فراوانکراوی کوردستانی لە سەر بەرگەکەی کرد بو، لای خوارووی لە سەر خەلیج و لای ڕۆژئاوای گەیشت بوە سەر دەریای سپی ناوەڕاست. نامیلکەکە بە ناوی «ولی ئەسای کۆمەڵەی خوێندکاران»ەوە بڵاو ئەکرایەوە.

چەند جاری کۆبونەوەی لە سەر کرا و، ناوەڕۆکەکەی خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە. لە سەر نەخشەکەی کوردستان من هەندی بۆچونم دەربڕی. کورتەی قسەکانم ئەمە بو: «ئەمجۆرە نەخشەیە گەلانی دراوسێ ئەترسێنی و، دژی کورد ئەیان وروژێنی. چونکە هەندی شوێن خراوەتە ناو سنوری جوگرافی کوردستانەوە، ئێستا بە ئەرزی کورد دانانرێن. ڕەنگە هەبێ بڵێ: کورد هێشتا دەولەتی نیە چاوی بڕیوەتە ئەرزی گەلانی تر، ئەی ئەگەر دەولەت و لەشکری هەبێ چی بکا؟»

قسەیەکی زۆر کرا لە سەر دەسکاری نەخشەکە. چەند کەسی تریش قسەیان کرد. کوڕێک لە کۆڕەکەدا بو، ناوی «حەننان»، خەڵکی چیای کرمانج بو لە سوریا و، تەندروستی ئاژەلی ئەخوێند. سور بو لە سەر هەڵوێستی خۆی، زۆر بە گەرمی دیفاعی لە باری سەرنجی خۆی ئەکرد، ئەیوت: «ئەوانە هەزار ساڵە کوردستان تاڵان ئەکەن، لە باتی تەعویضی ئەوە، من بە پارە لێ یان ڕازی نابم، ئەرزیان لێ وەرئەگرم». هەرچی کردمان و کۆشاین ئێستا و ئەوسا بیانوەکانی ئێمەی ئەسەلماند و پەلەبازییەکەی بەوە بڕییەوە: «ئەز دەڤ ژ بەحری بەر نادەم!»، واتە من دەس لە دەریا بەر نادەم. دەسکاری نەخشەکەی نەکرد.

پێ ی وابو من گرنگیی هەبونی دەریا نازانم، و نازانم نەبونی سنوری دەریایی چ کارێکی خراپی کردوتە سەر چارەنوسی سیاسی کورد، بۆیە من دەستم لێ بەر ئەدا و، ئەو دەستی لێ بەر نەئەدا.

*

ئەو کاتەی خەریکی ئامادەکردنی نامەی دکتورا بوم لە سەر: «پەیدا بون و گەشەکردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد»، ڕووبەڕووی پرسیاری ئەبومەوە، ئەبو وەڵامێکی زانستیی بۆ بدۆزمەوە، ئەویش: «کورد بۆچی نەیتوانیوە دەولەتی تایبەتی خۆی

دامەزرێنی، لە کاتێک دا هەمو نەتەوە دراوسێکانی: عەرەب، فارس، تورک، ئەرمەنی..
دەولەتی خۆیان دامەزراندوە؟»

ئەمە پاسێکی قوڵ و، لێکۆڵینەوەی زۆری گەرەک بو، نوسەرانی کوردیش زۆر کەم و بە کورتی لێ ی دواون. لە ناو ئەوانەدا لەم مەسەلەیە دواون، لە کۆنەکان: ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی، ئەحمەدی خانی، حاجی قادری کویی و، لە ناو نوسەرانی هاوچەرخیش دا: ئەمین زەکی، عەلائەدین سجادی، جەمال نەبەز مەسعود محەممەد.

نوسەرانی کۆن: هەمویان هۆیەکەیان گێراوەتەوە بو خۆخۆری کورد و تەفرەقە و نیفاق.

نوسەرانی هاوچەرخ: ئەمین زەکی لە «خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان» دا ئەیگێڕێتەوە بو «پێ نەگەیشتن» و نەبونی «عیلم و سەروەت» و، عەلائەدین سجادی لە «شۆرشەکانی کورد» ا بو «موسولمانەتی» کورد و، جەمال نەبەز لە «کوردستان و شورشەکەی» دا بو نەبونی «دین یا مەزهەب» یکی تایبەتی بە کورد و، مەسعود محەممەد لە «حاجی قادری کویی» دا بو «نزیکی ئابوری» کە بە هوی دراوسی بە هێزەکانیەوە توشی کوردستان بوە.

هەر کەسی لە مانە لە ئەنجامی لێکدانەوەی قوڵ و درێژی خوی دا ئەم ئەنجامەی هەلهێنجاوە و، بیانوی خوی هەیە بو سەلماندنی، بەلام هیچکامیان درێژەیان بە پاسەکەیان نەداوە.

بە دوای سەرچاوەدا هەردو کتێبخانە گرنگەکەی ڤییەننا: کتێبخانەی دەولەت «شتاتس بیبلوتێک» و، «کتێبخانەی زانستگا» بە وردی گەڕام. کتێبی کوردیان تێ دا نەبو. کتێبی عەرەبییش زۆر دەگمەن بو. بە زمانە ئەوروپاییەکانیش بە دەگمەن سەرچاوەی لە سەر کورد تێ دا دەس ئەکەوت. یەکێ پێویستایە پاپەتی لە سەر کورد ئامادە بکا ئەبو خوی سەرچاوەکانی پەیدا بکا. زوری ئەو کتێبانەی لە سەر کورد بە زمانی ئەلمانی لەو دو کتێبخانەیەدا بون سەیرم کردون، بە تایبەتی ئەوانەی کون چاپ کرا بون. لەوانە: کتێبەکانی لێرخ، جوستی، وەرگێرانی ئەلمانی شەرەفنامە لە لایەن «بارب»، نامەکانی مولتکە.

مولتکە، کە دوایی وەکو جەنەرالێکی ستراتیجی زان ناوی دەرکرد و، بو بە سەروکی «هەیئەتی ئەرکان» ی پروسیا. ئەوسا وەکو ئەفسەرێکی پچوک لە هێندی لە لەشکرکێشییەکانی ئوردوی عوسمانی دا بو سەر میرایەتییەکانی کورد لە کوردستانی تورکیا، بەشداری کرد بو. لە شوێنی شەرەکانەوە هێندی نامەی نوسیوە پاسی شەرەکان

ئەگیرێتەوە. بابەتی مێژوویی خۆش و بەنرخیان تێ دایە، بە تایبەتی لە سەر ڕەفتاری هێزی
داگیرکەری تورک. نوسخە کۆنەکانی چەند نەخشە و وێنەی دەستکری قەڵاکانی ئەوسای
کوردستانی تێ دا بوو.

هەندێ بابەتی خۆش و نایابم لەم کتێبانە وەرگرت بوو. بە تایبەتی لە نامەکانی
مولتکە، بە هۆی گەڕانەوەمەوە بۆ کوردستان، نەمتوانی کەڵکیان لێ وەربگرم.

*

من نەمئەتوانی بە ئازادی هاتوچۆی عێراق بکەم. پێشوودانەکان سەفەری وڵاتانم
نەکرد.

زستانی ٧٢ - ٧٣ سەفەرێکی درێژم کرد بۆ سویسرا، ئیتاڵیا، فەرەنسا،
ئیسپانیا. ئیسپانیا هێشتا لە ژێر دەسەڵاتی دیکتاتۆریی فرانکۆدا ئەیناڵاند. طەیب
بەرواری لەو کاتەدا دیپلۆمات بوو لە سەفارەتی عێراقی لە مەدرید کاری ئەکرد. جەنەراڵ
حەسەن نەقیب سەفیر و، حەمید سەعید «ملحق صحفي» بوو. هەردووکیان دوورخرا
بوونەوە. بە ئاشکرا ناڕەزاییان دەرئەبڕی. دیپلۆماتێکی تری لێ بوو، پیاوێکی قسە خۆش و
دڵپاک بوو. حەزی زۆری لە خواردنەوە بوو. چەند جارێ لە ماڵی خۆیان و دەرەوە
میوانداریی کردم. هەمیشە ئەم وتەیەی دووبارە ئەکردەوە: «من المحيط الى الخليج قطيع
من الغنم». طەیب و من هاوڕێ ی سالانی زانستگا و کاری سیاسی بووین. ئەوسا
هەردووکمان سەڵت بووین. زیاتر لە ٤ حەفتە لە مەدرید مامەوە. شەوی سەری ساڵم لە
مەیدانێکی گشتی مەدریدا لە گەڵ دەیان هەزار گەنج بە سەر برد.

د. فوئاد جەلال و ناجیەی خوشکم بۆ گەشت و گەڕان هات بوون بۆ ئیسپانیا.
پێکەوە بە ئۆتۆمبێل سەفەری هەنگاریامان کرد.

لەو ماوەیەدا سەردانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، یوگوسلاڤیا، بولگارستان...م
کرد. هەوڵی زۆرم دا سەردانی مۆسکۆ و لەندەن بکەم. سەرکەوتوو نەبووم. ئەیانوت: «ئێمە
لە بەغداد ڤیزای سەردانی ئەو شوێنانە وەربگری».

جارێکی تر سەفەرێکی درێژی چیکۆسلۆڤاکیا و ڕۆمانیام کرد. هاوڕێ ی
سەردەمی قوتابخانەم ئیبراهیمی شێخ مەحمود لە بوخارێست ئەیخوێند. ئەو زەمانە ئیتر
کۆمونیزمی ئەو وڵاتانەم لە بەرچاو کەوت. بەرتیلخۆری بۆ بوو بە نەریتێکی باو، لە هەمو
ئاستەکانی حکومەت و حیزب دا، تەنانەت لە ناو پرۆفیسۆرەکانی زانستگادا، بڵاو
بووبوەوە. هێشتا خانوی لە قوڕ دروستکراو لە گوندەکان زۆر بوو. ئاستی ژیانی
کاربەدەستانی حیزب و خەڵک بە ئاشکرا دیار بوو جیاوازە. تەنانەت ژمارەی

ئۆتۆمۆبیلەکانیشیان جیاواز بو. خوێندکارە ڕۆمانییەکان هەندێکیان ئەوەندە هەژار بون لە مێزا چاوەڕوانی خوێندکارەکانی تریان ئەکرد کەس قاپەکانیان بە جێ ئەهێشت، ئەمان هێرشیان ئەکردە سەر مێزەکە و پاشماوەکانیان ئەخوارد. لە خانوی خوێندکاران کەس سابونی بە جێ نەئەهێشت و، فانیلە، دەرپێ، گۆرەوی، خاولی.. لە دەرەوە هەڵئەواسی چونکە ئەیان دزی. بێگانە ڕاوە کچی بە گۆرەوی و بلوز و مەمکەوانە ئەکرد. گەورەترین نەخۆشخانەی «سفلس» لەوێ بو.

کە ئەم دیاردە دزێوانەم ئەبینی سەیرم بەو زنجیرە وتارە ئەهات کە چەند ساڵی لەوەو پێش، «پارێزەر بەهجەت محەممەد» لە هەفتەنامەی «ژین» ی سلێمانی دا لە ژێر سەرناوی: «ڕۆمانیای تەپ و تەسەڵ» دا نوسی بوی. لەخۆم ئەپرسی: «ئەگەر ئەمانە تەپ و تەسەڵ بن، ئەی بۆسی گێ بێ[1]».

لەو سەردەمە دا هەر لە بابەتی ئەم وتارە ئایدیۆلۆجییەی بۆ پشتیوانی لە سۆڤیەت نوسرا بو، چەندین وتار و نامیلکەی لەم بابەتە لە عێراق بڵاو ئەکرایەوە. لە بیرم دێ نامیلکەیەکیان بە ناونیشانی: «لە یەکێتی سۆڤیەت گەڕاومەتەوە» بو، نوسەر هەر ئەوەندەی مابو بڵێ لە بەهەشت هاتومەتەوە وەرن بۆ زیارەتی دەستم. نوسەری ڕوسی «بۆریس پاسترناک» لە سەر داستانی «دوکتور ژیڤاگو» خەلاتی نۆبلی وەرگرت. محەممەدی مەلا کەریم، چونکە بیستبوی ئەم داستانە دژی سۆڤیەتە، بێ ئەوەی داستانەکەی خوێندبێتەوە یا دی بێتی، وتارێکی درێژی لە دژی نوسی. هەروەها چەندین وتاریان لە سەر خۆشیی ژیان و پێشکەوتنی سیاسی و ڕوشنبیری و ئەدەبیی کوردەکانی سۆڤیەت ئەنوسی، کەچی وەکو دوایی دەرکەوت کوردەکانی سۆڤیەت لەو زەمانەدا وەکو کوردە ئەنفالکراوەکانی گەرمیانیان لێ کرا بو.

لە سەردەمی شەڕی ساردا کە دنیا دابەش بو بو بە سەر بلۆکی ڕۆژهەڵات و بلۆکی ڕۆژئاوادا، حشع ئەندامەکانی خۆی بە «سۆڤیەتپەرستی» پەروەردە ئەکرد. وای فێر کرد بون کە مێشکی خۆیان بە کار نەهێنن بۆ جیاکردنەوەی چاک لە خراپ. باوەڕێکی پێشەکی ئامادەکراوی لە لا دروست کرد بون کە هەرچی لە دنیای سەرمایەداری دا بێ خراپە و، هەرچی لە دنیای کۆمونیستی دا بێ باشە.

سەردانی ئەم وڵاتانە کە سیستەمی حوکمڕانییان و، جۆری ژیانی دانیشتوانیان جیاواز بو، یارمەتییان دام زۆر لە بۆچونە کۆنەکانم سەبارەت بە سەرمایەداری، سۆسیالیزم، کۆمونیزم، دیموکراسی، ئازادی بیر و ڕۆژنامەوانی و پارتایەتی... بگۆڕم.

*

حیزبی شیوعی عێراق چوبونە ناو جەبهەکەی حکومەتەوە. هەروەها بەشداری وەزارەت بون. ئەوانیان لە گەڵ پارتی تێکچوبو. ڕۆژنامەکانی «طریق الشعب» ی حیزبی شیوعی و «التآخی» پارتی پەلاماری یەکتریان ئەدا. پارتی لەو شوێنانەی دەستی ئەرۆیشت تەنگی پێ هەڵچنی بون. ئەندام و لایەنگرەکانیان ئەگرتن و ئازاریان ئەدان. عیسا سواری بارزانی، سەرلەشکری هێزەکانی پارتی لە بادینان، ١٢ کادری شیوعی کە لە سوریاوە ئەگەڕانەوە، بە کۆمەڵ کوشت. وەکو دوایی بارزانی لە نامەیەکی دا بۆ کارتەر دانی پێ دا نابو، تەنگ هەڵچنین بە کۆمۆنیستەکان بە زۆری بۆ ڕازی کردنی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بوە.

لەو ماوەیەدا پەیوەندی سەرکردایەتی بارزانی لە گەڵ ئێران و ئەمەریکا و ئیسرائیل و، پەیوەندی سەرکردایەتی بەعس لە گەڵ سۆڤیەت بەهێز بوبو. عێراق و سۆڤیەت «پەیمانی هاوکاری و دۆستایەتی» یان ئیمزا کرد بو.

*

ڕژێمی بەعس گرنگیی مەسەلەی کوردو گەورەیی مەترسی ئەم جوڵانەوەیەی بۆ سەر خاکی عێراق و پاشەڕۆژی ئەزانی و ئەیزانی چ قورساییەکی عەسکەری، ئابوری، سیاسی لەسەر دروست کردوە.

حیزبی بەعس لە ئیمزاکردنی بەیانی ئازاری ١٩٧٠ لەگەڵ بارزانی ئومێدی وا بو کە کارتی کوردی لە دەس شا دەربهێنی و، بە قازانجی خۆی بە کاری بهێنی، بەڵام هەوڵدانی شا لەگەڵ بارزانی بۆ ئەوەی پەشیمانی بکاتەوە لە ڕێکەوتن لەگەڵ بەعس و، پیلانگێڕانی بەعسی دژی بارزانی و، بزوتنەوەی کورد، هەروەها بی بڕوایی بارزانی بە بەعس و نەویستنی ڕێکەوتن لەگەڵ بەعس، ئەو ئومێدەی بەعسی نەهێنایە دی و کارتی کوردی بە موافەقەتی سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد لەدەس شادا مایەوە.

ئەو ٤ ساڵەی لە بەیانی ئازاردا بۆ بڵاو کردنەوەی قانونی ئوتونومی دیاری کرا بو بەرەو تەواو بون ئەچو. بەعس سور بو لە کاتی خۆی دا قانونەکە بڵاو بکرێتەوە. سەرکردایەتی پارتی ئەیویست دوای بخا. بیروبۆچونی هەردولا لە سەر زۆر مەسەلەی بنەڕەتی جیاواز بو. هیچ لایەکیان بڕوای بەوی تر نەمابو.

مانگی مارتی ٧٤ گفتوگۆی سەرکردایەتی بارزانی و بەعس چوە ناو کۆڵانێکی داخراوەوە، بە تایبەتی دوای چونی ئیدریس بۆ بەغدا بۆ بینینی صەددام و، گەڕانەوەی بە بێ ڕێککەوتن.

چەند جاری صەددام باسی ئەم کۆبونەوەیەی گێڕاوەتەوە. دوائێش، لە گفتوگۆکانی

٨٤ دا بۆ نوێنەرایەتی یەکێتی باس کرد و، پێش داگیرکردنی کوێت بۆ ئەپریل گلاسپی سەفیری ئەمەریکای گێڕاوەتەوە. وت بوی: «چارەنوسی ئێوە بەستراوە بە پشتیوانی ئێرانەوە و، ئێران داوای شەطولعەرەب ئەکا، شەطولعەرەب لە کوردستان خۆشەویستتر نیە.

ئەگەر شەر دەس پێ بکەنەوە، ساڵێک شەرتان لە گەڵ ئەکەم، ئەگەر نەمتوانی بە سەرتانا زاڵ بم. لە گەڵ ئێران رێک ئەکەوم نیوەی شەطولعەرەبی ئەدەمێ بەرامبەر بەوەی بارزانیتان لێ ببڕێ.. تۆپاڵەکەی لە گەردنی ئێوەدا ئەبێ و، واتان لێ ئەکەم پەشیمان ببنەوە. بەڵام ئەوسا ئیتر پەشیمانی کەلکی نابێ..»

بارزانی ئەوسا ئەم هەڕەشەیەی بە هەند نەگرت بو. بارزانی پشت ئەستور بو بە هاوپەیمانەکانی. خۆی بە خورت و هێزدار ئەزانی. تەنانەت د. مەحمود عەلی عوسمان لە کۆبونەوەیەک دا لە مزگەوتەکەی گەلالە وت بوی: «حکومەتی عێراق بە کام چەک لێمان بدا بە هەمان چەک لێ ی ئەدەینەوە!»

لە مانگی نیسانەوە شەر بە گەرمی لە کوردستان دا دەستی پێ کردەوە. نزیکەی هەمو کوردی عێراق لە ژێر ئاڵای بارزانی دا کۆبونەوە و، دژی حیزبی بەعس راوەستان. جگە لە جەش و ژمارەیەکی کەمی کورد کەسێکی ئەوتۆ هاوکاری بەعسی نەکرد.

شەری ئەمجارە لە چاو قۆناغەکانی پێشودا لە هەمو کات گەرمتر و سەختتر بو. پشتیوانی کوردیش لە شۆرشەکە لە چاو قۆناغەکانی پێشودا لە هەمو کات فراوانتر بو. سەدان هەزار کەس چونە ناو ریزی شۆرشەکەوە لەوانە بە سەدان ئەفسەر، مامۆستای زانستگا و قوتابخانەکانی ناوەندی و سەرەتایی، پزیشک، ئەندازیار، پارێزەر... تۆپخانەی قورسی ئێران و شارەزاکانی بەشدار بون.

نوێنەرایەتی دەرەوەی پارتی لە ١ ی ئابی ٧٤ دا بەیاننێکی بە ئینگلیزی دەربارەی هەلومەرجی کوردستان بلاو کرد بووەوە، بۆ نیشاندانی گەرمیی شەرەکە، لێرەدا ئەم چەند هەواڵەی لێ راتەگوێزم:

- لە ماوەی: ٤/١٥ تا ٧/١٥

ژمارەی هێرشی ئاسمانی: ١٥٤٢

ژمارەی کوژراو: ٤٨٥

ژمارەی دێ و شاری بردومانکراو: ٤٣٣

- خەرجی رۆژانەی شەر نزیکەی نیو ملیون دیناری عێراقی بەرامبەر ....٦٢٥, پاوەنی ستەرلینی لێ چوە.

- ئەم هێزانەی جەیشی عێراقی بەشداری شەر بون:

فیرقەکانی ١ و ٢ و ٤ و ٦ و ٨
لە نیوە زیاتری فیرقەکانی ٣ و ١٠.
نزیکەی ٢٥ کەرتی تانک
هەمو هێزی ئاسمانیی
چەندین کەرتی جاشی بەکرێگیراوی کورد
تا ئاشبەتاڵ شەر بە سەختی درێژەی کێشا.

پاش مـاوەیەک لە ئاشـبەتاڵ سـەرۆکی هەیئـەتی ئەرکـانی جـەیشی عـێـراق و، جـاریکیش صـەددام خـۆی لە بەردەمی «المجلس الوطنی» دا بە بۆنەی هەلوەشـاندنەوەی ڕێککەوتنی جـەزائیرەوە لە ١٧ ی ئەیلولی ١٩٨٠. دا وتی: جـەیشی عـێراق لە مـاوەی دوانزە مـانگی شـەردا زیاتر لە ١٦ هەزار ئەنگاوتەی، بە کـوژراو و بریندارەوە، هەبوە و، تیکرای ئەنگاوتەی جەیش و خەلک گەیشتوتە ٦٠. هەزار. بێگومان شـەرەکە قـورس بو، بەلام من لام وایە ئەم ژمارەیە ڕاست نەبو. ئەنگاوتەی هەردولا، هی بەعس و کورد، لە مە کەمتر بوە و، صەددام بۆ پاساودانی ڕێککەوتننامەی جەزایر ئەم درۆیەی ئەکرد.

*

ڕۆژنامـە بلاوەکـانی ئەمـسـا: کـورییر، کـرونیین، پریسـە، هەندی جـار هەواڵ و دەنگوباسەکانی شەری کوردستانیان بلاو ئەکردەوە. یەکێ لە کاربەدەستەکانی تەلەفزیۆن: «هانز بەنەدیکت» سەری کوردستانی دا و، بەرنامەیەکی درێژی لـە سەر شەری کوردستان ئامادە کرد، لەم بەرنامەیەدا گفتوگۆی لە گەڵ بارزانی، حەبیب محەمەد کەریم، د. مـحـمـود عـوسـمـان کرد بو. بەنەدیکت بە هاودەردییـەکی قـولەوە لەگـەڵ کـورد ئەم بەرنامـەیەی لە تەلەفزیۆنی ئەمسـادا بلاو کردەوە. لە ناو ڕۆژنامە ئەلەمانیزمانەکان دا ڕۆژنامەی سویسری: «نویە زوریخـە تسـایتونگ» زورجار وتار و لێـدوانی سـەنگینی لە سـەر کێـشـەی کـورد ئەنوسی.

هیلموت کرامەر، یەکێ لە مامۆستاکانم، کە دەرسی پەیوەندییـەکانی ناودەوڵەتانی پێ ئەوتین، داوای لێ کردم: منیش بە باسێک لە سـەر کـێـشـەی کورد لەو سیمیسـتەرەدا هاوبەشی بکەم. لەو سمیسـتەرەدا کێشەکانی شیلی، ڤیەتنام، فەلەستین، بەرزبونەوەی نرخی نەوت و، کـێـشـەی لەو بابەتانە، باس و لێکۆلینەوەیان لە سـەر ئەکرا. ئەوەی منیش بو بە بەشێکی بەرنامەی ئەو سـمیسـتەرە. لە گەڵ مامۆستاکەم ڕێک کەوتین باسەکەی من وەلامی ئەم پرسیارانە بداتەوە:

- بۆچی شـۆرشی کـورد هەمـیـشـە لە عـێـراق دا ئەتەقێـتـەوە، لە کـاتێک دا

هەلومەرجی ژیانی سیاسی کورد لە عیراق دا باشترە لە هی کوردەکانی تورکیا و ئیران و، ژمارەشیان لەوان کەمترە؟

- ئیران و تورکیا هەردوکیان سەر بە کامپی رۆژئاوان و، هەردوکیان ئەندامی پەیمانی «سنتو» ن و، هەردوکیان کەمایەتییەکی گەورەی کوردیان تێ دا ئەژی... بۆچی ئیران یارمەتی شۆرشی کوردەکانی عیراق ئەدا کەچی تورکیا دوژمنایەتی ئەکا؟

- بۆچی یەکێتی سۆڤیەت سیاسەتی خۆی بەرامبەر شۆرشی کورد گۆڕیوە، لەوەی پشتیوانی لی نەکرد و جارێک بە هۆی مەنگولیاوە ویستی بیباتە بەردەمی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کەچی ئێستا بە ئاشکرا یارمەتی عیراق ئەدا دژی کورد؟

- ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆچی جاران جوولانەوەی کوردی بە سوور دائەنا کەچی ئێستا پشتیوانی ئەکا؟

هەندی پرسیاری تری لەم بابەتە.

من بە گوێرەی بیروبۆچوونی ئەو کاتەی خۆم، پاسێکی تێروتەسەلم لە سەر ئامادە کرد و لە کۆڕێکی گەورەدا پێشکەشم کرد. لە ناو گوێگرەکان دا خوێندکارێکی تورکی تێ دا بوو، خۆی بە چەپ دائەنا. بە توندی بەرپەرچی دامەوە. یەکێ لە رەخنەکانی ئەوە بوو: «شۆرش ئەبێ کۆمەل لە قۆناغێکی دواکەوتووەوە بیبا بۆ قۆناغێکی پێشکەوتووتر، بەلام ئەمەی ئێوە پاشی بۆنێکی کۆنەپەرستانەیە ئەتانباتەوە بۆ دواوە». ئینجا ؟ بۆیە هێرش بۆ سەر بارزانی. منیش وتم: «کورد رێگای هێنانەی خەباتی سیاسی بۆ نەماوەتەوە بۆیە پەنای بردوتە بەر شۆرش. کورد ئەبەوی لە ژیانی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری عیراق دا بەشدار بکری. ئەیەوی لە ولاتەکەی خۆی دا ئازادی حیزبایەتی و رۆژنامەوانی و هەلبژاردنی هەبی. ئەیەوی قوتابخانە، نەخۆشخانە، رێگاوبان، کارگە... لە کوردستان بکرێتەوە... ئەگەر تۆ ئەمانە بە کۆنەپەرستی بزانی ئەبێ پێشکەوتن چی بی؟» کوڕەکە دوسەعاتێکی خاپاند.

هەر لەو ماوەیەدا «یەکێتیی خوێندکارانی جو» بە دوای کوردێک دا ئەگەڕا بۆ کێشەکەیان بۆ روون بکاتەوە. رۆژێکیان سەرۆکەکەیان تەلەفۆنی بۆ کردم. ئەو زەمانە منیش لە ژێر تەئسیری پروپاگاندەی عەرەب و فەلەستینییەکان دا بووم. لە هەمو پەیوەندییەک لە گەل جو ئەسلەمیمەوە. ویستم خۆمی لی بدزمەوە. کوڕەکە هەستی پی کرد وتی: «ئێمە جولەکەی ئەمسایین، ئیسرائیلی نیین». گفتوگۆکەمان بەوە تەواو بو بەلێنم دایە داواکەی جیبەجی بکەم. کاتێکمان دیاری کرد لە بارەگاکەی خۆیان کۆ ببینەوە. بارەگاکەیان نزیک زانستگا بو. لە گەل یەکێ لە کوردەکانی سوریا، کە لە هەموان چالاکتر و ئەلمانی باشتر

ئەزانی. لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بوین. ژمارەیەکی زۆر خوێندکاری کور و کچ هات
بوون. بە گەرمی پێشوازییان کردین. ئەوەی پێویست بو بۆمان ڕوون کردنەوە. لە کۆتایی دا
یەکێکیان لێ ی پرسین، هەڵوێستمان لە ئیسرائیل چیە؟ من وەلامم دایەوە؛ وتم: وتەمە
وشی خومە: من دژی جولەکە نیم، بەلام لایەنگری فەلەستینییەکانم، لام وایە ئیسرائیل
زولمی لە گەلی فەلەستین کردووە. قسەکەی منیان بە ئاسایی وەرگرت. نە کەسیان تووڕە بو
و، نە کەسیشیان وەلامی دامەوە.

*

جـەنگی ١٩٧٤ - ١٩٧٥ ی کـورد - بەعس ئەگـەرچی لە نێـوان هێـزە
چەکدارەکانی کورد و جەیشی عیراقی دا بو، لە سەر ئەرزی کوردستان ئەکرا، لە پێناوی
ئامانجە نەتەوەییەکانی گەلی کوردا بو، بەلام لە راستی دا ململانێ ی سیاسی - جەنگیی،
ئێرانی - عیراقی بو. هێزەکانی کورد بە چەک و ئیمکانیاتی ئێرانی ئەجەنگان و بەعس
بە چەکی روسی و ئیمکانیاتی نەوتی کەرکوک. لەم ململانێ یەدا عیراق بالادەستی بە
سەر کوردا و، ئێران بالادەستی بە سەر عیراق دا هەبو.

ئێـران دەسکەلای گوشـاری کـوردی - عـیـراقی بەدەسـتـەوە بو، کـە نەک هەر
گوشارێکی توند بو لە سەر ژیانی ئابوری، سیاسی، کومەلایەتی.. بەلکو هەرەشەیەکی
راستەقینە بو لە دەسەلاتی بەعس و یەکێتی ئەرزی عیراق و ئاسایشی نەتەوەی عەرەب.

لە بەرامبەر ئەمەدا عیراق دەسکەلایەکی هاوتای ئەمەی دژی ئێران بەدەستەوە نەبو.
ئەگەرچی رژێمی شا رژێمێکی ناخوشەویست بو لە ناو ئێران دا، بەشێکی زوری خەلکی
ئێران دژی بون، چەندین تاقمی ئوپوزیسیونی چەپ و راست لە ئەورووپاو لە عیراق دا
هەبون، هەر لە ئوپوزیسیونی دینییەوە وەکو ئیمام خومەینی، تاسەر ئوپوزیسیونی
دیموکراتی و کومونیستی و نەتەوەیی. بەلام لەو سەردەمەدا نە لە ناو ئێران دا
ئوپوزیسیون هێشتا توانیبوی زەمینەی بەرەنگاری کاریگەر و راپەرین خوش بکا، وە نە
ئەو ئوپوزیسیونەی لە عیراق کوبوونەوە قورساییەکی ئەوتویان هەبو کە هاوسەنگی
ئوپوزیسیونی کوردی عیراق بکەن لە ئێران دا.

لەو سـەودایەدا کـە ئێـران و عـیـراق ئەبو بیکەن بو ئەوەی بگەنە یەک، ئێـران
دەسکەلایەکی گوشاری کاریگەری لە ناو عیراق دا هەبو ئەیتوانی بیگوریتەوە لەگەل
عیراق، بەلام بەعس جگە لە ئەرزی عیراق و ناوبانگی سیاسی خوی شتێکی تری ئەبو لە
بەرامبەر ئەو گوشارەدا بیدا بە ئێران. بەم پێ یە صەددام ئەبو مل بدا بو شا، خواستە
کونەکانی لە شەطولعەرەب بە جێ بهێنێ بو ئەوەی ئەویش دەس لە یارمەتیدانی کورد

هەڵگری.

*

لە گەرمەی شەڕی کورد - بەعس دا، هەوڵدانی ئاشکرا و ژێربەژێر هەبوو بۆ ڕێکخستنەوەی تەهران و عێراق. ڕۆژنامە ناسراوەکانی دنیا و، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی هەواڵ و دەنگوباسی ئەم هەواڵانەیان بڵاو نەکردەوە. ئەم هەواڵانە لە ڕێگای نوێنەرایەتی دەرەوەی پارتیەوە نەگەیشتەوە «دەزگای پاراستن» و، لە ڕێگای ئەوانیشەوە بە بارزانی و سەرکردایەتی پارتی. سامی سنجاری لەو کتێبەدا کە بە ناوی: «طریق الحرکة التحرریة الکردیة: تقییم ثورة ایلول والبرنامج الجدید للحزب الدیمقراطی الکردستانی» وەکو ڕاپۆرتی سیاسی، لە ئابی ۱۹۷٦ دا، دلۆپتی بە کۆنفرەنسی قیادەی موەقەتە دانی پێوەدا ناوە کە لە کاتی شەڕدا دەنگوباسی هەوڵی ژێر بە ژێری ڕێککەوتنی عێراق و تەهران و، ناوبژی مەلیک حسێن و بومەدیەن و ساداتیان بیستوە.

مامجەلال، کە ئەو دەم، لە قاهیرە ئەژیا، هەواڵی نزیک کەوتنەوەی عێراق و ئێرانی بارزانی و سەرکردایەتی شۆڕش نوسی بوو.

پرۆفیسۆری ئەمەریکایی (بە ڕەچەڵەک ئێرانی)، د. ڕوحوڵڵای ڕەمەزانی، لە باسەکەی دا لە ژێر ناوی: «تەنگەی هورمز» بە زمانی ئینگلیزی، بە وردی ئەم هەوڵانەی لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە گێڕاوەتەوە و، شی کردونەتەوە. لێرەدا هەندێ لەو هەواڵانە یەکگیرەوە. گرنگترینیان ئەمانە بون:

- هەوڵەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە دوای پێکدادانێکی خوێناوی هێزەکانی عێراق و ئێران دا لە ۱۰ ی شوباتی ۷٤ دا کە ٦٥ کەس لە هەردولا کوژرا، هەردولا ناوبژی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانیان قبوڵ کرد بۆ ئەوەی کێشەکە بە ئاشتی لایەلا بکا. سکرتێری گشتی نوێنەری تایبەتی خۆی نارد.

لە ۲۱ ی مایس دا ڤالدهایم ڕاپۆرتێکی دا بە ئەنجومەنی ئاسایش ئاگاداری کردن کە هەردولای ناکۆکییەکە بە شێوەیەکی سەرەتایی قبوڵیان کردوە کە:

أ. هەردولا هێزەکانیان بکێشنەوە سنور.

ب. هیچی تر پەنا نەبەنە بەر کاری دوژمنانە.

ج. پەیرەوی سەرەتای گفتوگۆ بکەن.

لە ۲۸ ی مایس دا ئەنجومەنی ئاسایش موافەقەتی هەردولای بۆ گفتوگۆ لە سەر چارەسەری گشتلایەنەی هەمنانەی ناکۆکییەکانی پەسند کرد. وەزیرەکانی کاروباری دەرەوەی

هەردوو دەوڵەت لە مانگی تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر) دا لە ئەستەمبوڵ یەکتریان بینی. ئەگەرچی ئەم کۆبوونەوەیە کێشەکانی بە لادا نەخست، بەڵام عەبباس عەلی خەلعەتبەری، وەزیری دەرەوەی ئێران گەشبینی خۆی دەربڕی دەربارەی دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ.

- هەوڵی سۆڤیێتی

لەو سەفەرەدا کە شای ئێران بۆ یەکێتی سۆڤیێتی کرد. پۆدگۆرنی لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ٢ ی تشرینی دووەم (نۆڤەمبەر) ی ١٩٧٤ دا لە سەر کێشەی ئێران - عێراق بەمجۆرە لە گەڵ شا دوا بوو:

پۆدگۆرنی: هەمو گرژییەکی ئاسایشی جیهان لە هەر ناوچەیەک دا بێ لەوانە ناوچەی خەلیجی فارس و ئۆقیانوسی هیند، جەوی پێوەندی لە هەمو دنیادا ئەشێوێنێ. گرژی لە پێوەندییەکانی ئێران و عێراق دا بە ئازاڵجی ئاشتی نیە پەیمان خۆش بوو و ئێستاش حەز ئەکەین ناکۆکییەکانی عێراق - ئێران لە لایەن خۆیانەوە لە سەر مێزی گفتوگۆ لایەلا بکرێ، لایەلا کردنێک لە سەر بنچینەی سەرەتاکانی پێکەوەژیان بە ئاشتی و پێوەندییەکانی دراوسێیەتی باش دامەزرا بێ.

شا: حەز ئەکەم بڵێم ئەگەر عێراقیش لە پێوەندییەکانی دا لە گەڵ ئێمە هەمان هەڵوێستی هەبوایە کە ئێمەی دراوسێ ی گەورە هەمانە و، ئەگەر عێراق ئەنوسایە بە میراتی ئیمپریالی بەریتانیەوە، هیچ کێشەیەکمان لە سەر ئەم مەسەلەیە لە بەین دا ئەئەبوو. بە هەر حاڵ ئێران بەردەوام ئەبێ لە تەقەللاکانی دا بۆ چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە بە ڕێگای گفتوگۆ.

- هەوڵی ئەمریکی

کیسینگەر لەو کاتەدا خەریکی مەسەلەی ئیسرائیل و میصر بوو ، سووریا بە توندی دژی هەڵوێستی میصری بوو، ئەمریکاش بۆ ئەوەی سووریە خەریک بکا بە شتێکی ترەوە، ئەیەوڕێتە سەر مەسەلەی میصر و ئیسرائیل بە چاکی ئەزانی شۆڕشی کورد لە عێراق دا بکوژێتەوە بۆ ئەوەی عێراق دەستی بە تاڵ بێ بۆ یەکگرتنی سووریا... بۆیە ئەمریکاش بە نهێنی هانی ئێرانی دا ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ عێراق بە ئاشتی چارەسەر بکا.

- هەوڵی مەلیک حسێن

شای ئێران سەفەرێکی کرد بۆ ئوردون. مەلیک حسێن، شای ئوردون، لەم سەفەرەی دا لە ناو گفتوگۆکانی دا ، داوای لە شا کرد بوو: کێشەی ئێران لە گەڵ عێراق بە ئاشتی چارەسەر بکا.

له کـونگرەی سـەرانی عـەرەب دا لە رەباط، صـەددام داوای لە هەندێ لە سـەرانی عەرەب کرد بو، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندیهان لە گەڵ تیهران ئاسایی بو. لەوانە: مەلیک حسـین، ئەنوەر سادات، هەواری بومدیەن... هەوڵ بدەن بو ناوبژی لە نێوان ئیران و عێراق دا.

*

ح. ا. مهران، وەرگێڕی فارسی کتێبە ئینگلیزییەکەی فریدون هویدا: «سقوط شـاه» بو ئەوەی بەرپەرچی قـسـەکـانی هوەیدا بداتەوە، کـە ڕێککەوتنی (ناوەڕاسـتی ئیسـفـەندی ٥٣) ی شـا و صـەددام لە جەزایر بڕیاری «خـود سـرانە» ی شـا نەبوە، بەڵکو ئەنجامی ڕێککەوتنی ئەمەریکا و سـوڤیت بوە، بو خوشکردنی زەمینەی ئەم ڕێککەوتنە لە (ل ١٥٥) دا کرونولوجییەکی ڕیک خستوە لێرەدا وەکو خوی ئەی نوسمەوە:

- سـەرەتای ئاپانی ٥٣ هـێنری کـیسـینگەر هاتە تیـهران. دوای ئەوە یەکـسـەر وەزیرانی کـاروباری دەرەوەی ئیـران و عـیـراق لە ناو کـوبونەوەکـانی کـومـەڵەی گـشـتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیویورک گفتوگویان لە گەڵ یەکتری دەس پی کرد.

- کـوتایی ئاپان ٥٣ شـا چو بو ئوردون لەوی لە گـەڵ طاریق عـەزیز وەزیری ئیعلامی عیراق دانیشت.

- سەرەتای دەی ٥٣ شا چو بو سوڤیت و لە راگەیاندنی هاوبەشی هەردو وڵات دا باسی پەیوەستی ئاشتبونەوەی ئیران و عیراق کرا بو.

- ناوەڕاسـتی دەی ٥٣ شـا دوبارە چوەوە بو ئوردون و لەویوە چو بو مـیـصـر، ئاژانسـەکـانی هەواڵنێری دەربارەی هەردو سـەفـەر بڵاویان کردەوە کـە شـا حسـین و ئەنوەر سادات ئەیانەوی ناوبژی لە نێوان شا و صەددام دا بکەن.

- سەرەتای بەهمەنی ٥٣ گفـتـوگوی خەلعەتبەری (وەزیری دەرەوەی شا) لە گەڵ سـەعـدون حەممادی (وەزیری دەرەوەی عـیراق، کـە ئەیانوت لە هەمـو عـیـراقـیـیـەکـانی تر لە زمانی شا تی ئەگات) لە شاری ئەستەمبول دەستی پی کرد، یەکسەر دوای ئەوەش صەددام چو بو ئوردون.

- سـەرەتای ئیـسـفـەندی ٥٣ شـا لە سـەفـەری ڕابواردنی خـوی دا بو سـویـسـرە گفتوگوییەکی درێژی لە گەڵ هێنری کیسینگەر و جوزیف سیسکو (یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمـەریکا) کـرد و، دوای گـەڕانەوەی بو تیـهران یەکـسـەر چو بو جـەزایر تا لە کـونفـرەنسـی سـەرانی ئوپیک دا بەشـدار بی. لەم سەفـەرەدا بو لە نێـوان ئەو و صـەددام دا ڕێککەوتننامەی ناسراوی ١٩٧٥ ی جەزائیر ئیمزا کرا.

*

صەددام ئاتومێد بو لەوەی بە شەر شورشی کورد بکوژێنێتەوە. وەکو هەرەشەی کرد بو، دوای ساڵێک شەری سەرنەکەوتو ئێنجا رێگای سیاسی، واتە رێگای رازی کردنی ئێرانی گرت.

پێش ئەوەی ئەم دو دەوڵەتە رێک بکەون، سادات کە سامی سنجاری، بە نوێنەرایەتی بارزانی لە قاهیرە دی، هەواڵی بو بارزانی نارد کە بەو نزیکانە هەردو دەوڵەت پێک دێن، چاکتر وایە کورد بە زویی مشوری خوی بخوات. هەیکەلیش هەمان قسەی بە سامی وت بو لە قاهیرە، تەنانەت لی ی پرسی بو: «ئەگەر ئێران و عێراق پێک هاتن، ئێوە چی ئەکەن؟». سامی لە وەلام دا وت بوی: «بەوپەری توانامانەوە دریژە بە شەر ئەدەین». سامی دوای ئاشبەتاڵ بە ساڵ و نیوێک لە راپورتەکەی کە بە ناوی قسادە موقعتەوە نوسیویتی، هەندێ لەم رازەی درکاندوە. بەلام هەیکەل هەرزو لەو گفتوگویەدا کە دوای ئاشبەتاڵ لە تاران لەگەڵ بارزانی کردی، ئەم ووریاکردنەوە پێش وەختەی بە بیر هێنابوەوە.

سەروکی جەزائیری بومەدین پەیوەندی لەگەڵ عێراق و ئێران کرد، پێشنیاری دانوستانی روبەروی کرد بو هەردو لایان لە جەزائیر لە کاتی کوبونەوەی سەرانی ئوپێک، صەددام وەکو لە: «آراء ومواقف» دا رونی کردوتەوە، سەرکردایەتی بەعس ئەمەی بە «هەلێکی رەخساو دانا بو رزگارکردنی ئاسایشی عێراق و، یەکێتی نیشتیمانی و، ئاسایشی جەبهەی عێراق .. لە سەر ئەو بنچینەیە سەرکردایەتی حزب و دەولەت بریاری دا لەگەڵ ئێران دانوستان قبول بکا و خەتی تالویگ وەکو خەتی سنوری شط العرب قبول بکا، بەرامبەر بە کشانەوەی ئێران لەو ئەرزانەی لەسەردەمەکانی پێشودا داگیری کردوە... وە هەروەها واز بهێنی لە یارمەتیدانی سیایی و هی تری ئەو تاقمە نوکەرە هەلگەراوەیەی سەروی نیشتیمان»

*

ئاشبەتاڵ

لە کوتایی حەفتاکان دا، لە یەکی ژمارەکانی خولی یەکەمی گوڤاری «کومەلە» دا روداوەکانی روژانی ئاشبەتالم بە دریژی نوسیبوە. لەوەدا پشتم بە گیرانەوەی دەیان شایەتی ئاگادار بەست بو. لەبەر ئەوەی ئەو ژمارەیەی کومەلەم دەس نەکەوت لێرەدا دوبارە بینوسمەوە، لە بەر گرنگی ئەم کارەساتە، وا بە کورتی کرونولوجی روداوەکانی ئەو چەند روژە لێرەدا تومار ئەکەم.

٦ ی مارت   له ٤ - ٦ مارتی ۱۹۷۵ کوبونەوەی سەرانی ئوپیک لە جەزائیر بەسترا. هەواری بومەدیەن کە میوانداری کوبونەوەکەی ئەکرد بو لابەلا کردنی ناکوکیەکانی عیراق و ئیران کەوتبوە ناوێژی. شای ئیران و صەددام حسین دو جار کوبونەوە بە ئامادە بونی بومەدیەن. لە دوایین دانیشتنی سەرانی ئوپیک بومەدیەن لە ناو سەرسورمانی ئەندامانی کوبونەوەکەدا وتی: « خوشحالم پیتان رابگەیەنم کە روژی رابردو ریکەوتنیکی گشتی بو لە نیوان دوو ولاتی برا ئیران و عیراق دا بو کوتایی هینان بە ناکوکیەکانیان»

روژی ٦ مارتی ۱۹۷۵ ریکەوتنەکە بەم شیوەیە بلاو کرایەوە :

«اثناء انعقاد مؤتمر القمة للدول الاعضاء في منظمة الاوبيك في عاصمة الجزائر وبمبادرة الرئيس هواري بومدين، تقابل مرتين صاحب الجلالة شاه ايران والسيد صدام حسين نائب رئيس مجلس قيادة الثورة واجريا محادثات مطولة حول العلاقات بين العراق وايران وقد اتسمت هذه المحادثات التي جرت بحضور الرئيس هواري بومدين بطابع الصراحة الكاملة و بإرادة مخلصة من الطرفين للوصول الى حل نهائي دائم لجميع المشاكل القائمة بين بلديهما وتطبيقا لمبادئ سلامة التراب وحرمة الحدود وعدم التدخل بالشؤون الداخلية قرر الطرفان السامیان المتعاقدان:

اولا: اجراء تخطيط نهائي لحدودهما البرية بناء على بروتوكول القسطنطينية لسنة ۱۹۱۳ ومحاضر لجنة تحديد الحدود لسنة ۱۹۱٤.

ثانيا: تحديد حدودهم النهرية حسب خط تالوك.

ثالثا: بناء على هذا سيعيد الطرفان الامن والثقة المتبادلة على طول حدودهما المشتركة ويلتزمان من ثم على اجراء رقابة مشددة وفعالة على حدودهما المشتركة وذلك من اجل وضع حد نهائي لكل التسللات ذات الطابع التخريبي من حيث اتت.

رابعا: كما اتفق الطرفان على اعتبار هذه الترتيبات المشار اليها اعلاه كعناصر لاتتجزء لحل شامل وبالتالي فإن اي مساس بإحدى مقوماتها يتنافى بطبيعة الحال مع روح اتفاق الجزائر و سيبقى الطرفان على اتصال دائم مع الرئيس هواري بومدين الذي سيقدم عند الحاجة معونة الجزائر الاخوية من اجل تطبيق هذه القرارات ...

*

ریکەوتنی شا - صەددام ئەگەر چی ناوی کوردی نەهینا بو بەلام سەودایەکی ئیرانی - عیراقی بو لە سەر بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد. کوبونەوەی شا و صەددام لەگەل یەکتری و ریکەوتنەکەیان، بو بەرزانی و سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد روداویکی کتوپری چاوەری نەکراو بو، ئەوانیش وەکو خەلکی تر لە دەزگاکانی راگەیاندنی جیهانیەوە

بیستبیان. هەلبەت پیشتر دەزگاکانی راگەیاندن هەوالی پەیوەندی و گفتوگۆی ژیر بەژیری نوینەرانی عیراقی و ئیرانیان بلاو ئەکردەوە، ئەم هەوالانە ئەگەیشتنەوە بارزانی. لە سەرچاوەی تایبەتی خۆیشیەوە دەنگوباسی لەو بابەتەی پی گەیشت بو، بەلام بارزانی بڕوای وابو کە ناکۆکیەکانی شاو صەددام لەوە قولترە بتوانن ریک بکەون. لەبەرئەوە ئەو هەوالانەی بە هەند نەئەگرت.

٩ ی مارت ریککەوتنی جەزائیری شا - صەددام پشیوییەکی زۆری لە ناو بنەمالەی بارزانی و سەرکردایەتی پارتی و لە سەرانسەری کوردستان دا دروست کرد. زۆریان ئەگریان و، نەیانئەزانی چی بکەن. مەلا مستەفا لە کوردستانەوە چوە تاران. لەوی چاوەروانی گەرانەوە و بینینی شای ئەکرد.

١٢ ی مارت بارزانی لە گەل د. مەحمود و مورحسین دزەیی بران بۆ دیدەنی شا. لەم دیدارەدا سەرۆکی ساواک جەنەرال نەصیری یش بەشدار بو. پاش ئەوەی بارزانی دەستی شا ماچ ئەکا، شا ریگای دانیشتنیان ئەدا و، دەس ئەکا بە قسە و ئەلی:

«دەولەتانی عەرەبی لەم سەردەمەدا بونەتە هیزیکی گەورەی ئەوتۆ لە دنیادا کە ناکری پشتگوی بخرین. قازانجی ئیران لەوەدایە کە ناکۆکیەکانی خۆی لەگەل ئەوان بەلادا بخات و لەگەلیان ریک بکەوی. بەم ریککەوتنە ئیمە توانیمان ناکۆکیەکانی خۆمان لەگەل عیراق کە ٤٢ سالە نەمانئەتوانی بۆ لایەکا بکەین، بە جۆری بە لادا بخەین کە ئیمە ئەمانەویست.

ئیوەش خۆتان ئازادن لەوەدا چی ئەکەن:

- دینە ئیران ولاتی خۆتانە وەکو هاوولاتی ئیرانی رەفتارتان لە گەل ئەکەین.
- ئەگەرینەوە عیراق بەلینم لە صەددام وەرگرتوە کەستان ئەکوژی.
- دریژە بەشەر ئەدەن ئارەزوی خۆتانە، بەلام من ئیتر سنور لە یارمەتیدانی جەنگیی دائەخەم..»

مەلا مستەفا وت بوی:

«ئیمە میوانی تۆین. مادەم تۆ لە ریککەوتنەکە رازیت و قازانجی ئیرانی تی دایە کە دایکی ئیمەشە، ئیمەش هیچمان لە سەری نیە. ئیمە لە ژیر فەرمانی ئیوەداین بلی برۆن ئەرۆین و بلی بژین ئەژین. ئیمە دلسوزی ئیوە بوین و، دلسوزی ئیوەین و، دلسوزی ئیوە ئەمینینەوە...»

تەنیا قسەی مورحسین دزەیی لەو دانیشتنەدا کرد بوی، ئەوە بوە لە شای پرسی بو: «من کاتی کە سەفیری عیراق بوم لە پراگ بەردەوام راپورتم بۆ ئەنوسیت، ئاخو

گەیشتوە یا نە؟» شا دلنیای کرد بو کە راپورتەکانی پی گەیشتوە.

«نیـو سـتـەیتـسـمـان» لە ژمـارەی ۱۱ی ئەپریلی ۷۵ دا هەوالی ئەم دیمەنیـەی بە کورتی گیرا بوەوە و نوسی بوی: شای ئیران بارزانی خستە بەردەم هەلبژاردنی ۱ی لە ۳ ریگا: خـۆبەدەسـتـەوەدانی عـیـراق، دریژە پیـدانی بەرەنگاری بی پشـتـیـوانی، هێنانی خەلکەکەی بو ئیران.

۱۳ ی مارت   بارزانی گەرایەوە کوردستان. خەلک هەمو چاوەروانی ئەوە بون بارزانی چی ئەلی. کوبونەوەکانی بارەگای بارزانی: (مەلا مستەفا، ئیدریس، مەسعود) و مەکتەبی سیاسی: (حەبیب محەمەد کەریم، د. مەحمود عوسمان، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، صالح یوسفی) و کومیتەی ناوەندی و سەرکردەکانی شورشەکە، بو لیدوان لە هەلومەرجی نوی، دەستی پی کرد.

۱٤ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا.

۱٥ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا.

۱٦ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا. مەکتەبی سیاسی بروسکەیەکی بو سەرکردایەتی بەعس لی دا. ئامادەیی خوی دەربری بو چارەسەرکردنی کیشەکە بە گفتوگو و، ناردنی نوینەری بو ئەو مەبەستە.

۱۷ ی مارت   حیزبی بەعس داواکەی مەکتەبی سیاسی بو گفتوگو رەت کردەوە. لە بەیانیک دا کە واع (وكالە الانباء العراقيە) بلاوی کردەوە، داوای خوبەدەستەوەدانی بی قەید و شەرتی لی کردن.

۱۸ ی مارت   کوبونەوەکان دریژەیان پی درا.

۱۹ ی مـــارت   بریار درا ئاشــبـــەتال بکری. ئەمـــە یەکی بو لە گـــەورەترین کارەساتەکانی میژوی نوی ی کورد. مەینەتیەکی نەتەوەیی وای بە سەر کورد هینا هەتا ئیستاش شوینەوارەکانی ساریژ نەبون.

بە دریژایی ئەم کوبونەوانە دو رەش هەبون: یەکیکیان، لای وا بو مادەم عیراق و ئیران ریک کەوتون کورد بە تەنیا بەرگری پی ناکری و، ئەوی تریان، لای وابو سەرەرای هەمو کەموکوری و ناتەواوییەک بەرگری ئەکری و ئەبی دریژە بە بەرگری بدری.

بو ئەوەی خەلک ئەوروژی و، کارەکـانی بی دەردیسـەر ئەنجـام بدا، بارزانی رەئی خوی دەربارەی ئاشبەتال بە ئاشکرا دەرنەئەبری. لەم ماوەیەدا خەریکی گویزانەوەی سامان و دارایی و بەلگە و نامـە و، رانـە مـەر و رەوە ئەسـپـەکـانی بو. بی گـیـروگرفت هەمـویان گواسـتـەوە دیوی ئیران. کـە ئەوەی تەواو کرد، ئینجا رەئی خوی بە ئاشکرا دەربری کەوا:

سەرئامەرەیەکی دەولی لە کاپەداپە بو لە ناوبردنی کورد، بوبە ئەبی کورد سەرقامەت نەکا، نەگینا ئیبادە ئەبی و، ئەبی بکشیتەوە ئیران و، چاوەروانی هەلومەرجیکی دەولی باشتر بکا.

. ۲ ی مارت بارەگای بارزانی بروسکەی بو هەمو فەرماندەی هیزەکان لی دا واز لە شەر بهینن. چەکەکان بشکینن و تەقەمەنی و دەبوکانیان بتەقیننەوە و، بچن بو ئیران. لەو کاتەوە کادر و پیشمەرگەکانی پارتی لە نارەزایی دا ئەم بریارەیان ناو نا «ئاشبەتال» و، وەکو زاراویکی سیاسی کەوتە سەر زمانی خەلک و بلاو بووە. ئەوسا یەکیتی هیشتا دانەمەزرا بو.

لە روژانی ۱۹ تا ۲٦ ی مارت کوتایی بە شورشەکە هات و، زوری ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی و کومیتەی ناوەندی خەریکی ساخ کردنەوەی کەلوپەلی فروشگاکانی شورش بون، پیشمەرگە و کادر و فەرماندە و بەرپرسەکانی پارتی بە کومەل چونە ئیران یا خویان بە دەست کاربەدەستانی عیراقەوە دا.

*

کە ئاشبەتال بو، ئەم حیزب و ریکخراوانە، لە کوردستان دا هەبون:

- پدک، کە گەورەترین ریکخراوی سیاسی کوردستانی عیراق بو، سەرکردایەتی شورشەکەی ئەکرد، بە روخانی شورشەکە هەمو لق و ریکخراو و ریکخستنەکانی ئەمیش هەرەسیان هینا و، هەلوەشان.

- حشع، چەند سالی پیشتر ببو بە دو پارچەوە:

لوجنەی مەرکەزی، هیزی سەرەکی حیزبەکە بو، بەکیتیی سولیەت پشتیوانی لی ئەکرد، هاوبەشی بەعس بو لە حوکمی عیراق و، لە وەزارەت و جەبهەدا. هەندی کەرتی چەکداری دروست کرد بو، دژی شورش و پیشمەرگەکانی لە هەندی جی بە گویرەی ئەو توانا کەمەی هەیان بو بەشداری شەر ئەبون.

قیادەی مەرکەزی، پاش لیدانی چەند جار لە لایەن بەعس و گوشاری پارتی لاواز ببو، هەندی بنکە و پیشـــــمەرگـەی هەبو لە ناوچەکـانی شـورش دا، بەلام شـورش و سەرکردایەتی شورش لە تواناي هیزیکی وا لاواز و کەم نفوز دا نەبو. ئەمانیش بە کومەل گەرانەوە عیراق.

- کاژیک، ریکخستنیکی بچوک بو، ئەندامە ناسراوەکانی خویان خزاند بوە ناو بارەگای بارزانی و پارتی و، چارەنوسی خویان بە بنەمالەی بارزانیەوە بەست بو. ناوبانگی سیاسییان باش نەبو، سەرکردایەتی و هیزیکی ئەوتویان نەبو بتوانی سەرکردایەتی شورش

بگریتە ئەستۆ.

– کۆمەڵە، ڕێکخستنێکی بچووک بوو، بەڵام کادر و ئەندامی باشی پێ گەیاند بوو، خۆی ئاشکرا نەکرد بوو، لە بەر ئەوە وەکو حیزبی سیاسی خەڵک ئەیان ئەناسی. زۆری سەرکردە و ئەندامە پێشکەوتووەکانی چوونە ڕیزی شۆڕشەکەوە. ڕیزەکانی کۆمەڵەش لە بەر یەک ترازا بوو. کە ئاشبەتاڵ بوو لە پێش دا بە هیوای مانەوە و، درێژەدان بوون بە شۆڕش. بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندییان لە گەڵ قیادەی مەرکەزی و، سەرانی کاژیک و، هەندێ لە فەرماندەکانی پێشمەرگە کرد بوو، کەسێکی ئەوتۆ بە دەنگیانەوە نەهات بوو. ئەمانیش نائومێد بوون و بە کۆمەڵ گەڕانەوە بۆ عیراق.

*

تەلەفزیۆنی عیراق ڕیپۆرتاجی درێژی لە سەر هەرەسهێنانی شۆڕشەکە و، خۆبەدەستەوەدانی بە کۆمەڵی پێشمەرگە پیشان ئەدا. پێشمەرگەکان بە بێ چەک لە دەوری لەگەنێک خواردن لە ناو مەعەسکەری جەیش دا دانیشت بوون نانیان ئەخوارد. سەربازی عیراقی دەوری دابوون و، تفەنگەکانیان، وەکو داری سووتاندن، لێژنە کرد بوون. ئاژانسی دەنگوباسی عیراقی (واع) ئەم ڕیپۆرتاجانەی بە سەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا لە سەرانسەری جیهان دا بڵاو ئەکردەوە. ئەوانیش؛ بە تایبەتی دەزگای تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان، هەندێ بەشیان، بە لێدوانەوە، لێ بڵاو ئەکردەوە. من ئەم دیمەنانەم لە تەلەفزیۆنی ئەمساوە ئەدی. لە پێش دا دڵم بڕوایی نەئەدا باوەڕ بکەم، لام وابوو ئەمەش فێڵی پڕوپاگەندەی سەرکردایەتی بەعسە. بەڵام بە زوویی دەرکەوت کارەساتەکە لەوەش سامناکتر بوو.

بارزانی خۆی و بنەماڵەکەی و بەشێکی عەشیرەتەکەی و بەشێکی هێزەکەی لەگەڵی کشانەوە ئێران، خۆی و بنەماڵەکەی و سەد کەس لە لێپرسراوەکانی جوڵانەوەکەیان لە گەرەکێکی شاری کەرەج لە نزیک تاران جێ کردەوە، ئەوانی تریش کە لە پێش دا لە ۱۵۰ هەزار کەس زیاتر بوون، هەموویان بەسەر شارەکانی ئێران دا دوور لە کوردستان دابەش کرد.

شتێکی سەیرە، هیچکام لە بەشدارانی جوڵانەوەی کورد بیرەوەرییەکانی خۆیان ئەنووسیوەتەوە. زۆر لە ڕووداوەکان وەکو «مەتەڵ» ماونەتەوە و، هەندێکی بە تەواوی کوێر بوونەتەوە، مەگەر لە پاشەڕۆژدا بەشێکی ئەم نهێنییانە لە ئارشیفی دەزگا «موخابەراتییەکان» دا بدۆزرێنەوە. لەم ڕووەوە د. مەحموود عەلی عوسمان شایانی ڕێزلێنانێکی تایبەتییە، چونکە دوای ئاشبەتاڵ هەندێ لەم باسە گرنگانەی بۆ ڕای گشتی کورد ئاشکرا کرد، ئەگینا ئەوانیش وەکو زۆر ڕووداوی تر بزر ئەبوو. بەڵام ئەویش لە ڕێ دا بڕییەوە.

نوسەری ئەمەریکایی (بە ڕەچەڵەک لوبنانی): «ئەدمۆن غەریب» ، نامەی دکتۆراکەی لە سەر جوڵانەوەی کورد نوسیوە. ئەو کاتەی مەلا مستەفا لە واشنتۆن بو، هەوڵێکی زۆری لە گەڵ دا بو بۆ ئەوەی بیرەوەرییەکانی پێ بگێڕێتەوە و، لە سەر کاسێت تۆماری بکا، ئەمیش بیکا بە کتێبێکی سەربەخۆ. بارزانی ڕازی نەبو بو.

*

لەبەرچی بارزانی و شادا هیچ جۆرە ڕێکەوتنێکی سیاسی یا قانونی نەبو کە جۆری هاوکارییان دژی حکومەتی عیراق ڕێک بخات، وە ئیلتیزامی هەردولایان بەرامبەر بە یەکتری دیاری بکات. تەنانەت ئەگەر ڕێککەوتنێکی لەو بابەتەش لە نێوان گەلێکی بچوکی بێ دەوڵەتی وەکو کورد و، دەوڵەتێکی گەورەی خاوەن مێژوویەکی درێژ لە دەس بڕین دا وەکو ئێران هەبوایە، تاچ ڕادەیەک ئەبێ بەرامبەری و بەجێهێنانی بەڵێنی تیدا بێ؟

ئێران لە سالانی ۱۹۷۰ - ۱۹۷٤ کاتی کە هێشتا دانوستان لە نێوان بارزانی و بەعس دا بەردەوام بو، هەمیشە خەریکی تێکدانی هەوڵی چارەسەرکردنی بە ئاشتی مەسەلەی کورد بو، هانی بارزانی ئەدا بۆ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ، بەڵێنی پشتیوانی و یارمەتی پێ ئەدا، تواتی سەرلەنوێ لە شەڕەوە بگلێنێ، کەچی کاتی عیراق ئامادەیی دەربڕی خواستەکانی بەجێ بێنێ، لەگەڵی ڕێک کەوت و دەستی لە بزوتنەوەی کورد هەڵگرت، هەرچەندە ئەمە لە لای هەندێ کەسایەتی ئێرانی وەکو سیاسی ناسراو «فەریدون هویدا» لە (ل ١٥٤-١٥٥) کتێبی: «سقوط شاه» دا بە «عهد شکنی» و، مێژونوسی ناسراو «منوچهر پارسادوست» لە کتێبی: «ریشەهای تاریخی اختلافات عراق و ایران» دا بە «شکستی سەنگینی... ئەخلاقی» ئێرانی دائەنێن، بەلام ئەمە چی لە مەینەتی کورد کەم ئەکاتەوە.

ئێرانییەکان قسەیەکی مەشهوریان هەیە ئەڵێ: «سیاست پدر و مادر ندارد» واتە: سیاسەت دایک و باوکی نیە، ئەمە بە جۆرێکی سادە هەمان ناوەڕۆکی قسە ئینگلیزییەکە دەرئەبڕی کە ئەڵێ: «لە سیاسەت دا دوستی هەتا سەر و، دوژمنی هەتا سەر نیە، بەڵکو قازانجی هەتا سەر هەیە».

شا خۆی لە گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانی دا دوای چەن هەفتەیەک لەگەڵ هەیکەل ڕونی ئەکاتەوە بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتی دەرەوەی خۆی گەلێک لە چ دەسکەلایەک وەرئەگری. ئەم گفتوگۆیە کاتی خۆی لە ڕۆژنامەی «کەیهان» ی تارانی دا بلاو کرایەوە. هەیکەلیش لە گۆشە بە ناوبانگەکەی دا: «بصراحة» کە هەفتانە بۆ «الاهرام» ی ئەنوسی و،

دوای ئەفراسیش بو چەندین روژنامەی ئوردنی و کویتی و لوبنانی، هەر لەو کاتەدا بلاو کردەوە.

لە بەر ئەوەی دەقە عەرەبیەکەی چەند جاری بلاو بوتەوە و، هەیکەل لە کتیبەکەی دا: «زیارە جدیدە للتاریخ» سەر لە نوی بلاوی کردوتەوە. زور خوینەدواری کورد عەرەبیەکەیان دیوە. من لیرەدا تیکستە فارسیەکەی وەکو ئەوسا لە ژمارەی روژی ۱۵ ی سەپتەمبەری ۱۹۷۵ (٢٤ی شەهریوەری ٥٤) ی روژنامەی «کیهان» ی تارانی دا وەرم گرتوە ئەنوسمەوە. دەقە عەرەبیەکەی ئەگەر جیاوازیەکی هەبی لە گەل دەقە فارسیەکەدا تەنیا لە دارشتنەکەیدایەتی ئەگینا ناوەروکی هەردوکیان وەکو یەکە:

شاهنشاه فرمودند: میرسیم به قسمت سوم سوال شما «داستان ما با انقلاب کرد» باید صریحا به شما بگویم: آری ما به انقلاب کرد کمک کردیم و در دوره اخیر ما قدرت عملی در پشت سر آن بودیم و وقتی حمایت خودرا از آن پس گرفتیم آنچەرا کە میبایست اتفاق بیفتد اتفاق افتاد. میخواهم برای شما روشن کنم که ما انقلاب کردرا اختراع نکردیم بلکه ما آنرا یک حقیقت موجود یافتیم. سال های طولانی رژیم های حاکم بر عراق با ما دشمنی میورزیدند حملات خصمانه و دشمنی آشکار نشان می دادند. خرابکاران از مرزهای ما می گذشتند و گاهی اوقات برخوردهای مسلحانه روی میداد انقلاب کرد فرصتی یافت و ما از آن بهرەگیری کردیم، آیا ما در واقع میخواهیم یک مشکل کرد بوجود بیاوریم؟ طبیعتا خیر باید بدانید که ما دارای اقلیت کرد بزرگی هستیم بطوریکه یادآوری شد رژیمهای حاکم در عراق سالهای طولانی با ایران دشمنی میورزیدند آیا حق نداشتیم باین روش آنها جواب بدهیم؟ و از فرصتی اگر بدست آید استفاده کنیم؟ آری به انقلاب کرد علیه حکومت بغداد کمک کردیم و این اقدام ما پاسخی بود به اقداماتی که علیه ایران کرده بودند. وقتی ما معتقد به کاری باشیم که انجام دادهایم چرا پرده پوشی کنیم؟ انها از دشمنی با ما دست برداشتند ما نیز چنین کردیم آیا میدانید جا دادن پناهندگان کرد از عراق تا بحال برای ما ۳۰۰ میلیون دلار خرج برداشته است؟ باوجود این آیا غیر از این میتوانستیم کاری انجام بدهیم؟»

کاتی خوی لە یەکەم ژمارەی «ریبازی نوی» دا لە وتاریکی دریژدا لە سەر «ریککەوتنی جەزایر و هاوچارەنوسی نەتەوەی کورد» لەم قسانەی شا دواوم.

*

هاوەی نیوانخوشی ئیرانی - عیراقی

دوابەدوای ریکەوتنەکەی جەزائیر وەزیری کاروباری دەرەوەی عیراق سەعدون

حەمادی و وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران عەبباس عەلی خەلعەتبەری بە ئامادەبوونی وەزیری کاروباری دەرەوەی جەزائیر عەبدولعەزیز بوتفلیقە چەن ڕێکەوتنێکیان ئیمزا کرد. لەناو ئەواندا ئەوی بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عێراق و لە ئێران گرنگ بوو «پرۆتۆکۆلی ئاسایشی سنوور بوو».

سەددام خۆیشی سەردانی شای کرد لە تاران بۆ جێگیر کردنی ڕێکەوتنەکەیان.

ئێران و عێراق سنوورەکانی خۆیان قایم کرد. ئێران ئاگاداری کوردەکانی عێراقی کرد کە نابێ چالاکی سیاسی بنوێنن. کاتێک گومانی لە هەندێکیان کرد کە خەریکی خۆ ڕێکخستنەوەن ساواک گرتنی. هەروەها عێراقیش ئاگاداری ئێرانیەکانی کرد کە نابێ چالاکی دژی ئێران بکەن. هەردوو دەولەت کومیتەی هاوکاری یان دروست کرد.

ئاشتبوونەوەی عێراق و ئێران جەنزرەبەیەکی کارێگەری لە کورد دا. بەعس ئەو هەلەی قۆستەوە بۆ جێ بەجێ کردنی پلانەکانی تەعجیر و تەرحیل و تەعریب و تەبعیس. جوولانەوەی کوردی لاواز کرد. بەلام ڕێگە بۆ کپ‌کردنی شیعەیی ئوپوزیسیۆنی دینیی ئێران کرابوەوە. لەوە پێش بە هۆی گرژیی پەیوەندیانەوە، ڕێگەی زیارەتی شوێنە پیرۆزەکانی عێراق لە شیعەکانی ئێران گیرا بوو. لە دوای ڕێکەوتنی جەزائیر هاتوچۆکردنی هاوولاتیانی هەردوو دەولەت بۆ یەکتری ئاسان بوو. پێشەوای ئوپوزیسیۆنی دینیی ئێران، ئیمام خومەینی لە ١٩٦٤ ەوە لە نەجەف دانیشتبوو، پەیوەندی لەگەل لایەنگر و شاگردەکانی کز و کەم بوو.

هیلین کارەر دانکوس، یەکێ لە شارەزایانی کاروباری بلوکی ڕۆژهەلات لەم بارەیەوە نووسیوێتی: «موخالەفەتی ڕابەرانی دینی کە ماوەیەک بە هۆی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی شاوە بێدەنگ بوو بوو، لە سالی ١٩٧٥ بێدار بووەوە، واتە کاتێ کە ڕێکەوتنی ئێران و عێراق ڕێگەی بە زائیرانی ئێرانی ئەدا سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی بکەن و لەگەرانەوەدا پەیام و شریتەکانی خومەینیان لەگەل خۆیان ئەبردەوە. جۆرێکی تازە لە شۆڕش، واتە «شۆڕش بە هۆی شریتەوە» سەری هەل دا».

*

مەلا مستەفا و گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی

ئەودەمی مەلا مستەفا بە پەنابەری لە کەرەج جێگیر ببوو. ئەوی خوێندومەتەوە، دیومە دوو گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی کرد: یەکێکیان لەگەل «ئەمیری تاهیری» نووسەری ڕۆژنامەی «کەیهان»ی تارانی و، ئەوی تریان لەگەل ڕۆژنامەوانی میسری بە ناوبانگ

«محەمەد حەسەنەین هەیکەل».

خۆزگە یەکێکی شارەزا هەمو گفتوگۆکانی مەلا مستەفای لە گەڵ ڕۆژنامەوانەکان، لە دوای گەڕانەوەیەوە لە سۆڤیێت بۆ کوردستانی عێراق (١٩٥٨) تا کۆچی دوایی لە واشینتۆن (١٩٧٩) کۆ نەکردەوە و، بە بیلاییەنی و بە پێوانەی زانستی لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر ئەکرد بۆ شیکردنەوە و تێگەیشتنی «ئەقلییەتی سیاسی» بە ناوبانگترین و بە تەمەنترین سەرکردەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد.

گفتوگۆ ڕۆژنامەوانیەکانی مەلا مستەفا ٣ جۆرن:

١. ئەو گفتوگۆیانەی کەسی سێهەم وەکو تەرجومان لە بەینی مەلا مستەفا و ڕۆژنامەوانەکەدا بوە. وەلامەکانی بارزانی لە لایەن کابرای تەرجومانەوە بۆار کراوە لە قسەی «هەلەق مەلەق» و، ڕازێنراوەتەوە. نمونەی ئەمەش گفتوگوکانیەتی لە گەڵ ڕۆژنامەوانی بەریتانی «دەیڤید ئادەمسن» نوسەری کتێبی: «شەڕی کورد» و، ڕۆژنامەوانی ئەمەریکایی «دانا ئادەم شمیت» نوسەری کتێبی: «گەشتێ بە ناو پیاوە ئازاکان دا» و، ڕۆژنامەوانی فەرەنسی «ئێریک ڕولو» نوسەری ڕۆژنامەی «لیموند دیپلوماتیک»...

٢. ئەو گفتوگۆیانەی پرسیار و وەلامەکانی بە نوسین ئامادە کراون. ئەم گفتوگۆیانەش بە زوری ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی وەکو ئیبراهیم ئەحمەد، مامجەلال، حەبیب کەریم، د. محمود عوسمان، سامی سنجاری و، دارا توفیق بۆیان هونیوەتەوە و، بۆیان ڕێک خستوە. نمونەی ئەمەش گفتوگوکانیەتی لە گەڵ ڕۆژنامەکانی «خەبات» و «التاخی»...

هەمو یادداشت و بیرەوەریەکانیشی هەر ئەوان بۆیان نوسیوە.

٣. ئەو گفتوگۆیانەی ڕاستەوخۆ خۆی لە گەڵ ڕۆژنامەوانی عەرەب و فارس و کورد کردویەتی. بۆ ئەم گفتوگۆیانە بارزانی پێویستی بە کەسی سێهەم، واتە تەرجومان، نەبوە، ئەوەی لە دڵی دا بوە بە ئارەزوی خۆی و بە زمانەکەی خۆی وەلامی داوەتەوە.

جۆری سێهەمی گفتوگۆکانی گرنگییەکی زۆریان هەیە چونکە قسەی ڕاستەقینەی «بێ ڕوتوش و دەسکاری» خۆیەتی. نمونەی ئەمەش ئەم دو گفتوگۆیەیە لە گەڵ «ئەمیری طاهیری» و «هەیکەل» و، چەند گفتوگۆیەکی پێشوتری لە گەڵ گۆڤاری «روز الیوسف» ی قاهیرەیی و، «ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست» ی میصری.

ئەمیری طاهیری گفتوگوکەی خۆی بە فارسی لە ڕۆژنامەی «کیهان» و «ڕستاخیز» ی تارانی دا و، بە عەرەبی لە ژمارەی ٣٨. ی ڕۆژانی ١٠ - ١٧ ئاباری ١٩٧٥ ی مطبعنامەی «الاخاء» تارانی دا بلاو کردوەوە. لێرەدا دەقی فارسی گفتوگوکە وەکو لە

ژمارەی رۆژی ۱۰ ی مایسی ۱۹۷۵ ی «کیهان هوائی» دا بلاو کراوەتەوە، وەکو خوی بەبی هیچ دەستکاریەک تەنانەت لە قاریزە و نوقتەدا، تەنوسەوە. تەنها شت کە لیم لابردوە مانشیتەکانیتی:

«قسمتی از مصاحبه اختصاصی امیر طاهری سردبیر کیهان با ملامصطفی بارزانی

ملامصطفی بارزانی، ۷۳ ساله، که شاید قدیمی ترین و معروفترین رهبر جنگ های پارتیزانی در جهان است، با این تاکید نشان داد که فصلی مهم از تاریخ عراق، فصلی پر از ماجراهای خونین، برای همیشه بسته شده است.

بارزانی اکنون به همراه خانواده اش در نزدیکی تهران زندگی میکند. هفته پیش که به دیدار او رفتم بسیار شادمان و سر حال بنظر میرسید. هنگامی که از پایان جنگ در شمال عراق سخن می گفت و پایان زندگی سیاسی و نظامی خود را اعلام میکرد، کوچکترین اثری از تلخی یا تاسف در لحن او دیده نمیشد.

ملا که اکنون لباس های محلی کردی را کنار گذارده و کت و شلوار می پوشد و کراوات میزند در سراسر دیدار ۹۵ دقیقه ای ما مکرر در مکرر تاکید میکرد: من یک بنده ناچیز خداوند بزرگ هستم. همه چیز از قبل در کتاب سرنوشت امده است و بندگان را از ان گریزی نیست.

بارزانی گفت: هرگز به اندازه امروز احساس تندرستی و ارامش نکرده ام. اینده را نمی توانم پیش بینی کنم اما میتوانم بگویم که حالا فکر نمی کنم هرگز به عراق برگردم.

بارزانی افزود که قبلا هیچ اطلاعی از توافق ایران و عراق در الجزایر نداشت اما از این توافق پشتیبانی میکند زیرا صلاح ملت ایران را در بر دارد. هرچه خیر ایران را بهمراه داشته باشد مورد موافقت همه کردهاست.

در جریان یک سال نبرد، هیچ کشوری جز ایران به کردها کمک نکرد. بارزانی گفت: انها که یکباره کردها کشف کرده اند و برای ما اشک تمساح میریزند قصدی جز حمله تبلیغاتی علیه ایران ندارند. بعضی ها برای ما صدقه میفرستادند اما هرگز کمک جدی نمی کردند. مقداری پتو و مقداری دارو... همین، مسخره است و ما خودمان را مدیون هیچ کشوری بجز ایران نمیدانیم.

شورشی کهنسال که از دو ماه پیش سیگار را ترک کرده است و اکنون پیپ می کشد ادامه داد:

همه ما از انچه ایران برایمان کرده است و می کند سپاسگزاریم. ما در ایران زیر

سایه شاهنشاه، رهبر تمامی اریائی نژادها، به احترام و اسودگی زندگی میکنیم.

کردهای عراق اکنون چه باید بکنند؟ بارزانی در پاسخ به این پرسش گفت: من اینجا هستم و انها در انجا. همه چیز به خود انها بستگی دارد. من دیگر یک رهبر نیستم و به شما اطمینان میدهم که هرگز دوباره یک رهبر نخواهم شد. من تمام شده ام، مطلقا تمام شده ام، ارزویم این است که نامم از تاریخ محو شود اما شما روزنامه نگاران نمی گذارید.

بارزانی شدیدا به بعضی عناصر کرد عراقی که از خارج علیه ایران اظهاراتی کرده اند، تاخت و گفت: ان ها انسان نیستند، کرد نیستند، مرد نیستند.

درباره یکی از انها، عصمت شریف وانلی، بارزانی گفت: او خودش را فروخته است، او یک هیولاست به صورت انسان.

بارزانی در حالیکه مشتهانش را گره کرده بود افزود: کسی که این طور عمل میکند و خود را به یک سفارت خارجی میفروشد مسلمان نیست. خداوند همه موجودات بی شرف از این نوع را مجازات خواهد فرمود.

رهبر پیشین کردهای عراقی هم چنین به تلخی از کمونیست ها یاد کرد و ان ها را مسئول کشتار در شمال عراق خواند، کمونیست ها به گفته ملا: دشمنان اسلام هستند و از هر وسیله ای برای انداختن مسلمانان بجان یکدیگر استفاده میکنند.

ملا که چشمهائی با هوش و ذهنی دقیق دارد، گفت: به اعتقاد من اکثریت کردهای عراقی طرفدار پایان دادن به جنگ بودند. عراق نزدیک به سه ملیون کرد دارد که تنها ۱۰۰ هزار نفر انها خارج از عراق بسر میبرند.

اکثریت این صد هزار نفر در ایران هستند و چند صد روشنفکر کرد نیز در اروپا زندگی میکنند.

ملا گزارش های مربوط به درخواست پناهندگی او و پسرش ادریس را از ایالات متحده و سویس تکذیب کرد و گفت: همه اینها دروغ محض است ما نمی خواهیم ایران را ترک کنیم و از خارجی ها گدائی کنیم.

بارزانی به یاد اورد که در گذشته او را «ملای سرخ» می خواندند و گفت: این لقب را دشمنان درست کردند. من همواره مخالف کمونیسم بودم زیرا مسلمان هستم. در میان همکاران من حتی یک کمونیست وجود نداشت یا اگر وجود داشت جرئت نمیکرد دستش را رو کند.

ملا دست کم ۲۰ سال جوانتر از سن اش بنظر میرسد، کوتاه قدتر از انست که

انتظار میرود، اما بسیار تنومند است و شانه های پهن دارد. با انکه رژیم غذائی ندارد از بزرگی شکم در رنج نیست، میگوید: هرگز واقعا بیمار نشده ام. دکترهایم میگویند که حالم کاملا خوب است. او همان زمینه و برنامه های زندگی را که در روستای دیلمان، مرکز فرماندهی اش در کردستان عراق، داشت ادامه میدهد - با این تفاوت که در اقامتگاه اش در نزدیکی تهران سخن از جنگ و تصمیم های جنگی روزانه در میان نیست.»

مەلا مستەفا لەم گفتوگۆیانەدا خۆی بە گەنج و نەزان پیشان ئەدا و، قسەی وای نەکرد لە نرخی خۆی زور دابەزاند. تەنیا مەبەستی ئەوە بو شا و ساواک دلنیا بکات.
مەلا مستەفا تەمەنێکی درێژی بە سەر برد بو تەنیا ئەوەندە کوڕی بداتە پاشماوەی ژیانی خۆی، سەرەڕای ئەوەش بارزانی لەو کاتەدا پیاوێکی ناسراو و بەڕێز بو لە دنیادا، ناوی خراپەوە دەلیلی کەسایەتیە جیهانیەکانی لە پایەتی: «فیشەر لیلت ئالمانیاخ» ەوە، شا بە ئاسانی نەیئەتوانی ئازاری بدا یا تفەنگی پی هەلچنی. هەرکەسێکی شارەزا گفتوگۆکانی بارزانی لە گەل رۆژنامەوانەکانی بیگانە و، نامەکانی کە بو کاربەدەستانی ئینگلیز و سالانی دوایی ئەمەنی بو شای ئیران و، دیپلۆماتی سەرۆکی ئیراقی تورکیا و، کارتەری سەرۆکی ئەمەریکای... نوسیوە، بخوێنیتەوە و، بە وردی شی بکاتەوە ، بوی دەرئەکەوی کە: مەلا مستەفا لە ئاستی هاوولاتی کوردا خۆی چەند بە زل ئەزانی و، دلرەق و بی بەزەیی و زوردار بو، کەچی لە ئاستی بیگانەدا خۆی چەند بە پچوک و خزمەتکار و ملکەچ دائەنا.
هەیکەل گفتوگۆکەی خۆی رۆژی ٦ ی ئەیلول (سەپتەمبەر) ی ١٩٧٥ لە ژیر سەرناوی «مقابلە مع صقر عجوز من کردستان» دا بلاو کردەوە. هەیکەل ئەوسا لە ئەهرام نەمابو. وتارە حەفتەییەکانی لە چەند رۆژنامەیەکی ئوردونی، کوێتی و لوبنانی دا لە یەک رۆژدا چاپ ئەکرا. هەیکەل ئەم گفتوگۆیەی لە هیچکام لە کتیبەکانی دا بلاو نەکردەوە.
دلنیا نیم لەوەی ئەمەیری طاهیری قسەکانی بارزانی وەکو خۆی نوسی بو یا شیواند بوی، بەلام هەیکەل لەوانە نەبو قسەی بارزانی بگۆڕی، هیچ دەسکەوتێکی لەوەدا نەبو، کەسیش زوری لی نەکرد بو. ئەگەر یەکی ناوەرۆکی هەردو گفتوگو لە گەل یەکتری بەراورد بکا ئەبینی زور جیاواز نین.
هەیکەل گفتوگۆکەی بە هەندی سەرنج و بیروبۆچونی خۆی تەواو ئەکا. لەوی دا ئامۆژگاری دەسەلاتدارانی عیراق ئەکا سەبارەت بە جوری رەفتاریان لە گەل کورد و مەسەلەکانی. ئەگەر صەددام ئامۆژگاریەکانی هەیکەلی لە گوی بگرتایە و، بە جی ی بهینایە، لەوانە بو پیویست نەکا کورد جارێکی تر پەنا بەرێتەوە بەر چەک.

هەیکەل بیری بارزانی ئەخاتەوە کە بە نوێنەرەکەی دا کاتی خۆی هەواڵی بۆ ناردە ئێران و عێراق پێک دێن. مشوورێکی خۆی بخوا، بۆچی هیچی نەکرد؟

بارزانی ئەلێ: ئیرادەی خوا بوو.

ئەم وەڵامە چیرۆکێکی کۆنی بە بیر هێنامەوە. هولاکو کە بەغدای گرت لە خواجە نەصیرەدینی طوسی پرسی: ئەگەر خەلیفە بکوژێ راستە دنیا ژێروژوور ئەبێ؟ طوسی ئەلێ: ئەم هەموو صەحابەیەی پێغەمبەر لەتوپەت کران هیچ نەقەوما ئەبێ بە کوشتنی ئەم بۆچی دنیا ژێروژوور بێ؟

هولاکو خەلیفەی گرت و، بە زۆر گەنجینەی سەدان ساڵی بنەماڵەی عەبباسی پێ دەرهێنا. گەنجینەکەیان پڕ بوو لە خشڵ و دەفری زێڕین. هولاکو خەلیفەی لە قەفەزێکا دانا بوو. خەلیفە برسی بوو داوای خواردنی کرد. هولاکو فەرمانی دا لە سەر سینییەکی زێڕ ژەمی خواردنی گەورە لە زێڕ و گەوهەر و مرواری... برازێننەوە و بۆی بەرن. بۆیان برد و لەبەردەمی دا دایان نا بیخوات.

خەلیفە وتی: ئەمە ناخورێ.

هولاکو ئینجا لێی پرسی: مادام ناخورێ کە هەواڵت زانی من لەشکرم ساز داوە بیمە سەرت، بۆچی ئەم زێڕەت نەکرد بە دراو بیدەی بە مووچەی مانگانەی سەربازەکانت و بیانبریتە سەر ئاوی جەیحون رێگەم پێ بگرن؟

خەلیفە وتی: ئیرادەی خوا بوو.

هولاکو پرسی: باشە کە من ئێرانم گرت و لە بەغدا نزیک کەوتمەوە بۆچی ئەم زێڕەت نەتوانەوە بیکەی بە دەروازەی شاری بەغدا بۆ ئەوەی من نەتوانم بیگرم؟

خەلیفە وتی: ئیرادەی خوا بوو.

هولاکو وتی: مادەم وایە ئیرادەی خوایە منیش تۆ بکوژم.

لە باوەڕی مەغۆل دا نەشێ خوێنی گەورەپیاوان بڕژێتە سەر ئەرز. لە بەرئەوە فەرمانی دا لباد لە خەلیفەوە بپێچن و بیسوننەوە و هەڵی گلۆلن هەتا ئەمری.

بارزانی ئەگەر درێژەی بە بەرەنگاری بدایە بێگومان ئەبوو بە سەرکردەیەکی سیاسی و پێشمەرگەیی ئەفسانەیی بەرێز لە هەموو دنیادا. بەڵام ئاشبەتاڵی کرد، ئەمیش هەمان بەهانەکەی خەلیفەی هێنایەوە. هەرچەندە چارەنووسی شەخسی بارزانی لە هی خەلیفە بەختیارتر بوو، چونکە بەردەستی صەددام نەکەوت، ئەویش بە پێی ئیرادەی خوا بیقلیقێنێتەوە، بەڵکو خۆی لە ئەمریکا بە دەردی خوا مرد، بەڵام چارەنووسی بارزانی وەکو پێشەوای سیاسی و، سەرکردەی عەسکەری کورد لە هی خەلیفە باشتر نەبوو.

*

### دامەزراندنی یەکێتی

لە ڕۆژانی ئاشبەتاڵ دا ئاژانسەکانی دەنگوباس بڵاویان کردەوە عەلی عەسکەری و چەند کەسێکی تر بڕیاریان داوە درێژە بە شۆڕش بدەن. ئەم هەواڵە بۆ من هەم مایەی دڵخۆشیی بو، هەم سەیر نەبو. عەلی عەسکەری ئەوەندەی من ئەمناسی کاری وای لە دەس ئەهات. زۆری پێ نەچو دەرکەوت هەواڵەکە ڕاست نیە. کاک عەلی چو بوە تاران.

«کۆمەڵە» ڕێکخستنێکی پتەوی دامەزراند بو. من زۆرتر دڵم پێوە خۆش بو کە کۆمەڵە ئەرکی درێژە پێدانی بەرەنگاریی ئەگرێتە ئەستۆ. زۆرجار باسی ئەوەمان کرد بو کە بورجوازییەتی کورد ناتوانی هەتا سەر درێژە بە خەبات بدا، لە قوناغێک دا ڕائەوەستێ، ئەوسا نیمتر سەرە دێتە سەر کۆمەڵە درێژە بە خەبات بدا تا سەرکەوتن. من لام وابو ئەو قوناغە هاتوتە پێشەوە. کۆمەڵەش ئەرکی مێژوویی خۆی ئەبینی. بە تایبەتی وەکو بۆیان باس کرد بوم کادری باشی پێ گەیاند بو، سەرکردەی ناسراوی وەکو مامجەلالیشی لە پشت بو. بەلام ئەمیش نەبو.

د. کەمال فوئاد دوای بوردومانی قەلادزێ گەرابوەوە بو ئەلمانیا. ناوبەناو تەلەفونمان بو یەکتری ئەکرد و نامەمان ئەگۆرییەوە. ڕۆژانی ئاشبەتاڵ زۆر جار تەلەفونمان لە گەڵ یەکتری ئەکرد، هەروەها لە گەڵ زۆر لەوانەی ئەمناسین. هەموومان لامان وابو کە پێویستە ئێمەش لە دەرەوە خۆمان ڕێک بخەینەوە، بو ئەوەی ئەگەر لە وڵات بەرەنگاریی دەستی پێ کردەوە، یا ڕێکخراوێکی نوێ دامەزرا، ئێمەش هاوکاری بکەین، بە تایبەتی لقی ئەوروپای پارتی وەکو هەمو دەزگاکانی تری شۆڕشەکە هەلوەشا و، لە کار کەوت بو. لە ماوەیەکی کورت دا زۆر کەس، لە زۆر وڵاتی جیاواز، بون بە هاودەنگ و هاوبیرمان.

مامجەلال کەوت بوە جموجوڵ. ئەو ماوەیە لە قاهیرە، بیروت، دیمەشق، تەرابلوس هاتوچوی ئەکرد. لە بیروتەوە هەواڵ بلاو کرابوەوە کە مامجەلال خوی بو گەرانەوە ئامادە ئەکات. مامجەلال دوستایەتی لە گەڵ کەمال فوئاد و لە گەڵ من بە هێز بو. دوستایەتی من لە گەڵ مامجەلال ئەگەرابوەوە بو سالی ۱۹٦۱، بو ئەو کاتەی لێپرسراوی لقی سلێمانی پارتی بو. چەند جاری تەلەفونی بو کردم و نامەی بو ناردم، هەواڵ و دەنگوباسەکانی پێ ئەگەیاندم و، بیرو بوچونەکانی خوی بو ڕون ئەکردەوە، منیش بیروبوچونەکانی خۆمم بو باس ئەکرد. داوای لی کردم خۆم ئامادە بکەم بو بەشداری لەو ڕێکخراوە تازەیەدا کە خەریکی دامەزراندنیەتی و، بو گەرانەوە بو وڵات. ئەگەرچی ماوەیەکی درێژ بو من لە کوردستان دور بوم بەلام «ئیلتیزامی ئەخلاقی و ئەدەبی» بە کۆمەڵە و بە مامجەلالیەوە

بەست بوم، بە جوانم ئەنەزانی لە ژێری دەرچم. یەکسەر وتم: کەی داوات کردم بە سەر چاو ئامادەم.

ئەم قسەیەی من لای هەندێ کەس سەیر بو. لەو هەلومەرجە سەختەدا کە زۆر کەس بە ئاواتەوە بون بگەنە ئەوروپا، من لە ئەوروپا جێگیر بوبوم، لە دوا قۆناغی تەواو کردنی خوێندنی دکتۆرادا بوم، دەس لە هەمو شت هەلبگرم و ملی ڕێگای هات و نەهات بگرم بەرەو کوردستانی ژێر هەرەسی ئاشبەتاڵ. ڕاستی بڕیارێکی وەها دژوار، هەمو کەس بە ئاسانی نەی ئەسەلماند، بگرە هەندێ کەس بە شێتیان ئەزانی.

جارێکیان لە وەلامی نامەیەکی دا، بۆ ئەوەی دلنیای بکەم لەوەی من هەر لە سەر پەلینە کونەکەی خۆم ماوم، سەرەتای نامەکەم بەم شیعرەی «سالم» دەس پێ کرد:

ئەی قیبلەی مورادم ئاخر بە ڕۆژگاران

جاری لە کەس ئەپرسی حالی غەریبی تاران

بەو سوێندەکەی کە خواردم: من هەر ئەوم کە دیوتم،

حاشا بکەم فەراموش، میثاق و عەهدی جاران!

لە دێری دوەمی بەیتی یەکەم دا وشەی «تاران» م گۆڕی بو بە «شاران».

پەلینم دابە هەر کاری بو دەسپێکردنەوەی شۆڕش دەس پێ بکەن، من واز لە هەمو شتێکی خۆم ئەهێنم لە ڤییەننا و، لە گەلیان ئەبم. بەلام ئەو ماوەیە من ئازادی هاتوچوم نەبو. پاسپورتەکەم عێراقی بو. سەفارەت بڕیان تازە نەکرد بوەوە. نەمئەتوانی هاتوچو بکەم. لە ڤییەننا گیرم خوارد بو.

مامجەلال لە سەرەتادا ڕەئی وابو کە هەمو تێکۆشەرانی کورد لە چەپەوە بو ڕاست لە یەک ڕێکخراوی فراوان دا یەک بخرێن. بو ئەم مەبەستە پەیوەندی لە گەل زۆر کەس کرد بو بە تایبەتی لە گەل ئەو ئەندامانەی کومیتەی ناوەندی پارتی کە هاتبونە دەرەوە، لە گەل ئەوانەی نوێنەری بارزانی بون. ئەم بیرە سەری نەگرت.

د. فوئاد مەعصوم نوێنەری بارزانی بو لە قاهیرە. لە گەل مامجەلال پەیوەندی باش بو. ئەویش لە گەل مامجەلال هاوبیر بو کە ڕێکخراوێکی نوێ دروست بکرێ بو دریژەپێدانی خەبات.

عادل موراد و عەبدورەزاق میرزا عەزیز لە تەورانەوە چوبون بو سوریا بو لای مامجەلال. عادل سەروکی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و عەبدورەزاق ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەتی یەکێتیی لاوان بو.

مامجەلال کومیتەیەکی پێک هێنا بو لە: خوی، د. فوئاد مەعصوم، عادل موراد،

عەبدولڕەززاق فەیلی، کەمال فوئاد، عومەر شێخموس و، من بۆ سەرکردایەتی ڕێکخراوێکی تازە کە درێژە بە خەباتی سیاسی - چەکدار بدا. ناو لەم کۆمیتەیە نرا بۆ «دەستەی دامەزرێنەری یەکیەتی نیشتمانیی کوردستان» و یەکەمین بەیانی ڕاگەیاندنی دامەزراندنی بە عەرەبی، لە شام پاش باس کردنی لە گەڵ د. فوئاد و عادل و عەبدولڕەززاق، لە ٧٥/٥/٢٢ دا نوسی بو و، بڵاو کرد بووەوە و، بۆ کەمال فوئادیشیان نارد بۆ لە ئەورووپا بڵاوی بکاتەوە. ئەویش دوای ئەوەی هەندێ دەستکاری تێ دا کـرد بۆ لە ٧٥/٦/١ دا بڵاوی کردەوە. من ئەوسا هێشتا لە ڤیەننا ئەجولا بووم، لە بەر ئەوە لە دارشتنی بیرەکانی ئەم بەیانەدا بەشدار نەبووم.

دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە سوریا ئەم بەیانەیان بڵاو کردەوە. ئەم بەیانە لە سەرانسەری دنیا بە زمانی جیاواز چاپ و بڵاو کرایەوە لەوانە: ئینگلیزی، ئەڵمانی، فارسی. کەمال بورقای ئەوسا لە تورکیا مانگنامەی «ئۆیزگورلوک یولو» ی دەرئەکرد. ئەویش دەقی بەیانەکەی بە تورکی بڵاو کرد بووەوە.

ئەگەرچی ناوەمێدی و سەرلێشێوان و بێ وورەیی کوردی داگرت بوو، بەڵام ڕاگەیاندنی ئەم بەیانە دەنگدانەوەیەکی زۆر گەورەی هەبو لە کوردستان دا.

ئێمەش: کەمال فوئاد و عومەر شێخموس و من لە ئەورووپا کەوتینە دروست کردنی ڕێکخستنی ئەورووپا. لە ئەورووپاش کۆمیتەیەکمان پێک هێنا بە ناوی «دەستەی دامەزرێنەر» بۆ سەرپەرشتی دامەزراندن و چالاکی یەکێتی. زەمینەی سیاسی لە بار بو لە ماوەیەکی زۆر کورت دا لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا ڕێکخستنی فراوان دامەزرا. مامجەلال و هەڤالانی سوریا کەوتنە پێوەندی لە گەڵ کادرە ناسراوەکانی جوڵانەوەی کورد لە تێهران و لە عێراق. مامجەلال نامەیەکی بۆ بارزانی نوسی بۆ دەربارەی دامەزراندنی ئەم ڕێکخستنە نوێ یە و، دڵنیای کرد بو لەوەی کە نەک دژی بارزانی نابێ بەڵکو بە چاوی سەرکردەی جوڵانەوەی کورد سەیری ئەکاو، بۆ پشتیوانی ئەبێ لەو هەر هاوکاری بێ.

*

ئاشبەتاڵ تێکۆشەرانی کوردی هەژاند بوو. سەر لێ شێوان و ناوەمێدی و بەرچاوتاریکیی هەمو لایەکی داگرت بو. چەند کەسی لە کاربەدەستە زلەکانی پارتی بێ ئەوەی هیچ بیانوویەکیان هەبێ تەسلیمی عێراق بونەوە. سالح یوسفی، ئەندامی مەکتەبی سیاسی، هەر زو لە کەلالەوە گەڕایەوە بۆ عێراق، هەروەها عەبدولی سوران و، صدیق ئەمین کە ئەندامی کومیتەی ناوەندی بون. حەبیب محەممەد کەریم، سکرتێری پارتی، لە ناصیرە بو، ئەویش لەوێوە خۆی تەسلیم بە عێراق کردەوە. دارا توفیق، لە بیروت بو،

لەوێوە ڕۆیشتنەوە بۆ بەغدا. چەند کەسێکی تریش لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و، فەرماندەی هێز و بەتالیۆنەکان، تەسلیم بوونەوە. وە ئەمی ئەمانە بەرنامە یا پلانێکیان هەبووبێ، بەلکو لە ئەنجامی نائومێدی و ڕوخان دا تەسلیم بوونەوە. ئەوانی تریشیان لە تەهران خەریکی ڕێکخستن و دابینکردنی ژیانی خۆیان بوون. هەرچەندە ئەوەندە گەورە و کاریگەر بۆ زۆر کەس لایان وابوو ئیتر جوولانەوەی کورد تەواو. بەعس و هاوکارە کوردەکانیان لە بابەتی عەزیز عەقراوی بڕوایان بەم بۆچوونە ئەدا و ئەیانوت: «مەسەلەی کورد، هیچ نەبی لەم قۆناغەدا تەواو، حەوالەی نەوەکانی داهاتوو کراوە».

لە تەهران، مەلا مستەفا ئەیویست زۆرترین ژمارەی خەلک لە دەوری خۆی بهێلێتەوە. هەر جارە قسەیەکی ئەکرد. جارێک ئەیوت: «وەزیری دەولی خراپە، ئەبی چاوەڕوانی وەزیفەیەکی دەولی باش بکەین» و، جارێک ئەیوت: «کاری من تەواو ئیتر من سەرکردەی کورد نیم» و، جارێکی تریش ئەیوت: «ئێستا ئومێدم لە جاران بە هێزترە و، بەمزووانە بە هێزێکی گەورەترەوە ئەگەڕێینەوە کوردستان و ئەمساڵ تری ی ڕەش لە حاجی ئومەران ئەخۆین». ئێرانیش خەریکی بلاوە پێ کردن و جێگیر کردنی پەنابەرانی کورد بۆ لە دەرەوەی ناوچە کوردنشینەکان.

عێراق چەند جاری نوێنەرانی خۆی نارد بۆ ناو پەنابەرانی کورد بۆ ئەوەی قانعیان بکا بگەڕێنەوە عێراق. زۆریشیان قانع کرد و گەڕانەوە.

لە ئەنجامدا تاقمی لە کادرەکانی پارتی، لە هەردو باڵی مەلایی و جەلالی، لەوانە: عەلی عەسکەری، عومەر مستەفا، تاهیری عەلی والی، ڕەسوڵ مامەند، عەلی هەژار، کاردۆ گەلالی... چەند جاری لە ناو خۆیان دا کۆبونەوە، بۆ لێکدانەوەی هەلومەرجی سیاسی کوردستان و، دانانی ئەخشەی کاری داهاتوو. ئەمانە لایان وابوو سەرکردایەتی بارزانی بەو ڕێبازە سیاسییە چەوتەی لە چەند ساڵی ڕابردوودا گرت بوی، جوولانەوەی کوردی توشی هەلدێران کردوە. ڕێکخستنەوەی پارتی لە سەر بنچینەیەکی پێشکەوتو، بە دوستایەتی لە گەڵ بەعس و، بەشداری لە دامودەزگای حوکمی زاتی دا ئەگری هەندی لە دەسکەوتەکانی کورد بپارێزی.

کاربەدەستانی بەعس لە سەرەتادا بەلێنیان پێ دان. بەو هیوایەوە بە کۆمەڵ گەڕانەوە عێراق. لە عێراق بە گەرمی پێشوازییان لێ کردن. بەلام بەعس هیچکام لە بەلێنەکانی بە جێ نەهێنا. پاش ماوەیەکی کورت چالاکی سیاسی لێ قەدەغە کردن و، لە کوردستان دووری خستنەوە، هەریەکەیانی بە وەزیفەیەکی حکومەتی نارد بۆ جێگایەکی خواروی عێراق.

بەلام ئەمان کە لە تەهران قسەیان کرد بو بە یەک، لە عیراقیش لە ناو خویان دا ئەو پەیوەندییەیان پاراست و، ریکخستنیکیان پیک هینا، سەرەتا بە چاولیکەری «الحرکة التصحیحیة» کەی بەعس لە سوریا، ئەمانیش ناویان لە خویان نا «بزوتنەوەی راستکردنەوە»، گوایە چەوتی و لادانە سیاسییەکانی پارتی راست ئەکەنەوە. چەندین کەسی تریش، لەوانە: سالح یوسفی بو بو بە هاوبیر و هاوەدەنگیان. سەرەنجام ناوی خویان کرد بە: «بزوتنەوەی سوشیالیستی دیموکراتی کوردستان»

*

کوردی سەرانسەری کوردستان بە هاودەردییەکی قولەوە سەیری رووداوەکانی کوردستانی عیراقیان ئەکرد و، هەمویان بە مەینەتی خویان ئەزانی. زوری سیاسییەکانی ئەوەوەیان ئامادە بون هەرچییەکیان لە دەس بی بیکەن بو هەلساندنەوەی جولانەوەی کورد لە عیراق دا. هەندیکیشیان بە کردەوە بەشدار بون. لە ناو کوردەکانی تەهران دا حەسەنی قازی و محەممەدی موهتەدی لە هەمویان زیاتر بە پەروش بون. حەسەن بلاوکراوە گرنگەکانی یەکیتی کرد بە فارسی و بلاوی کردنەوە. ئەمەش بو ناسینی یەکیتی لە ناو تەهرانییەکان دا بایەخیکی تایبەتی هەبو.

*

چەند مانگی دوای ئاشبەتال نوری ئەحمەد طەها گەیشتە لیبەننا. کاک نوری لە تارانەوە چو بوە دیمەشق و، لە دیمەشقەوە هات بو بو لیبەننا، بو ئەوەی بچی بو ئەلمانیای روژئاوا بو لای کورە گەورەکەی: ئاسو.

کاک نوری لە تیکوشەرە دیرینەکانی ریگای کوردایەتی بو. کە جمهوریەتی مەهاباد دامەزرا ئەم ئەفسەریکی تازە دەرچو بو لە جەیشی عیراق دا. چوە مەهاباد بو ئەوەی لە ریزی سوپای کوردستان دا خزمەت بکا. یەکی بو لە دامەزرینەرەکانی «پارتی دیموکراتی کورد». دوای روخانی جمهوریەتی مەهاباد، لە گەل بارزانی چو بو تاران بو گفتوگو لە گەل تەهرانییەکان. لەوی هەندی هەلویستی ناڕازیانەی نواند بو. بارزانی لە بەر ئەوە ریزی لی ئەگرت. دوای رویشتنی بارزانی بو سوڤیت ئەم گەرایەوە کوردستان. چەند سالی لە زیندان دا مایەوە. لە زیندان دا بە هەلویستی ناڕازیانە بە ناوبانگ بو. دوای بەربونی دریژەی بەکاری سیاسی دا لە کومیتەی ناوەندی پارتی دا. لە سەر چالاکی سیاسی چەند جاریکی تر خرایەوە زیندان، بە تایبەتی دوای خوپیشاندانەکانی کرا لە دژی دەستدریژی ٣ قولی بو سەر میصر و، بو ناشتنی تەرمی شیخ محمود.

دوای ١٤ ی تەمموزی ٥٨ گەرایانەوە بو جەیش. وەزیفەیەکی ئیداری پچوکیان

دابویه له شوێنێکی دووی کوردستان، بەلام هەر ئەندامی کومیتەی ناوەندی پارتی مابوەوە. ئینجا خۆی خانەنشین کرد و، خەریکی کاری حیزبایەتی بو.

له دەسپێکردنی شۆرشی ئەیلول دا کاک نوری پێشمەرگەی ناوشاری دامەزراند و، خۆی راستەوخۆ سەرپەرشتی چالاکیەکانی ئەکرد. له ناکوکیەکانی نێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانی دا، سەرەتا له گەڵ مەکتەبی سیاسی بو، دوایی بەلای مەلا مستەفادا کەوت و، زوری نەبرد خۆی له ژیانی حیزبی کەنارەگیر کرد.

له تەقەللا سەرنەکەوتوەکەی عەبدولغەنی ئەلراوی دا بو گورینی حوکمی حیزبی بەعس کاک نوریش ئیتیهام کرا. لەو ساوە چوە ناوچەی ناوپردان له نزیک بارەگای بارزانی دانیشت.

کاک نوری له ژیانی سیاسی خۆی دا هەستی به «غبن» ئەکرد، له بەر ئەوە له هیچ شوێن و له هیچ موناسەبەتێک دا دەمی خۆی نەئەگرت. رەخنەی ئەگرت، پلاری ئەهاویشت و، توانجی لەم و لەو ئەگرت. قسەی «گالتە» و «جەیدی» تیکەلاو ئەکرد. له دەربرینی بیروڕا و هەلویستەکانی له هیچ نەئەترسا و، له هیچ نەئەپرنگایەوە. دوای ۱۱ ی ئازار جارێک ئەچیتە لای بارزانی و شیعرە به ناوبانگەکەی خالیصی بو ئەخوێنیتەوە، که ئەگاتە ئەم بەیتەی:

له لای تو وەک یەکن، بی فەرقن له خزمەت تو،

شەهین و حاجی لەقلەق، شێر و ریوی، مورشید و جانی!

کاک نوری وت بوی: «سالی ۱۹۲۰ شەهین و حاجی لەقلەق، شێر و ریوی، مورشید و جانی، وەکو یەک وا بون. سالی ۱۹۷۰ دوای ۵۰ سال ئەبی خەبات بکەین بو ئەوەی وەکو یەکیان لی بیتەوە، چونکە ئیستا حاجی لەقلەق به سەر شەهین و، ریوی به سەر شێر و، جانی به سەر مورشیدا زال بوە...»

له سەر ئەم قسانە چارەی خۆی له لای زور له کاربەدەستەکانی پارتی و شۆرش قورس کرد بو. حەزیان له چارەی نەئەکرد و بویان تی ئەچاند. بەلام گوی ی نەئەدایە و، له قسەکانی نەئەکەوت.

مالی «ئەحمەدی طەها» له کونەوە له بەرخانەقا نیشتەجی بون. ناسیاو و دراوسی ی کونی مالی ئیمە بون. ماوەیەک مالی ئیمە و مالی کاک نوری دەرگامان به دەرگای یەکتریەوە بو به تایبەتی له ناوەراستی پەنجاکان دا. که ئەهاتنە سەر مالەکەیان بو گرتنی زور جار کەلوپەلی نهینی له مالی ئیمە ئەشاردەوە.

من له منالیەوە کاک نوریم له نزیکەوە ئەناسی. روژیکی تایبەتی له لای من

هەبو. ئەو یەکێ بو لەوانەی کاریان تێ کردم تێکەڵاوی کاری سیاسی ببم.

کاک نوری زور لە قیبەشتا نەمایەوە. چوە ئەڵمانیای روژئاوا. منداڵەکانی لە سلێمانی بە جێ هێشت بو. لە ئەڵمانیا خوی پێ نەگیرا گەرایەوە عیراق. لە کورەوەکەدا کوچی دوایی کرد.

*

هێشتا کاک نوری لە قیبەشتا بو، شازاد صائیب بو گەشتوگەران لە گەڵ هاوسەرەکەی و منداڵەکانی لە مانگی ئایی ٧٥ دا هاتن بو ئەوروپا. شازاد لە ٧٤ دا نەچوبوە ریزی شورشەوە. هاتوچو بو ئەو ئاسانتر بو لە چاو ئەوانەدا کە چوبونە ناو پێشمەرگەوە. هاوریانی کومەڵە راپان سپارد بو «استطلاع» ی هەلومەرجی دەرەوە بکا، بزانێ چیمان بە دەستەوەیە. لە لەندەن سامیجەلالی دی بو. بە دریژی قسەیان کرد بو. هەندێ راسپاردەی پێ وت بو بە سەرکردایەتی کومەڵەی بڵێ. هاتە قیبەشتاش. لەو دەورەیەدا ژمارەیەکی زوری تێکوشەرانی کوردستان بە تەمای ئەوە بون سەرەتای کار لە دەرەوە دەس پێ بکات. چەندین نامەی لەم بابەتەم لە هاوری و دوستەکانەوە بو ئەهات.

شازاد، لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانی بو. خوێندکارێکی چالاکی ریزی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و، پارتی دیموکراتی کوردستان بو لە زانستگای بەغداد و، دوایی‌تر کەسایەتییەکی ناسراوی بەریز و، پاریزەرێکی سەرکەوتو بو. هاوری یەکی نزیک و گیانی بە گیانی سەردەمی خوێندن و کاری سیاسی و روژنامەوانی منیش بو.

پێکەوە هەفتەنامەی «رزگاری» مان دەرکرد بو. پێکەوە لەو گروپەدا کارمان کرد بو کە بیری دامەزراندنی کومەڵەیان چەسپاند و، پێکەوە هەندێ لە ناوکەکانمان رێکخست بو. هەندێ کێشەی خێزانی هاتە پێشەوە، ئێمە واماں بە قازانجی رێکخراوە تازەکە زانی، خومان لە مەسئولییەتی سەرکردایەتی بکێشینەوە. لەو گروپەی ئێمە هەندێک دور کەوتنەوە، زوریەیان وەکو ئەندام لە ریزەکانی کومەڵەدا دریژەیان بە کار دا، شازاد یەکێ لەوانە بو. من چوم بو قیبەشتا، بە کردەوە منیش دور کەوتمەوە.

لە گەڵ هەڵگیرسانەوەی شەری کوردستان دا ساڵی ٧٤ سەرکردایەتی کومەڵە و زوری کادرە پێشکەوتوەکانی و ئەندامەکانی چونە ریزی شورشەوە، هەرکەسەیان بە گوێرەی ئەو کارەی پێیان سپارد بو، بە دڵسوزی کارەکانی خوی ئەنجام ئەدا. لە روژانی هەرەسهێنانی شورشەکەدا، لە پێش دا بە تەمای مانەوە و، رێکخستنی بەرەنگاری بون و، پەیوەندیان لە گەڵ زور کەس کرد بو، بەلام کە ئەیانزانی هەرەسەکە بەمان ناگیرێتەوە ئەمجاتیش بە کومەڵ گەرانەوە بو عیراق. هەوڵیان دا ریزەکانی خویان، کە بە هوی لە یەک

داهران و چونه ریزی پیشمەرگەوە شهوا بو، سەر لەنوی ریک بخەنەوە.

شازاد هەلومەرجی ولاتی بە وردی بو باس کردم و منیش بیروبوچونەکانی خوم بو باس کرد. گەرابوە کوردستان و، قسەو باسەکان و، بیروبوچونەکانی ئیمەی بو باس کرد بون.

دوای ئەویش لە روژانی بەستنی کونگرەی خویندکاران دا لە بەرلین، قادرەبدون عەبدولقادر بە نهینی هات بو. ماوەیەکی زور کورت مابوەوە. من نامەینی چونکە درەنگ لیزای ئەلمانیایان دامی، بەلام لە گەل مامجەلال یەکتریان دی بو. راسپاردە و پیشنیاری سەرکردایەتی کومەلەی هینا بو. مامجەلالیش راسپاردەکانی خوی پی دا نارد بوەوە بو سەرکردایەتی کومەلە.

گرنگترین راسپاردەکانی مامجەلال بو سەرکردایەتی کومەلە ئەمانە بو:

١. دەستەی دامەزرینەری یەکیتی لە ولات داهەزرینن. تیکەلاو بی لە ئەندامانی کومەلە و کەسایەتی ناسراوی نیشتمانیی و دیموکرات. ناوی هەندی کەسیشی دیاری کرد بو قسەیان لە گەل بکەن.

٢. پەیوەندی لە گەل کادرە پیشمەرگەییەکانی شورشی ئەیلول بکەن. ریکخراوی پیشمەرگەیان لی پیک بهینن و، ئامادەیان بکەن بو دەس پی کردنەوەی خەباتی چەکدار.

٣. لە هیچ حالەتیک دا ناپی کوردستان بە جی بهیلن. لە کاتی لیقەومان و ئاشکرا بون دا خویان بشارنەوە یان بچنە شاخ.

ئیمە دلیکمان بە ریکخستنەکەی کومەلە خوش بو. هیوایەکی زورمان لە سەر هەلچنی بو. بەلام روداوەکانی کوردستان کاری لە سەر کومەلەش کرد بو. ناکوکی لە ریزەکانیان دا تەقاند بوەوە. تاقمیکی ریکخستنەکانی خوارەوەی کومەلە دژی سەرکردایەتیەکەی راوەستا بون، بە ئاشکرا کەوت بونە جموجول و موهاتەرات و دامەزراندنی ریکخستنی تازە. سەرکردایەتی هەرچەند هەولی دابو بە ریگایەکی ئوسولی چارەی ناکوکییەکان بکا، کەلکی نەبو. سەرەنجام، بو ئەوەی لەو ئاژاوەیە دەربچن و ریکخستن لە لیدان بپاریزن، بریار ئەدەن برون بو تیهران بو ئەوەی لەویوە بچن بو سوریا.

سەرکردایەتی کومەلە بزر بون. ئیمە وامان زانی راسپاردەکانی مامجەلالیان جیبەجی کردوە و، خویان شاردوتەوە. تومەز چون بو تیهران و لەوی: شەهابی شیخ نوری سکرتیری ریکخستنەکە و، قادرەبدون عەبدولقادر، جەعفەر عەبدولواحید، عومەری سەید عەلی، عەلی محەمەد عەسکەری (عەلی پچکول)، ئەرسەلان بایز، ئاوات زەکی عەبدولغەفور گیراون. ئیمە پەیمەمان ئەئەزانی. پاش چەند حەفتەیەک کە حکومەتی تیهران

لە پێنجوێن تەسلیمی حکومەتی عێراقی کردنەوە، ئینجا زانیمان. بۆ ئێمە ئەمە ڕووداوێکی چاوەڕێ نەکراو بوو. بەشێ لە عێراکانی داوەخانین. ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە کەوتنە بەر هێرشی ڕاونان و گرتن. هەندێکی گیرا و هەندێکی خۆی شاردەوە.

لە ئەورووپا حەملەیەکی گەورە ساز کرا بۆ ئازاد کردنیان. چەندین بەیاننامەیان بە زمانی جیاجیا لە سەر بڵاو کرایەوە. «ئەمنەستی ئینتەرناشناڵ» مەسەلەکەی گرتە ئەستۆ.

*

لە ١٤ ی ئابی ٧٥ دا عیسمەت شەریف وانلی بەیانێکی بە عەرەبی بۆ «دەوڵەکانی گەلی کورد» بڵاو کردەوە نوسی بوی کە بە دەعوەتی حکومەتی عێراق لە گەڵ چەند کەسایەتیەکی تردا ئەچی بۆ گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی عێراقی بۆ دابینکردنی مافەکانی گەلی کورد.

بەعس لە دنیادا زۆری پڕوپاگاندە کرد بۆ دەربارەی سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد و، جێبەجێ کردنی قانونی حوکمی زاتی. عیسمەت و ئەوانیشی دەعوەت کرد بۆ بە چاوی خۆیان دەسکەوتەکانی کورد ببینن.

عیسمەت لە کوردەکانی سوریا بوو. لە سەرەتای پەنجاکانەوە لە سویسرە نیشتەجێ بوو. یەکێ بوو لە دامەزرێنەرەکانی «کۆمەڵەی خوێندکاران» و ماوەیەکی درێژ سەرۆکی بوو. لە کۆنگرەی «یەکیەتی خوێندکارانی جیهان» دا کە ساڵی ١٩٦٠ لە بەغدا بەسترا، لە گەڵ سەرۆکی «یەکیەتی لوتابیانی عێراق» بوو بە کێشەیان لە سەر مەسەلەی کورد. ئەم ڕووداوە ئەوسا لە لایەن پارتی و ڕۆژنامەی «خەبات»، وە کە بە عەرەبی لە بەغدا دەرئەچوو زۆری باس کرا. بەم هۆیەوە عیسمەت ناوبانگی دەرکرد. کە شۆڕش لە کوردستانی عێراق دا هەڵگیرسا، عیسمەت یەکێ بوو لە «کۆمیتەی پاراستنی مافەکانی گەلی کورد» و، دوایی بوو بە نوێنەری بارزانی و قسەکەری شۆڕش. ماوەیەکی درێژ بەم ناوەوە پەیوەندی لە گەڵ دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا ئەکرد. لە سەرەتای حەفتاکان دا کە پارتی دەزگای نوێنەرایەتی خۆی لە ئەورووپا دامەزراند، ئیتر عیسمەت دەورێکی گرنگی لەم دەزگایەدا نەما، بەڵام هێشتا کەسایەتیەکی ناسراو بوو لە ناو کوڕ و کۆمەڵە سیاسیەکان و، لای دەزگاکانی ڕاگەیاندن.

ئەم بەیانەی عیسمەت لای زۆر کەس و لا سەیر بوو، یەکەمیان، چونکە ئەوەی بە مەلا مستەفا و سەد هەزار پێشمەرگە نەسێنرا بوو، چۆن بەم لە بەعس وەرئەگیرێ. دووەمیان، لەو کاتەدا کورد بە دەس حوکمی بەعسەوە تووشی کارەساتێکی نەتەوەیی بووبوو، عێراق ئەیویست ڕووی دزێوی خۆی بشارێتەوە. کورد ئەیو بچن بە گژی دا و، ڕیسوای

بکەن نەک پارەمەتی بدەن.

عیصمەت گوێ ی نەدایە لومە و ئامۆژگاری هیچ کەس و لایەک و، وەفدێکی پێک هێنا لە: «شەریف بو مەعزە»، کە یەکێ بو لە سەرکردەکانی شۆرشی جەزائیر. «جان کلود لوتی»، لە «یەکێتیی جیهانیی مافی مروڤ» و، یوسف پەری، کە لێکشتیەکی کوردی عیراق بو.

ئەم وەفدە لە ١٨ ئاب دا گەیشتنە عیراق و، گەشتەکەیان تا ٦ ئەیلول درێژەی کێشا. دوای ئەوە گەرانەوە ئەوروپا.

لە ٧٥/١١/١٧ دا عیصمەت راپورتێکی درێژی لە سەر گەشتەکەیان بلاو کردەوە. باسی سەردانەکەیانی بو شارەکانی کەرکوک، هەولێر، دهوک، سلێمانی، موسل و بەعقوبە، هەروەها خانەقین، قەلادزە، پێنگرد، ئاکرێ.. و بینینی کاربەدەستانی حکومەتیی و حیزبیی لەم شارانە و، گفتوگوکانیان لە گەڵ سەران و وەزیرەکانی بەعس: طاریق عەزیز، نەعیم حەداد، زەید حەیدەر، مونذیر شاوی... بە درێژی گێرا بوەوە.

لە راپورتەکەی دا لایەنە سلبی و ئیجابییەکانی سیاسەتی بەعسی لە کوردستان دا باس کرد بو. ناسینی کورد لە دەستور دا وەکو نەتەوەیەکی سەرەکی و، سەلماندنی مافی ئوتونومی و، رێزگرتنی مافی نەتەوایەتی لە ناوچەی ئوتونومی دا و، رێفورمی کومەلایەتی لە ژیانی جوتیار و کرێکاری کوردستان دا وەکو شتی ئیجابی و، تەهجیر و تەعریب و، رێز نەگرتنی مافی نەتەوایەتی لە دەرەوەی ناوچەی ئوتونومی و، ناتەواوییەکی قانونی حوکمی زاتی.. وەکو شتی سلبی ژمارد بو.

لە راپورتەکەی دا دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری بە کارێکی چەوت و لە کردن نەهاتو دانا بو.

پی ئەچی بینینەکانی عیصمەت لە گەڵ چاوەروانیەکانی جوت نەبوبن، ئەمە بە راپورتەکەیەوە دیارە. دوای ئەوەش چەند بەیانێکی تری دەرکرد و، چەند گفتوگویەکی روژنامەوانی کرد. لە سەر ئەمە بەعس زور تورە بو. ناردیان بو کوشتنی. بە ناوی میوانداری دوستانەوە چونە لای و بەر گوللەیان دا. کابرای بکوژ وایزانی بو عیصمەت تەواو بوە لە بەر ئەوە بە جێ ی هیشت بو. گەیەنرایە نەخوشخانە و لە مردن رزگاری بو.

*

سالی ٧٤ ماوەی پاسپورتەکەم تەواو بوبو. سەفارەت بریان درێژ نەکردمەوە داوایان نەکرد بگەرێمەوە عیراق لەوێ درێژی بکەمەوە. لە گەڵ تێشکانی شورش و، دەرچونی لێبوردنی گشتی، حکومەتی عیراق بریاری دا پاسپورتی ئیمەماتانیش درێژ بکەنەوە. چوم

بۆ سەفارەت بە کابرای «استعلامات»م وت: «ئەمەوێ پاسپۆرتەکەم تازە بکەمەوە یەلکو یەکێ لە کاربەدەستان ببینم» کابرا شەلەیکی ئەمسایی بۆ لەوێ کاری ئەکرد. ناوەکەمی پرسی. ناوی خۆمم پێ وت. تەلەفۆنی بۆ کونسول کرد. دەسبەجێ داوای کردم بۆ لای خۆی.

زۆر بە گەرمی پێشوازی کردم وتی: «کاکە! ناوی تۆ زۆرجار ئەبیستم، بەلام هیچ جاری خۆت نابینم، زۆرم پێخۆشە هاتی و بینمت». خێزانێکی عێراقی، پێ ئێچو بۆ گەشتەرگەران هاتبن، میوانی بوون. رووی کردە ئەوان، بە پێکەنینێکی سەرکەوتوانەوە وتی: «ئەمە لە برا کوردەکانمانە، زۆری کار کردوە لە دژی ئێمە». من ئەیچو بووم بۆ شەر لە سەری نەرویشتم. پاش هەندێ موجامەلە و قاوە خواردنەوە، وتی: «ئەمزانم ئیشت هەیە بۆیە هاتوی» وتم: «بەلێ» وتی: «ئەتەوێ پاسپۆرتەکەت تازە بکەیتەوە؟» وتم: «بەلێ» وتی: «راستە تەعلیمات لەو بارەیەوە دەرچوە، پر بەدڵ حەزم ئەکرد ئیشەکەت جێبەجێ بکەم، بەلام تازە کردنەوەی پاسپۆرتەکەی تۆ لە دەسەلاتی من دا نیە. ئەبێ پرسی بەغدا بکەم. بەلێنت ئەدەمێ بە باشی لە سەرت بنوسم». منیش سوپاسم کرد. ئینجا وتی: «کاکە! لێرە بە دواوە چی ئەکەی؟» وتم: «هیچ ناکەم. خەریکی خوێندن ئەبم». بە پێکەنینەوە وتی: «ئەقلم نابڕی ئارام دابنیشی!» وتم: «مەلا مستەفا دانیشت و سەد هەزار چەکدار وازیان هێنا، ئێمەمانان لە دەرەوە ئەتوانین چی بکەین؟». لام وابو قسەکەی بە گوێی دا چو. وتی: «ئەوپەری دو حەفتەی پێ ئەچێ وەلامەکەی دێتەوە. بە تەلەفۆن ئاگادارت ئەکەم یان خۆت سەرمان لێ بدە»

دوحەفتە تێ پەڕی وەلامی نەهاتەوە. چەند جاری بە تەلەفۆن لێم پرسین خەبەری نەبو. نائومێد بووم. نامەم بۆ چەند کۆمەلەیەکی جوتیاری نوسی بۆ بۆ کاری ئاژەلداری. لە هەندێکیانەوە وەلامی وەرگرتنم بۆ هاتەوە. لە گوندێکی بچوک لە ناوچەی «شتابیرمارک» لای کابرایەکی خاوەن گاوگوتاڵ کارێکم دۆزییەوە. کارەکەم لە چیای بەناوبانگی «ئالپ» بو.

«کارخۆی» کەم ٤٢ مانگای هەبو. ئەو ماوەیە شارەزاییەکی زۆرباشم پەیدا کرد لە سەر ژیانی جوتیارانی ئەمسا و، جۆری راگرتن و پەروەردەکردنی گوێرەکە، چێل، گای ئەورووپایی. گەوری ولاخەکانی ئەوان رێکوپێکتر دروست کرا بو لە خانوی ئەوسای زۆر لە ئاغاکانی لای ئێمە.

چوار حەفتە مامەوە لە سەفارەتەوە هەوالم بۆ هات کارەکەم جێبەجێ بوە. وازم لە کارەکەم هێنا و بەکسەر گەرامەوە بۆ ڤیەننا، پاسپۆرتەکەم تازە کردەوە. هەر لەو ماوەیەدا

کونگرەی خوێندکاران لە بەرلین ئەبەسترا. مامجەلالیش ئامادە ئەبو. ئەبو منیش بچم.

*

چەند گەنجێکی باسک حوکمی ئیعدام درا بون. فرانکو لە نەخوشخانە کەوت بو لە سەر مردن بو. حوکمی ئیعدامی ئەوانە لە دنیادا زور بە خراپ دەنگی دابوەوە. زور کەسایەتی ناسراو و حیزب و ڕێکخراو داوایان لە فرانکو کرد بیانبەخشێ و، لە چەند شاری ئەوروپا خوپیشاندانی نارەزایی ساز کرا، لەوانە شاری ڤیەننا. فرانکو گوێ ی نەدایە رای گشتی جیهان. لە سەر نەریتی کونی ئیسپانی ئیعدامی کردن، بڕبڕەی پشتیان شکاندن. فرانکو وەکو دیکتاتورێکی خوێنڕێژ زور بەدناو بو، بەم کارەی بەدناوتر بو.

پاش ماوەیەکی کورت لەم ڕوداوە فرانکو مرد. صەددام حسێن، ئەوسا، جێگری سەروکی «مجلس قیادة الثورة» بو. بو بەشداری پرسەکەی چو بو بو سەفارەتی ئیسپانی. لە دەفتەری تشریفات دا چەند دێڕێکی لە ستایشی فرانکودا نوسی بو، وەکو شاسواری ولاتەکەی و، دوستی هەرە نزیکی عەرەب و، شتی لەم بابەتە. لە کاتی ئەم نوسینەدا وێنەی صەدداميان گرت بو. ڕوخساری صەددام لە کاتی نوسینەکەدا بە تەنیشت وێنەی فرانکو وە، وەکو ئەوەی پێکەوە بن، دەرچو بو. ڕوژنامەکانی عێراق ئەم وێنەیەیان لە لاپەرەی یەکەم دا لە گەڵ تەعلیقەکەی صەددام بڵاو کرد بوەوە.

ئێمەش ئەم وێنەیەمان وەرگرت و تەعلیقەکەی صەددامان کرد بە ئینگلیزی و ئەلمانی و، لە ژێر سەرناوی هاوتای «الطیور علی اشکالها تقع» چاپ کردەوە. زور بە بڵاوی دابەشمان کرد.

بەیانییەک بانگیان کردم بو وەلامدانەوەی تەلەفون. فەلاح حسن مطرود بو. فەلاح موچەخورێکی دیپلومات بو لە سەفارەتی عێراقی. زور بە تورەییەوە وتی: «تو.بە کونسولت ئەوت ئیتر هیچ ناکەم، چی بو کونگرەی خوێندکاران قەیناکا، ئەمە چیە کردوتانە؟ بوچی ناوبانگی ولاتەکەی خوتان خراپ ئەکەن؟» من ئەمزانی مەبەستی چیە بەلام ویستم خومی لی هەلە بکەم. وتم: «من هیچم نەکردوە ناوبانگی ولاتەکەمی پێ خراپ بێ. نازانم تو باسی چی ئەکەی؟» دیسان بە تورەییەوە وتی: «دلنیام ئەزانی باسی چی ئەکەم.. بوچی ئەوەتان لە سەر السید النائب نوسیوە؟». منیش بێئاگایی خومم پیشان دا. ئەو هەر لە سەری ڕویشت وتی: «کەسێکی کە شتی وا ناکا تو نەبی. من دلنیام ئیشی تویە. قسە بە حکومەت ئەلێن، قسە بە حیزب ئەلێن، قسە بە هەر کەس ئەلێن قەیناکا جگە لەو. بوچی ئێوە دوست و دوژمنی خوتان ناناسن؟ ئەگەر کورد لە عێراق دا یەک دوستی هەبی صەددام حسێنە...» من ئیتر قسەکەم پێ بڕی وتم: «ئەگەر

سەددام حسێن دۆستی کورد بێ، کورد ئیتر پێویستی بە دوژمن نییە؛» کابرای تایمز زیاتر تووڕە بوو وتی: «ئێمەش شت لە سەر جەلال تاڵەبانی بڵاو ئەکەینەوە. ئەنووسین: جەلال ڕۆژێ عەمیلی ئێران بووە، ڕۆژێ عەمیلی عێراق بووە، ڕۆژێ عەمیلی لیبیا و، ڕۆژێ عەمیلی سووریایە...» خەریک بوو گفتوگۆکەمان زیاتر تووندوتیژ بێ لە بەر ئەوە ویستم بیبڕمەوە وتم: «بێ منەت بن چیتان لە دەس دێ بیکەن. حەز ئەکەی کەمێکی بۆ دابنێن» تەلەفۆنەکەم بە ڕوودا داخستەوە.

ئەوسا ئەوقسەیەی ئەم پیاوەم دەربارەی سەددام بە هەند نەگرت.

*

کونگرەی کۆمەڵەی خوێندکاران

سەرۆک و سکرتێر و زۆری ئەندامەکانی «دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵەی خوێندکاران» ئەندامی پارتی بوون. هەندێکیان کاریان بۆ «دەزگای پاراستن» ئەکرد. ئەمیش وەکو هەموو دەزگاکانی تری سەر بە شۆڕش لە ئەنجامی ئاشبەتاڵ دا تووشی ئیفلیجی بوو بوو. بۆ ئەوەی لەو حاڵە دەربێ و بکەوێتەوە چالاکی ئەبوو «کونگرەی حەفتەهەم» ببەستێ. لە پێش بەستنی کونگرەکەدا طاریق عەقراوی، سەرۆکی کۆمەڵە، چوو بۆ تاران بۆ ئەوەی دوا ئامۆژگاری لە ماڵی بارزانی وەربگرێ و، لە دەورووبەری کونگرەکەدا گەڕایەوە.

ئەندامانی خوێندکاران لە هەموو وڵاتەکانەوە بانگ کران بۆ بەرلینی ڕۆژئاوا، شوێنی بەستنی کونگرە. ڕۆژی دەستپێکردنی ٧٥/٨/٢٦ کە ئەندامەکان چوو بوون بۆ هۆڵی کۆبوونەوە، سەیریان کرد بۆ وێنەیەکی زۆر گەورەی مەلا مستەفا بە دیواری سەکۆی بەردەمی هۆڵەکەدا هەڵواسراوە، دەستەی بەڕێوەبەر لە بەردەمی دا دانیشتوون. ئەمە نارەزایەیەکی زۆری لە ناو هۆڵەکەدا خوڵقاند بوو. داوا کرا بۆ وێنەکە دابگرن. ئەوانیش سوور بوون لە سەر هێشتنەوەی. زۆری ئەندامەکان هۆڵەکەیان بە جێ هێشت بوو. کونگرەکە تێکچوو و، کۆبوونەوەکانی دواخرا.

من ئەو ڕۆژە لەوێ نەبووم چونکە ڤیزای ئەڵمانیام درەنگ پێ گەیشت بوو. کە من گەیشتم لە پشتی پەردەوە گفتوگۆی لایەلا ئەکرا بۆ دۆزینەوەی چارەیەکی مامناوەنجی کە هەموو بەشدارەکان پێ ی ڕازی بن.

ساڵانی تر من بۆ هیچ کونگرەیەکی نەچووبووم. ئەمجارەیان لە بەر ناسکی هەلومەرجی سیاسی لە سەر داوای یەکێتی چووم. مامجەلال و کەمال فوئاد و عومەر شێخموس هات بوون.

ئیمە: ئەوانەی یەکێتی، ڕەنجمان وابوو کونگرە بە یەکگرتوویی بهێنینەوە و،

ڕێبازێکی پێشکەوتنخوازانە بگرێ و، نوێنەرانی هەر چوار بەشەکەی کوردستانی تێ دابێ. هیچ بەیاننامەیەکی بەجێ مان نەشدی بۆ تێکدانی کۆنگرە و، لەتکردنی کۆمەڵەی خوێندکاران. بە تایبەتی نەتوانرا بە هەڵبژاردنی ئازاد دەستەی بەڕێوەبەر لە دەس پارتی دەربهێنرێ.

هەندێ لە کوردەکانی ئێران کە سەر بە حیزبی دیموکراتی کوردستان بوون لەو ڕووەوە زۆر توندڕەو بوون. تەنانەت ئەمیری قازی، کە وەکو دەمڕاستی کوردەکانی ئێران ئەدوا، بە ڕاشکاوی ئەیوت: «ئێمە ئامادە نین لە ژێر یەک سەقف دا لە گەڵ لایەنگرانی بارزانی دابنیشین. ئەوانە سەر بە ساواکن. هەواڵەکانی ئێمە بە ساواک ئەگەیەنن».

چارەیەکی کاتی دۆزرایەوە. دەستەیەکی تێکەڵاو دانرا بۆ بەڕێوە بردنی کۆنگرە تا هەڵبژاردنی گشتی. چونکە هۆڵەکەوە. ئەمیر کامەران بەدرخان هات بۆ ئەوەی وەکو میوانی کۆنگرە بەشداری بکا. ئەمیری قازی هەستا بە نارەزایییەوە هەندێ قسەی کرد و، وتی کۆنگرە پڕ بووە لە پیاوی گومانلێکراو لە بەرئەوە جێگای ئێمەی تێ دا نەماوەتەوە. لە هۆڵی کۆبوونەوە چووە دەرەوە و، کوردەکانی ئێران و، هەندێکی تورکیاش بە دوای دا ڕۆیشتن. ئێمەش بە ناچاری لە گەڵیان دەرچووین. ئەمیری قازی ئەوەندە باسی ئەوەی ئەکرد کە ئەوان ئامادە نین لە ژێر یەک «سەقف» دا لە گەڵ لایەنگرانی بارزانی دابنیشن ناویان نا بوون: «ئاغایانی سەقفی».

ئەم کۆنگرەیە، یەکەمین ڕووداوی سیاسی گرنگ بوو دوای ئاشبەتاڵ، بەڵام چەند شتێکی بە ڕوونی دەرخست:

- سەرەڕای ئەو مەینەتییە نەتەوایەتییەی بنەماڵەی بارزانی بە سەر گەلی کوردیان هێنا بوو، هێشتا ژمارەیەکی زۆر لایەنگری دڵسۆزیان هەبوو، لە هەمو هەنگاوێکی باش و خراپی دا کوێرانە دوای ئەکەوتن.

- بارزانی، بە پێچەوانەی ئەوەی ئیدیعای ئەکرد کە دەوری تەواو بوە، سەرلەنوێ کەوت بووە خۆ کۆکردنەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر دەس بگرێتەوە بە سەر جوڵانەوەی کوردا. لایەنگرەکانی خۆی هاوێشتەوە مەیدان. هەر لەو ماوەیەدا یەکەمین بەیانیان دەربارەی ئاشبەتاڵ بە ناوی لقی ئەورووپای پارتییەوە بڵاو کردەوە.

- بنەماڵەی بارزانی تەجرووبەیان لە ڕابوردو وەرنەگرت بوو، هەمو جۆرێ لە «پلورالیزم» یان ڕەت ئەکردەوە و، وەکو جاران سوور بوون لە سەر سەپاندنی «سەرۆکایەتی بارزانی» و «پارتی پێشڕەو» بە سەر جوڵانەوەی کوردا. بۆ جێبەجێ کردنی ئەمەش سڵیان لە هیچ جۆرە «حەرام و حەڵاڵ» ێکی سیاسی نەئەکردەوە.

ئەمە هەوڵێکی زۆرمان دا کۆمەڵەی خوێندکاران لەت نەبێ، بەڵام سەرەنجام بۆ رازی کردنی کوردەکانی ئێران ئەمەش: لایەنگرانی یەکێتی جیا بوونەوە. کۆنگرەیەکی جیاوازیان بەست. کۆمیتەیەکی ئامادە کردنیان دامەزراند. پاش چەند مانگی «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە دەرەوەی وڵات» یان پێک هێنا. هەردوو کۆمەڵە دەورێکی ئەوتۆیان نەما لە ئەوروپا. لایەنگرانی دیموکرات وەکو گەرم بوون بۆ لەت کردنی کۆمەڵە، ئەوەندە گەرم نەبوون بۆ بەگەڕخستنی کۆمەڵەی نوێ و بۆ بەشداری لە چالاکییەکانی دا.

*

فاروقی مەلا مستەفا، ئامۆزای فوئادی مەلا مەحموود و، ناسیاوی لە مێژینەی منیش بوو. بە هۆی بیروباوەڕی سیاسییەوە لە گەڵ یەک کۆک و تەبا نەبووین. ئەو لە سەردەمی خوێندنی ساناوییەوە لە گەڵ حشع بوو، منیش لە گەڵ پارتی بووم. لە گەڵ ئەوەش دا دۆستایەتیمان هەر هەبوو.

کە حشع بوو بە دوو بەشەوە و، عەزیز ئەلحاج جیا بووەوە و، «القیادە المرکزیە للحزب الشیوعی العراقی» پێک هێنا. فاروق و هەندێ لە هاوڕێکانی دایانە پاڵ عەزیز حاج. دوایی عەزیز گیرا و، خیانەتی لە هاوڕێکانی کرد و، هاتە سەر تەلەفزیۆن پەشیمانی لە رابوردوی خۆی دەربڕی. پاشماوەکەی قیادەی مەرکەزی درێژەیان بە کارەکانی خۆیان دا. ئیبراهیم عەللاوی رابەری کردن. ئیبراهیم چوو بوو سووریا و، فاروق مەسئولی بنکە و پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی کوردستانیان بوو لە ناو کێڵەکان دائەنیشت.

ڕۆژانی ئاشبەتاڵ، ئەمیش لە گەڵ سەرکردەکانی کۆمەڵە قسەی کرد بوو، هاوکاری بکەن بۆ مانەوە و بەرەنگاری. پاشان بۆیان دەرکەوت بۆ ئەم کارەیان پێ ناکرێ، ئەوانیش لە گەڵ لێشاوی خەڵک دا گەڕا بوونەوە بۆ عێراق. کاربەدەستان، لەوانە غانم عەبدولجەلیل، لە گەڵ فاروق و هاوڕێکانی قسەیان کرد بوو: کە حیزبەکەی ئەوانیش لە وەزارەت و پەرەدا بەشداری بکەن. ئەمان خۆیان لەو مەسەلەیە دزی بووەوە بە بیانووی ئەوەی مەسئولەکانیان لە دەرەوەیە. ڕێگایان بەو و بە هاوڕێیەکی تری: عەفیفان چلەمیران، دابوو بچنە دەرەوەی عێراق، بۆ ئەوەی قسە لە گەڵ هاوڕێکانیان بکەن، بە تایبەتی لە گەڵ ئیبراهیم عەللاوی.

فاروق لە گەشتەکەی دا بۆ ئەوروپا گەیشتە لەندەنا. چەند ڕۆژێ مایەوە. بە تێر و تەسەلی لە سەر هەلومەرجی کوردستان دواین و، من باسی بەرنامەی کاری داهاتوی یەکێتیم بۆ کرد. لە گەڵ فوئاد زۆری لە گەڵ خەریک بووین لە لەندەنا بمێنێتەوە و، نەچێتەوە بەر چەقۆی بەعس، تا ئەمەش دەس پێ ئەکەینەوە، ئەوسا پێکەوە ئەگەڕێینەوە کوردستان. فاروق ملی نەدا و سوور بوو لە سەر گەڕانەوەی بۆ عێراق. بیانووەکەشی ئەوە بوو،

کە ئیلتیزامی هەیە و، بەلێنی داوە بە هاورێکانی بگەڕێتەوە لایان، ئەگەر نەگەڕێتەوە لەوانەیە بەعس ئازاریان بدات. فاروق ئەیشەزانی چارەنوسی چی ئەبێ و بەعس چۆن رەفتاری لە گەڵ ئەکا، لە گەڵ ئەوەش دا گەڕایەوە بۆ عیراق. بێگومان ئەمە هەڵوێستێکی جوامێرانە و ئازایانە بو.

عەللاوی و حیزبەکەی ئەندامی «التجمع الوطنی العراقی» بون. عەللاوی دوای ئاشبەتاڵ رەش وابو: لە بەر ئەوەی جولانەوەی نیشتمانی و دیموکراتی لە عیراق دا زەبرێ زوری لی کەوتوە و، کادری زوری لە دەس داوە و، لە بەرامبەر داوودەزگای بەعس دا لاواز بوە، هیزە سیاسیەکان بو ئەوەی پاریزگاری ریکخستنەکانیان و کادرەکانیان بکەن بە هیوای هەلێکی لە بار، جاری چالاکی خویان راگرن. ئیبراهیم عەللاوی سالی لە دیمەشقەوە گویزایەوە بو لەندەن. قیادەی مەرکەزی چالاکی خوی راگرت، حیزبی بەعسیش وازی لی هینان.

لە شام دەستەیەک لە کادرەکانیان بە مە رازی نەبون. ریکخراوێکی نوی یان پێک هێنا و بلاو کراوەیەکیان بە ناوی «وحدە القاعدە» وە دەر ئەکرد. عادل عبدالمهدی «ابو امل» رێبەری ئەکردن. لەو کوردانەی لە گەڵیان بون: فاضلی مەلا محمود و، سامی شورش.

*

تا ئاشبەتاڵ پەنابەری کوردی عیراق لە ئەوروپا و ئەمەریکا نەبو. یا ئەگەر بوبی زور بە دەگمەن بو. کوردەکانی دەرەوە توشی گیروگرفتی پاسپورت و گەڕانەوە و هاتوچو نەبون. بەلام هەمو گفتوگویەک جوری لە چارەسەر کردنی ئەم کیشانەی بە سەرا ئەهات.

ئاشبەتاڵ مەینەتیەکی نەتەوایەتی گەورەی بە سەر کوردا هێنا. سەدان هەزار کوردی عیراقی دەربەدەر بون. زوربەیان رویان کردە ئیران. ئیران جیگای کردنەوە بەلام نەیهیشت لە ناوچە کوردنشینەکان دا بمێننەوە. دابەشی کردن بە سەر ئوستانەکانی دەرەوەی کوردستان دا. دوای ماوەیەک هەر کەسیکیش بیتوانیایە ولاتیکی تر بو خوی هەلبژیری ریگایان لی نەئەگرت ماوەیان ئەدا بروات. هەندی ولاتی ئەوروپی بریاریان دا یەکی ۱۰۰ خیزانی کورد بە پەنابەری سیاسی وەربگرن لەوانە: نەمسا، هولەندە، سوید.

نەمسا تەجروبەیەکی زوری هەبو لە مەسەلەی پەنادانی سیاسی دا. دوای رووداوەکانی دوبچیک سەدان هەزار چیکوسلوفاکی رویان کرد بوە نەمسا. لە بەهاری ۷٦ دا لە تارانەوە ۱۰۰ کەس، هەندیکیان خیزاندار و هەندیکیان سەلت، لە سەر حسابی نەمسا گویزرانەوە بو نەمسە. هەمویان لە ئوردوگایەکی پەنابەری نزیک ڤییەننا دانان.

ئیمەمانان کە خۆمان پەنابەری سیاسی نەبوین ئەمان ئەزانی ماڵەکانی پەنابەر، بە تایبەتی سەرچەو خانو... چیە. لەو ڕووەوە ئیمە نەمانئەتوانی هیچ ڕینماییەکیان بکەین. خۆیان بە شێنەیی شارەزای ژیانی پەنابەری بون.

زۆری پێ نەچو سامی سنجاری هاتە ئەوروپا بۆ گەشتێکی سیاسی. لەو گەشتەیدا سەردانی نەمسای کرد و، سەری پەنابەرەکانیشی دا. پەنابەرەکان ئەوان خۆیان هەڵیان بژارد بون. هەندێکیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی «قیادە موەقەتە» بون. بەڵام کە گەیشتنە ئەوروپا ژمارەیەکی زۆری ئەندامەکانیان لێیان جیا بونەوە.

زاراوەکانی پەنابردنی سیاسی و هیجرەت هێشتا لە ناو کوردا ناشنا نەبو. لە ئەدەبی سیاسی کوردی دا بڵاو نەبوبو. دەوڵەتەکانی دەسەڵاتداری کوردستانیش ڕێگای هیجرەتی کوردیان نەئەدا. هەر لە قوتابخانە «ادب المهجر» ی عەرەبەکانی لوبنانمان خوێند بو. دوای ئاشبەتاڵ شەپۆلی پەنابەری سیاسی بۆ ئەوروپا و ئەمەریکا دەستی پێ کرد. ڕاستییەکەی ئەمە «هیجرەت» بو نەک «پەنابردن». زۆر لەوانەی بە ناوی پەنابەری سیاسی گەیشتنە ئەوروپا و ئەمەریکا، ئەیانئەتوانی لە عێراق بژین بەڵام ئەوانە ئەیانئەویست لە وڵاتێکی ترا، کە هەلومەرجی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕوشنبیری... ژیان باشتر و خۆشتر بێ دابمەزرێن، ئەگینا مەترسی ڕاستەقینە لە سەر ژیانیان نەبو، بگرە هەندێکیان فریان بە سەر کاروباری سیاسییەوە نەبو.

ئەریتی «چونە دەرەوە» نیتر لە ناو کوردستانی عیراق دا داهات و بو بە باو.

*

لە نیسانی ٧٦ دا کۆبونەوەیەکی دەستەی دامەزرێنەرمان لە ڤییەننا کرد. لەم کۆبونەوەیەدا: مامجەلال، کەمال فوئاد، عومەر شێخموس، عادڵ موراد، فوئاد مەعصوم و، من بەشدار بوین. عەبدوڕەزاق نەیتوانی بەشدار بێت.

بۆ ئەوەی جۆری بیرکردنەوەی ئەوسای هەندێ لە سەرکردەکانی یەکێتی پیشان بدەم لێرەدا ئەم نمونەیە ئەگێڕمەوە:

یەکێ لەو باسانەی لەم کۆبونەوەیەدا کرا، باسی جوڵانی دیپلوماسی بو بۆ تازەکردنەوەی پەیوەندی لە گەڵ حکومەتان، پارلەمان، حیزبەکان و، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دنیا. هەر لەم بوارەدا پرسیاریان لەمن کرد وەکو نمونە لە نەمسا چی بکری باشە؟ منیش وتم: لە نەمسا دو پارتیی گەورەی لێ یە سوسیال دیموکرات و گەل کە ناوبەناو حوکم ئەگرنە دەس. ئیستا سوسیال دیموکرات لە سەرکارن. کرایسکی رابەریانە. گەل ئۆپۆسیونن. جگە لەمان چەند پارتییەکی تر هەیە لەوان بچوکترن وەکو حیزبی ئازادیخواز

که تاوانبار ئەکرین بەوەی کرنە نازییەکانی تیا کوبوتەوە. ئەوانیش نوینەریان لە پارلەمان دا هەیە. پارتی کومونیستی سەر بە یەکیتی سوفیت و دو ریکخراوی بچوکی ماوییەکان و تروتسکییەکانیش هەیە کە نوینەریان لە پارلەمان دا نیە. ئەمە نەخشەی دابەشبونی سیاسی ئەم ولاتەیە. ئەگەر بمانەوی جولانی سیاسی دەس پی بکەین ئەبی لە پارتی دەسەلاتدارەوە دەس پی بکەین تا ئەگاتە سەر ئەوانی تر.

دەزگای راگەیاندنی ئەم ولاتەش جگە لە رادیو و تەلەفزیون ۳ روژنامەی گەورەیان هەیە: کوریر، کرونین، پریسە...

کەمال فوئاد، کە خوی بە مارکسی ئەئەزانی و ماوەیەکی دریژ لە ئەوروپا ژیا بو، لە ناو سەرکردایەتی یەکیتی یش دا بە «معتدل» دانرا بو، هەلی دابو، بە زمانە گالتەجارییەکەی خوی کەوتە قسە وتی: «سوسیال دیموکرات» لە یەکەمین جەنگی جیهانییەوە لینین «جەواب» ی داون. «پارتی گەل» سەر بە کارتیل و تریستەکانن. هەر لایەک پەیوەندی لە گەل «پارتی ئازادیخوازەکان» بکا ئابروی ئەچی. «پارتی کومونیست» تا لە سوفیتەوە فەرمانی بو دەرنەچی قسەشیان لە گەل بکەین کەلکی نیە. «ماوییەکان» و «تروتسکییەکان» یش وەکو شیخ رەزا ئەلی: «ئەولادی ئەم عەسرەن» کەلکی هیچیان پیوە نیە».

بەمجورە بە کورتی هەمویانی لت کرد.

منیش وتم: «ئەگەر وابی لە نەمسا کەس نامینیتەوە قسەیان لە گەل بکەین پیرەژن و سەگەکانیان نەبی». نەمسا بە هوی ئەوەی لە دوەمین جەنگی جیهانیی دا ژمارەیەکی زور لە پیاوەکانی کوژرا بو، رادەی پیرەژن زور زیاتر بو لە پیرەمیرد.

لەو سەفەرەدا مامجەلال ژمارەیەکی باش لە کاربەدەست و سیاسی و روژنامەوانی نەمسایی بینی. رادیو و تەلەفزیون گفتوگوی کوردیان لە گەل مامجەلال بلاو کردەوە، روژنامەکانیش هەندی ستونیان دەربارەی قسەکانی نوسی. هەروەها لە گەل سامی و هەندی لە بەرپرسەکانی ق م دانیشت بو ئاساییکردنەوەی نیوانی ق م و یەکیتی. بەلام کوبونەوەکە هیچی لی سەوز نەبو.

*

ئەو شوینەی من لی ی ئەژیام جگە لەوەی «خانوی خویندکاران» بو ئوتیلیکی بچکولەشی هەبو بو خزم و میوانی خویندکارەکان. جەماعەت لەوی دابەزی بون. کوبونەوەکانمان لە جیگایەکی تر ئەکرد. دوستیکی ئیرانی فلاتەکەی خوی بو چول کرد بوین. لە گەرمەی قسەکردن دا بوین، یەکی لە زەنگی مالەکەی دا. دەرگامان کردەوە

کچێک بۆ وتی: «من دانیشتووی ئەو فلاتەی تەنیشت ئێوەم. خوێندکاری زانستگای پزیشکیم. خەریکی دەرس خوێندنم. چەند ڕۆژێکی تر تاقیکردنەوەیەکی گرنگم هەیە. دەنگتان زۆر بەرزە. تکایە بە دەنگی نزم بدوێن». وتمان: باشە. درێژەمان بە گێڕانەوەکان دا. پاش ماوەیەکی تر تەلەفۆنی بۆ کردین دیسان داوای لێ کردین بە دەنگی نزم قسە بکەین. وا دیار بۆ ئێمە ڕاهاتبووین بە دەنگی بەرز قسە بکەین داواکانی کچی تایەن کەلکی نەبوو. دواجار هاتەوە سەرمان وتی: «ئەگەر بێدەنگ نەبن تەلەفۆن بۆ پۆلیس ئەکەم ئەڵێم تالسی تێرۆریست لە فلاتەکەی تەنیشتا من خەریکی دانانی پلانی کارێکی تێرۆریستین!»

ئێوارەیەکیان لە گەڵ د. فوئاد چووین بۆ گەڕان. لەو کاتەدا تازە فلیمی بە ناوبانگی «ئیمانوێل» لە سینەماکان پیشان ئەدرا. پێکەوە چووین بۆ سەیری ئەم فلیمە. لە ساڵۆنی بلیت بڕین دا بە ڕێکەوت تووشی کونسوڵی عێراق بووین. ئەویش ئەچوو بۆ سەیری هەمان فلیم. چاکوچۆنی لە گەڵ من کرد ئیمزانی جەماعەت لە فیەننان. پرسی: «ئەوە مامجەلالە لە گەڵتا؟». وتم: «نەخێر». وتی: «کەواتە د. فوئادە». وا دیار بۆ بە قسەی دا ناسیبووەوە.

*

د. کەمال خۆشناو لە «بەلگراد» ی پایتەختی «یوگوسلاڤیا» وە تەلەفۆنی بۆ کردم کە هاتوتە دەرەوە و، ئەیەوێ من ببینێ. حەزم کرد بیبەم لیبیننا نەیئەتوانی. لە بەر ئەوە من چووم بۆ لای. کە زانستگای سلێمانی کرابوو د. کەمال خۆشناو لەوێ دامەزرا. پێشتر ناسیاویمان هەبوو بەڵام کە هاتە سلێمانی دۆستایەتییەکمان بە هێزتر بوو. لە یەکگرتنەوەی هەردو باڵەکەی پارتی دا بوو بە ئەندامی لقی سلێمانی و، لە گەڵ هەڵگیرسانەوەی شەڕدا چوو ڕیزی پێشمەرگەوە.

عێراق بۆ هاندانی زاناکان یا وەکو خۆی پێی ئەوتن: «اصحاب الكفاءات» ی عێراق هەندێ «ئیمتیازی» تەرخان کرد بوو. یەکێ لەو ئیمتیازانە ئەوەبوو ڕێگای ئەدان لە ئەورووپا ئۆتۆمۆبێل و کەلوپەلی ناوماڵ بکڕن و بێ گومرگ بیهێننەوە بۆ عێراق. د. کەمال خۆشناو کە زەمانێک «عەمید» ی کاروباری خوێندکاران بوو لە زانستگای سلێمانی ئەیتوانی کەلک لەم ئیمتیازە وەربگرێ. بەو بیانووەوە هات بوە دەرەوە. لە کوردستان قسەی لە گەڵ کاک شەهاب کرد بوو. کاک شەهاب پێی وت بوو لە دەرەوە قسە لە گەڵ ئێمە بکات و هەر ڕەوشێتێکمان پیشان دا بە قسەمان بکا.

لە ڕۆژانی ئاشبەتاڵ دا کە هێرشی جەیش بۆ سەر ناوچەی سەیدسادق دەستی پێ

کرد، کاک کەمال ئەندامی لقی سلێمانی پارتی بو، پێش دەستپێکردنی هێرشەکە، لە گەڵ فەتاح ئاغا و، کۆمەڵێکی تر لە مەسئولەکانی شۆڕش چو بون بۆ ئەو ناوچەیە. هێرشەکە گەیشتە سەریان. حەمەی سەید عەلی حافظ، یەکێ لە فەرماندەکانی هێزەکە، بۆ ئەوەی بە زیندویەتی نەکەوێتە بەردەستی دوژمن خۆی کوشت و، ئەوانی تر بە نارەحەتییەکی زۆر لە گەمارۆی جەیش دەرباز بون. کەمال لەم شەڕەدا قاچی بریندار بو بو. کە هاتە بەلگراد هێشتا بە تەواوی چاک نەبوبوەوە و ئەشەلی.

چوم بۆ بەلگراد. لە گەڵ د. کەمال یەکمان گرتەوە و چەند رۆژێ پێکەوە بوین. گفتوگۆی تەواومان کرد. پێشتر من لە گەڵ هەندێ لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر قسەم کرد بو کە چی بکات، بگەڕێتەوە یا بمێنێتەوە؟ ئەگەر بمێنێتەوە چی بکات؟ رەئیمان وابو: ئەگەڕێتەوە بۆ عێراق. هەوڵ بدا جارێ لە دەرەوە بمێنێتەوە. ئەگەر بتوانی بۆ دابینکردنی ژیانی کارێک بدۆزێتەوە، تا بزانین رووداوەکان بەرەو کوێ ئەڕۆن.

د. کەمال نەگەڕایەوە بۆ عێراق. خوێندنی کشتوکاڵی لە زانستگای بەغداد و خوێندنی دکتۆرای لە یوگوسلاڤیا تەواو کرد بو. کاری لە لای کۆمپانیەکی یوگوسلاڤی دۆزیەوە. کارەکەی لە لیبیا بو. د. کەمال چوە سەر کارەکەی لە لیبیا تا کاتێ داوا کرا بۆ سوریا و دوایی بۆ کوردستان.

هەر لەم سەفەرەدا بە هەلم زانی بۆ پێکهێنانی رێکخراوەکانی یەکێتی لە ناو خوێندکارە کوردەکان دا سەردانی زۆری کۆمارەکانی یوگوسلاڤیام کرد، لە «زەگرێب»ەوە دەستم پێ کرد، تا «سکۆپیا»ی پایتەختی «مەکەدونیا».

*

پێش ئەوەی ڤییەننا بە جێ بهێڵم بۆ خواحافیزی سەردانی هەندێ مامۆستا و ناسیاوم کرد. لە ناو ئەوانەدا «هێلموت کرامەر». پێم وت: «هاتوم بۆ خواحافیزی. ئەگەڕێمەوە بۆ کوردستان». وتی: «بۆچی ئەگەڕێیتەوە؟». وتم: «ئەچین شۆڕش هەڵئەگیرسێنینەوە». سەیری بە قسەکەم هات. دەستی برد بۆ لای لاجانگی و پەلەپەکانی یادا. ئەمە نیشانەی تێکچون و شێتی بو. وتم: «وا من تێک ئەچوم بەلام ئێمە سەر بە دو جیهانی جیاوازین لە یەکتری تێ ناگەین. لای ئێوە ئازادی ئەوەندە زۆرە گەیشتوتە رادەی داوشین «دیکلیناسیون: انحطاط»، کەچی لای ئێمە هیچ جۆرە ئازادییەک نیە. لای ئێوە پارە ئەوەندە زۆرە گەیشتوتە رادەی ئاوسان «ئینفلاسیون: تضخم» کەچی لای ئێمە پارە نیە. لای ئێوە پیشەسازی ئەوەندە زۆرە گەیشتوتە رادەی پیسبونی ژینگە «پۆلیوشن: تلوث البیئە» کەچی لای ئێمە هێشتا پیشەسازی نیە. لە بەر ئەوە زەحمەتە لە من تێ

بکەی». ئیتر خواحافیزیم لێ کرد. تا ئێستاش دڵنیا نیم لەوەی: بۆچوونەکەی ئەو ڕاست بوو کە منی بە گەوج ئەزانی، یان کارەکەی من کە چووم بۆ بەشداری لە دەستپێکردنەوەی شۆڕش دا.

# شام: مەکۆی خۆسازدان

*

ڕۆژی ٧٥/١٢/١٣ بۆ یەکەمین جار لە لوبنانەوە بە فڕۆکە چووم بۆ دیمەشق.

دەستەی دامەزرێنەر، جگە لە عومەرشێخموس کە کوردی سوریا بو نەیتوانی ئامادە بی، ئەندامەکانی تر: مامجەلال، د. فوئاد مەعسوم، د. کەمال فوئاد، عادل موراد، عەبدولڕەزاق میرزا و، من، هەمو لە دیمەشق خڕ بوبونەوە.

موئەیەد نەقشبەندی هاوڕێی عادل موراد بو ئەویش لە تارانەوە هات بو، عەلی سنجاریش لە شام نیشتەجێ بو بو، هەردوکیان بە تەما بون ببنە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر.

جگە لە مان، لەو ماوەیەدا چەندین کوردی عێراقی گەیشت بونە سوریا:

سەلامی مەلا ئەحمەد، عارف شێخ کەریم، ئەنوەر شاکەلی، ئیبراهیم عەزو، ئیبراهیم سەعید عەلی، ئەندامی کۆمەڵە بون، دوای دەس پێ کردنی هێرشی گرتنی ئەندامانی کۆمەڵە لە عێراقەوە هات بون.

حەسەن خۆشناو، سەید کەریم کەریم، جەمال ئەحمەد بەنا، عەبدوللا خۆشناو، وەلید نەقشبەندی، فوئاد عومەر، فەرەج جەمیل، عومەر عوسمان (زەعیم عەلی)، سەردار ئەبوبەکر، عەلی مستەفا، ڕاشید عەزیز، ئەنوەری ئەمین میسری.. ئەفسەر بون و، حەسەن باپشێخ، بزۆز، مستەفا خۆخی، حەسەن نەرمە، عەباس شەبەک، سامان گەرمیانی، عادل شوکر، داود محەمەد عەلی... لە تارانەوە هات بون.

ئەمانە و، زۆری تریش، بە ڕێگای جیاجیا گەیشت بونە سوریا. هەندێک بە پاسپۆرتی عێراقی و، هەندێک بە «پەروانەی عوبور» ی ئێرانی و، هەندێ بە پێ، بەڵام هەمو لە دەوری یەکێتی کۆبوبونەوە، هەندێکیان لە قامیشلی بون و، هەندێکیان لە دیمەشق. هەمویان هات بون، بە قسەی خۆیان، بە نیازی بەشداری کردن لە دەسپێکردنەوەی شۆڕش دا.

کۆبونەوەکان تەواو بون. ئەو مەسەلانەی پێویست بون باس کران و، ڕێوشوێنی کاری داهاتو دانرا. هێشتا کاتی گەڕانەوەی ئێشتمان نەهات بو، منیش هێشتا هەندێ وردە کارم لە لوبنانا مابو. دوای ئەوەی لە گەڵ هەمو ئەوانەی لە سوریا کۆبونەوە ئاشنایەتی و ناسیاویم پەیدا کرد، پاش چەند هەفتەیەک گەڕامەوە لوبنانا، بە هیوای ئەوەی لە

ماوەیەکی کورت دا دیسان بیمەوە شام.

*

دوای ئەو شالاوەی دەزگا ئەمنییەکانی بەعس بۆ سەر ڕیکخستنەکانی کۆمەڵەی کرد، ریزەکانی پشێوییەکی زۆریان تێ کەوت بوو. سەرکردایەتی و، کۆمیتەی ڕیکخستنی شارەکانی نەما بوو. بەڵام هەندێ لە کادر و ئەندامەکانی بەر دەس نەکەوت بوون خۆیان شارد بووەوە و، هەندێکیشی هەر ئاشکرا نەبوو بوون.

هەندێ لەو ئەندام و کادرانەی لەم شالاوە دەرباز بووبوون، هەولیان دا ڕیکخستنەکە بگرنەوە، بەڵام هەندێ لەوانیش گیران و، کارەکەیان سەری نەگرت.

شاسوار جەلال، کە دوایی بە «کاک ئارام» ناوی دەرکرد، لەوانە بوو بەر دەس نەکەوت بوو، خۆی شارد بووەوە. شاسوار لە سەرەتاوە یەکێ بوو لە ئەندامە چالاکەکانی کۆمەلە و، شارەزای ڕیکخستن و، زۆری ئەندامەکانی بوو، هەر زۆ هەولێکی زۆری دا بۆ گرتنەوەی پاشماوەی ڕیکخستنەکە و، ڕیکخستنەوەی. ئەوسا ڕیکخستنی کۆمەلە هەر پاریزگایەکی بە هەریمێک دانا بوو. لە هەر پاریزگایەک یەکێکی دیاری کرد بوو، لەوانە: سالار (نەجمەدین عەزیز) لە سلیمانی، عادل (ئازاد هەورامی) لە کەرکوک، مەلا بەختیار (حیکمەت محەممەد کەریم) لە خانەقین، عەبدوڕەزاق لە هەولیر. پێکەوە کۆمیتەیەکیان پێک هینا بۆ بۆ سەرکردایەتی کۆمەلە و ناویان نا بوو: «کۆمیتەی هەریمەکان». عەبدوڕەزاق پاش ماوەیەک لە گەڵیان تێک چو بوو، هاوکاری لە گەڵ نەکرد بوون، بەڵام سەرپەرشتی ئەو ڕیکخراوانەی کرد بوو کە ناسی بوونی.

ئەم کۆمیتەیە چەند کارێکی گرنگیان ئەنجام دا:

١. ئەندامەکانی کۆمەلەیان ڕیک خستەوە، لە گەڵ زۆری ئەوانەی خۆیان شارد بووەوە و، ئەوانەی ئاشکرا نەبووبوون، پەیوەندییان دروست کرد و، هەمو ئەو شانە و خەتانەیان پێکەوە گری دایەوە کە ما بوون و، کۆمیتەیان لە شارەکان دا دامەزراندەوە و، کەوتنە ڕاکیشانی تیکۆشەرانی تازە.

٢. پەیوەندییان لە گەڵ چەندین ئەفسەری شۆرشگێر و کادری پێشمەرگایەتی دروست کرد و، داوایان لی کرد بوون خۆیان ئامادە بکەن بۆ چوونە شاخ.

٣. پەیوەندییان لە گەڵ دەستەی دامەزرینەری یەکێتی لە دەرەوە بە تایبەتی لە گەڵ مامجەلال دروست کرد.

جگە لە ئەندامانی کۆمیتەی هەریمەکان، چەند کەسێکی تریش هاوکاری زۆر و کاریگەریان کرد بوو بۆ بەجیهینانی ئەرکەکانیان، لەوانە: جەمال عەلی مەعروف

«جەمالەرەش»، جەمال تاهیر، شازاد صائیب، ئیبراهیم ئەحمەد، عەزیز مەحمود...
جەمال عەلی عارف (جەماله رەش) و، ئیبراهیم ئەحمەد هەر یەکەی جاریک هاتن بۆ سوریا نامەی کومەلەیان هینا و، عوسمانی مام برایم چەند جاری هات بۆ عەممان.

*

سوریا و عیراق ئەگەرچی هەردووکیان لە ژیر دەسەلاتی حیزبی بەعس دا بون، بەلام هەر لە سەرەتاوە ناکوک، بەلکو بە خوینی سەری یەکتری تینو بون.
هەندی لەو عیراقییانەی چوبونە سوریا ریکخراویکی «بەرەیی»یان دامەزراند بو بە ناوی «التجمع الوطنی العراقی: توج».
ئەو حیزب و ریکخراوانەی لە «توج» دا کو بوبونەوە بریتی بون لە مانە:
- حزب البعث العربی الاشتراکی - قیادە قطر العراق. احمد العزاوی و باقر یاسین
- الحرکه العربیه الاشتراکیه.
عبدالاله النصراوی، جواد الدوش، عونی قلمچی.
- الحزب الشیوعی العراقی (القیادە المرکزیە)
ابراهیم علاوی
- الحزب الاشتراکی
رشید محسن، مبدر الویس.
- موتمر القومیین
ایاد سعید ثابت
هیچ ریکخراویکی کوردی لە توج دا نەبو. لە پیش ئاشبەتال دا، توج لە گەل بارزانی و سەرکردایەتی پارتی نەیانی بلاش بو، بەلام پارتی تیکەلاوی نەبوبو. رەنگە هوی یەکەمی ئەوە بوبی کە توج چەپ و عەرەبپەرست و دوژمنی ئیسرائیل و ئەمەریکا بو. ئەوەش لە گەل تیگەیشتنی بارزانی نەئەگونجا. هوی دوەمیشی رەنگە ئەوە بوبی، بارزانی و پارتی خویان لە توج زور بە زلتر ئەزانی. ئەوان حوکمرانی ناوچەیەکی فراوان و، خاوەنی لەشکریکی گەورە بون، لە کاتیک دا توج پەنابەر بون لە ولاتیکی تر.
یەکیتی دوای ئەوەی سوریای کرد بە مەلبەندی سەرکردایەتی خوی ئەبو هەلویستی خوی لە توج رون بکاتەوە. سوریا بو یەکیتی پیویست بو. مانەوەی یەکیتی لە سوریا و، راپەراندنی کارەکانی، وەکو ماسیجەلال ئەیوت: بەند بو لە سەر ئەوەی یەکیتی ببیتە ئەندامی «توج». بەلام ئەندامیتی یەکیتی لە توج دا، یەکیتی ئەخستە ژیر باری چەند

ئیلتیزامیکی سیاسی گرانەوە، لەوانە:

١. ئەبو شۆرشی کورد بەشی بێ لە شۆرشی عیراق و، دروشمەکانی شۆرشیکی عیراقی بەرز بکاتەوە و، یەکیتی لە ژیر ئالای تودە دا شۆرش بکا.

٢. ئەبو یەکیتی روخاندنی رژیم بکاتە ئامانج و دروشمی سەرەکی خۆی.

٣. ئەبو یەکیتی تا روخاندنی رژیمی عیراقی دریژە بە خەبات بدا و، هیچ جۆرە سازین و چارەیەکی ئاشتیانەی قبول نەکا.

لە کۆبوونەوەیەکی «دەستەی دامەزرینەر» دا ئەم باسە خرایە بەر لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن و دەنگدان. عادل موراد و من دەنگمان نەدا بۆ ئەندامەتی تودە. من رەئیم وابو: یەکیتی نەچیتە ژیر باری هیچ ئیلتیزامیکی سیاسیەوە و، خۆی نەبەستیتەوە بە هیچ ریکخراویکی ترەوە، بۆ ئەوەی ئازادی جوڵانی هەبی. بە زۆرایەتی دەنگی دەستەی دامەزرینەر یەکیتی بریاری دا ببی بە ئەندامی تودە. لە گەڵ تودە کەوتە گفتوگۆ، زۆر مەسەلەی گرنگی پی سەلماند:

- پرۆگرامی تودە دەستکاری کرا، مافەکانی کورد روونتر و فراوانتر خرایە ناوی.

- تودە بەلێنی دا کە ئیمکاناتی مادی و مەعنەوی بۆ شۆرشی کورد دابین بکەن و، شۆرشەکە گەشە پی بدەن بۆ شۆرشیکی عیراقی لە روی: سەرکردایەتی و بەشداری و مەیدانی کارەوە.

- تودە بەلێنی دا کە هاوزەمان لە گەڵ دەستپیکردنەوەی خەباتی چەکدارە لە کوردستان ئەوانیش لە ناوەراست و خواروی عیراق دا چالاکی شۆرشگیرانە دەس پی بکەن.

بارەگاکەی تودە لە نزیک «الجسر الابیض» بو بو بە شوینی کۆبوونەوەی عیراقیەکان. بە روژ لەوی یەکتریان ئەدی و قسە و باسیان ئەکرد. سەرکردەکانی بەعس لە بارەگای قیادەی قەومی دەوامیان ئەکرد، هاتوچوی تودە یان نەئەکرد. سەرکردەی هەندی لە حیزبەکانی تر وەکو: رشید محسن، صبحی الویس (ابو عروبە) لە قاهیرە بون، جاروبار ئەهاتن بۆ دیمەشق. ئەوەی بە زۆری لەوی دەوامی ئەکرد: جواد الدوش (ابو شوقی) و، عونی قلمچی (ابو عمر) بون.

*

راپورتی پایک

ئوتیس پایک نوینەری نیویورک بو لە کونگریسی ئەمەریکادا. کرا بە سەرۆکی کومیتەیەک بو لیکولینەوە لە جموجولە نهینیەکانی «سیا». لە بەر ئەوە کومیتەکە و راپورتەکەی ئامادەیان کرد بو بە ناوی «پایک» ەوە ناویان دەرکردوە.

ئەم کومیتەیە لە ٣ مەسەلەیان کولی بووەوە یەکیکیان پیوەندی ئەمەریکا و کورد بو. روژی ٧٦/١/٢٩ راپورتەکەیان دا بە کونگریس. چەند نهینییەکیان ئاشکرا کرد بو، بلاوکردنەوەی بو ناوبانگی ئەمەریکا خراپ بو، لە بەر ئەوە سیا و بەریوەبەرایەتی ئەمەریکی، تەنانەت سەروک فورد، هەولیکی زوریان دا بو هیشتنەوەی بە نهینی، بەلام دانەیەکی ئەم راپورتە گەیشتە دەس روژنامەوانەکانی گوڤاری وەدەنگی لادی: ڤیلیج ڤویس» و، لە ٧٦/٢/٢٣ دا بلاوی کردەوە.

ئەم راپورتە میژووی پەیوەندی بارزانی - ئەمەریکا لە سەرەتای دامەزرانییەوە تا کاتی ئاشبەتال ئەگیریتەوە. ئەمەریکییەکان مەسەلەی کوردیان بە «کارتی یاری» ناوبردوە. راپورتەکە ئەیگیریتەوە چون ئەم کارتەیان بە کارهیناوە بو تەنگاو کردنی عیراق، کاتی عیراق دوژمنایەتی ئیرانی شای ئەکرد و، کاتی عیراق دژی لیک جیا کردنەوەی هیزەکانی عەرەب و ئیسرائیل بو، وە چون ئەم کارتەیان لە کار خست بو ئەوەی عیراق دەستی بەتال بی بو دوژمنایەتی سوریا، چونکە سوریا لەو کاتەدا دژی رەوتی ئاشتی بو لە گەل ئیسرائیل.

ئەم راپورتە لە دنیادا دەنگی دایەوە. یەکیتی کاتی خوی دانەیەکی دەس کەوت، وەریگیرایە سەر عەرەبی و، لە «الشرارە» دا وتاریکی لە سەر نوسی. بەلام هەیکەل لە وتارەکانی دا چەند جاری باسی کرد وەکو فونەیەک لە سەر جوری کاری کیسینگەر لە بەریوەبردنی ململانی دا. هەروەها (ل١٣٦ - ١٤١) ی کتیبەکەی : «الحل والحرب» ی بو ئەم باسە تەرخان کردوە و، نوکتە سەرەکییەکانی بە وردی وەرگرتوە.

کاتیک گلەیی لە کیسینگەر کرا لە سەر ئەم رەفتارەی لە گەل کورد وتی: «سەودای ژیربەژیر کاری تەبشیری نییە». مەبەستی ئەوە بو لە پیلانگیران و کاری جاسوسی دا گوی نادریتە بەهاکانی رەوشت و دین.

*

دوای ئەوەی لە هەلبژاردنی گشتی دا لە تورکیا «جمهوریەت خلق پارتی سی» بە رێبەری «بولەند ئەجەویت» هاتە سەر کار، «لیبوردنی گشتی» بو هەمو بەند و هەلاتوە سیاسییەکان دەرکرد. گیراوەکانی کورد بەربون و، ئەوانەی لە دەرەوە بون گەرانەوە تورکیا. جوری لە ئازادی سیاسی لە سەرانسەری تورکیادا بلاو بووەوە. جولانەوەی نەتەوەیی کورد بوژایەوە و، گەشەکردنیکی گەورەی بە خویەوە بینی. نەخشەی سیاسی ناو کوردستانی تورکیا لەو کاتەدا بەمجورە بو:

- کادرەکانی حیزبەکەی د. شڤان سەرلەنوی حیزبەکەیان بە ناوی «پارتی

دیموکراتی کوردستان لە تورکیا» ڕێک خستبوو، بۆ داپۆشینی چالاکی حیزبەکەیان ڕێکخراوێکی قانونییان بە ناوی: «د د ک د» دامەزراند. ئەم ڕێکخراوە لە سەرانسەری کوردستان دا پەرەی سەند و، لقی یانەی قانونیی دامەزراند. عەلی چەتین، ئەحمەد قارلی، نەجمەدین بیوک قەیا، عەلی شیر، عەبدولحافظ، موحەڕەم، سەعید، محەممەد عەلی، زەروک.. لە سەرکردە چالاکەکانیان بون.

ئەم حیزبە، بە قسەی خۆی، پارتی پێشڕەوی مارکسی - لینینی دائەمەزراند و، خۆی ئامادە ئەکرد لە داهاتوودا شۆڕش لە کوردستانی تورکیا بەرپا بکا. لە ناو لاوان و ڕووناکبیرانی چەپی ناوشارەکان دا نفوزی پەیدا کرد بو.

- کادرەکانی حیزبەکەی سەعید ئالچی یش سەر لەنوێ حیزبەکەیان بە ناوی: «پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا» ڕێک خستەوە و، لە ناو ڕووناکبیرانی گوندپارێزی شارەکان و سەرانی عەشائیر دا، نفوزی پەیدا کرد. دەروێش سەعدو و، عەلی دیجلەر لە سەرکردە چالاکەکانیان بون.

- بنکەیەکی بلاوکردنەوە بە ناوی «کومال» دامەزرا و، گوڤاری «ڕزگاری» بە تورکی بلاو ئەکردەوە. ئەم گوڤارەش هەندێ ڕووناکبیر و لاوی لێ کۆبوەوە و، ڕێکخراوێکیان بە ناوی ڕزگاری دامەزراند. مومتاز قوتان و، خەدیجە بەشتاو لە چالاکەکانیان بون.

- بنکەیەکی تری بلاوکردنەوە گوڤاری تورکی «ئۆزگورلک یولو: ڕێگای ئازادی» بلاو کردەوە ئەمیش هەندێ ڕووناکبیر و لاوی شارەکانی لێ کۆبوەوە و، ڕێکخراوێکیان پێک هێنا. دوایی بو بە ناوکی «پارتی سوسیالیستی کوردستانی تورکیا». ئەم ڕێکخراوە زۆر بە توندی لایەنگری یەکێتیی سوڤیت بو. کەماڵ بورقای ڕێبەریان بو.

- چەند کەسێکی تر بنکەیەکی تریان دامەزراند بە ناوی «کاوە». ئەمیش بو بە تاقمێکی سیاسی.

جگە لەم ڕێکخراوە نهێنییە ناقانونییانە، هەمو حیزبە گەورەکانی تورکیا وەکو: «جمهوریەت خەلق پارتی سی» بە ڕێبەری بولەند ئەجەوید. «عەدالەت پارتی سی» بە ڕێبەری سولەیمان دەمیرێل. «میللی سەلامەت پارتی سی» بە ڕێبەری نەجمەدین ئەربەکان. تەنانەت حیزبە نەتەوەییە فاشیستەکەی: «میللیەتچی حەرەکەت پارتی سی» بە ڕێبەری تورکەش، لە کوردستان دا جموجولێکی زۆر و، ئەندام و لایەنگری زۆریان هەبو.

کە یەکێتی دامەزرا، هەوڵێکی زۆری زۆرەزۆری دا بۆ دامەزراندنی پێوەندیی دۆستایەتی لە گەڵ هەمو ئەو ڕێکخراوانە. یەکێتی ڕێکخراوێکی تازە و نەناسراو بو لە

کوردستانی تورکیا. مامجەلال ناسراو بو، ئەویش بە هۆی پروپاگاندەی پارتیەوە ناوی زۆر بە خراپی رۆیشت بو. هەر لە سەرەتاوە هەندی لەم ڕێکخراوانە بە هۆی ناوی مامجەلالەوە لە یەکێتی کەوتنە سڵەمینەوە.

کە ق م دامەزرا، کوردستانی تورکیای کرد بە مەیدانی سەرەکی چالاکیەکانی خۆی و، هەندێ لە بەرپرس و کادرەکانی خۆی ناردە ئەوێ. زۆر بە زویی دوستایەتی خۆی لە گەڵ دوستەکانی تازە کردەوە. حیزبەکەی دەرویشی سەعدو و عەلی دیبلەر وەکو لقی ق م لە تورکیا کەوتە گەڕ. هەمو چالاکیەکانی خۆی تەرخان کرد بو دوژمنایەتی یەکێتی. بە «تایپ و رونیو» بڵاوکراوەیەکی تورکییان بە ناوی: «خەبات» دەرئەکرد، هەمو بابەتەکانی جنێو بو بە مامجەلال و هێرش بو بو سەر یەکێتی. یەکێتی یان بە «جاشی ۷٦» ناو ئەبرد. سەرانی عەشیرەتەکانی سنوریان لە یەکێتی تیژ کرد بو.

د. شڤان، ئەو کاتەی لە ناوچەی زاخۆ ژیا بو، هەندێ وتار و بابەتی لە سەر کوردستانی عێراق نوسی بو، بو ڕازی کردنی بارزانی و پارتی، زۆر بە توندی هێرشی کرد بوە سەر مامجەلال و بە خیانەت تاوانباری کرد بو. لەم ماوەیەدا رزگاری ئەو وتارانەی شڤانی سەرلەنوێ بڵاو کردەوە.

حیزبێکی ماوی لە تورکیا دامەزرا بو، رۆژنامەی «تایەنلک» یان دەر ئەکرد. ئەم رۆژنامەیە زۆر جار وتاری خراپی لە سەر یەکێتی ئەنوسی و، یەکێتی بە نوکەری سۆڤیەت دائەنا. لە وتارەکانی دا جۆرێ لە جاسوسی بو حکومەتی تورکیا ئەکرد. رێگاکانی هاتوچوی کادرەکانی یەکێتی و، شوێنی مانەوەیان و، ناوی دوستەکانی ئاشکرا ئەکرد.

یەکێتی، لە ناو ڕێکخراوەکانی تورکیادا، بە تەنیا لە گەڵ «پ د ک ت - باڵی شڤان» توانی دوستایەتی دابمەزرێنێ. ئەمەش چەند هۆیەکی هەبو:

۱. بارزانی، «د. شڤان»، ڕێبەری حیزبەکەیان و، دو لە کادرەکانی سەرکردایەتی: «بروسک» و «چەکو» ی بە تاوانی کوشتنی «سەعید ئیلچی»، ڕێبەری باڵەکەی تری «پ د ک ت» کوشت بو. بنکەکانی کوردستانی عێراقیان داخست بون. کادر و ئەندامەکانیان توشی گرتن و ڕاو نان و سەرگەردانی بو بون. بەم هۆیەوە حیزبیان لە چارەی بارزانی ئەبو.

۲. لە شەڕەکانی ۷٤ دا بارزانی پشتیوانی سۆڤیەتی و، حیزبە شیوعیەکانی دنیای لە دەس دابو. دوای ئاشبەتالیش پەنای بو تەهران برد بو، دوایەش چو بوە ئەمەریکا. بارزانی بە کۆنەپەرست و دوستی ئەمەریکا ناسرا بو، لە کاتێک دا یەکێتی بە چەپ و دوستی سۆڤیەت.

۳. یەکێتی بارمەتی زۆری ئەم حیزبەی ئەدا. ژمارەیەکی زۆر چەکی دایە.

چەردەیەک پارەی بۆ ژیانی کادرەکانی و چالاکی حیزبەکەیان تەرخان کرد بوو. بە ڕێکخراوە فەلەستینییەکانی ناساند، کە ئەوسا لە لای جوولانەوەکانی چەپی تورکیا وەکو قیبلەی موسوڵمانەکان سەیر ئەکران.

د د ک د کە چەتری قانونیی ئەم حیزبە بوو زوو بە خێرایی پەرەی سەند، بەڵام لە ناو گوندەکان و، سەرانی عەشیرەتەکان دا دەسەڵات و نفوزێکی ئەوتۆی نەبوو، بە تایبەتی لەو ناوچانەدا کە یەکێتی پەیوەستی پێ ی هەبوو.

د د ک د زۆری پێ ناخۆش بوو یەکێتی لە گەڵ هیچ ڕێکخراوێکی تر و هیچ لایەن و کەسایەتییەکی تر پەیوەندی دابمەزرێنێ، بەڵکو هەندێ جار هەڕەشەیان ئەکرد کە ئەگەر یەکێتی کاری وا بکا، ئەوا ئەوان «دانوستان» ی خۆیان لە گەڵ یەکێتی «قوت» ئەکەن!

لە گەڵ ئەوەش دا هەوڵی زۆر درا بۆ ئەوەی لە گەڵ هەموویان پەیوەندی باش دابمەزرێنێ، تەنانەت دەروێشی سەعدو «دەعوەت» کرا بۆ سوریا و، زۆری قسە لە گەڵ کرا بێ سود بوو. لە گەڵ کەمال بورقای کە ئەو زەمانە لە ئەنقەرە بوو پەیوەندیمان کرد. منیش لە گەڕانەوەم دا چووم بۆ لای و، مامە جەلالیش لە گەڕانەوەی دا سەردانی کرد. «پارتی سوسیالیست» ئەوسا لاواز بوو، لە ناو دێهات دا نفوزی نەبوو.

لە ناو یەکێتی دا ئێمە لامان وابوو:

١. گرنگیی کوردستانی تورکیا بۆ کورد وەکو گرنگیی میصر وایە بۆ عەرەب.

٢. ئەو هەڵسانەوەیەی لە کوردستانی تورکیا دەستی پێ کردوە ئەبێ پشتیوانی بێ قەیدوشەرت بکرێ بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ئەوەی ئەوان هەڵوێستیان لە یەکێتی چییە و چۆنە.

٣. ئەبێ جوولانەوەی سیاسی کوردستانی تورکیا بە بێ دەستێوەردان و کوێخایەتی گەشە بکات.

لە بەر ئەوە بە هیچ جۆرێ یەکێتی خۆی لە کاروباری سیاسی کوردستانی تورکیا هەڵنەشڵەقاند. تەنانەت دژایەتی ئەوحیزبانەشی نەئەکرد کە دژایەتی یەکێتیان ئەکرد و، ئامادە بوو یارمەتییان پێشکەش بکا.

*

کاری فیکری

بۆ یەکێتی کاری ڕاگەیاندن و فیکری شتێکی گرنگ بوو چونکە ڕێکخراوێکی تازە دامەزراو بوو، ڕابردوی دوور و ناسراوی نەبوو، جەماوەری خۆی هەبێ لێ ی کۆ بێتەوە. ئەوەی

ئەندامانی یەکێتی بە یەکەوە ئەبەستەوە: کوردایەتی، بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازی، هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، بەدیهێنانی ئامانجەکانی گەلی کورد بوو... ئەمانە بیری بەرز و پاک بوون، تێکۆشەرانی کورد خۆیان لە پێناودا بەخت ئەکرد.

یەکەمین بەیاننامەی یەکێتی، ئەوەبوو بە بۆنەی دامەزراندنی یەکێتییەوە لە ۷۵/٥/۲۲ دا لە شام و، لە ۷۵/٦/۱ دا لە ئەورووپا بڵاو کرایەوە. ئەم بەیانە لە رادیۆی دیمەشقەوە خوێندرا بووەوە. لە کوردستان دا بە چاکی دەنگی دا بووەوە. پێش ئەوەی هیچ ئەندام و کادری لە کوردستان کار بۆ دروستکردنی رێکخستنی یەکێتی بکات، ئەم بەیانە دۆست و لایەنگری بۆ پەیدا کرد بوو. بەیانەکە مامجەلال بە عەرەبی نوسی بوی. وەرگێڕدرایە سەر چەند زمانێکی تر: عومەر شێخموس کردی بە ئینگلیزی و کەمال فوئاد بە ئەڵمانی و، حەسەنی قازی بە فارسی. بە هەزاران دانەی لێ بڵاو کرایەوە.

بە دوای ئەمەدا نامیلکەیەک لە ژێر سەرناوی «الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟!» بڵاو کرایەوە. ئەم نامیلکەیەش مامجەلال بە عەرەبی نوسی بوی. ئارام لە کوردستان کردی بە کوردی. پارتی تا ئێستاش وا ئیدیعا ئەکا کە یەکێتی بۆ لە ناو بردنی پارتی دامەزراوە و، ئەم نامیلکەیە ئەکات بە بەڵگە. گوایە لەم نامیلکەیەدا نوسراوە: «ناکۆکی سەرەکی یەکێتی لە گەڵ پارتییە و، پارتی دوژمنی سەرەکی یەکێتی و کوردە!». ڕاستییەکەی ئەوە واهیمەی سەرانی پارتییە ئەگینا شتی وا لەم نامیلکەیەدا نییە. یەکێتی توشی دوژمنایەتی و، ناکۆکی خوێناوی بوو لە گەڵ پارتی، بەڵام هەرگیز پارتی بە ناکۆکی سەرەکی و دوژمنی سەرەکی نەزانیوە، هەمیشە رژێمی بەعسی بە دوژمنی سەرەکی خۆی و کورد داناوە. من ئەمەم لە وتارێک دا لە ژێر سەرناوی: «باری ئێستای گەلەکەمان و ڕێکخستنی ی ن ک» دا لە یەکەمین ژمارەی «ڕێبازی نوێ» دا ڕوون کردوەتەوە.

پێویست بو یەکێتی ئۆرگان، یان وەکو ئەڵێن: «زمان حال» ی هەبێ، بۆ ئەوەی بیروبۆچونەکانی بە خەڵک بناسێنی و، هەڵوێستی خۆی لە ڕووداوەکان دیاری بکا. بڕیار درا بە عەرەبی «الشرارە» و بە کوردی «ڕێبازی نوێ» بڵاو بکرێتەوە.

یەکەم ژمارەی «الشرارە» لە تشرینی دوەمی ۱۹۷٥ دا دەر چو.

وتارەکانی ژمارەی یەکەم بریتی بو لە:

- هذه الجريدة
- نداء الى الامه العربيه المجيده
- حمله الاعدامات الجماعيه مستمره في العراق
- من اجل جمعيه كردستانيه تقدميه للطلبه الاكراد في اوروبا

- المراه الكرديه تواصل نضالها
- من الذى اقترح ميثاق امن الخليج
ئەم هەوال و کورتە تەعلیقانەشی تی دا بو:
- التجمع الوطنى يبارك الاتحاد الوطنى الكردستانى
- لماذا لا تذكر الصحافه العراقيه اسم القوات الايرانيه الغازيه فى الخليج
- على طريق اتفاقيه اذار الخيانيه: اعتراف الدكتاتوريه العراقيه بحكم السلطان قابوس
- حقيقه صارخه: حكم ذاتى كارتونى على الطريقه التكريتيه
- اليس السكوت عن جرائم التشريد والتهجير الجماعيه بحق الشعب الكردى خيانه وطنيه ايها الساده المسؤلون الاكراد؟
- الاتحاد الوطنى الكردستانى يشكر التجمع الوطنى العراقى

هەروەها «البيان الاول للاتحاد الوطنى الكردستانى» و «بيان اتحاد الشبيبه الديمقراطى الكردستانى واتحاد طلبه كردستان: النصر لشعبنا العراقى والاندحار للفاشيه وتحالفاتها الرجعيه» لەم ژمارەیەدا دوبارە بلاو کراوەتەوە. بە خوێندەوارانیشی راگەیاند بو کە بەو نزیکانە «ریبازی نوێ» بە کوردی بلاو ئەبێتەوە.

زوری وتارەکانی مامجەلال نوسی بوی. لە چاپخانەکەی «القیادە القومیە» لە شام چاپ کرا.

دوەم ژمارەی «الشراره» لە کانونی دوەمی ١٩٧٦ دا بلاو کرایەوە.

وتارەکانی ژمارەی دوەم بریتی بو لە:
- عام جديد من النضال والفداء
- الاستقلاليه والاعتماد على الجماهير الشعبيه سبيلنا لتخليص القضيه الكرديه من اللعبه الدوليه
- التهجير الجماعى مظهر واضح للعنصريه الفاشيه
- واقع الحقوق الثقافيه للشعب الكردى فى العراق
- اسس الحكم فى العراق
- لماذا التراجع؟

زوری وتارەکانی ئەم ژمارەیەش مامجەلال نوسی بوی.

ئەمانویست «ریبازی نوێ» دەر بکەین. ئەمە دو کوسپی لە بەردەم دا بو: یەکەمیان، هونەری بو. لە شام هیچ چاپخانەیەکی لی نەبو پیتی کوردی هەبی تا

رۆژنامەکەی لێ چاپ بکەین. دوەمیان، سیاسی بو، بو چاپی رۆژنامەیەکی وا لە چاپخانەیەکی ئەھلی دا ئەبو موافەقەتی چەند داوودەزگای حکومەتی وەربگیری. تا ئەوسا لە سوریا نوسینی کوردی چاپ نەکرا بو.

بریارمان دا رۆژنامەکە لە لوبنان چاپ بکەین. عارفی شیخ کەریم مسودەکانی لە گەل خوی برد و لە بیروت چاپی کرد و هینایەوە.

ژمارەی یەکەمی «ریبازی نوی» لە کانونی دوەمی ١٩٧٦ دا بلاو کرایەوە. وتارەکانی بریتی بون لە:

- سەروتار
- چەپای لالش بە شوڤینیەکان ناگوێزرێتەوە
- ریکەوتنی صەدام و شا لە جەزایر و مەسەلەی هاوچارەنوسیی نەتەوەی کورد
- باری ئیستای گەلەکەمان و ریکخستنی ی ن ک

جگە لە سەروتارەکەی کە مامجەلال نوسیبوتی، وتارەکانی تری هەموی من نوسی بوم. دوای چەند حەفتەیەک ژمارەی دوەمیشمان چاپ کرد. ئەم ژمارەیەیان لە شام چاپ کرا. ئەویش سەروتارەکەی مامجەلال و ئەوی تری من نوسیبومە.

جگە لە هەردو ئورگان، چەند بەیان و نامیلکەیەکیش بلاو کرایەوە. لەوانە بەیانیک بە عەرەبی بە بونەی چواردەهەمین یادی هەلگیرسانی شورشی ئەیلولەوە و، نامیلکەیەک بە ناونیشانی «باری ئیستای خەباتمان». ئەمە راپورتیکە مامجەلال لە کوبونەوەیەکی «دەستەی دامەزرینەر» دا خویندبیەوە. پاش هەلسەنگاندن و هەندی ئالوگوری کەم بلاو کرایەوە.

«ریبازی نوی» لە ئەوروپا باش بلاو نەکرایەوە، بەلام زور بە کەمی و زور بە زەحمەت نەگەیشتە کوردستان. منیش خەریکی ئامادە کردنی خوم و پیشمەرگەکان بوم بو گەرانەوە بو کوردستان. کاتیکی ئەوتوم نەمابو بو ریبازی نوی. رۆژنامەکە وەستا. تا دوای سەرکەوتنی شورشی ئیران، لە کوردستان دەزگای راگەیاندن سەرلەنوی دەستی کرد بە بلاوکردنەوەی.

«الشرارە» هەر بەردەوام بو لە دەرچون. دەرچونی بلاوکراوەیەکی عەرەبی زور پیویست بو، بو گەیاندنی بیروبوچونەکانی یەکیتی بە دنیای عەرەب. زوری وتارەکانی الشرارە مامجەلال ئەینوسی و د. فوئاد مەعصوم سەرپەرشتی چاپەکەی ئەکرد. منیش چەند وتاریکم بو نوسی. هەندیکیان بە عەرەبی و، هەندیکیشیان بە کوردی د. فوئاد کردونی بە عەرەبی. دوای گەرانەوەی مامجەلال بو کوردستان ئەویش راوەستا، ئەویش دوای سەرکەوتنی شورشی ئیران لە کوردستان دیسان بلاو کرایەوە.

*

هەرکەس بڵاوکراوەکانی یەکێتی بخوێنێتەوە ئەبینێ توندڕەوی زاڵە بە سەری دا. ناوی «الشرارە» لە ناوی ئۆرگانەکەی لینین و، قسە نەستەقەکەی ژێریشی: «ومن الشرارة ينطلع اللهيب» لە ماوتسی تونگ وەرگیرا بو. ناوەڕۆکی باسەکانیش پڕن لە بابەتی دوژمنایەتی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و سەهیونیزم... ئەمەش نابێ بە دابڕاوی لە ڕووداوەکانی ئەو زەمانە سەیری بکرێ.

یەکەم، بە هۆی کارەساتەکەی جەزائیرەوە، ڕەدفعلێکی بەهێز دژی ئەمەریکا و ئێران لە لای هەموو کورد دروست بوبو. هەموو کەس ئەم دوهێزەیان بە پیلانگێر و دوژمنی کورد دائەنا.

دووەم، ئەمەش: خۆمان پێشینەی فیکریمان مارکسی و چەپ بو. بەسترا بوینەوە بە کۆمەڵەوە. هەندێ لەو بۆچونانە «قەناعەتی فیکری» بون لە لامان. بیری چەپ ئەوەندە برەوی هەبو، تاڵەبی وەکو قەڵەم پێش بون بە مارکسی. لەم ڕووەوە لە «طريق الحركة التحررية الكردية» دا نوسی بویان: «اخيرا وليس اخرا نعتمد في وضع سياستنا الجديدة على الدراسة العلمية في ضوء الماركسية اللينينية لوضع الشعب الكردي المضطهد والامة الكردية المجزاة والشعب العراقي المقهد وطبيعة السلطة الفاشية...»

*

بیرمان لەوە کرد بووە بۆ ئەوەی ئازادی زیاترمان هەبێ و، کەمتر پەیوەستیمان بە سوریا بێ، بنکەیەک لە لوبنان دابمەزرێنین. لوبنان لاوازترین وڵاتی عەرەبی بو، تا ڕادەیەکیش دیموکراسی و، ئازادی بیر و کاری سیاسی تێ دا بو. ڕێکخراوە فەلەستینیەکان لاوازی لوبنانیان بە هەل زانی بارەگا و بنکە و لەشکر و جبەخانەکانیان لەوێ کۆ کردەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی سوریا و میصر ڕێگای چالاکی فیدائیان نەئەدان و، ئوردونیش لە «ئەیلولی ڕەش» دا بە شەڕ دەری کرد بون.

مامجەلال نێوانی لە گەڵ سەرانی فەلەستینی خۆش بو. دوستایەتی لە گەڵ عەرەفات و، جورج حەبەش و، نایف حەواتمە هەبو. لەو ڕێگایەوە یەکێتی بش پەیوەندی لە گەڵ دامەزراند بون. بەڵێنیان دابو یارمەتی یەکێتی بدەن بە: چەک و، مەشق پێ کردنی کادر و پێشمەرگەکانی. ئامادەش بون یارمەتی یەکێتی بدەن بنکەی پێشمەرگایەتی لە لوبنان دابمەزرێنێ.

شەڕی ناوخۆ لە لوبنان تا ئەهات گەرمتر ئەبو. وازمان لە بیری کردنەوەی بنکەی پێشمەرگایەتی هێنا. هەموو لایەنەکان، هەر یەکەیان بە جۆرێ، لە شەڕەوە گلا بون.

ترسایین ئیمەش، بی ئەوەی هیچ قازانجێکی گەلەکەمان لەو شەڕەدا هەبی، تیوە بگلێین.
بو یەکەمین جار من سالی ۱۹۷۰ بە دەم ریگاوە بو قاهیرە سەردانێکی چەند روژەی بیروتم کرد بو. ئەمجارەیان لە دیمەشقەوە چەند جاری بو گەڕان و سەیران و کتێب سەردانی لوبنانم کردەوە. شەری ناوخو لوبنانی ئەجاری و، ئەو ولاتە خوشەی سەردەمێک لە چاو هەمو ناوچەکانی روژهەلاتی ناوەراستدا ئەمینترین مەلبەند و، ناوەندی روژنامەوانی و، بازرگانی و، توریزم و، لەونەی ئازادی سیاسی و فیکری بو، بو بو بە ئوردوگایەکی گەورەی دوژمنایەتی و مەرگ. دەیان هەزار لوبنانی لە تاو شەری ناوخو هەلات بون بو سوریا.

*

لیبیەکان پەلیدنیان بە مامجەلال دابو، بەردەوام یارمەتی یەکیتی بدەن بە: پارە و چەک. ئەودەم هیشتا خەباتی چەکدار لە کوردستان دەستی پی نەکرد بووەوە. لیبیەکان مانگانە چەردەیەک پارەیان بو یارمەتیدانی بارەگا و کادر و پیشمەرگەکانی یەکیتی لە سوریا تەرخان کرد بو. هەمو مانگی پارەکەیان ئەناردە سەر حسابیک لە لوبنان. مامجەلال باوەریکی بەهیزی بە مونزیر نەقشبەندی هەبو، چەند جاری ئەوی نارد بو وەرگرتن و هینانەوەی بو سوریا.
لیبیەکان کاتی خوی بەو شەرتە یارمەتی یەکیتیان ئەدا عیراق پی نەزانی. کەچی پاش ماوەیەکی کەم عیراق پەمەی زانی، لیبیەکان بە گلەیی و توڕەبونەوە وت بویان: عیراق ژمارەی «چەکەکانی بانک» یشی زانی بو. لە سەر ئەمە یارمەتیدانی لیبی ماوەیەک راگیرا و، کوسپی تی کەوت.
کەس گومانی لە مونزیر نەئەکرد. مونزیر وریا و چالاک و گەرموگور بو. سوریەکان پوستەیەکی سفارەتی عیراقیان لە فروکەخانەی بیروت گرت، لە ناو «هەمانەی دیپلوماسی» دا بو بەغدایان ئەنارد. لە ناو هەمانەکەدا هەندی راپورتی تی دا بو لە سەر چالاکیەکانی موعارەضە لە سوریا. وەکو لیکولینەوە دەری خست مونزیر نوسی بونی. مونزیر بە نهینی لە گەل موخابەراتی عیراق پەیوەندی هەبو، هەر ئەویش مەسەلەی یارمەتی لیبیای بو موخابەراتی عیراقی ئاشکرا کرد بو.

*

لە کونەوە لە شام «چالیە» یەکی کوردی لی یە. ئەمانە بە یەک جار و لە یەک سەردەم دا نەچونەتە شام. بەلکو پچر پچر و لە زەمانی جیاجیادا کوچیان کردوە بو ئەوی. هەندی لە کوردەکان هیشتا پاریزگاری رەچەلەکی خویان کردوە و، هەندیکی تریشی لە

ناو کۆمەڵی شامی دا تواونەتەوە. ئەو کاتەی ئێمە لە شام بووین دەیان هەزار کورد لە جەزیرە و ناوچەکانی ترەوە بۆ کرێکاری هات بوون بۆ شام.

پاش تێشکانی شۆرشەکانی کورد لە تورکیا پۆلێک لە روشنبیرەکانی پەریوەی سوریا بون. لە شام و ناوچەی جزیرە جێگیر بون. حیزبی «خۆیبون» یان پێک هێنا و، یەکێ لە سەلبەندەکانی چالاکییان حەسەکە بو. کە شۆرشی ئاگری داغ هەڵگیرسا، ئەو ئەمانیش لە ناوچەکانی سەروەک، ماردین، جزیرە... دەس یکەن بە چالاکی چەکدار. ئەو دەستەیەکان پێیان زانین و، لە سنور دوریان خستنەوە. جەلادەت بەدرخان، دوای ئەوەی لە کاری سیاسی - حیزبی کنارەگیری کرد، خۆی بۆ زمان و ئەدەب تەرخان کرد. لە سەرەتای سییەکانەوە دەستی کرد بە بلاوکردنەوەی گۆڤاری کرمانجی - فەرەنسی «هاوار» و، چەندین نامیلکە و کتێبی دەربارەی زمان و ئەدەبی کورد بلاو کردەوە. لە چلەکان دا بە هاوکاری کامەرانی برای و، چەند کەسێکی تر «ستێر» و «روژانو» یان بلاو کردوتەوە. دەستەیەکی باش نوسەر و شاعیری کورد پێ گەیشتن، لەوانە: عوسمان صەبری، قەدری جان، جگەرخوێن، رەشید کورد. نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، دوای سەربەخۆیی سوریا، ئەم مافەیان بە کورد رەوا نەدی. نەیانهێشت هیچ نوسینێکی کوردی بلاو ببێتەوە و، چالاکی روشنبیری، سیاسی، کۆمەلایەتییان لێ قەدەغە کردن.

جولانەوەیەکی سیاسی ئەوتو لە ناو کوردەکانی سوریادا نەما تا سالی ١٩٥٦ کە «پارتی دیموکراتی کورد» دامەزرا. ئەویش دوای «وحدە» ی سوریا لە گەڵ میصر کەوتە بەر هێرش و پەلامار و، دوایەکەیش پارچە پارچە بو.

چەند گەورەپیاوێکی کورد لە شام نێژراون، لەوانە: صەلاحەدینی ئەییوبی، مەولانا خالیدی شارەزوری، بەدرخان بەگی میری بوتان... لە یەکەمین سەفەرم دا بۆ شام لە گەڵ د. کەمال فوئاد، سەردانی گۆری صەلاحەدینم لە نزیک «جامع الاموی» و گۆری مەولانا خالیدم لە «قاسیون» کرد. گۆری بەدرخان بەگمان بۆ نەدۆزرایەوە. لە زۆر کەسیشمان پرسی پێ یان نەئەزانی.

*

ئەجو سەردانی زۆر لە کوردە ناودارەکانی شامی ئەکرد. هەندێ لە مانە لە تورکیا لە دایک بوبون و هەر لەوێش خوێند بویان و گەورە بوبون، بەلام بە هۆی تێشکانی شۆرشەکانی کوردەوە پەریوەی سوریا و، جێگیر بوبون. ئەوانە هەرچەندە پەیوەندییەکی ئەوتویان بە کوردستانی تورکیا و رێکخراوەکانی و، تەنانەت بە بنەماڵە و خێزانەکانیشیانەوە نەما بو، بەلام ناسنامەیا «حنین» یکی قولیان بۆ کوردستانی تورکیا

هەر مابوو. بە پەرۆشەوە تەعقیبی هەواڵەکانیان ئەکرد و، بە خۆشییەوە لە بزاوتنەوەی جوولانەوەی کوردیان ئەڕوانی. ڕێزێکی تایبەتییان لە ئەجو ئەنا.

جاریکیان ئەجو لە گەڵ خۆی بردمی بۆ سەردانی مەمدوح سەلیم بەگ لە ماڵەکەی خۆی دا. مەمدوح بەگ لە تێکۆشەرەکانی بیستەکانی ئەم سەدەیە بوو. لە پێش یەکەمین جەنگی جیهانییەوە بەشداریی لە چالاکی سیاسی و ڕۆژنامەوانی و کۆمەڵایەتی کوردا کرد بوو. دوای جەنگ یەکێ بوو لە چالاکەکانی جوولانەوەی کورد. لە گەڵ چەند هاوڕێیەکی «پارتی دیموکراتی کورد»یان دامەزراندووە. چەندین یادداشتیان دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد داوە بە نوێنەرانی هاوپەیمانەکان و، خۆیان گفتوگۆیان لە گەڵ کردوون. گۆڤاری، دواییتر جەریدەی، تورکی - کوردی «ژین»ی بە هاوکاری لە گەڵ حەمزە مەکسی لە ئەستەمبوڵ بڵاو کردووەتەوە. دوای هاتنی مستەفا کەمال، ئەمیش وەکو تێکۆشەرەکانی تری کورد دەربەدەر بوو. سەرئەنجام لە سووریا گیرسا بووەوە. لە دامەزراندنی «خۆیبوون»دا هاوبەش بووە.

ئەوکاتەی لە گەڵ ئەجو چووین بۆ لای، مەمدوح بەگ پیر بووبوو. بەڵام هێشتا قسەکانی ڕێکوپێک بوون. وێنەیەکی سوڵتان عەبدولحەمیدی لە ژوورەکەدا هەڵواسی بوو. درەنگ ژنی هێنا بوو، هاوسەرەکەی کورد نەبوو، منالیشی نەبوو.

مەمدوح بەگ جگە لەوەی ڕێزێکی زۆری ئەجوی گرت کۆمەڵێ چاپکراوی بە نرخی بە دیاری پێشکەش کرد، لەوانە هەندێ لە ژمارەکانی «ژین» و «کوردستان» و «هاوار» و «ڕۆژانو» و چەند بەرگێک لە کتێبە مێژووییەکانی سەردەمی عوسمانی. یەکێ سەیر بوو، مەسعود محەممەد بە ناوی «کۆڕی زانیاری کورد»ەوە، هەڵکەوت هەڵکەوت چوو بۆ شام بۆ سەردانی مەمدوح بەگ و چەند کەسێکی تر، کەچی هیچی لەمانە تەنانەت فۆتۆکۆپییەکانیشی نەداوییە.

*

ی ن ک لە کاتی دامەزراندنی دا سووریای کرد بە بنکەی سەرکردایەتی و شوێنی خۆڕێکخستن و، مەشق پێ کردنی هەندێ لە کادر و پێشمەرگەکانی و، چاپ و بڵاو کردنەوەی ئۆرگان و بەیاننامەکانی. ڕاستییەکەی ئەگەر دامەزراندنی یەکێتی و، هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش دوای ئاشبەتاڵ، بە سەروەرییەکی گەورە لە مێژووی کوردا حساب بکری، ئەبێ لەم سەروەرییەدا کورد بە ڕێز لێ نانەوە چاکەی سووریا، بە تایبەتی هی سەرۆک حافظ ئەسەدی، لە بەر چاو بێ.

لە ڕۆژانی ئاشبەتاڵ دا ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەکانی خەڵکی شنگار،

تەلەعفەر، زەمار، زاخۆ کە سەر بە عەشیرەتەکانی کوچەر، میران، گەرگەری، سندی، گولی، تەی، باتوا، بەزیدی و لە هێزەکانی تەلەعفەر، سنجار و، زاخۆ بون ... هات بونە ناو سوریاوە. زوربیان خزم و ناسیاوی خۆیان لە ناو کوردەکانی سوریادا هەبو. کاربەدەستانی سوریش کارئاسانییان بۆ کرد بون و ڕێگەیان لێ نەگرت بون. بەکیەتی هەندێ لە کادرەکانی خۆی تەرخان کرد بۆ سازدان و ڕێکخستنەوەیان. بە زۆری لە گوندەکانی قامیشلی و دیرکی و حەسەکە نیشتەجێ بون.

ئەم ناوچەیە هاوسنور بو لە گەڵ عیراق و تورکیا. لەوێ وە ئەتوانرا دزە بکرێ بۆ زاخۆ و شەنگار و گوندەکانی ناوچەکە. هەروەها ئەتوانرا دزە بکرێ بۆ ناو تورکیا و لەوێوە دزە بکرێ بۆ ناو کوردستانی عیراق.

کاربەدەستانی عیراق هەر لە ڕوداوەکانی سالی ٧٤ و لە کاتی شەڕەکانی ٧٤ دا و دوای هەرەسی جولانەوەکەش ناوچەکەی تەعجیر و تەعریب کرد بو. گوندەکانی سنوری هەمو ڕاگوێزرا بو. زورایەتی کوردەکانی شەنگار و دەوروبەری ڕاگوێزرا بو بۆ نوردوگای زورەملی و شارەکانی تر. «ڕیبە» ی زوری لە سەر سنور دانا بو. ڕێگا و شوێنە گرنگەکانی بە مین چاند بو. چەپای بەعسی زور بە توندی گرت بو. هێزێکی زوری جەیشی لە ناوچەکەدا بلاو کرد بوەوە.

ی ن ک لە چوارچێوەی ئەو پلانە گشتیەدا کە دای نا بو، بۆ دروست کردنی مەفرەزەی بچوکی بلاوی بە چەندایەتی کەم و بە چونایەتی باش، لە سوریاش خەریکی سازدان و ڕێکخستنی هەندێ مەفرەزە بو. ئەو کورنە پێشمەرگانەی ئامادە بون بینەوە بە پێشمەرگە زوری ڕێکخستنەوە، هەندێ دەورەی تەدریبی لە مەعەسکەرەکانی شام بۆ کردنەوە، لە چەند مەفرەزەیەک دا ڕێکی خست بون. لایەنگرانی بنەمالەی بارزانی کە دوایی تر بە ناوی قیادەی موەققەتەوە کەوتنە کار کردن، زور بە توندی کەوتنە دوژمنایەتی ی ن ک. هەولیان ئەدا خەلکیان لێ بەدگومان بکەن و پێشمەرگە و لایەنگرەکانیان لێ هەلبگێرنەوە، لە ناو خەلک دا پروپاگاندەی خراپیان دژی یەنک و سەرکردە و کادرەکانیان بلاو ئەکردەوە. تەنانەت هەندێ کەسیان خزا بونە دەزگا ئەمنیەکانی سوریا و تورکیاوە بۆ پاراستنی خۆیان و ئازار دانی لایەنگرانی یەنک و بەدگومان کردنی ئەو دەزگایانە لە چالاکیەکانیان.

لەگەل هەمو ئەوانەدا ڕوژبەروژ ڕێکخستنی یەنک پەرەی ئەسەند و لایەنگری زورتر ئەبون. لە ناو کوردستانیش دا دائەمەزرا.

*

ستراتیجی صەددام حسین لە کوردستان دا

بەعس، راگوێزانی کوردی کرد بۆ بە یەکێ لە پایە سەرەکییەکانی ستراتیجی کوردیی خۆی. دوای ئاشبەتاڵ بە پەلە کەوتنە جێبەجێ کردنی. ئەمەیان لای رۆژنامەوانەکانی بیگانەش نەشاردەوە. طارق عزیز چەند جارێ بە ئاشکرا باسی ئەمەی بۆ ئەکردن و کەلکەکانی راگوێزانی بۆ ئەژماردن.

صەددام حسین، لە کۆبوونەوەیەک دا لە ۲۱ ی ئابی ۱۹۷٦ دا لە کۆشکی «المجلس الوطني» لە گەڵ ئەندامانی «اللجنه العليا للجبهه الوطنيه والقوميه التقدميه وسكرتاريه الجبهه وكل لجان الجبهه في المحافظات»، ستراتیجی خۆی بەرامبەر بە کورد روون کردەوە و، بە راشکاوی و بی پێچوپەنا مەسەلەی راگوێزانی ناوچەکانی سنووری بە قولایی ۲۰ کیلۆمەتر و، بلاو کردنەوەی جەیشی لە کوردستان دا باس کرد. لەم وتارەدا وتی:

«ولقد قلت في اجتماع المجلس التشريعي لمنطقة الحكم الذاتي: عندما تكون هناك استحالتان: استحالة مادية و استحالة ذهنية وروحية، استحالة مادية تمنع الانفصال، واستحالة ذهنية وروحية في الوجدان وفي العقل وفي الايمان من قبل الغالبية العظمى من ابناء شعبنا الكردي ومن قبل كل العراقيين، عندها لا يمكن ان يحصل ما يسيء الى وحدة شعبنا وارضنا. الا ان عدم ضبط الموازنة، وحصول ميل لحساب اي من العاملين اللذين اشرنا اليهما على حساب العامل الاخر، باي ظرف وفي اي عمل، سيلحق بمسيرتنا اضرارا فادحة، وعلى هذا الاساس، اذا ما تصور اي منا انه اذا عمل على خلق الاستحالة المادية وحدها متصورا انه سيخلق وحدة المصير داخل الشعب العراقي، فان حكمه سيكون خاسرا بالتاكيد، لان هذا ليس هو الركن الوحيد الذي يستند عليه عملنا وسياساتنا، وعندما ننظر الى المسالة نظرة غير عملية وغير موضوعية وغير سياسية ونتصور ان المسالة تحل ضمن الحكم المبدئي والعقلي المجرد دون ان نعمل على خلق الركائز المادية والموضوعية لجعل الانفصال عملية مستحيلة، نكون بذلك قد اعطينا الفرصة الواسعة للاستعمار لان يعبث بوحدة شعبنا....

يجب ان تكون القوى المضادة، ومن بينها القوى الراغبة في الانفصال، والساعية اليه امام استحالتين: استحالة ذهنية ووجدانية، بمعنى ان يؤمن شعبنا في كردستان بان مصيره مرتبط نهائيا بوحدة تراب العراق ووحدة شعبه، ويقتنع به قناعة عقلية ويربط كل اهدافه واماله في هذا الاطار، واستحالة مادية موازية لها توجدها التدابير القانونية والسياسية والاقتصادية وحتى العسكرية التي تتخذها الدولة والتوازن بين هذا وذاك يجب ان تحكمه المبادئ. ان ايا من الاستحالتين وحدها، لا يمكن ان يلغي دور العمل المضاد في منطقة

كردستان للحكم الذاتي. ان من يتصور بانه من خلال التعامل بالمبادئ المجردة فقط يلغي فرص العمل المضاد في كردستان، لا يمكن بتصوره هذا ان يخدم وحدة العراق بل انه يقود شعبنا الى نتائج منحرفة. كما ان التصور الذي ينطلق من ان الاجراءات السياسية والعسكرية والاقتصادية وما يماثلها تلغي وحدها فرص العمل المضاد وتلغي نزعة الانفصال، فان هذا التصور منحرف ايضا لان هذا الجانب وحده لا يمكن ان يلغي هذه الفرص.. ان ما يلغي فرص العمل المضاد هو المبادئ والتدابير المتصلة بالمبادئ التي تجعل شعبنا في منطقة الحكم الذاتي يؤمن بان الناس والقيادة في بغداد، انما هم جزء منه، وانهم يسعون من اجله، ويريدون له الخير، ويعملون من اجل قضيته القومية كما يعمل هو، اضافة الى ذلك، لابد من استكمال بعض المستلزمات الاخرى مثل ضبط الحدود، والترحيل من الحدود بعمق عشرين كيلومتر، لكي لا يحدث تسلل، وايجاد اجهزة لتقصي المعلومات والنزعات الشريرة، وابقاء جيش في المنطقة وتوزيعه على شكل معسكرات معينة وشق الطرق في الجبال..الخ»

راگویزان کاری بو کە مەترسییەکی گەورەی بو سەر پاشەڕوژی کورد دروست نەکرد.

*

لە کوبونەوەیەکی دەستەی دامەزرینەردا لە شام باسی دارشتنی پروگرام و پەیرەوی ناوخوی یەکیتی کرا. جگە لە عومەر شیخموس هەمو ئەندامەکان بەشدار بون لە باسەکانی دا. بابەتە سەرەکییەکانی دیاری کرا و، دارشتنەوەی بە کوردی بە من سپیردرا. بیگومان پروگرام و پەیرەوی ناوخو گرنگییەکی گەورەیان هەیە، پروگرام: ریبازی سیاسی ریکخراوەکە بو چارەسەرکردنی کیشەکانی کومەل و، پەیرەوی ناوخو: ژیانی ناو ریکخراوەکە ریک ئەخات. لیرەدا سەر لە نوی ئەیان نوسمەوە:

بەرنامە

یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان خەبات ئەکات بو:

یەکەم - عیراقی دیموکرات

أ. رزگار کردنی عیراق لە کوت و زنجیر و پەیوەندییەکانی کولونیالیزمی نوی و لە ریژیمی دیکتاتوری دوژمن بە گەل و هینانە سەر کاری حکومەتیکی دیموکراتی ئینتیلافی لە نوینەرانی پارتییە سیاسییە پیشکەوتوەکان و چینەکانی گەل و نەتەوە سەرەکی و بچوکەکانی عیراق، تا ولات لە ماوەیەکی کورت دا بگوازیتەوە ژیانیکی ئاسایی دیموکرات، کە هەمو سەربەستییە دیموکراتییەکان بو گەل دابین بکا: سەربەستیی

هەڵبژاردن، نووسین، فەرهەنگ، دامەزراندنی پارتی، نەقابە، کۆمەڵەی جوتیاران، ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی لاوان، قوتابیان، مامۆستایان، ئافرەتان، مافی کۆبونەوە، خۆپیشاندان و مانگرتن.

ب. پێکهێنانی ئەنجومەنێکی نیشتمانی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازاد و ڕاستەوخۆ و نهێنییەوە لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکی عێراقەوە، بۆ دانانی دەستووری وڵات و دارشتنی بناغەی حوکمی دیموکراتی و سەلماندنی ئۆتۆنۆمی.

ج. بەشدار بونی کورد و نەتەوە بچوکەکان لە ئۆرگانە ناوەندییەکان دا بە پێ ی ژمارەیان.

د. گەڕاندنەوەی دانیشتوانی ئەسڵیی ئەو ناوچانەی لە شوێنەکانی خۆیان بە زۆر دەرکراون.

هـ. بەرطلا کردنی هەمو گیراوە سیاسییەکان و گەڕانەوەیان لە گەڵ هەمو ئەوانەی لە سەر بیروباوەڕی پێشکەوتوانە لە کار دەرکراون بۆ سەر کار و فەرمانەکانی خۆیان.

و. لابردنی هەمو ئەو یاسایانەی بە گیانی فاشیستی و بیروباوەڕی کۆنەپەرستانە دانراون، وە هەڵوەشاندنەوەی هەمو ئەو ڕێککەوتنە ناودەوڵەتی یانەی کە بە پێچەوانەی ئازادیی گەلەوە کراون.

ز. هەڵبژاردنی شارەوانییەکان و دەزگاکانی بەڕێوە بردن، ڕاستەوخۆ لە لایەن هاووڵاتییانەوە.

دووەم - کوردستانی ئۆتۆنۆم

. پێکهێنانی هەرێمی کوردستانی ئۆتۆنۆم لە ناوچەکانی: شەنگار، زمار، سمیل، دهوک، شێخان، تلکیف، بەعشیقە، لیواکانی هەولێر، کەرکوک، سلێمانی و، قەزاکانی خانەقین و مەندەلی.

ب. دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی جگە لە کاروباری پاراستنی وڵات، پەیوەندییەکانی دەرەوە، ئابوریی گشتی کە بە دەس دەزگای ناوەندییەوە ئەبن، هەمو دەسەڵاتێکی تری ئەبی.

ج. دەزگای ئۆتۆنۆمی ئازادییە دیموکراتییەکان بۆ گەڵ دابین ئەکات.

د. دانیشتوانی کوردستان، لە ١٨ ساڵییەوە بەرەو ژور، بە ڕێگەیەکی ئازاد و نهێنی و ڕاستەوخۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان هەڵ ئەبژێرن.

هـ. ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان دەزگایەکی بەڕێوە بردن بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستان هەڵئەبژێری و، باوەڕی ئەداتی یا لی ی

ئەسپێنەوە.

و. هێزەکانی پۆلیس، ئەمن، پاسەوانی سنور و پێشمەرگە، ئەبەستری بە دەزگای بەڕێوەبردنی ئوتونومییەوە.

ز. بودجەی ئوتونومی پێک دی لە باجە ناوچەییان و دەرامەتی پرۆژەکانی تایبەتی هەرێمەکە و ئەو بەشەی بودجەی گشتیی عیراق کە بە پی ی ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی ئوتونومی لە چاو هی هەمو عیراق دا دیاری ئەکرێت.

ح. تەئمین کردنی ژیانی خێزانی شەهید و پەککەوتو و لێقەوماوانی شۆرشی کوردستان و پاراستنی مافەکانی ئەوان و هەمو ئەوانەی بەشداری شۆرش ئەبن و زەرەریان لی ئەکەوێ.

ط. هەمو کوردێکی نیشتماپەروەر بوی هەیە بێتە هەرێمی ئوتونومی کوردستانەوە و کار بکات.

- مافی ئاسوری، تورکومان و کلدان

أ. بو ئەوەی لە ناو چوارچێوەی کوردستانی ئوتونوم دا سەربەستیی بە کار هێنان و گەشە پێدانی مافی نەتەوەیی و فەرهەنگیی ئاسوری، تورکومان، کلدان تەئمین بکری، بە پی ی ژمارەیان لە چاو دانیشتوانی هەرێمەکەدا نوێنەریان ئەبی لە ئەنجومەنی نیشتمانی و دەزگای بەڕێوەبردنی کوردستان دا.

ب. لەو شوێنانەدا کە زورایەتیی دانیشتوانن مافی دامەزراندنی دەزگای تایبەتی خوبەڕێوەبردنیان هەبی.

ج. هەمو ئەوانەی دەربەدەر کراون مافی گەڕانەوەیان هەبی بو هەرێمی کوردستان.

چوارەم - گەشەپێدانی لادێ

أ. چاکردنی بنەرەتیی کشتوکاڵ بە پشت بەستن بە جەماوەری جوتیاران بە جورێکی ئەوتو کە رەگوریشەی پەیوەندییە دەرەبەگی و خێڵەکییەکان دەربهێنی و ئەرز و ئازادی بو جوتیاران تەئمین بکا و ببێتە هوی خەملین و گەشەکردنی لادێ و ژیانی لادێ یەکان و ماکینەوی کردنی کشتوکاڵ و پرۆژەکانی ئالودان.

ب. دامەزراندنی ئاوایی کشتوکاڵی، ئاژەڵی، پیشەسازی بو دروستکردنی مەڵبەندی ئاوەدان و عەسریی ژیان بە کوکردنەوەی چەند گوندێکی پچوک، وە یان دانیشتوانی ناوچەیەک لە دەوری پرۆژەیەکی سەرەکی.

ج. پاشکردنی ژیانی شوان و گاوان و خاوەن ئاژەڵەکان و پاراستن و پەروەردە کردن و گەشەپێدانی ئاژەڵ و ولسات و دیاریکردنی شوێنی کوکردنەوە و لەوەڕاندنیان، چاکردنی

چونایەتی و زۆرکردنیان، وە داممزراندنی پیشەسازیی ئاژەلی و پەرەپێدانی خزمەتی پەیتالی.

د. دانانی پلانێکی درێژخایەن بۆ بەین کردنەوەی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان بە شێوەیەکی وا کە لە گەڵ پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤی ئەم سەردەمە و تەشەن کردنی خانو و بەرە بۆ هەمو کەس و جوانی سروشت و ئاووهەوای کوردستان بگرێتەوە.

هـ. بەستنی گوند و شارەکانی کوردستان بە یەکتریەوە لە رێگەی دروستکردنی توری رێگاوبانی ئاسن و ئاسفالت و رێگەی هەواییەوە.

پێنجەم - بە دەسهێنان و چەسپاندن و گەشەپێدانی سەربەخۆیی ئابوریی نیشتمانی

أ. بە تەواوی رزگار کردنی ساسانی پەترولی عێراق لە چنگ کۆمپانیا ئیمپریالیستییەکان بە هەڵهێنجان و پالاوتن و گواستنەوە و فرۆشتنەوە، دامەزراندنی پیشەسازیی پیترو - کیمیاوی و، بەبرەوی کردنی سیاسەتێکی نیشتمانیی دوربین لە هەڵهێنجان و فرۆشتنی پەترول دا کە بە تەواوی بگونجێ لە گەڵ نەخشەی درێژخایەنی گەشەپێدانی ئابوری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی دا.

ب. نەتەوەیی کردنی بازرگانیی دەرەوە و چاودێری کردنی بازرگانی ناوەوەی ولات و گەشەپێدانی دەزگاکانی بەشی گشتی.

ج. گەشەپێدان و فراوانکردنی بەشی گشتی لە پیشەسازی و دروستکردن و بازرگانی و بانقەکانا لە گەڵ هاندانی بەشی تایبەتی لە پیشەسازی و پرۆژە بەرهەم هێنەکان دا.

د. دانانی پلانێکی درێژخایەن بۆ پیشەسازکردنی کوردستان لە رێگەی دامەزراندنی پیشەسازیی کشتوکالی و ئاژەلی و پەرەپێدانی پیشەسازیی پەترولی و پیترو - کیمیاوی و بەهرەوەرگرتن لەو مەعدەنانەی هەن بۆ دامەزراندنی پیشەسازیی قورس و ئەوانەی بۆ گەشەپێدانی ولات پێویستن.

هـ. دامەزراندنی ئیستگای بەرهەم هێنانی وزەی کارەبا لە گۆری ئەستێلە دەستکرد و تاڵگە سروشتییەکان دا بۆ کارەباوی کردنی سەرانسەری ولات.

شەشەم - پەیوەندیی نیشتمانی و نەتەوەیی و جیهانی

بۆ سەرکەوتنی بزوتنەوەی شۆرشگێرانەی کوردستان لە دارشتنی پەیوەندییە نیشتمانیی و نەتەوەیی و جیهانییەکان دا ی ن ک بە رەچاو کردنی سەربەخۆیی، دەس وەر نەدانە کاروباری یەکتری، گۆرینەوەی بیروڕا، ئالوگوری بارمەتی و ئالیکاری، خەبات ئەکات بۆ:

أ. پێکهێنانی یەکگرتنی ریزەکانی گەلی کوردستانی عیراق، یەکگرتنی کرێکاران و جوتیاران، بورجوازیی بچوک و بورجوازیی نیشتمانیی پێشکەوتو، یەکگرتنی تاقم و پێلە پێشکەوتوە جیاجیاکان لە یەکێتییەکی نیشتمانیی پێشکەوتوی دژ بە ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی، دژی دەربەدەر کردنی کورد و بە عەرەب کردنی کوردستان، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی شۆرشی نیشتمانیی دیموکرات.

ب. پێکهێنانی بەرەی یەکگرتوی هەمو پارتی و رێکخراو و تاقم و کۆمەڵە پێشکەوتو و دیموکرات و مارکسیە لینینیەکانی عیراق لە پێناوی روخاندنی حوکمی فاشیستی و هێنانە سەر کاری حکومەتێکی دیموکراتی ئینتیلافی، کە دیموکراسی بۆ عیراق و ئوتونومی بۆ کوردستان جێبەجێ بکات.

ج. پێکهێنانی هاوکاری پتەو لە گەڵ بەشەکانی تری بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا لە پێناوی بەدەستهێنانی مافی چارەنوسی دا.

د. پێکەوە گری دانی خەباتی رزگاریخوازانەی خەڵکی کوردستان و بزوتنەوەی رزگاریخواز و شۆرشگێرانەی عەرەب، فارس، تورک، ئازەری، بلوچ و گەلەکانی تر بۆ شکاندن و دەرکردنی ئیمپریالیزم و زایونیزم و روخاندنی حوکمی چینە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە، تەواو کردنی سەربەخۆیی نیشتمانیی سیاسی و ئابوری، وە گەشە پێدانی دیموکراسی لە رۆژهەلات دا.

هـ. پێکەوە گری دانی بزوتنەوەی خەڵکی کوردستان لە گەڵ بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلانی دنیای سێیەم، بزوتنەوەی شۆرشگێرانەی چینی کرێکاری ولاتانی سەرمایەدار و دەولەتە سۆشیالیستەکان دا.

حەوتەم - گەشەکردنی کۆمەڵایەتی

أ. ئافرەت

١. رزگار کردنی ئافرەت لە کوت و زنجیرەکانی کۆنەپەرستیی سەدەکانی ناوەراست و تەئمین کردنی مافی سیاسی، ئابوری و کۆمەڵایەتی یان و یەکسانی تەواو و هاوبەشی یان لە گەڵ پیاودا، وە داتانی یاسای ئەوتو کە مافەکانی ئافرەت لە کارکردن، خوێندن، شوکردن، جیابونەوە و میرات دا بپارێزێ.

٢. دابینکردنی سەربەستیی دیموکراتی بۆ بە هێزکردنی بزوتنەوەی ئافرەتان و خستنە گەریان بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری ولات.

٣. پاراستنی مافی دایک و منال، تەئمینکردنی بە خێو کردنیان و چاوەدێریکردنی دایکە کارکەرەکان.

٤. تەشەنکردنی کار، بە مەرجەی بێکاری بۆ هەمو هاوولاتیەکی ژن و پیاو، وە تەشەنکردنی مەرجەی خانەنشینی و بە سالا چون و پەک کەوتیان.

ب. کرێکار

١. پاراستنی مافی کرێکارانی شار و لادێ، بڕینەوەی مەرجەیەکی گونجاو لە گەڵ چونایەتی کارەکەیان کە لایەنی کەمی ژیانێکی ئاسودەیان بۆ تەئمین بکات.

٢. دیاریکردنی ماوەی کارکردنی رۆژانە بە ٧ سەعات.

٣. تەشەنکردنی مافی دامەزراندنی نەقابە و جوش دانی بزوتنەوەی کرێکاران تا دەوری مێژویی خۆی بیبنێت لە ژیانی سیاسی، کۆمەلایەتی و ئابوری ولات دا.

٤. تەشەنکردنی مافی مانگرتن و خۆپیشاندان.

٥. چاک کردنی شەرتەکانی کارکردن و پاراستنی کرێکاران لە نەخۆشی و مەترسییەکانی کار.

ج. تەندروستی

١. زیادکردنی تیمارخانە و نەخۆشخانە و دابەشکردنی دکتۆر و برینپێچ بە سەر ناوچەکان دا، بە پێی ی پێویستی ناوچەکان و ژمارەی دانیشتوانیان.

٢. پاراستنی تەندروستی گەل بە تەشەنکردنی تیماریی خۆرایی و لە ناوبردنی نەخۆشییە بلاوەکان.

٣. کردنەوەی خوێندنگا و کۆلیجی پزیشکی بۆ ئامادەکردنی کادری پێویست.

٤. بایەخدان بە هاوینەهوار و شوێنەکانی حەسانەوە بۆ کۆمەلانی خەلک.

٥. پاراستنی پاک و خاوێنیی مەلبەندی ژیان.

هەشتەم - گەشەپێدانی خوێندن و پەروەردە

أ. بە زۆرکردنی خوێندن لە پلەی سەرەتایی دا و ئامادەکردنی ئەو سەرچاوەی پێویستان بۆ ئەوەی هەمو مناڵێک بتوانێت لە کاتی خۆی دا بچێتە خوێندنگا.

ب. بە کوردی کردنی خوێندن لە هەمو پلەکان دا لە هەرێمی کوردستان و پاراستنی مافی نەتەوە بچوکەکان (ئاسوری، تورکومان، کلدان...) لە خوێندن دا بە زمانی خۆیان.

ج. کردنەوەی خوێندنگای پێگەیاندنی مامۆستایان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دا.

د. فراوان کردن و گەشەپێدانی زانستگای سلێمانی وەکو زانستگایەکی تایبەتی هەرێمی کوردستان و بەستنەوەی بە دەزگاکانی ئوتونومییەوە و بایەخدانێکی تایبەتی بە

زمان و ئەدەب و مێژو و فەرهەنگی کورد تیای دا.

هـ. خوێندنی زمان، ئەدەب و مێژوی عەرەب لە هەمو پلەکانی خوێندنی هەرێمی کوردستان دا، وە هەروەها خوێندنی زمان و ئەدەب و مێژوی کورد لە خوێندنگاکانی ناوچەکانی تری عیراق لە پێناوی بەهێزکردنی گیانی برایەتی لە نێوان هەردو نەتەوەی کورد و عەرەب دا.

و. پاک کردنەوەی پاپەتەکانی خوێندن لە بیروباوەری شوڤێنی و کۆنەپەرستی و ناراست و پەروەردە کردنی قوتابی بە گیانی پێشکەوتنخوازی و برایەتی گەلان و دوژمنایەتی ئیمپریالیزم ، زایونیزم و کۆنەپەرستی.

ز. دامەزراندنی ئاکادیمیی زانستی مۆردەی بە کوردستان، لە کەسانی زانا و شارەزای نیشتمانپەروەر بو سەرپەرشتی کردنی نوسینەوەی مێژوی زمان و ئەدەب و بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی خەلکی کوردستان و ساغ کردنەوە و چەسپاندنی زاراوە زانستیەکان بە کوردی و دانانی شێوەیەکی یەکگرتو بو نوسینی زمانی کوردی.

ح. گەشەپێدانی یەکێتیی نوسەرانی کورد و کومەلی روشنبیرانی کورد و گواستنەوەی بارەگاکانیان بو پایتەختی هەرێمی ئوتونومی و تەئمینکردنی سەربەستیی بیرکردنەوە و نوسین و هەلبژاردنیان.

ط. دانانی ئیستگای رادیو و تەلەفزیونی کوردستان لە ژێر چاودێری دەزگاکانی ئوتونومی دا.

ی. پایەخدان بە سامانی نەتەوەیی هونەری و ئەدەبی و ژیاندنەوە و گەشەپێدانی لا پێشکەوتوەکەی فولکلور و هونەری گەل.

ک. پایەخدان بە هونەری موسیقا و گورانی و وەرزش، وە گەشە پێدانیان بو خزمەتی گەل.

ل. دامەزراندنی دەزگای نوی ی ئەوتوی چاپەمەنی لە کوردستان دا کە بتوانێت پێویستیەکانی هەرێمەکە پر بکاتەوە لە روی چاپ و بلاو کردنەوە بە زمانەکانی کوردی و ئاسوری و تورکومانی.

بیرە بنەرەتیەکانی حکومەتی ئیئتیلافی و، چەسپاندنی سەربەخوی ی ئابوری و، ریکخستنی پەیوەندیە نیشتمانی و نەتەوەیی و جیهانیەکان هی مامجەلال و... پایەتەکانی پلورالیزمی سیاسی و فیکری و نەتەوەیی و، گەشەپێدانی لادی و کومەلایەتی هی من و... گەشەپێدانی خوێندن و پەروەردە هی کمال فواد و فوئاد معصوم بو..

دارشتنەوەی ماددەکانی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆ بە کوردی بە من سپێردرا. مامجەلال بە عەرەبی پێشەکییەکی درێژی بۆ نووسی. د. فوئاد مەعصوم بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی کرد بە عەرەبی و، منیش پێشەکییەکەم کرد بە کورد. لە مانگی تەمووزی ١٩٧٦ دا بڵاو کرایەوە.

*

دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار: «خطە رزگاری»

مامجەلال پەیوەندی لە گەڵ کاک ئارام لە کۆمەڵە و، عومەر مستەفا و عەلی عەسکەری لە بزووتنەوە و، د. خالید سەعید و چەندین کەسی تر دامەزراند بوو. بە نامە ئالوگۆڕی بیروڕای لە گەڵ ئەکردن. یەکێ لەو مەسەلانەی باسی ئەکرا: جۆری دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار بوو.

بۆ ئەم مەبەستە مامجەلال چەندین کۆبوونەوەی لە گەڵ ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر و، ئەفسەرەکان و، کادرەکانی تر کرد بوو. ڕۆژی ٧٦/٥/١٩ منیش بە یەکجاری ئەڵمانیام بە جێ هێشت و بە فڕۆکە چوومەوە شام، بۆ ئەوەی لەو کارەدا بەشدار بم.

لە زنجیرەی ئەو کۆبوونەوانەدا، ڕۆژی ٢٣ - ١٩٧٦/٥/٢٤ کۆبوونەوەیەکی ترمان لە شام کرد، عەلی سنجاری و مونزیر نەقشبەندی پێش ئامادە بوون. مامجەلال پرۆژەیەکی ئامادە کرد بوو، لەم کۆبوونەوەیەدا پاس کرا و، پاش زیادکردنی هەندێ بابەت پەسند کرا. هەروەها بڕیار درا یەکەمین وەجبەی پێشمەرگە ڕەوانەی کوردستان بکرێنەوە و، نامە بۆ هەمو ڕێکخستنەکانی ناو وڵات بنێردرێ کە ئیتر دەس بکەن بە ناردنی مەفرەزەکان بۆ شاخ.

پرۆژەکەی مامجەلال:

اسم الخطة: رزگاری

الهدف: اشعال الثورة مجددا في كردستان تمهيدا لثورة عراقية (عربية - كردية) تستهدف الديمقراطية للعراق والحكم الذاتي الحقيقي لكردستان العراق.

المبادئ الاساسية:

١. الثورة عمل جماهيري تعتمد على الجماهير، لذلك فان مهمتنا الرئيسية هي استنهاض وتنظيم وتوعية وقيادة الجماهير الشعبية ومراعاة مبدا الاعتماد على النفس، على الشعب وطاقاته الخلاقة ومراعاة قواعد حرب الانصار العصرية تمهيدا لتحويلها الى حرب الشعب الثورية.

٢. الالتحام الكفاحي مع القوى الثورية العربية (الممثلة للجماهير الكادحة) المؤمنة

بحق الشعب الكردي في تقرير المصير اولا ومن ثم مع القوى الوطنية والتقدمية الاخرى.

التلاحم الكفاحي في ساحة النضال الفعلي هو الاساس والجوهر والتجمع الوطني العراقي هو الاطار الوطني العام.

٣. الالتحام الكفاحي مع القوى التقدمية الكردستانية في ايران وتركيا والاستعداد لمختلف الاحتمالات باعتبار كردستان وطننا المجزأ وباعتبار ان استنهاض جماهيرها وتنظيمها وتوعيتها هو مهمة مشتركة لجميع الاحزاب الكردستانية التقدمية.

قواعد العمل:

١. ايجاد وحدات مسلحة صغيرة ومتحركة تتألف من خيرة العناصر الثورية، الواعية والشجاعة، مهمتها الرئيسية في المرحلة الراهنة هي: الدعاية السياسية، التوعية، التنظيم، التحريض الجماهيري، رفع معنويات الناس، وحماية الكوادر والعناصر الثورية الهاربة من المدن.

٢. تتجنب هذه الوحدات قدر المستطاع الاصطدام بالقوات المسلحة للعدو حتى تحين اللحظة المناسبة وتدق ساعة الانتفاضة العامة.

٣. تنتقل العناصر الواعية والمقاتلة الباسلة الموجودة في الخارج الى الداخل تدريجيا، وتخلق لها قواعد سرية ومتنقلة، وتوجد ارتباطات واتصالات بالمنظمات الموجودة وتساعد على تنظيم الجماهير حيث لا يوجد تنظيم.

٤. يؤلف الرفاق - في الداخل - وحدات مسلحة تقوم بنفس المهام في مختلف انحاء البلاد، وتأمر تنظيمات الداخل رفاقها والعناصر الثورية القريبة منها بالامتناع عن اطاعة اوامر الحكومة بنقلها الى خارج المنطقة بل تلتجأ الى الجبال لنفس الغرض.

٥. ارسال الاسلحة والذخيرة الى الداخل لتوزيعها على الرفاق وخزنها في اماكن سرية ومخفية.

٦. ايجاد قيادة مركزية موحدة لقيادة وتنسيق فعاليات الوحدات المسلحة في مختلف المناطق مع مراعاة مبد اللامركزية في حرب الانصار في التنفيذ والتكتيك والمركزية في الخطة العامة والستراتيجية.

٧. تشغيل الاذاعة وتوفير اجهزة لاسلكية واستحصال بعض انواع الاسلحة كالصواريخ المعادية للدروع والطائرات.

بعض المستلزمات الاخر:

١. توفير دعم خارجي سياسي ودعائي - مادي و معنوي.

٢. توفير مقدار من الاموال والذخيرة تكفي لمدة سنة لحرب انصار محدودة ومتحركة.

٣. ضمان مساندة قوى عربية (بعثية وناصرية) على الاقل، فضلا عن التلاحم الجدي مع القوى الثورية العراقية.

المقترحات المضافة:

١. ارسال عناصر قيادية الى الداخل و عنصر الى تركيا.

٢. ارسال بعض اخواننا العرب مع الوجبة الثانية.

٣. السعي لتامين خط الامداد - التموين والذخيرة -

٤. تامين معيشة الذين يرحلون الى الداخل.

٥. وضع خطة زمنية للوجبات وارسالها الى الوطن.

٦. الانتفاضة يجب ان تعلن وتبدأ من الداخل.

به هه‌مان مه‌عنا، مامجه‌لال نامه‌ی بۆ هه‌مو خه‌ته‌كانی ریكخسته‌نه‌كانی ناو ولات نوسی. داوای لی كردن مه‌فره‌زه‌ی «به چوناپه‌تی باش و به چه‌ندایه‌تی كه‌م» بنیرنه شاخ و، ئیمپی پروپاگانده‌ی سیاسی «فرق الدعایه المسلحه» له سه‌رانسه‌ری كوردستان دا پیك بهینن.

سه‌ركردایه‌تی ئه‌م پۆله پیشمه‌رگه‌یه كه بریتی بون له ٣٧ كه‌س و، دابه‌ش كرا بون به سه‌ر ٤ مه‌فره‌زه‌دا، ئه‌بو ئیبراهیم عه‌زیز بیكا. ئیبراهیم له عه‌شیره‌تی گه‌رگه‌ری بو. ده‌رچوی كلیه‌ی هندسه‌ی زانستگای موسل بو. له سه‌ر حسابی جه‌یش خویند بوی، له سالانی خویندن دا هات بوه ریزی كومه‌له‌وه. كه خویندنی ته‌واو كرد بو به ئه‌فسه‌ر له جه‌یشی عیراق دا، بو ده‌وره‌ی ئیبرونی ساروخ نیردرا بو سوفیت و میصر. گه‌یشت بوه پله‌ی «نقیب مهندس». گه‌نجیكی روشنبیر و زیره‌ك و وریا بو. سوورانیه‌كی ره‌وان له هاوریكانیه‌وه فیر بو بو. روح سوك و قسه خوش و گورجوگول بو. دوای ئاشكرا بونی ریكخسته‌نه‌كانی كومه‌له، ئه‌میش له گه‌ل ئه‌نوه‌ر شاكه‌لی و ئیبراهیم عه‌بد عه‌لی، له به‌غداوه چوبونه ره‌مادی و به پی له سنور په‌ری بونه‌وه بو سوریا. ئیبراهیم له قامیشلی مابوه بو كاری سیاسی و پیشمه‌رگه‌یی له ناو كورده عیراقیه‌كانی ئه‌وی دا.

پیشمه‌رگه‌كانی ئاماده‌كرا بون بو گه‌رانه‌وه، له ناو هیزه‌كه‌ی ئه‌وی دا هه‌لبژیردرا بون و، عیززه‌ت ئیسماعیل شه‌نگاری و، عه‌بدولجه‌بار مه‌لا غه‌نی سندی، عومه‌ر ئیبراهیم ره‌شید، عه‌بدولره‌حمان حه‌سه‌ن دانرا بون به فه‌رمانده‌ی مه‌فره‌زه‌كانیان. زوربان پیشمه‌رگه یا كادر بون له شورشی ئه‌یلول دا، شاره‌زای ناوچه‌كانی بادینان و، ئاشنای خه‌لكه‌كه‌ی بون.

مامجه‌لال چو بو قامیشلی بو به‌ری كردنی یه‌كه‌مین وه‌جبه‌ی پیشمه‌رگه‌كان به سه‌ركردایه‌تی ئیبراهیم عه‌زیز به‌ره‌و كوردستان. پیشمه‌رگه‌كان به ورمه‌یه‌كی به‌رزه‌وه، كه

ئەتوت ئەچن بۆ شایی و زەماوەن، خواحافیزییان لە مامجەلال کرد بوو.

نەجمەدین بیوکقەیا(نەجو)، کە ئەوسا لە ناو ئێمەدا بە سەلاح ناسراو بوو، ئەم پۆلە پێشمەرگەیەی گەیاندەوە کوردستانی عێراق.

*

باسی سەرەتای کارەکانی یەکێتی بێ باسی نەجو ناتەواو دەرئەچێ.

نەجو سالی ١٩٤٣ لە شاری ئورفای کوردستانی تورکیا لە دایک بووە. لە سالانی ١٩٦٦-١٩٧١ لە زانکۆی ئەستەمول خوێندکاری زانستگای حقوق بوو.

خوێندکارانی ناوچە کوردنشینەکانی رۆژهەلات چەند یانەیەکی کۆمەلایەتییان لە ئەستەمول دامەزراند بوو. ئەم یانانە بووبوون بە ناوەندی چالاکی سیاسی. هۆشی کوردایەتی بوژاندبووە. نەجو یەکێ لە هەرە چالاکەکانی ئەم یانەیە بوو. ماوەیەک بوو بە سەرۆکی یانە. هەر ئەوسا چووە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیاوە.

سالی ٧١ دامەزراوەی جەنگی تورک، بۆ راگرتنی گەشەکردنی چەپ و سەرکوتکردنی چالاکی کورد، کودەتای کرد و، باری نائاسایی لە تورکیا راگەیاند. ژمارەیەکی زۆر سیاسی و تێکۆشەری تورک و کوردیان گرت. فەرمانی گرتن بۆ نەجو دەرچوو. نەجو چوە کوردستانی عێراق بۆ لای د. شڤان.

د. شڤان ناوی نهێنی د. سەعید قرمزتوپراخ بوو. لەو کاتەدا پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا (پ د ک ت) بوو بوو بە دوو بالی چەپ و راست. بالی چەپی د. شڤان و، بالی راستی سەعید ئالچی رێبەرییان ئەکرد. بنکەی هەردوکیان لە کوردستانی عێراق بوو. بارزانی بۆ رازی کردنی تورک سەعید ئالچی کوشت و، بە سەر د. شڤانی دا هێنا. بەو بیانووەوە شڤانیشی کوشت. هەردوو سکرتێر کوژران. نەجو و، زۆر لە تێکۆشەرانی تری کوردستانی تورکیا ئاوارە بوون. نەجو بۆ چیکوسلۆڤاکیا و، لەوێوە چوو بۆ سوید بوو بە پەنابەری سیاسی. سالی ٧٤ هەلبژاردن لە تورکیا بوو. حکومەتی تورک «لێبووردنی گشتی» بۆ هەمو ئەوانە دەرکرد کە لەبەر هۆی سیاسی گیرا بون یا هەلات بون. نەجو گەرایەوە بۆ تورکیا. لە گەل هاورێکانی کەوتە رێکخستنەوەی پارتی. رێکخراوێکی قانونی ئاشکرایان بە ناوی دەدەکادە وەکو چەتر بۆ حیزبەکەیان دروست کرد. نەجو دیسان لە ریزی هەرە چالاکەکانی حیزبە نهێنییەکەو رێکخراوە قانونییەکەش بوو. هەرزوو دیسان فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو.

یەکێتی لە دوای دامەزرانی لە گەل هەمو حیزب و رێکخراوە سیاسییەکانی سەرانسەری کوردستان پەیوەندی کرد بوو. لەوانە رێکخراوە سیاسییەکانی کوردستانی

تورکیا. نەجو بە نوێنەرایەتی حیزبەکەیان هاتە سوریا. ئەوسا حیزبەکەیان سکرتاریەتێکی ٣ کەسی هەبو ئەم یەکێکیان بو.

ناوچە سنورییەکانی کوردستانی تورکیا گرنگیەکی ژیانییان بو یەکێتی هەبو. یەکێ لەو پاسانەی کە لەگەڵ ئەم حیزبەو زور لە رێکخراوەکانی تر کرا هاوکاری سیاسی و، پارمەتیدانی تێکوشەرانی یەکێتی بو گەرانەوە بو کوردستانی عیراق.

هاوکاری نێوان هەردولا بە زویی دامەزرا و بە هێز بو. سەرکردایەتی حیزب، وای ئیدیعا ئەکرد، کە خوی بو شورش ئامادە ئەکا. یەکێتی زور لە پێویستییەکانی بو دابین کردن. ئەوسا ئەوان بوبون بە رێکخراوێکی سیاسی گەورەو فراوان. لە پێشەوە بە گەرمی هاوکاری یەکێتییان ئەکرد و، نەجویان تەرخان کرد بو پەیوەندی لە گەڵ یەکێتی. لە دوایی دا خاو بونەوە، خویان لە هەمو جورە هاوکارییەک ئەدزییەوە لەترسان، وەکو خویان ئەیانوت: یەکێتی تووشی «تەعلوکە» یان بکا و، حیزبەکەیان پێش وەخت بەر هێرشی دەزگاکانی تورک بکەوی.

نەجو زورجار ئەهات بو سوریا. چەند جارێکیش بو کاری حیزبەکەی خویان چو بو لوبنان. ئیبراهیم عەزو و هاورێکانی بە رێبەری ئەم چونەوە بو کوردستان. منیش لە گەڵ نەجو چوم بو تورکیاو لە دیاربەکر لە یەکتری جیابوینەوە. نەجو لە گەڵ حەسەن خوشناو چون بو ئەستەمول بو پێشوازی و هێنانەوەی مامجەلال بو کوردستان. چەندین وەجبە چەکی لە سوریاوە بە ناو تورکیا گەیاندە دەست یەکێتی. کوردێکی راستگو، جوامێر، تێکوشەر و، هەتا پلی ی ئازاو لە خوبوردو بو. لە گەڵ سەرکردایەتی حیزبەکەی سەبارەت بە هەڵوێستی لە یەکێتی و خوئامادەکردن بو شورش و هەندێ مەسەلەی تر تێکچو. ئەیتوانی بەشێکی گەورەی رێکخستنەکە لە گەڵ خوی جیا بکاتەوە. ئێمە لامان وابو تازە خەریکە کورداییەتی لە تورکیا ئەبوژێتەوە. ئەو حیزبە هەڵوێستی هەرچونی بی لە ئێمە، ئێمە بە چاکی نازانین رێزەکانی تێک بچی. روداوەکانی تورکیا راستیی هەڵسەنگاندنەکانی ئێمەی سەلماند. نەجو لە دوای کودەتاکەی ساڵی ٨١ گیرا و، لە روژی ٢٢ی ئوکتوبەری ١٩٨٤ دا لە زیندانی دیاربەکر کوشتیان. نەجو کادرێکی خاوەن تەجروبەی بە نرخ بو بو کوردستانی تورکیا. مەخابن بەو جورە لە ناوەختا کوژرا..

نەجو بیرەوەرییەکانی خوی نوسیوەتەوە. لە ناو بیرەوەرییەکانی دا بەشێکی زوری بو یەکێتی و ئێم تەرخان کردوە. روداوەکانی زور بە وردی نوسیوە، بیروڕای خوی بە رونی لە سەر دەربڕیون. کە ئەهات بو شام بە زوری میوانی من ئەبو. بەڵام نەمئەزانی بیرەوەرییەکانی تومار ئەکا.

ئەجىو لە يادداشتەكانى دا سەفەرى رێ ى هات و ئەهاتەى ئيبراهيم عەزو و هاورێكانى و، دوايىتر كوژرانيانى بە درێژى گێراوەتەوە.

لە كوردستانيش ئيتر دەستيان كرد بە ناردنى مەفرەزە و چونە شاخ.

*

نامەكانى لە د. خاليدەوە ئەهات، هەروەها نامەكانى كاك ئارام هەمويان پێ يان لە سەر دەستپێكردنەوەى خەباتى چەكدار دائەگرت. د. خاليد لە نامەيەكى دا نوسى بوى: «دواكەوتن بە قازانجى دوژمنە، كاتى دەستپێكردن هاتوە...» نامەكان رەنگە لە ئارشيفەكەى مامجەلال دا مابن. لە راستى دا ئيمەش هەمو خومان بو دەستپێكردنەوەى خەباتى چەكدار ئامادە ئەكرد و، من خوم هەر بو ئەو مەبەستە هات بوم بو سوريا.

لە شام چەند كوبونەوەيەك كرا بو جور و كاتى دەستپێكردنەوە. مامجەلال كوبونەوەكانى رێك ئەخست، ئيمەش: د. فوئاد مەعصوم، عەبدورەزاق فەيلى، عادل موراد، مونذير نەقشبەندى، عەلى سنجارى و، من بەشداريمان ئەكرد.

لە جەزيرە چەند مەفرەزەيەك ئامادە كرابون بو گەرانەوە. عەلى سنجارى لە كوبونەوەكان دا هەميشە پێ ى لە سەر ئەوە دائەگرت كە يان ئەو مەفرەزانە ئەگەرێنەوە بو كوردستان، يان ئەگەر گەرانەوە ئەبى خويان لە ق م بپارێزن و، زور وريا بن، چونكە بە هەمو توانايەكيانەوە لێ يان ئەدەن.

ئەوسا ئيمە باوەرمان نەئەكرد پەنجەكانى بارزانى زات بكا چەكدار بنێرێتە سەر پێشمەرگە، يا ئەگەر بيەوێ دواى ئەو ئاشبەتاڵەى ئەوان كرديانە كەسانى هەبن بە قسەيان بكەن و، پێشمەرگەيان بو بكوژن. بوچونەكەى عەلى سنجارى لە شارەزايى و ئاگاداريەوە بو، بوچونەكەى ئيمە لە خوشباوەريەوە بو.

مامجەلال نامەى بو كومەلە و بو خاليد سەعيد و عەلى عەسكەرى نوسى كە دەس بكەن بە ناردنى مەفرەزەكان بو شاخ. لە سوورياشەوە چەند مەفرەزەيەك ئەنێرن بو بادينان. بە تەما بوين ئەوان ناوچەى سوران ئاوا بكەنەوە، ئيمەش بادينان و، بەمجورە هەردو لا يەك بگرينەوە.

سەرەتاى مانگى حوزەيران مەفرەزەكانى بادينان بە هوى ئەجو وە بەرەو كوردستان بە رێ كەوتن. د. خاليد و كومەلەش بە درێژايى مانگەكانى حوزەيران تا مانگى تشرينى دوەم خەريكى رێكخستن و ناردنى مەفرەزەكان بون. دەيان مەفرەزە لە سەرانسەرى كوردستان دا بلاو بونەوە.

لە دروستكردنى هێزى پێشمەرگەدا بە دو جورى جياواز كاريان ئەكرد:

سەرانی کۆمەڵە، پەیوەندییان لە گەڵ ئەفسەرە گەنجەکان کرد بوو. پێشمەرگەکانیان بە زۆری لە خەڵکی شارەکان دروست نەکرد و ئەیان ناردن بۆ دەرەوە.

سەرانی بزوتنەوە، دانیشتوانی لادێکان و عەشائیریان ساز ئەدا و، پاش ئەوەی کە خۆیان چونە شاخ، هێزی چەکدارییان لێ پێک هێنان.

زۆری نەخایاند سەدان کەس لە کەسانی ناوداری عەشائیر هاتنە ریزی پێشمەرگەوە. بایزی عەباس ئاغاو کوڕەکانی ئاکۆ، بالەکیان، عەلی حەسەن ئاغا و کوڕەکانی مەنگوڕ، مامەش، دزلی جاف، شێخانی بەتی، بە کۆمەڵ هاتنە ریزی پێشمەرگەوە. هێزێکی گەورەیان پێک هێنا. دەیان پارەکایان داتا. مەفرەزەکانی کۆمەڵە لە چاو ئەوان دا بۆ بوون بە کەمایەتی.

یەکێتی بە بۆنەی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدارەوە بەیانێکی بە ناونیشانی «النصر للثورة العراقية المندلعة في جبال كردستان» بڵاو کردەوە. بەیانەکە مامجەلال نوسی بوی. لەو کاتەدا من لە دیرکی بوم.

ئەمە پەژارەی بۆ قم و بۆ بەعس دروست کرد. هەردولایان بە خەو کەوتن قم بۆ تێکدانی و، بەعس بۆ کوژاندنەوەی.

قم لە تهرانەوە جەوهەر نامیق و کەریم سنجارییان بۆ ناوچە سنورییەکانی تورکیا و، محمد قادر (کەمال کەرکوکی)، شێرکۆی شێخ عەلی سەرگەلو، فاضیل جلال (عادل) یان ناردە ناوچەکانی سۆران. کاری سەرەکییان تێکدانی شۆرشەکە بو.

کەمال و شێرکو و فاضیل، بە پارە و مەسئولیەت، سەدان کەسیان هەڵگێڕایەوە و، هەندێ ناوچەیان بە تەواوی تێک دا. چەندین کەسی وەکو فەقێ سمایلی باخیان، ستاری سەعید خەلیف، عەبدولەلیکیان هەڵگێڕایەوە و، لە هەمان کات دا دەستیان ئازاد کردن چون لە گەڵ خەڵک رەفتار ئەکەن بیکەن. بەمەش خەریک بو چارەی پێشمەرگەی نوێ بە تەواوی لە بەرچاوی خەڵک ناشیرین و دزێو بکەن.

جەوهەر نامیق و کەریم سنجاریش، مەفرەزەکانی بادینانیان تەفروتونا کرد.

حیزبی بەعسیش، بە ناشیتال ئەوەندە بایی بوبو، لای وابو جارێکی تر شۆرشی کورد نابێتەوە. لە سەرەتادا مەسەلەکەی بە هەند نەگرت. تەنانەت صەدام جارێکیان لە باسی گفتوگۆ دا لە گەڵ مامجەلال بە جۆرێ حەیەشی وت بو: «جەلال دارخورما لە سەری ئەروێ بەڵام جارێکی تر ناتوانی حەوت کەس بنێریتە شاخ».

لە حوزەیرانی ٧٦ ەوە تا مارتی ٧٧ جەیشی عێراق هیچ لەشکرکێشییەکی ئەوتۆی نەکرد و، هیچ پەلامارێکی گرنگی پێشمەرگە و بنکەکانی نەدا. پێشمەرگەش

هێشتا لە قوناغی خوسازدان دا بو لە بەر ئەوە خوی لە پەلاماردانی هێزەکانی حکومەت لا ئەدا.

سەرکردایەتی بەعس لە پێش بەهاردا بە چەند حەفتەیەک کەوتە خوسازدان و دانانی نەخشەی پەلاماردان. ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی راسپێردرا شورشی ئەمجارەی کورد بکوژێنێتەوە.

*

کیشەی ق م

کە ی ن ک دامەزرا ئەوسا بارزانی و سەرانی پارتی لە تیهران بون. بارزانی لە چەند جیگا بە ئاشکراو بە نهێنی ئەیوت: دەوری ئەو تەواو بوە. زەرلی دەولی خراپە. کورد ناتوانی و نابی هیچ بکا.

پارتی هیچ چالاکییەکی نەمابو. بەشی لە ئەندامەکانی کومیتەی ناوەندی و، سکرتیری حیزب، گەرابونەوە عیراق. هەندیکی تریشیان لە تیهران بون. ئاشیەتال بوشاییەکی سیاسی گەورەی لە جولانەوەی کوردا دروست کرد بو. کە یەکیتی دامەزرا ئاسویەکی روشنی بو تیکوشەرانی کورد کردەوە. زوری پی ئەچو یەکیتی پەرەی سەند. ریکخستنی لە سەرانسەری ئەوروپا دامەزراند. بەشیکی زوری ئەوانەی پەنایان برد بوە بەر سوریا ریکخران. پیوەندی لە گەڵ هەندی لە کادرە چالاکەکانی لە ئیران بون دامەزران. هەندی لە ئەفسەر و کادرە سیاسییەکان لە ئیرانەوە بە قوروگەو هەندیکیان بە پی بە ناو تورکیادا هاتنە سوریا.

جموجولی یەکیتی ساواکی سلەماندەوە. ترسان ئەو بوشاییە سیاسییەی بە ئاشبەتالی بارزانی و سەرانی پارتی دروست بوە، بە ریکخراویکی چەپی دژی ئیران پر ببیتەوە. بە تایبەتی یەکیتی لە سەرەتاوە بە هیرش بو سەر شا و رژیمی ئیرانی دەستی پی کرد. بارزانیش ئەترسا سەرکردایەتی لە دەس دەربهینری. چەند جاری ئیدریس هەوالی بو مامجەلال و سەرکردایەتی یەکیتی ئەنارد: «کە ئەگەر شورشیان پی ئەکری، شورشیان پی تیک ئەدری» داوای لە سەرانی یەکیتی ئەکرد جموجوڵ نەکەن.

بنەماڵەی بارزانی بە هاوکاری ساواک کەوتنەوە خوریکخستنەوە.

یەکەمین چالاکیان ئەوەبو لە دەوروبەری گرتنی کونگرەی کومەلەی خویندکاران دا طارق عەقراوییان بە پارە و بەیانەوە ناردەوە بو ئەوروپا. طارق لە گەڵ خوی مسوودەی بەیانیکی کالوکرچی هینابو بە ناوی «لقی دەرەوە» ی پارتیەوە بە عەرەبی نوسرابو. هوی شکستی شورشی کوردی گیرابوەوە بو «عاملی جوغرافی مخشوم». دوای ئەوە تیتر

بنەماڵەی بارزانی بە ناوی قم وە کەوتە چالاکی. تیهران ڕیگای سامی دا بیتە ئەورووپا سەرپەرشتی ڕیکخستنەوەی پارتی بکا. سامی بە موالەفەتی بنەماڵەی بارزانی سەرکردایەتییەکی بۆ پارتی دروست کرد بۆ بە ناوی قم وە بریتی بوو: لە ئیدریس و مەسعود، جەوهەر نامیق، عارف تەیفور، کەریم سنجاری، محەمەد حەمە ڕەزا، ئازاد خەفاف، ئازاد بەرواری، غازی زیباری، ڕویا سەعاتچی، فاضیل جەلال، ئەورەحمان پەهلەوی، کەمال کەرکوکی، شەرکوی شێخ عەلی...

ئەمانیان دابەش کرد هەندێکیان بۆ تورکیا، هەندێکیان بۆ ئەورووپاو، هەندێکیان بۆ کوردستانی عێراق. ئەرکی سەرەکیان دوژمنایەتی یەکێتی و تێکدانی کارەکانی یان وردتر وەکو ئیدریس وتبوی: «تێکدانی شۆڕش بۆ مادەم خۆیان پێیان ناکرێ».

ڕاستییەکەشی ئەم گروگرفتێکی ڕاستەقینەو گەورەی بۆ یەکێتی دروست کرد بۆ لە هی عێراق و ئیران و تورکیا گەورەتر بوو. ئەمان بە ناوی پارتی پێشڕەو و هەلگیرساندنەوەی شۆڕشەوە کاریان ئەکرد و، ناوبانگی بارزانی و پارتی و شۆڕشی کوردیان بەکار ئەهێنا بۆ دوژمنایەتی یەکێتی.

١. جەنگی پروپاگاندەیان دژی یەکێتی و سەرکردەکانی بە تایبەتی مامجەلال دەس پێ کرد.

٢. لە سەر سنوری تورکیا کەوتنە چالاکییەکی زۆر بۆ هاندانی عەشیرەتەکانی ئەوی دژی یەکێتی و، بۆ ڕیبڕین لە هاتوچۆی تەقەمەنی و پێشمەرگەکانی یەکێتی.

٣. باوەڕپێکراوانی خۆیان نارده ناو ڕیزی پێشمەرگە و ڕیکخستنی یەکێتی بۆ کلۆر کردن و تێکدانی لە ناوەوە.

٤. ئەندامەکانیان فێر کرد بۆ بێ شەرم و شوورەیی هاوکاری لە گەڵ دەزگا موخابەراتییەکانی ناوچەکە: ساواک، میت، موخابەراتی سوری.. بکەن بۆ پاراستنی خۆیان و زیاندان لە ئەندام و دوستەکانی یەکێتی.

٥. هەلگێڕانەوەی کادر و پێشمەرگەی یەکێتی لە کوردستان بە پارە و پلەی مەسئولیەت و، ئازادکردنی دەستیان بۆ ئەوەی چییان بوێ بیکەن.

٦. ڕاسپاردنی کادرە عەسکەرییەکانیان بۆ دروستکردنی مەفرەزەی تایبەتی سەر بە ئیستیخباراتی عەسکەری عێراق بۆ ڕاوی پێشمەرگە.

سوریا بۆ یەکێتی گرنگییەکی زۆری هەبو. بنکەی کۆبونەوەی کادر و پێشمەرگەکانی دەرەوەی بو. سەرچاوەی چەک و تەقەمەنی بو. جێگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئۆرگان و بلاوکراوەکانی بو. بەلام لە بەر ئەوەی سنوری عێراق و سوریا

وا نامەیەکم بە هۆی ئێوەوە بۆ کاک ئیدریس و کاک مەسعود هەنارد هیوام وایە پێ یان بگەیەنێت و ئومێدیشم زۆرە کە ئێوەش هۆی چاکە و خێر بن لە نێوان دا.

بە راستی رەفتار و کرداری تاڵمی کەریم سنجاری و جەوهەر نامیق لە تورکیا گەیشتوتە رادەیەک چیکە خۆمان پێ ناگیری لە عاستیان دا. ئەمە شەری براکوژیە. ئەمە ئیهلاتی حەریە لە سەرمان.

ئیمە ئەمانەوی دژی بەغدا شەر بکەین، شۆرش بکەینەوە، بۆیە هەمو کوردیکی دڵسوز ئەبی یارمەتیمان بدات. ئەوەی کوسپ بخاتە ئەم ڕیگەیە، بەرپرەکانی بکات، هەر تەنها خزمەتی ئەم پلانە ئیمپریالیستیە - شۆڤێنیە ئەکات کە شۆرشەکەی دوایی پێ هێنا.

جا هیوام وایە کە ئێوش لە گەڵ کاک مەسعود قسە بکەیت کەوا: خیلافی سیاسی نێوانمان ئەکەینەوە شەری براکوژە، یا بە ڕیگەی سیاسی، ڕیگەی نوسین و رەخنە و، پەنا بردنە بەر جەماهیری گەل لایەلا بکەین. ئەم جۆرە کردەوانە کە راستەوخۆ بە یارمەتی تورکیە و لە بەر چاوی کاربەدەستانی تورانی ئەکرێت ڕیسواکردنی زۆری تێ ناچێت، بەلام ئیمە نامانەوی بگاتە ئەم رادەیە بۆیە تکای زۆرم هەیە لە سەرەتاوە چارەسەری ئەم مەسئلەیە بکەن بە منع کردنی تاقمەکەی تورکیا لە بەرهەڵست کردنی هاتوچۆی خەڵک بۆ لامان، لە ماوە دان بە پەناهەندەکانی دێن بۆ لامان لە ئیرانەوە، لە بەرهەڵلا کردنی ئەوانەی گرتویانن، لە ڕیگە ئەگرتن لەوانەی هاتوچۆی لای ئیمە ئەکەن لە بادینانەوە. چونکە ئەمە دەوری ژەندرمەی تورکی و شورتەی عیراقە.

بۆ مێژو، بۆ دواڕۆژ، ئەم نامەیەتان پیشکەش ئەکەم وە ئەتانخەمە ڕو لە گەڵ مەسئولیەتی مێژوی دا.

هەر خۆش بن　　　　　　برای دڵسوزتان

مام جەلال

- نامەی دوەم:

١٩٧٦/٨/١٤

برایانی بەڕێز: کاک ئیدریس و کاک مەسعود

سلاوێکی گەرم

هیوام وایە ساغ و سەلامەت بن.

لەم ڕۆژانە ناڵەبارەدا کە گەلەکەمان پێ ی دا تێ پەر ئەبێت زۆر بە پێویستم زانی

لەم راستیهیانەی خوارەوە ئاگادارتان بکەم وە بخانخەمە بەردەم مەسئولییەتی میژویی خوتان.

دامەزراندنی یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان بو ریکخستنەوەی ریزەکانی گەلەکەمان و هینانەوە جوش و خروشی هیزەکانی شورشی کوردستان بو. لە پاش ماوەیەکی، لە چاو خوی دا کەم، توانرا کە خو سازدان بو دەستکردنەوە بە شەری پارتیزانی و بەشیوەی نوی بگاتە رادەیەک بتوانریت سەدان پیشمەرگە ئامادە بکرین لە ولات داو، سەدانیش لە دەرەوە. ئەوانەی دەرەوە زووتر بو یارمەتی دان و یارمەتی گەیاندن بە هەڤالانی ناوەوەیە، ئەگینا شورش وەک هەمو جورە خەباتیکی تر هەر لە ولات ئەکری.

هەلسانی یەکیتی نیشتمانی کوردستان بەم فرمانە میژوییەی خوی جیگەی پایەخی هەمو دلسوزیکی کورد و کوردستانە وە لە لایەن زوریەی زوری گەلەکەمانەوە پیشوازییەکی گەرمی لی ئەکریت، بە تایبەتی سەبارەت بەو دواهینانە بی جی و ری یەی سەرکردایەتی شورش بە خەباتی سیاسی و عەسکەری هینا. هەروەک لە ئازاری ۷۵ بە تصریحاتی تەلەفزیونی و صحفی جەنابی بارزانی بو روژنامەی رستاخیز بە سەربەستی دەرتان بری. جا لەم کاتەدا دو مەسەلە خویان قوت ئەکەنەوە لە بەرامبەرمان دا:

یەکەمیان، ئەمەیە کە هەمو هیز و تاقم و کوردیک ئەبی هەلویستی خوی دیار و ئاشکرا کات بەرامبەر بەم هەولەی ئاقمیک لە روله جوامیرە لە خوبوردوەکانی کوردستان ئەیدەن دژی حوکمی فاشیستی بەغداد و ئەو پلانە ئیمپریالیستیەی دژی کوردایەتی گیردرا. ئەوانەی یارمەتی ئەم خەباتە تازەیە ئەدەن دلسوز و کوردپەروەرن و، ئەوانەی دژی ئەوەستن، دژی کوردایەتی ئەوەستن، دژی ژیاندنەوەی شورش و بەربەرەکانی وتعریب و تشرید ء ی گەلەکەمان و لە ناوبردنی کوردایەتی ئەوەستن، لە ریزی حوکمی بەغداد و پلانە ئیمپریالیستیەکەدان.

دوەمیان، ئەمە کە پەیوەندی نیوان ئیوە و یەکیتیی نیشتمانی چون ئەبیت؟

هەروەک لە سەرەتاوە بە نامە بو کاک مەسعود نوسراوە و چەندین جار بە زار و بە راسپاردەش عەرزتان کراوە ئیمە لایەنگری یەکیتیی ریزەکانی گەلی کوردین لە سەر بناغەیەکی: نیشتمانیی و پیشکەوتو دژی ئیمپریالیزم و فاشیست و صەهیونیەتی ئیسرائیلی و سەنتو و هیزە کونەپەرستەکانی خومالی. وە زور هەولیشمان لە گەل ئیوە داوە. ئیستەش بەم نامەیە بە ناوی یەکیتیی نیشتمانیەوە عەرزتان ئەکەم کە:

١. بو هاوکاری سیاسی هەر تەنها یەک ئاکە شەرتمان هەیە ئەویش پچراندنی پەیوەندییە لە گەل ئیمپریالیزم (بە تایبەتی ئەمەریکا) و صەهیونیەتی ئیسرائیلی و سەنتو. واتە یەکگرتنیکی نیشتمانی و پیشکەوتوی کوردایەتی مان گەرەکە و بەس.

٢. بو هاوکاری له کوری شەری پێشمەرگانەدا که دەستمان داوەتی ئێمه ئامادەین له گەڵ هەمو کەس و هێز و تاقم و حیزبێک هاوکاری بکەین که ئامادەی هاوکاری بێت، بەو شەرتەی رازی بێت لە سەر پروگرامی (التجمع الوطني العراقي) که خەباتەکه لە ژێر ئالاکەی دا ئەکرێت.

برایانی بەڕێزا

ئەوەی جێگەی داخه ئێوه تا ئێستا وەرامی هیچ نامەیەک یا وتارێکی ئێمەتان نەداوەتەوه به شێوەیەکی سیاسیانه و ئاشکرا. بەڵکو وەرامەکەتان بریتی بو له پروپاگاندەیەکی شەخسی زور توندوتیژ دژی یەکێتی نیشتمانی بەگشتی و دژی شەخسی من به تایبەتی.

ب. ناردنی تاقمێک کەس لە (پاراستن) بو تورکیه تاکو به هاوکاری له گەڵ پولیسی تورک و سوخابەراتی تورکی هەرچی ئەتوانن دژی شورشی کوریەی کوردایەتی له کوردستانی عیراق دا بیکەن وه بو بلاوکردنەوەی هەمو جوره پروپاگاندەیەکی ناڕەوا دژی یەکێتی نیشتمانی.

ئێسته تاقمەکەی که له تورکیان به ئاشکرا و به بەرچاوی سلطاتی تورکیەوه به دەوری: منع کردنی خەڵک له هاتن بو سوریه له ئێرانەوه، هەڵنەسەن، منع کردنی پێشمەرگەی کوردستانی سەر به یەکێتی له چونەوه عیراق، وه یان پەیوەندی کردنەوەیان له گەڵ براکانیان له سوریه، گرتن و راونانی ئەو مطرەزانەی هاتوچو ئەکەن له نێوان سوریه و عیراق دا.

بێگومان ئەم کارەش راستەوخو به پێچەوانەی کوردایەتی و خزمەت کردنه به دوژمنەکانی، بویه هیوامان وایه به ئەمری ئێوه نەبێت و به ئاگاداری ئێوه نەکرا بێت.

نمونەیەکی زیندوی ئەم کاره گرتنی ٨ هەڤالی چەکداری هێزی پێشمەرگەی کوردستانه که له بادینانەوه ئەهاتنەوه بو سوریه به کاری گرنگ. وه ئەشکەنجه دان و ئەزیەت دانیان به شێوەیەکی دڕندانه. ئەم رووداوه له ٧/١٦ دا له دێ یەکی قشوریەیان ئەوماوه.

- ناردنی عەناسیری پاراستن بو ناو ریزەکانی یەکێتی نیشتمانی له سوریه بو گێرەشێوێنی کردن وه تێک دانی ریزەکانی و دەنگوباس گەیاندن به دوژمنانی گەلەکەمان. بویه ئەلێم دوژمنانی گەلەکەمان - نەک هەر به ئێوه چونکه خوتان ئەزانن که پاراستن له سەر دەستی سوخابەراتی ئیسرائیلی و جیهانی تر تەدریب کراوه بویه دور نیه بگره زور نزیکه نوکەرانی ئیمپریالیزم و ئیسرائیلی تی دا خزا بێت وه خەبەر به دوژمنانی گەلەکەمان

بگەیەنن.

برایانی بەڕێزا

ڕێگەی خەبات و شۆڕش لە کەس نەگیراوە و کەسیش ناتوانێ بیگرێت. ئەگەر ئێوە ئەتانەوێ شۆڕش بکەنەوە خۆ ئەوا دەستی پێ بکەنەوە و، ئێمە هیچ ڕێگەمان لە ئێوە نەگرتوە. ئەگەر تاقمەکەی ئێوە لە تورکیە گەرەکیانە شۆڕش بکەنەوە فەرموو با بیکەنەوە و ئێمەش هیچ کۆسپمان بۆ دروست نەکردوون، تەنانەت ئەمانەی لە سووریەوە گەرەکیانە بچنە لایان ئێمە لە کۆبوونەوەی گشتی داوایان لێ ئەکەین بچن و یارمەتیشیان ئەدەین بڕۆن بۆ لایان وەک یارمەتی بورهانی برای جەوهەر نامیق مان دا.

برایانی بەڕێزا

ئەو کردەوانەی تاقمەکەی ئێوە لە تورکیە لای ئێمە ئیعتیبار کراوە بە اعلانی حرب لە سەرمان وانە دەستکردنەوە بە شەڕی براکوژی لە دوای ڕاکردن لە شەڕکردن لە گەڵ دوژمنان بۆیە داواتان لێ ئەکەین هەڵوێستی خۆتان بە ڕوونی و ئاشکرا دەرببڕن: گەر ئەم کارە بە ئەمری ئێوەیە ئەوا ئیبالی شەڕی براکوژە ئەکەوێتە ئەستۆتان، ئەگەر بە ئەمری ئێوە نیە ئەوا ئەبێ دەستبەجێ (حدیکی جدی) یان بۆ دابنێن و ئەمریان بدەنێ کە برایانی ئێمە بەرەڵڵا کەن وە واز بێنن بە ئیهانەتی لە هەڵسان بە دەوری ژەندرمەیی لە گرتن و مەنع کردنی خەڵک لە هاتوچوون بۆ لای ئێمە. ئەگینا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ناچار ئەبێت هەڵسێت بە واجبی مقدسی (دفاع عن النفس) و ئاشکرا کردنی ئەم ڕاستیە بۆ گەلەکەمان لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستانی عێراق و بۆ ڕەئی گشتی ڕۆژهەڵات و دنیا.

ئەم نامەیە تکایەکی دڵسۆزانەی برایانەیە بۆ بەرپەستی کردنی هەڵگیرساندنی شەڕی براکوژە لە ناومان دا بۆ ئەوەیە کە ئەو خیلافە سیاسییانەی نێوان هەردولا بخرێتە قالبی سیاسی و دیمانی خۆی بە شێوەی ڕەخنە و ڕەخنە لە خۆ گرتن و حواری علنی لە بەرچاوی جەماوەری گەلەکەمان بکرێت، نەک بە شێوەی بە گژ یەکا چوونی عەسکەری و یەکتر کوشتن و هەوڵدان بۆ ئیغتیال کردنی سەرکردەکانی هەردولا.

برایانی بەڕێزا

هیوام وایە نامەکەم بخەنە چوارچێوەی سیاسی خۆیەوە نە پاڕانەوە و نەیە هەڕەشەی ئەدەنە قەڵەم، بە گفتوگۆیەکی صریح و بێ پێچوپەنای بدەنە قەڵەم.

دیسان بانگی ویجدانتان ئەکەم کە دەسکەوتی گەلەکەمان، دەسکەوتی شۆڕشی کۆریە و تازەمان، بخەنە سەر هەمو شتێکی تایبەتی. فەرموون بۆ یەکێتییەکی نیشتمانی پێشکەوتو لە نێوان هەمو هێزەکانی کوردستان و عێراق دا. فەرموون بۆ هاریکارییەکی

جەنی بۆ ژیاندنەوەی شۆرش و خەبات دژی حوکمی فاشیستی بەغدا، شان بە شانی هەمو هێزە پێشکەوتوەکانی عیراق، فەرمون بۆ برایەتی نەوەکا بۆ شەری براکوژە.

بە هیوای وەرامێکی نوسراو لێتانەوە بە خواتان ئەسپێرم

براتان جەلال تالەبانی

ئاگادرای: لە دوای سەری مانگەوە خومان بە سەربەست ئەزانین لە وەرامدانەوەی رەفتاری تالەبانی کەریم سنجاری - جەوهەر نامیق لە تورکیە بە هەمو شێوەیەکی سیاسی، دیعائی،... و هتد. بۆیە تکایە هەرچی ئەیکەن پێش ئەو ماوەیە بێت.

*

لە جزیرە

چەندین هەزار کوردی عیراق بە تایبەتی خەلکی دهوک، زاخو، تەلعەفەر، سمێل، شەنگار، شێخان دوای ئاشبەتال رویان کردبوە سوریا. ئێلە کوردەکان لەو ناوچەیەدا لە هەر ۳ لای سنوردا لە کونەوە لە گەڵ یەک پەیوەندییان هەیە. لە سەردەمی میرایەتی جزیرەدا، هەندێ لە ناوچە کوردنشینەکانی سەر سنوری ئێستای سوریا و عیراق تا شەنگار بەشی بوە لە قەلەمرەوی میری بوتان.

ئەوانەی پەری بونەوە سوریا بە زوری لە گوندەکانی جزیرە دانیشت بون. زوریان لە ناو خزم و ئیلەکانی خویان دا جێگیر بوبون. زوریان بە خیزانەوە هات بون. هەندێکیان پێشمەرگە و هەندێکیان هاوولاتی بون. سوریا رێگای لێ نەگرتبون، بەلام وەزعی قانونییان دیاری نەکرا بو. بە «پەنابەری سیاسی» دانەنرا بون. دەزگایەک هەبو بە ناوی «مکتب شرون العراق» سەر بە حیزبی بەعس ئەو سەرپەرشتی نەکردن. کاغەزی هاتوچوی ئەدانی.

*

د. مەحمود عەلی عوسمان یەکێ بو لەوانەی بە دلسوزی خزمەتی شورش و مەلا مستەفای کرد بو، لە سەر ئاشبەتال لە مەلا جیا بوەوە. ئەو کاتەی لە تهران بو لە گەڵ مامجەلال نامەیان ئالوگور ئەکرد و بە تەلەفون قسەیان ئەکرد. پاش ماوەیەک بە مالەوە هاتە دیمەشق. شەمسەدین موفتی و عەدنان موفتی و قادر جەباری پێتی لە گەڵ هات. ئەمان خویان دەستەیەکی هاوبیرو باوەر بون. د. مەحمود ئامادەیی خوی دەربری بێتە ناو یەکێتییەوە، بەلام ئەیوت لە بەر ئەوەی ئیلتیزامی لە گەڵ شەمسەدین و قادر هەیە ناتوانی دەستیان لێ هەلبگری و، خوی بە تەنیا بێت. لە ناو دەستەی دامەزرێنەر و هەندێ لە کادرانی دەرەوشتوردا هەبون حەزیان لە چارەی شەمسەدین نەئەکرد و، قادریشیان بە

پیاویکی بەدناو ئەزانی. ئەم تاقمەیان هان ئەدا بێنە ناو یەکێتییەوە.

د. محمود بە هاوکاری لە گەڵ هاوڕێکانی «اللجنە التحضیریە للحزب الدیمقراطی الکردستانی» یان دروست کرد، بەو هیوایەی کادر و ئەندامەکانی پارتی لە خۆیان کۆ بکەنەوە و، سەرلەنوێ پارتی ڕێک بخەنەوە.

یەکێ لە کارە هەرە گرنگ و سەرنجڕاکێشەکانی ئەم کۆمیتەیە بڵاو کردنەوەی نامیلکەیەک بو بە ناوی «تقییم مسیرە الثورە الکردیە وانهیارها والدروس والعبر المستخلصە منها» و، بڵاوکردنەوەی حسابی داهات و خەرجی شۆڕش و، پارەی پاشەکەوت کراو بو. تا ئەوسا کەس نەیئەزانی لە کۆبونەوەی شا - بارزانی دا چی وترلوە و، حسابی جولانەوەکە چون بوە.

بنەماڵەی بارزانی زۆر بە خۆ کەوتن. قیادەی موقەتەیان دامەزران. پارتی بو بو بە حیزبی ئەم بنەماڵەیە، کادرو ئەندامەکانی پارتی لە ق م کۆبونەوە و، کەسێکی ئەوتۆ لە د. محمود و کومیتەی ئامادەکردن کۆ نەبوەوە.

*

دوای گەڕانەوەی ئەبەراهیم عەزو و هاوڕێکانی بو کوردستان ئەبو من بچم بو ناوچەی جزیرە و، وەجبەی دوەمی پێشمەرگەکان بنێرمەوە بو کوردستان. لە ڕێ من «دێرکێ» م هەڵبژارد بو شوێنی مانەوەم.

دێرکێ ناحیەیەکی بچوکی ناوچەی جزیرەیە. زۆری ئەو پێشمەرگانەی یەکێتی ڕێکی خستبون لە دێرک و گوندەکانی دەوروبەری دانیشتبون. دێرک کەوتوتە ناوچەی ۳ سنوری عیراق و تورکیا و سوریا. لە نزیک ئەوی چەمی لیشخابور تێکەڵاوی ڕوباری دیجلە ئەبی. ناوچەیەکی دەشتاییە. چاندنی دانەوێڵە بەروبومی سەرەکییانە. ئاژەڵداریش ئەکەن. حکومەتی سوری ناوی دێرکی کرد بو بە «مالکیە» هەروەها ناوی کوردی هەمو گوندەکانی گوری بو بە ناوی عەرەبی.

چەند مانگێ بو چوبومە دێرک. لەوێ بارەگایەکم دانا بو. هەندێ لە پێشمەرگە سورانییەکانیش لەوێ بون. لەوەش چەند مەبەستێکم هەبو:

- شارەزای پێشمەرگەکان بم و بیانناسم.

- ئەوەمان کرد بو بە بنکەی گوێزانەوەی چەک لە ناو تورکیاوە بو سەر سنوری عیراق.

- ڕێگای هاتوچۆ بو ناو عیراق بدوزمەوە.

قم دەورێکی زوری خراپیان هەبو لە تێکدانی ڕیزەکانی پێشمەرگەکان و، تەنانەت لە

ڕەفتاری سیاسییان دا. فێری هەڵاتن و تفەنگ فڕاندن و درۆیی و دوزمانیی و جاسوسیان ئەکردن. نەیانویست گومان و بێ بڕوایی لە ناو ڕیزەکانمانا بڵاو بکەنەوە.

*

بارەگاکەمان لە دێرکی خانوییەکی لە قوڕ دروستکراو بوو، لە گوزلانێکی قەرتاو نەکراودا. دێرکی شارێکی بچوکی دواکەوتوی پشت گوێ خراو بوو. چەردەیەکی زۆر چەکی جۆراوجۆر و، میین و، تی ئێن تی، تێ دا هەڵگیرا بوو. ئەترسام، دەستی تێکدان، ئاگر لە خانوەکەمان بەر بدات یا شتێ بتەقێنێتەوە و،ماڵەکەمان ئاگر بگرێ و، ببێتە هۆی تەقاندنەوەی هەمو گەڕەکەکە. ناوچەکە زۆر نزیک بو لە عیراقەوە. قیادەی مووەقەتیش کتێی لە هێزەکەمان دا کرد بو. ناو بە ناو پێشمەرگەمان ڕایان ئەکرد بۆ تورکیا و چەکیان ئەفراندین. لە بەر ئەوە بۆ ئێشکی ماڵەکە ناچار بوم زۆر بە وریایی پێشمەرگە هەڵبژێرم و، تەنها ئەوانەم دائەنا کە زۆر لێ یان دڵنیا بوم.

بارەگاکەمان دو کەسی خۆشی لێ بو، نمونەی دو کەسایەتی جیاواز بون: مامە زەبیا و یونس. مامە زەبیا دیان و، بە ڕیچەڵەک تیاری بو. ماوەیەکی درێژ پێشمەرگایەتی کرد بو. خواردنی بۆ دروست ئەکردین. یونس خۆشناو بو خەڵکی شەقڵاوە بو. ژمارەیەکی زۆر ڕادیۆ شکاوی کۆ کرد بوەوە، گوایە پارچەکانی بە کار ئەهێنان بۆ چاکردنی ڕادیۆ و ڕێکوردەری تر. بێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکی، لەم پیشەیەدا، هەبێ، زۆر ڕادیۆی خراپ کرد. جەماعەت کەرستەیەکیان دەس کەوت بۆ خۆیانی پێوە خەریک بکەن. یونسیان هەڵئەدا و لە گەڵ مامە زەبیا بە شەڕیان ئەدان.

لە منالیەوە حەزم لە پەروەردەکردنی گوڵ و، ڕاگرتنی مەل و، گیان لە بەر، ئەکرد. ئەمانە لەو سەرگەرمیانەی من بون، کاتی بێکاری و بەتاڵیم پێ بەسەر ئەبرد و، حەسانەوەی دوای ماندبونیان پێ ئەبەخشیم. لە حەلەب چەند کەوێکی تۆرم کڕی و، لە گەڵ خۆم بردمەوە بۆ بارەگاکەی دێرکی و، لەوێ دامنان بە هیوای ئەوەی بە شمەنیی کەویان بکەم. بۆ کارێکی پێویست ئەبو بچم بۆ قامیشلی. کەوەکانم بە یەکێ لە پێشمەرگاکان سپارد تا خۆم ئەگەڕێمەوە ئاگای لێیان بێ. چەند ڕۆژێ لە قامیشلی گیر بوم. کە گەڕامەوە کەوەکان نەما بون. پرسیم: «چییان لێ هاتوە!» وتیان: «پشیلە خواردونی».

زۆرم پێ ناخۆش بو بەو هەمو پێشمەرگەیە نەیانتوانی بو چەند کەوێ لە پشیلە بپارێزن. زۆری لە سەر ڕۆیشتم و، زۆرم توانج و تەشەر لێ دان. سەرەنجام یەکێکیان دەرکاندی کە پشیلە کەوەکانی نەخوارد بو، بەڵکو کوڕێک سەری بڕی بون، ناوی ڕەشوڵ بو. زۆر زیاترم پێ ناخۆش بو، چونکە: یەکەم، ئاشتیی و بێ زەوقی ڕەشوڵی ئەگەیاند و،

دوەم، شاردنەوەی رووداوەکانی ناو ماڵەکە لە من، بە رەفتارێکی نا دروستم ئەزانی.

رەئوف خەلکی دوبزی لای کەرکوک بو لە تەهرانەوە هات بو. بو هەندی کاروبار ناردمانە ناوچەی هەکاری لە تورکیا. لە دێ یەک مایەوە و، ئیتر لەوێ جێگیر بو.

لە گەڵ خوم جوتێ پێڵاوی شاخەوانی ئەسپایم برد بو. چەرمەکەی ئەستور بو، ناوبەناو پێویستی بە چەورکردن هەبو. تەنەکەیەکی کرێمم لە تاقێکی ژوورەکەم دا دانا بو. پاشماوەیەک دەسم لێ دا خەریک بو تەواو ئەبو. بە لامەوە سەیر بو چونکە خوم بەکارم نەهێنا بو. پرسیم: «کێ بەکاری هێناوە؟». لە پێش دا کەس نەیهێوە ژێری. دوایی حەسەن خوی دانی پی دا نا کە ئەو بە کاری هێناوە. ئورمەز هەمو جار کە ڕیشی تاشی بو پەو کرێمە دەموچاوی چەور کرد بو.

حەسەن خەڵکی کەرکوک بو لە ئێرانەوە هات بو. ئەویش چو بۆ ئەورووپا دانیشت.

عارف لە شام پێ تاقەت بو بو ماوەیەک هاتە دیوکی پای پالی خوی بدات. شەوێک داپان ناپو بە ئیشککگر. کاتی سەرەی گەیشت پویە، چی لە گەڵی خەریک بو بون لە خەو هەستی ماوەی دیاریکراوی خوی ئیشک بگری، هەڵنەستا بو، وت بوی: «هەڵناستم پێویستم بە خەو هەیە». هاورێکانی ئەوەندەیان سەر کردە سەری، سەری خوی هەڵگرت، لە پێش دا چوە خەلیج و، سەرەنجام لە سوید گیرسایەوە.

*

لە ناو ئاوارەکانی جەزیرەدا تاقمێکی زور یەزیدییان تی دا بو، پلە و پایەی کومەلایەتی و دینییان جیاواز بو، وەکو: شیخ، قەوال، فەقیر...

شیخ حەسەن، خوێندەوارێکی روشنبیر و، سیاسیەکی کوردپەروەر و، نەجیب، کوری بابەشیخ بو. لە ناو یەزیدییەکان دا «میر» خاوەنی دەسەلاتی دنیایی و، «بابەشیخ» خاوەنی دەسەلاتی دینییە. لە مەسەلە دینییەکان دا بابەشیخ «فەتوا» ئەدا و، راست و ناراست دیاری ئەکا، تەنانەت ئەتوانی یەزیدی لە دین دەر بکا.

جگە لە شیخ حەسەن چەند شیخێکی تری لێ بو، لەوانە: شیخ خەلەف. خەلەف لەو سەردەمەدا کە بەعسیەکان گیچەڵیان بە کوردەکانی شەنگال ئەکرد و، ئەیانویست رایان بگوێزن، لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی پارتی بو لە سنجار بو. لەو هەرایەدا قایمقامی سنجار کوژرا. لەم رووداوەدا شیخ خەلەف تاوانبار کرا بو. شیخ خەلەف ئەگەرچی نەخوێندەوار بو، بەلام پیاوێکی نوکتەبازی وریا و، شارەزای کاروباری دینی خویان و ناوچەکەیان بو.

یەزدین، حەسەن نەرمو، خودێدە پسی، قاسم ملکو... لە پیاوە ناسراوەکانیان بون.

له سەر یەزیدییەکان کتێب و وتار زۆر نوسراوە.

عوسمانییەکان بە هاندان و فەتوای مەلاکان زۆر جار لەشکریان ناردوتە سەریان، جگە لەوەی بە شەیتانپەرستی و، کافری تاوانباریان کردون، شتێکی تریان لە سەر نەنوسیون.

ئەم کەماپەتییە دینییە سەرنجی هەندێ لە نوسەر و گەڕیدە ئەوروپاییەکانی راکێشاوە. سەردانی ناوچەکانیان کردون و، شتیان لە سەر نوسیون. کتێبەکەی «لایارد» بە ئینگلیزی لەسەر «کەلاوەکانی نەینەوا» هەندێ وێنەی دەسکردی جوانی یەزیدییەکان و شوێنە پیرۆزەکانی تێ دایە.

لە سییەکانی ئەم سەدەیەوە بە عەرەبی چەندین وتار و کتێبیان لە سەر نوسراوە، لە ناو ئەوانەدا هەردو مێژونوسی عیراقی: «السید عبدالرزاق الحسني» و «المحامي عباس العزاوي» دو کتێبیان لە سەر نوسیون و، چەند جاری دەسکاریان تێ دا کردوە و، چاپ کراونەتەوە.

شاکیر فەتاح، ماوەیەک لە ناویان دا ژیا بو، ئەویش بە کوردی کتێبێکی لە سەر نوسیون. پێش ئەوەی بلاوی بکاتەوە چەند بەشێکی بو ئێمە نارد لە «ژینگاری» دا بە زنجیرە بلاومان کردەوە.

یەزیدییەکان خۆیان هیچیان لە سەر خۆیان نەنوسیوە.

تا ئێستاش لێکۆلینەوەیەکی زانستی بێلایەن و تیروتەسەلیان لە سەر نەنوسراوە، لە بەر ئەوە زۆر بابەتی دینیی و کۆمەلایەتییان، هێشتا وەکو مەتەڵ ماوەتەوە و، هەریەکە بە جۆری لێ یان ئەدوێ.

بو من هەلێکی باش رەخسا بو هەندێ لە زانیارییە کونەکانی لە سەر یەزیدی خوێند بومەوە تاقی بکەمەوە و، هەندێ شتی نوێ یان لێ فێر بوم. سەرەتا سلیان لێ ئەکردمەوە. منیان بە «کومەلە» ئەناسی و، پێش منیش نونەیەکی خراپی کومەلەیان دی بو. وایان ئەزانی منیش لەو تیپەم. زوری پێ نەچو سلەکەیانم رەواندنەوە. بوین بە دوست و ئاشنا. بێ سلەمینەوە گفتوگومان ئەکرد و، بە راشکاوی وەلامی پرسیارەکانیان ئەدامەوە و، هەندێ لە بیروڕا دینییەکانی خۆیان بو رون ئەکردمەوە.

یەزیدییەکان بە خۆیان ئەلێن: «میللەت» و بە دینەکەیان ئەلێن: «تولی ئێزدی». خۆیان بە میللەتی هەلبژێردراوی یەزدان ئەزانن، چونکە لایان وایە مروڤایەتی هەموی لە نەوەی «ئادەم و حەوا» ن، بە تەنیا ئەوان لە «ئادەم» کەوتونەتەوە. بە کرماڵجییەکی رەوان ئەدوین و، لایان وایە لە روژی قیامەت دا خوا و فریشتەکانی بە کرماڵجی لە گەڵ مروڤ

ئەدوین و، هەر کەسێ ئەم زمانە نەزانێ ناچێتە بەهەشت. ترۆز و بەیعە دینییەکانیان هەموی بە کرمانجییە.

«ئولی ئیزدی» بێگومان دینێکی کۆن و سەربەخۆیە، تایبەت بووە بە کورد. بە تێپەڕینی زەمان و لە ئەنجامی تێکەڵاوییان لە گەڵ دینەکانی دراوسێیان هەندێ باوەڕ و نەریت و زاراوەیان لێ وەرگرتوون، بەڵام ئەمە کاری نەکردوەتە سەر باوەڕە بنەڕەتییەکانیان.

ئایینەکان بە گوێرەی «خواپەرستی» دابەش ئەکرێن بۆ یەک خوایی «مونو ثایزم» و، دوخوایی «دوالیزم» و، چەند خوایی «پولی ثایزم»:

- یونانییەکان باوەڕیان بە هەبونی «چەند خوا» هەبوە، وەکو خوای جوانی، خوای شەڕ، خوای باران، خوای دەریا...

- زەردەشتییەکان باوەڕیان بە هەبونی «دوخوا» هەبوە، خوای چاکە «ئاهورامەزدا» و، خوای خراپە «ئەهریمەن».

- جو و، مەسیحی و، موسولمان باوەڕیان بە هەبونی «خوای تاک و تەنیا» هەبوە و، لایان وابوە ئەوانەی دوخوا یا زیادتر ئەپەرستن موشریک و کافرن.

زۆر کەس وا ئەزانن یەزیدییەکان ئەچنە خانەی «دوخواپەرستەکان»ەوە. هەندێ لە روشنبیرانی یەزیدی بۆ خۆیان بە پاشماوەی زەردەشتییەکان دائەنێن. بەڵام ئەوەی من لەو ماوەیەدا لێیان تێ گەیشتم: یەزیدییەکان باوەڕیان بە «ئیزد»، واتە خوای تاک و تەنیا هەیە. «مەلەک تاوس» کە موسولمانەکان بە «شەیتان» و، هەندێکی تر بە خوای شەڕی زەردەشتییەکان «ئەهریمەن»ی دائەنێن «ئیزد» یا «خودی» نیە بەڵکو «فریشتە: مەلایکەت» ە، بەڵام فریشتەیەکە پایەیەکی تایبەتی لای یەزدان هەیە، چونکە ئەم لە روناکی دروست بوە نەک لە ئور.

یەزیدییەکان بە درێژایی مێژو قوربانیی زۆرلێکراوی ئازادی دین و بیروباوەڕیان بون. زۆر جار کەوتونەتە بەر پەلاماری بێ بەزەییانەی ئوردوی تورک و، حوکمڕانەکانی دەوروپشتیان. وەکو دەساودەم بۆیان باس کردوم ۳۲ جار «فەرمان» بۆ لە ناوبردنیان دەرچوە. فەرمان وشەیەک بوە بە مەعنای: «ئەمری سولتان و گەورە کاربەدەستەکانی عوسمانی»، بەڵام لە زمانی ئەمان دا «ڕابونی فەرمان» واتە قەتڵوعام، یا بە زمانی ئەم زەمانە «جینوساید»، چونکە هەمو جار فەرمانەکان بۆ لە ناوبردنی یەزیدی و تاڵانکردن و وێرانکردنی ئاوایییەکانیان بوە. بە هۆی ئەم هەمو پەلامارەی خۆیان و شوێنە پیرۆزەکانیانەوە، هیچ بەڵگەیەکی نوسراویان نەماوە. کتێبە پیرۆزەکانیان: «جیلوە» و «مەسحەفی رەش» لای خۆیان نەماوە و، ئەوەی دەس ئەوروپاییەکانیش کەوتوە جێگای

باوەر نیە. باوەڕە دینییەکانیان ئەوەیە کە لە سەنگی «بابەشێخ» و «قەواڵ»ەکانیان دا پارێزراوە.

«قەواڵ» کە لە وشەی «قەول» داتاشراوە، بەو کەسانە ئەڵێن کە بەیتە دینییەکانی ئولی ئێزدییان لە بەرە و، لە مۆناسەبەتە دینییەکان دا بە گۆرانییەوە بۆیان ئەگێڕنەوە. قەواڵەکانی سەردەمی زۆ نەخوێندەوار بوون. یەکێ لە بەیتە دینییە گرنگەکان: «بەیتی ئافراندن»، واتە «سفر الخليقة» یە کە باسی دروستبوونی گەردوون ئەگێڕێتەوە لە باری سەرلێجی دینییانەوە. بەیتی تریان زۆرە. بەیتەکانیان سادەن و، لە سەر ئەفسانە دامەزراون.

زۆرم مەبەست بو تێرمینۆلۆجی تایبەتی ئولی ئێزدی ساخ بکەمەوە و، لە گەڵ زاراوە ناسراوەکانی تیۆلۆجی و سۆسیۆلۆجی بەراوردیان بکەم. شتێکی ئەوتۆم گیر نەکەوت، چونکە زۆری زاراوە کرمانجییەکان فەوتاون و لە بیر چوونەتەوە، ئەوی ما بو کەمێکی زۆر کەم بو، بەڵام وەکو «مفهوم» و «معنى» باسی ئەکەن.

یەکێ لەو باسانەی ئەمەویست بچمە بنجوبناوانی و، زاراوەکانی وەربگرم «تناسخ» بو. «تناسخ» کە لای کاکەیی «ئەحلی حەق» پێ ی ئەڵێن: «دوونادوون» لای ئەمان زاراوێکی تایبەتی نیە. کەمێ لە بنەرەتی باوەڕە دینیەکانیانە. عبدالرزاق الحسنی باسی ٤ جور «دونادون» ئەکا: «نسخ، فسخ، رسخ، مسخ»، بە واتای چوونی گیانی کەسێ کە ئەمری، بە گوێرەی کردەوە باش یا خراپەکانی، بو ناو لەشی کەسێکی تر، یان ئەچێتە ناو لەشی حەیوان، یان ئەبێ بە نەبات، یا جەماد.. ئەم باوەڕەیان لە لا هەیە، بەڵام بە وشە و زاراوی تایبەتی دیاریان نەکردوە.

احمد العزاوي، ئەندامی «قیادەی قەومی» و «ئەمین سری قیادەی قوطری عیراق»، لە تەقینەوەیەک دا لە شام کوژرا. بەعسییەکان لە قامیشلی پرسەیان بو دانا بو. لە گەڵ چەند کەسێکی تر، لەوانە هەندێ یەزیدی، چووین بو پرسەکە. لەوێ بە دەنگێکی نزم لە شێخ خەلەفم پرسی: «گیانی ئەم کابرایە چوتە چیەوە؟». بێ سەرودو وتی: «کوچک»، واتە سەگ. دیارە سەگ لای خەڵکی ئەم ناوچانە گڵاو و سوک و چەپەڵە.

ئولی ئێزدی دینێکە لە سەر بنچینەی چینایەتی دابەش بوو. چینەکان: میر، شێخ، قەواڵ، فەقیر، داخراون. بە میر، کە بەرزترینیانە دەس پێ ئەکا، بە فەقیر، کەمترینیانە دوایی دێ. یەکێکی چینی خوارووتر هەرچی بکا ناتوانی هەڵکشی بو چینێکی لە خوی بەرەوژوورتر. هەمیشە لە ناو سنووری چینەکەی خوی دا ئەمێنێتەوە و، بوی نیە ژن لە چینی سەرووی خوی بهێنێ.

لە ناو یەزیدی دا «کریف» ڕێزێکی تایبەتی هەیە. دو خێزان یا دو بنەماڵە کە

خزمایەتییان نیەو ئەمانەوی بێن بە دوست و هاوپەیمانی یەکتری، ئەبن بە «کریف».

ئەم دو لایە وا ریک ئەکەون لە ئاهەنگی «خەتەنە» ی کورەکەدا ئامادە ئەبی، پیاوێکی لای یەکەم منالی پیاوی لای دوەم ئەکاتە باوەشی و، خەتەنەی ئەکەن. پاشە ئیتر ئەبن بە «کریف» ی یەکتری، لە خوشی و ناخوشی و، شایی و شیوەنی یەکتری دا، هاوبەش ئەبن. تەنانەت لە شەری خێلایەتی دا لە سەر یەکتری ئەکەنەوە.

یەزیدی بوی هەیە لە گەڵ موسوڵمان، مەسیحی و، جو، ببێتە «کریف»، بەڵام بوی نیە لە غەیری یەزیدی ژن بهێنی.

یەزیدییەکان ریزێکی تایبەتی بو گەورەکانیان قایل بون و، پیرەوی پاپەی چیناپەتییان ئەکردن. میری یەزیدییەکان، تەحسین بەگ، لە حەفتاکان دا چو بوە ناو شورشەوە و، دوای ئاشبەتاڵ چو بوە ئەوروپا. ئەو ماوەیەی من لە جەزیرە بوم، سەردانێکی یەزیدییەکانی جەزیرەی کرد. وەکو کەسێکی پیروز رەفتاریان لە گەڵ ئەکرد. دەست یا چاکەتەکەیان ماچ ئەکرد. تەنانەت لە کاتی داکەندن و لە پێ کردنی پێلاوەکانی دا، یەکی بە ئارەزوی خوی لە پەردەی دا دائەنیشت، قاچی بە پێلاوەکانەوە ئەگرتە باوەش بو کردنەوە و بەستنەوەی قەیتانەکانی. هەندی لە یەزیدییەکان لە بەر داپێنکردنی گوزەرانیان بو بون بە پەعسی. پەعسی لی ی قەدەغە کرد بون دەستی تەحسین بەگ ماچ بکەن. ئەوانیش بە دزییەوە دەستیان ماچ ئەکرد.

هەندی رەوشتیان هەیە پێ ئەچی خویان پێوە گرت بێ و، لێ یان بوبی بە نەریت، ئەگینا هیچ تەفسیرێکی دینیی ئەوتویان بوی نیە. بو نمونە: سمێل ناتاشن، هەندێکیان ئەگریجە بەرئەدەنەوە، کاهو ناخون، خویان لە رەنگی شین ئەپارێزن... شێخ خەلەف و بنەماڵەکەی گوشتی کەلەشێریان نەئەخوارد، هەرچەند کەلەشێری دەس پەکەوتایە بو منی ئەنارد.

ئەوەندەی من ناسیمن و، تێکەڵاویان بوم، نمونەی پیاوی جوامێر و رەوشت بەرز و سەر راست بون.

*

عەبدورەزاق فەیلی سەرپەرشتی رێکخستنەوەی کوردە عێراقییەکانی قامیشلی ئەکرد. هەر لەو نزیکانە پاش گیرانی هەندی لە ئەندامەکانی کومەڵە لە بەغدا ئیبراهیم عەزو، ئەنوەر شاکەلی و ئیبراهیم عەبد عەلی کە هەرسێکیان ئەندامی کومەڵە بون و فەرمانی گرتنیان دەرچوبو، بە پێ لە سنور پەرینەوە و، گەیشتنە سوریا.

سەرکردایەتی یەکێتی کومیتەیەکی پێک هێنا بو لە قامیشلی بو سەرپەرشتی

ڕێکخستنی ئەوانەی بە ئەندامەتی یان بۆ پێشمەرگایەتی ئەهاتنە ڕیزی یەکێتییەوە. سوریا کارئاسانی زۆری بۆ چالاکییەکانی یەکێتی ئەکرد. دەورەیەکی جەنگیی بۆ ئەفسەرەکان و، چەند دەورەیەکی بۆ پێشمەرگەکان کردەوە.

*

ناوچەی جزیرە درێژبونەوەی جوگرافی جزیرەی بۆتانە و، بەشێک بوە لە قەلەمڕەوی ئەوان. سەردەمێکی درێژ مەلبەندی هاتوچوی ئێلە ڕەوەندەکان بوە و، بە دەگمەن ئاوایی تێ دا بوە. دوای یەکەمین جەنگی جیهانی کە سوریا لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی جیا کرایەوە، هێلی ئاسنین کرایە سنوری هەردو وڵات. ئەم سنورە چەندین شار و ئاوایی و ئێل و بنەماڵەی، بێ هیچ ئیعتیبارێکی ئینسانی، کردوتە دوبەش. شارەکانی: نسیبین - قامیشلی، جەیلانپنار - سەریکانی (راس العین) لەوانەن.

*

کابرایەک بە ناوی «محمد طلب هلال» کتێبێکی لە سەر ناوچەی جەزیرە نوسی بو. کوردەکانی سوریا، بە تایبەتی ئەوانەی لە دەرەوە ئەژیان، هەرای زۆریان لە دژی کرد، ڕۆژنامەی حیزبە کوردییەکان، لەوانە «خەبات»، وتاریان لە سەر نوسی بو. «عیصمەت شەریف» یش ئامێلکەیەکی بە ئینگلیزی بۆ بەرپەرچدانەوەی نوسی بو. مەسەلەی «الحزام العربي» و «الحزام الاخضر» و تەعریبی ناوچە کوردنشینەکانی جەزیرە، بو بو بە پەژارەی ڕاستەقینەیان و، ئەم کتێبەیان ئەکرد بە شایەت و بەڵگە. دانەیەکم لە کتێبی تایبەتی پەیدا کرد و، کەوتمە خوێندنەوە و تاووتوی کردنی. لێرەدا بیر و پێشنیارە بنەڕەتییەکانی ئەگێڕمەوە.

ناوی کتێبەکە:

«دراسة عن محافظة الجزيرة: من النواحي القومية، الاجتماعية، السياسية»

ناوی نوسەرەکەی:

الملازم الاول محمد طلب هلال رئيس الشعبة السياسية بالحسكة

ساڵ و شوێنی چاپی لە سەر نیە، بەڵام لە ١٢/١١/١٩٦٣دا لە نوسینەوەی بوتەوە. بە سەر یەکەوە ١٥٦ لاپەڕەیە.

لە (المقدمە) دا باسی ئەبونی سەرچاوەی پێویست ئەکا، لە بەر ئەوە نوسینەکەی لە سەر بنچینەی تەجروبەی خۆی و کەسانی تر نوسیوە و، باسی گرنگیی پاککردنەوەی ئەتەوەیی ناوچەکە ئەکا لە تاڵی ئەعەرەب بە تایبەتی پاش دوزینەوەی ئەوت لە ڕومەیلان و قەرەچوخ.

له (المدخل) دا (ل ١ تا ٢) به داخەوە لەوە ئەدوێ کە کابرایەکی عەرەب لەو ناوچەیەدا، بە هۆی زۆریی ناکوکی و تێکەڵاوبی رەگەز و نەتەوە و دینی جیاوازەوە، هەست بەوە ناکا لە وڵاتی خۆیایەتی. لە بەر ئەوە داوای پاککردنەوەی ئەکا لە رەگەزی بێگانە.

بەشی یەکەم (ل ٣ تا ٢٥)ی تەرخان کردوە بۆ «سەرلەبەکی مێژوویی لە کێشەی کورد» لەوەدا باسی کێشەی کورد ئەکا لە سەرەتاوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم و، کاتی یەکەمین جەنگی جیهانی و، نێوان دو جەنگ. باسی بیری نیشتمانی نەتەوەیی کورد و، کورە جیهانیەکان و ئیمپریالیزم و کورد ئەکا.

لەم بەشەدا ئەیەوێ بیسەلمێنێ کورد نەتەوە نیە و نیشتمانی نەتەوەیی نیە. دوژمنانی عەرەب بە تایبەتی ئیمپریالیزم کوردیان خستوتە سەر کەلکەڵەی بیری نەتەوەیی. لە شوێنێک دا ئەڵێ: «واذا یمکننا القول بانه لیس هناك شعب بمعنی الشعب (کردی) ولا امة بکاملها بمعنی الامة الکردیة» ئینجا ئەڵێ: «لا یتعدی الشعب الکردی هذا المجال حیث لا تاریخ لهم ولا حضارة ولا لغة حتی ولا جنس، اللهم الا صفة القوة والبطش والشدة..» «ولیست المشکلة الکردیة الان وقد اخذت فی تنظیم نفسها الا انتفاخ ورمی خبیث نشأ او انشئ فی ناحیة من جسم هذه الامة العربیة ولیس له ای علاج سوی بتره»

بەشی دووەم (ل ٢٦ تا ٤٨) ی گرنگترین بەشەکانی کتێبەکەیە. شوێنی کوردەکانی سوریا دیاری ئەکا و، باسی خێڵەکانیان ئەکا، پێشنیارەکانی خۆی بە دیاری کراوی ئەخاتە بەرچاوی کاربەدەستان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد.

شوێنی کوردەکانی جزیرە بەم جۆرە دیاری ئەکا:

«یتجمع الاکراد علی طول الشریط الشمالی محاذیا للحدود الترکیة فی محافظة الجزیرة بعمق نحو الجنوب یتراوح بین ١٥ - ٣٥ کیلومتر تقریبا من منطقة راس العین غربا حتی حدود منطقة المالکیة شرقا حیث یتکاثف التجمع هذا فی الامکنة الخصبة بحیث یستعصی علیك ایجاد جیب عربی صغیر فی بعض المناطق وخصوصا فی منطقة المالکیة والقبور البیض والقامشلی وعامودا ویحتلون اخصب المناطق فی الجزیرة واکثرها امطارا حیث تتراوح نسبة الامطار فی منطقة المالکیة والقامشلی بین ٤٠٠ - ٥٠٠ مم مطری حسب خریطة الامطار.»

کە باسی خێڵە کوردەکانی سوریا ئەکا هەمویان تاوانبار ئەکا بەوەی خەریکی بە نیشتمانی نەتەوەیی: کوردستانەوە ئەبیان، پارتی و شیوعین، ئیسلام نین و لە سەر دینی شیعەتن، بەلام بە پێ ی ئەخشەی ئیمپریالیزم بۆ هەڵخەڵەتاندنی عەرەب باسی ئیسلامەتی

ئەکەن، هەمویان لە تورکیاوە هاتون و، لەو دیو سنور ئامۆزاو خزمیان هەیە و، سنور بە خەتێکی رەسمی دائەنێن. خێڵە گرنگەکان وەکو هیلال ژمارەونی ئەمانەن:

١. هەڵهێرکان. لە قبور البیض و قامیشلی و هەندێکی لە حەسەکە جێگیر بون.

٢. دەقۆری. لە قامیشلی و عامودە جێگیر بون. نزیکەی ٤ هەزار خێزانن لە ١٢٠ گوندا ئەژین. ئەم خێڵە ئەبن بە چەند تیرەیەکەوە گرنگترینیان: گابارە، لە ٣٠ گوندی عامودا ئەژین. کاباکا، لە ٢٠ گوندی عامودا ئەژین. سیدان، لە ٢٠ گوندی عامودا ئەژین.

٣. کیکی. لە درباسیە جێگیر بون. نزیکەی ٣ هەزار خێزانن لە ١٥٠ گوندا ئەژین. ئەم خێڵە ئەبن بە چەند تیرەیەکەوە گرنگترینیان: ساروخان، کورسکان، ئومەران، هیسکان، ئیسماعیلانە.

٤. مرسینی. لە قامیشلی جێگیر بون. بەرەوژوری ١ هەزار خێزانن.

٥. ملی. لە راس العین جێگیر بون. نزیکەی ١٥٠٠ خێزانن. ئەبێ بە ١٠ تیرەوە گرنگترینیان: خضرکان، کومنشان، تاجریان، دودکان، شیخان، دیلان، مائدان، زیلان...

جگە لەمانە چەند خێڵێکی تری کورد ئەژمێری وەکو: بەرازی لە عین العرب و راس العین، کیتکان، شیخان، محەملی لە رۆژهەڵاتی قامیشلی، دورکان، جابیە و حەسنا و میران یا کوچەر.

دێتە سەر ئەوەی لەوەو پێش چۆن سەیری کوردیان کردوە و، لەمەوە بە دوا ئەبێ چۆن سەیریان بکەن. لەوەو پێش لایان وا بوە کورد ئەمین و دڵسۆز و گوێڕایەڵە و، پەیوەندی دینیی ئیسلام پێکیانەوە ئەبەستێ. بەڵام ئیسلام ناتوانێ ئیتر ئەو پەیوەندیە رابگرێ و، «بهدوستان» و «کوردستان» وەکو یەکن.

پاش ئەوەی ئیوریە رەگەزپەرستیەکانی دەربارەی پارتی و، ئەوەی تازەی کورد رون ئەکاتەوە و، دەوری هەردو بلوک: رۆژئاوا و رۆژهەڵات لە دوژمنایەتی عەرەب دا بە هۆی جولەکە و کوردەوە باس ئەکا و ئەڵێ: «لم يتفق المعسكرين في تاريخ صراعهما على شئ اتفاقهما على مسرحيتين وعلى الارض العربية بالذات هي مسرحية فلسطين و مسرحية كردستان، كردستان العربية على وجه الخصوص.»

هیلال هێرش ئەکاتە سەر کاربەدەستانی میصر، بە تایبەتی ناصر، چونکە کورد بە برای دینیی عەرەب دائەنێن و، داوای چارەسەری بە ئاشتی کێشەکەیان ئەکەن و، ئەم بۆچونەی ئەوان بە «شعوبی» و «سطحی» دائەنێ، ئینجا دێتە سەر بیروڕاکانی خۆی. لە

بەر گرنگی باسەکە وەکو خوی رابان ئەگوێزم. لە ژیر سەرناوی «المقترحات بشان المشكلە الكرديه» دا نوسیویتی:

١. ان تعمد الدولة الى عمليات التهجير الى الداخل مع التوزيع فى الداخل ومع ملاحظة عناصر الخطر اولا فاولا. ولا باس ان تكون الخطة ثنائية او ثلاثية السنين تبدا بالعناصر الخطرة لتنتهى الى العناصر الاقل خطورة وهكذا...

٢. سياسة التجهيل: اى عدم انشاء مدارس او معاهد علمية فى المنطقة لان هذا اثبت عكس المطلوب بشكل صارخ وقوى...

٣. ان الاكثرية الساحقة من الاكراد المقيمين فى الجزيرة يتمتعون بالجنسية التركية. فلا بد لتصحيح السجلات المدنية وهذا يجرى الان انما نطلب ان يترتب على ذلك اجلاء كل من لم تثبت جنسيته وتسليمه الى الدولة التابع لها. اضف الى ذلك يجب ان يدرس من تثبت جنسيته دراسة ايضا معقولة وملاحظة كيفية كسب الجنسية لان الجنسية لا تكسب الا بمرسوم جمهورى. فكل جنسية ليست بمرسوم يجب ان تناقش تبقى من تبقى اى الاقل خطرا وتنزع من تنزع منع الجنسية لنعيده بالتالى الى وطنه.

ثم هناك تنازع الجنسيات فانك لتجد احدهم يحمل جنسيتين فى ان واحد او قل ثلاث جنسيات. فلا بد والحالة هذه ان يعاد الى جنسيته الاولى وعلى كل حال فالمهم ما يترتب على ذلك الاحصاء والتدقيق من اعمال، حيث يجب ان نقوم فورا عمليات الاجلاء.

٤. سد باب العمل: لابد لنا ايضا مساهمة فى الخطة من سد ابواب العمل امام الاكراد حتى نجعلهم فى وضع، اولا غير قادر على التحرك وثانيا فى وضع غير المستقر المستعد للرحيل فى اية لحظة وهذا يجب ان ياخذ به الاصلاح الزراعى اولا فى الجزيرة بان لا يوجر ولا يملك اكراد والعناصر العربية كثيرة وموفورة بحمدالله.

٥. شن حملة من الدعاية الواسعة بين العناصر العربية ومركزة على الاكراد بتهيئة العناصر العربية اولا لحساب ما وخلخلة وضع الاكراد. ثانيا بحيث يجعلهم فى وضع قلق وغير مستقر.

٦. نزع الصفة الدينية عن مشايخ الدين عند الاكراد وارسال مشايخ بخطة مرسومة عربا اقحاحا. او نقلهم الى الداخل بدلا من غيرهم. لان مجالسهم ليست مجالس دينية ابدا بل وبدقة العبارة مجالس كردية. فهم لدى دعوتهم الينا لا يرسلون برقيات ضد البرزانى انما يرسلون ضد سفك دماء المسلمين. واى قول هذا القول.

٧. ضرب الاكراد فى بعضهم وهذا سهل وقد يكون ميسورا باثارة من يدعون منهم بانهم من اصول عربية على العناصر الخطرة منهم. كما يكشف هذا العمل اوراق من يدعون

بانهم عرباً.

٨. اسكان عناصر عربية وقومية في المناطق الكردية على الحدود لهم حصن المستقبل ورقابة بنفس الوقت على الاكراد ريثما يتم تهجيرهم. ونقترح أن تكون هذه العناصر من شمر لانهم اولا افقر القبائل بالارض وثانيا مضمونين قوميا مئة بالمئة.

٩. جعل الشريط الشمالي للجزيرة منطقة عسكرية كمنطقة الجبهة بحيث توضع فيها قطعات عسكرية مهمتها اسكان العرب واجلاء الاكراد وفق ما ترسم الدولة من خطة.

١٠. انشاء مزارع جماعية للعرب الذين تسكنهم الدولة في الشريط الشمالي على ان تكون هذه المزارع مدربة ومسلحة عسكريا كالمستعمرات اليهودية على الحدود تماما.

١١. عدم السماح لمن لا يتكلم اللغة العربية بان يمارس حق الانتخاب والترشيح في المناطق المذكورة.

١٢. منع اعطاء الجنسية السورية مطلقا لمن يريد السكن في تلك المنطقة مهما كانت جنسيته الاصلية (عدا الجنسية العربية. الخ..

هذا وان هذه المقترحات ليست كافية بل اردنا منها اثارة المسؤولين بحسب خبرتنا لتكون تباشير مشروع خطة جذرية شاملة لتؤخذ للذكرى بعين الاعتبار.

بەشی سێیەم (ل ٤٩ تا ٨٢) تەرخان کراوە بۆ بڵاو کردنەوەی هەندی بەڵگە و، وتاری ڕۆژنامەکانی جیهان دەربارەی شۆرشی کوردستانی عیراق. پی ئەچی زۆری بەڵگەکان درو بن و دەستکردی خۆیان بی بە نیازی شێواندنی خواستە سیاسی و کومەڵایەتی و ڕوشنبیرییە ڕەواکانی کورد لە سوریا و، هاندانی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب لە کورد.

بەشی چوارەم (ل ٨٢ تا ١٠٩) باسی حیزبە سیاسیەکانی پارێزگای جەزیرە ئەکا. لە ناو ئەو حیزبانەدا باسی پارتی ئەکا. کابرا بە ئەنقەست پارتی دیموکراتی کوردی سوریای تیکەڵاو کردوە لە گەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق. بەشی لە پروگرامی پارتیەکەی عیراقی نوسیوە وەکو ئامانجی پارتیەکەی سوریا.

بەشی پێنجەم (ل ١١٠ تا ١٣٧) شوینی عەرەب و خێلە عەرەبیەکانی جەزیرە دیاری ئەکا. لەم ڕووەوە نوسیویتی:

ولقد قررنا فيما مضى بان الشريط الشمالي للجزيرة اهل ومسكون بالاكراد وفق خطة استعمارية قديمة. ومن هنا نفهم ان اماكن ومواطن العشائر العربية هي المناطق الجنوبية من محافظة الجزيرة، حيث تتمركز اكثر العشائر العربية وهي بخطوطها العريضة: شمر في الشرق، والجبور في الوسط، والبكارة في الغرب على سفوح عبدالعزيز وتتراوح بقية العشائر

بين العشائر المذكورة تلك، كطى، والشرابين والحرب وغيرها من بقية العشائر الصغيرة من العرب. اجل انهم موزعون بحسب خريطة الامطار في سوريا في المناطق الجنوبية والتي تتراوح نسبة امطارها بين ١٠٠ - ٢٥٠ مم مطرى فمناطق العشائر العربية اذا ليست خصبة عدا ما حول الخابور والسلى وهى قليلة وعدا قرى دهام الهادى وبعض قرى طى فهى على درجة من الخصوبة لا باس بها.»

خێڵە عەرەبەکانی جەزیرە بەمجۆرە ئەژمێری:

١. شەممەر. پێش ٣٠٠ ساڵ لە ناوچەی نەجدی حیجازەوە هاتون و، لە ناوچەکانی بەغداد تا رقە جێگیر بون. ئەمین بە دو تیرەوە: شمر الخرصە لە تەڵ کوچەک خر بوندەوە و، شمر الزور لە تەڵ هدلول دانیشتون.

٢. طەی. لە حیجازەوە هاتون. نزیکەی ١٠ هەزار کەس ئەبن. ئەمین بە چەند تیرەیەکەوە: العساف، الحریث، الجوالە، حرب، راشد، بنی سبعە، الیسار، زبید، البوعاصی، الغنامە، المعامرە، البکارە. لە سەروی روژهەڵاتی قامیشلی لە سەر سنوری تورکیا و، بەشێکیان لە مالکیە و، بەشێکیان لە حەسەکە جێگیر بون.

٣. شەرابی. لە دیرکی و قامیشلی و حەسەکە و راس العین دائەنیشن.

٤. جبور. لە کەناری خابور ٢ کیلومەترخواروی حەسەکە ئەژین. دابەش ئەبن بە سەر تیرەکانی: ملحم، سلطان، الهزیم، المحاسن، المحمد، الخوی، الریث، البوصهنا، المحیش، الهنە، العلی، البومانع، العامر، البری، البوعصرە، اللضاە، الحلیون، البوریاش، البو سلامە.

٥. البکارە. لە بناری چیای عبدالعزیزی سەرو ئەژین.

بو ئەوەی سەترسی کورد نەمینی و، خێڵاتی عەرەب زاڵ بی بە سەر ناوچەکەدا، هیلاڵ بو بلاو کردنەوەی خوێندەواری پێشنیار ئەکا:

١. احداث اكثر مايمكن من المدارس وعلى مختلف درجاتها وانواعها بين العشائر العربيه وفى مناطقهم التى يعيشون فيها، وتجهيز تلك المدارس بكل ما تحتاجه المدارس الحديثه.

٢. وحدات ارشاديه وتوجيه شعبى يرافق تلك المدارس ويساعدها على نشر الثقافه والعلم.

٣. ارسال اكبر كميه من الشباب العربى ومن الفقراء على وجه الخصوص دون التقيد بالشروط المعروفه الى الخارج للدراسه واكمال الاختصاصات وذلك بخطه مستمره وباعداد كبيره...

٤. فتح معاهد زراعيه عاليه فى الجزيره لابناء العرب مجهزه بكل الوسائل الحديثه لتساعد على لزدهار النهضه الزراعيه وتحسينها.

بو چاككردنى هلومەرجى مادى بشيان پێشنيار ئەكا:

١. توزيع كل الفائض من الارض فى الجزيره والمشمول بقانون الاصلاح الزراعى على هذه العناصر فقط دون غيرها مطلقا. اذ على الاصلاح الزراعى ان لا يعطى سندات تمليك فى الجزيره الا لهولاء العناصر حتى ولا يوجر الا لهم لانهم السند والدعم والدرع الواقى عندما تتحسن احوالهم فهم امل المستقبل علما ووعيا وقوميا بالنسبه للجزيره.

٢. تقديم المساعدات الفعاله والمجديه بالنسبه للدوله لهولاء العاجله والاجله.

٣. انشاء جمعيات او مزارع جماعيه من تلك العناصر العربيه فقط.

٤. انشاء قرى نموذجيه تشرف عليها الدوله، بكثره وموزعه فى مختلف المناطق العربيه لكى يلاحظوا الفارق بين حياتهم السابقه وحياتهم الاحقه ويشجعهم على العمل والجد فيما بعد.

٥. اشعارهم بالدعم الدائم من قبل السلطات المحليه التى كانت سابقا لا تستقبل سوى الشيخ ذو النفوذ. لكى يلاحظوا الفارق ايضا ويحسوا بان الدوله هى دولتهم وهم ترسها ودرعها. مما يعطيهم شيئا من المعنويات.

٦. فتح ابواب المصارف الزراعيه لهولاء الصغار فقط واغلاقها امام الشعوبيين والمقتدرين من العرب الاغنياء.

٧. وضع خطه عامه بالنسبه لهولاء العناصر العربيه لانقاذهم مما هم فيه تدخل فى موازنه خاصه.

هیلاڵ لای وایە عەقلییەتی عەشائیری عەرەب کۆسپێکی گەورەیە بۆیە داوا ئەکا پەیوەندییە مادی و جێگاییەکانی خێڵەکان هەڵ بوەشێنری و، شەمەر و جبور و طەی... لە یەک شوێن دا تێکەڵاو بکرێن. زۆریش گلەیی لەوە هەیە کە پەیوەندی نێوان خێڵەکانی کورد و عەرەب لە ناوچەکەدا باش و دۆستانەیە.

بەشی شەشەم (ل ١٣٨ تا ١٥٦) دوا بەشی کتێبەکەیە. تەرخانی کردوە بۆ باسی دین و مەزهەبی دانیشتوانی جەزیرە کە تێکەلاوە لە موسوڵمان و، مەسیحی کاتولیک و ئەرتودوکس و نەستوری و پروتستانت و، یەزیدی و، لە ئاشوری و ئەرمەن و کلدانی و جو...

ساڵی ١٩٦٣ حیزبی بەعس بە کودەتایەکی خویناوی لە بەغدا حوکمی گرتە دەس، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کورت حیزبی بەعس لە سوریاش بە هەمان ڕێگا حوکمی گرتە

دەس. بەعسییەکان بەمە بایی بون. ئەوپەری توندوتیژییان بەرامبەر دوژمن و ناحەزەکانیان بە کار ئەهێنا و، گیانی رەگەزپەرستییان خرۆشا بو. عیراق و سوریا و میصر گفتوگوی «وەحدە» یان دەس پێ کرد. گفتوگوکەیان بە ئەنجام نەگەیشت. کەوتنە دژایەتی ناصر و میصر. کە شەڕیان دەس پێ کردەوە لە دژی کورد، میصر پەسندی نەکرد، بەلام حکومەتی سوریا «لیوای یەرموک» ی بو یارمەتیدانی بەعس نارد بو عیراق. ئەم کتیبە لەو کەشە سیاسییەدا نوسراوە، بە هەمان گیانی رەگەزپەرستانە. بیروبوچونەکانی هیلال پێچەوانەی سەرەتاکانی دیموکراسی و مافی مروڤ و تەنیا ئاشکراکانی حزبی بەعسە.

کوردەکانی سوریا ئاهەنگیان نەبو، ئەم کتیبە ئەیهێنا هەرای گەورەتری لە سەر ساز بکرایە و، ئەگەر لە ولاتیک دا بونایە ریزی مافی مروڤی بگرتایە، ئەبو هیلال بەری بە دادگا.

*

سەردانی زور گوند و شاروچکەی ناوچەکەم کرد.

چەند جاری لە گەل هەندی روشنبیر و پیاوی ناسراوی ناوچەکە چوین بو سەیران بو کەناری دیجلە. جاریکیان چوین بو نزیک پردی «بافت». «بافت» شوینەواری پردیکی کونە. وەکو ئەیانوت دوازدە تاقی هەبوە، بە قەد بورجەکانی سال. هەر پایەیەکیشی وینەی یەکی لەو بورجانەی لە سەر بوە. ئەو کاتەی ئیمە چوین شوینەواریکی کەمی چەند تاقیکی مابو. ناوچەکە پوری زوری لی بو.

لە گەل شیخ حەسەنی باپەشیخ سەردانی یەحرکی و خاتونیەمان کرد لە راستی ناوچەی شەنگار دا. گومەیکی خاوین و جوان و دلرفینی لی بو. رەنگیکی شینی گەشەنگی هەبو. دانیشتوانی ناوچەکە یەزیدی بون و، ئازەلداریان نەکرد، دالدەی هەندی لە یەزیدییە ئاوارەکانی ئیمەیان دابو.

هەروەها چەند جاری چوم بو سەری کانی، عامودا، درباسیە.

ناوی گوند و شوینەکان بە زوری کوردی بون، حکومەت ناوەکانی گوری بون بە عەرەبی. زورایەتی دانیشتوانی ناوچەکە کوردن و، بە کرمانجییەکی رەوان ئەدوین، بەلام جلوبەرگی عەرەبی لە بەر ئەکەن. ئەمەش خویەکی دیرینەیە ئەسەپینراوە بە سەریان دا. زەویوزاری خویان بە دەس خویانەوە بو و، هەندیکیان ئەرزی فراوانیان هەبو. بەرهەمی سەرەکی دانەویلە، بە تایبەتی گەنم، بو. ناوچەیەکی بە پیت و دەولەمەند بو. ئەرزی بەراو و باخیشیان هەبو. لە هەندی جیگای بیریان هەلکەند بو بو ئاودان. کشتوکال لەوی پیشکەوتوتر بو لە چاو کوردستانی عیراق دا. لە وەرزی هەلگرتنی گەنم دا سەدان شایی

ژنهێنان ئەکرا.

نەوت لە جەزیرە دۆزرا بووەوە. ئەو ناوچەیەی نەوتەکەیان لێ دەرئەهێنا ناوچەیەکی دەوڵەمەندی کشتوکاڵ و کوردنشین بو، ناوی «قەرەچۆخ» بو. بیری نەوتەکان و، بۆرییەکانی لە ناو ئەرزی جوتیارەکان دا بو. حکومەت داگیری ئەکرد بو. زۆرجار تراکتۆر و کۆمباین لە نزیک بیرەکان کاریان ئەکرد بێ ئەوەی دەس بهێننە ڕێگەیان.

*

سنووری سووریە - تورکیا، ئەگەرچی بە تێلی درکاوی پەرژین کرا بو، بە درێژای هێڵی سنوور مین یان لێ چاند بو، ژمارەیەکی زۆری جەندرمەش تەرخان کرا بون بۆ چاودێری سنوورەکە بەڵام جموجۆڵی قاچاخچیەتی هەر هەبو. لە تورکیاوە: ئاژەڵ، پەتو، پێڵاوی لاستیک... یان ئەهێنا و، لە سووریاوە: چایی، جگەرە، تفەنگ و فیشەکیان ئەبرد. قاچاخچیە گەورەکان کرێکار و کۆڵهەڵگریان بە کرێ ئەگرت کەلوپەلەکانیان لە سنوور بپەڕیننەوە.

قاچاخچیەکان لە گەڵ ئەفسەرەکانی تورک ڕێک کەوتبون، بە پارە کۆڵەکانیان ئەپەڕاندەوە. هەند جار بەرامبەر بە هەر کۆڵێک چەندەیەک پارەیان ئەدا، یان بۆ چەند سەعاتی سنوورەکەیان بە کرێ ئەگرت و، لەو ماوەیەدا چەندی بیانتوانیایە تێی یان ئەپەڕاند. هەندێ جاریش کە بە قاچاخ ئەپەڕینەوە، کۆڵهەڵگرەکان بە سەر مین دا ئەکەوتن، یا بەر گوللەی جەندرمە ئەکەوتن.

دیجلە لەو ناوچەیەدا پێی ئەڵێن: «ئاڵا سۆزن» واتە ئاوی گەورە. لە سەر و ئەوبەری دیجلە چەند گوندی هەبون، زۆربەیان ناوەکانیان وەکو یەک وا بو. هەندێ جار بۆ پەڕاندنەوەی یەکی کۆمەڵی لە خەڵکی هەردو گوند بە ناوی مەلە و ڕاوەماسییەوە ئەچونە ناو ئاوەکەوە. ئەوەی ئەیویست بپەڕێتەوە، ئەویش لە گەڵیان ئەچو. پاش بڵاوە لێکردن لە گەڵ خەڵکی دی یەکە ئەچوە وشکایی، پێشتر جلوبەرگیان بۆ ئامادە کرد بو، جلی لە بەر ئەکرد و، تێی یان ئەپەڕاند.

چەند جاری بۆرکیان، بە «کەلەک»، لە بەری تورکیاوە ئەهێنا بۆ سووریا، یا لە سووریاوە ئەیانبرد بۆ تورکیا. بەڵام زۆر جار ئەمەیان بە پارە تەگبیر ئەکرد.

کەلەک بۆ پەڕاندنەوەی ئاژەڵیش بە کار ئەهێنرا.

*

لەبەر ئەوەی هەندێ گوندی نوێ دروست کرا بون، خانوەکانیان لە قوڕ و، هەژارانە دروست کرا بو. بە زۆری ئەو جوتیارانە بون کە ئەرزەکانیان بۆ بو بە ژێر ئاوی بەنداوی

فىرواتەوە. بەلام ئەمانە کەمایەتییەکی بچووک بوون لە ناوچەکەدا. مەسەلەی تەعریب هەندێکی پیوە نرا بوو، بەو ئەندازەیە نەبوو، کە من بیستبووم.

کوردەکان، ئەوانەی جنسیەی سورییان نەبوو، گیروگرفتی راستەقینەیان هەبوو. بێ بەش بوون لە مافی خاوەنیتی زەوی و خانوو و، دامەزران لە دائیرەکانی دەولەت دا و، خوێندن لە زانستگاکانی سوریا.

کورد بە دەگمەن لە داوودەزگای حکومەتی و بەڕێوەبەرایەتی دا دائەمەزرێنران، بە تایبەتی لە شوێنی گرنگ دا، کاربەدەست و حوکمڕانی ناوچەکە هەمو عەرەبی بەعسی بوون.

یەکی لەو شتانەی بو من لێرە جێگەی سەرسوڕمان بو، یەکەمین جار بو ئافرەت ببینم «کاری قورس» بکا. ژمارەیەکی زور کچی گەنج و ژن لە سەر جادەی نێوان قامیشلی و دیرک بەردیان ئەکێشا، یان لە کاری جادەکەدا، بە تایبەتی لە قیرتاوەکەی دا، ئیشیان ئەکرد.

*

سالی ۱۹۷۵ - ۱۹۷٦ کوردەکانی سوریا دابەش بوبون بە سەر چەندین حیزب دا، لێرەدا بو ناسینەوەیان ناوی سکرتێرەکانیان ئەهێنم: حەمید دەرویش، کەمالی ئەحمەد ئاغا، صەلاح بەدرەدین، عیصمەت سەیدو، مەلا باقی، عەزیز چەرکەس...

- زوری ئەم حیزبانە ناویان «الحزب الديمقراطي الكردي» بو. هەندی وشەی وەکو «اليساري» و «التقدمي» و شتی لەم بابەتەیان خست بوە سەری بو ئەوەی لە یەکتری جیا بکرێنەوە.

- ئامانج و بەرنامەی هەمو ئەم حیزبانە لە گەڵ یەکتری جیاواز نەبو.

- لە سەرەتای دامەزراندنی پارتییەوە بو ئەوەی حکومەتی سوری و نەتەوەپەرستەکانی عەرەب تورە نەبن، وشەی کوردستانی سوریایان بەکار نەهێنا بو.

- هیچ کام لەم حیزبانە، جگە لە صەلاح بەدرەدین کە لە دەرەوەی سوریا بو، دژی رژێمی سوری نەبون، بەڵکو پشتیوانییان لە هەمو هەلویست و هەنگاوەکانی ئەکرد، بە تایبەتی لە ناکوکی عەرەبی - ئیسرائیلی و، ناکوکی سوری - عیراقی دا.

- هیچ کام لەم حیزبانە دروشمی ئەبەی هەلنەگرت بو، ئامانجی زل و زوری نەبو، داوای مافی هاونیشتمانیتی سوری و یەکسانی و هەندی مافی روشنبیریان ئەکرد.

سەرەرای ئەوە، حکومەتی سوری رێگەی هیچ جورە چالاکییەکی سیاسی، روشنبیری، کومەلایەتی نەئەدان. ناوبەناو لێ ی ئەگرتن و، بانگی ئەکردن بو لێپرسینەوە و

لیکولینەوە.

رووداوەکانی کوردستانی عیراق کاری لەوانیش کرد بو. حیزبەکان بوبون بە دوبەشەوە و، رای گشتی کوردەکانیش بوبو بە دو کەرتەوە.

- حیزبەکان هەندێکیان، وەکو جاران، پشتیوانییان لە بنەماڵەی بارزانی ئەکرد و، باوەڕشیان پو لەم کرد بوەوە. تەنانەت حیزبەکەی کەماڵی ئەحمەد ئاغا وەکو لقی لەم کاری ئەکرد.

- هەندێکی تریشیان وەکو حەمید دەرویش و عیسمەت پشتیوانییان لە یەکێتی ئەکرد.

- صەلاح بەدرەدین، لە لوبنان دائەنیشت، جورە پەیوەندییەکی لە گەڵ حکومەتی عیراق دروست کرد بو. لایەنی ئۆتونومی بەعسی گرت بو. دژی جەوجوڵی حیزبە کوردیەکانی عیراق بو. بەهانیکی دژی بەهانەکەی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی دەر کرد بو.

من زوری ئەم جوامێرانەم بەردەوام ئەبینی و، گفتوگومان ئەکرد. شەوێک لە گەڵ کەماڵی ئەحمەد ئاغاش دانیشتم. زورمان قسە و باس کرد. جگە لە سەرکردەی حیزبەکان چەند دوستێکی ترم هەبو پەیوەندییان لە گەڵ هیچکام لەو حیزبانە نەبو. جگە لەم حیزبە کوردییانە حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی سوریاش لقیان هەبو. حیزبی شیوعی بارەگای ئاشکرایان نەبو.

کوردەکانی سوریا بە گشتی سیاسی بون، بان راستتر بە دوی هەواڵەکانی کوردستان دا ئەگەڕان. بەڵام لایان وابو تا کورد لە عیراق یا لە تورکیا بە مافەکانی نەگات، ئەوان هیچ دەسکەوتێکی سیاسی بە دەس ناهێنن. لەبەر ئەوە زور بە تەنگ ئەوەوە بون بزانن چارەنوسی کورد لە یەکێ لەو دو پارچەیەدا بە چی ئەگات.

لە ناو ئەو کتێبانەدا کە لەو ماوەیە خوێندمەوە دیوانی مەلای جزیری بو. ئەم دیوانە مەلایەکی کورد ساغی کرد بوەوە و، بە عەرەبی لێکی دابوەوە و، شیعرە کوردیەکانیشی بە ئیملای عەرەبی نوسی بو، بەڵام سەرەڕوری بو وشە کوردیەکان کرد بو، بە ئاسانی ئەخوێنرانەوە. لە سوریا چاپ کرا بو. ساغکردنەوەیەکی چاک و، لێکدانەوەیەکی باش بو. پێشتر تەنها ئەوەم لە سەر مەلای جزیری و شیعرەکانی خوێند بوەوە کە عەلادین سەجادی لە «مێژووی ئەدەبی کوردی» دا نوسی بوی، بەڵام بە هوی ئەم دیوانەوە شارەزای بیری بەرزی سوفییانەی مەلای جزیری بوم و، زەوقم لە شیعرەکانی وەرگرت.

دیوانی شیعری جگەر خوێن «کیمە ئەز؟» تازە بە تیپی لاتینی لە لوبنان چاپ

کرا بوو. لە ناو خوێندەوارانی کرمانجی دا جگەرخوێن بە شاعیرێکی گەورە دانرا.

«مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی تازە لە تورکیا بە لاتینی و بە تەرجومەی تورکیەوە چاپ کرا بوو. ئەو کتێبانەی لە تورکیا چاپ ئەکران ئەگەیشتنە ناوچەی جەزیرە، بەڵام من کەڵکێکی ئەوتۆم لێ وەرنەگرتن و، تێ یان نەئەگەیشتم.

*

سەرهەڵدانی مەفرەزەکانی بادینان

لێرەدا بە کورتی کرونولوجی بە سەرهاتی مەفرەزەکانی بادینان ئەنووسمەوە:

١ی حوزەیرانی ١٩٧٦ بە بۆنەی تێپەڕ بوونی ١ ساڵەوە بە سەر دامەزراندنی یەکێتی دا نقیب مهندس ئیبراهیم عەزو محەممەد (جەبار) فەرماندەی دەستە چەکدارەکانی بادینان بۆ یەکەمین جار لە نزیک ڕووباری هێزل لە پشتی زاخۆ لە گەڵ پێشمەرگەکانی تردا یەکی گرتەوە و کۆ بوونەوە بۆ ڕێکخستنەوەی مەفرەزەکان و دابەش کردنی کاروفرمان بە سەریان دا. ژمارەیان ٣٧ پێشمەرگە بوو. بوون بە چوار مەفرەزە: ئیبراهیم عەزو، عەززەت ئیسماعیل شەنگاری، عومەر ئیبراهیم ڕەشید، جەبار مەلا غەنی سندی، هەریەکەیان فەرماندەی مەفرەزەیەکیان بوو.

ئەم ٤ مەفرەزەیە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان دابەش بوون بە سەر ناوچەکانی زاخۆ، ئامێدی، دهۆک و، کەوتنە چالاکی سیاسی، ڕێکخراوی، پێشمەرگەیی. مژدەی دەس پێ کردنەوەی خەباتی چەکداریان بە خەڵکی بادینان دا و، پەیوەندییان لە گەڵ زۆر کەس لە گوند و شارەکان دامەزراند و، هەندێ ناونیشانیان درا بوویە بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لە گەڵ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە لە سلێمانی. لە گەڵ ئەوانیش پەیوەندییان دامەزراند بوو.

١٥ی تەمووزی ٧٦ ئیبراهیم عەزو بۆ بەڕێ کردنی پێشمەرگەیەکی نەخۆش و، ناردنی پوستە دەربارەی ئەنجامی کارەکانیان لە گەڵ مەفرەزەکەی چوو گوندی «نەبروە» ناوچەی گوێی (لە قەزای ئولودەرە) لە کوردستانی تورکیا. پێشتر قەم کەوت بوونە چاودێری و سوراخی ئەم پێشمەرگانە لە ناوچە سنوورییەکانی ئولودەرە - چەلوورجە و، خێڵە کوردەکانی ئەوێ یان لێ هان دا بوون کە هەر کەسێکیان لەو پێشمەرگانە بەر دەس کەوت بیان گرن، چەک و کەلوپەلەکانیان بۆ ئەوان و، سەریشیان بۆ قەم، چونکە ئەوانە جاشی سەددامن و، بە قیتی سەددام ئەیانەوی شۆرش لە بارزانی تێک بدەن!

خەڵکی گوندی نەبروە بە ناوی میوانداریەوە لە ناو ماڵێک دا دایان ئەنێن. دەوریان ئەگرن و، بە فێڵ هەمویان چەک ئەکەن و، بە گیراوی تەسلیمی لێپرسراوەکانی

قم: هاشم رەمەزان، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیق یان ئەکەن.

ساوەیەک بە گەراوی لە گەور و گولەکانی ناوچەکانی گویی، قەشووری، نەرتوشی... سووراندیانەوە و، قم گوی یان نەدایە نامەکانی مامجەلال و، ناوزی و هەولەکانی سەرانی د د ک د، سەرەنجام هەمویان کوشتن.

۱ ی ئابی ۷٦ پاش ئەوەی ماوەی چەند هەفتەیەک مەفرەزەکانی بادینان ئاگایان لە فەرماندەکەیان نامینی، جاریکی کە یەک ئەگرنەوە بریار ئەدەن: عەززەت ئیسماعیل و عومەر ئیبراهیم بە خۆیان و مەفرەزەکانیانەوە بچن بو سوراخی ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی. جەباری مەلا غەنی و مەفرەزەکەشی لە ناوچەکەدا بمێننەوە بو دریژەدان بە کارەکانی خۆی.

عەززەت و عومەر لە گەڵ مەفرەزەکانیان رو ئەکەنە ناوچەی گویی. دیسان ئاقمی لە خەلکی گوندی «رووبوزک» بە ناوی میوانداریەوە تەفرەیان دا بون. دەوریان گرت بون و داوایان لی کرد بون چەک دابنین.

عەززەت ئەکەویتە دواندنیان بە قسەی خوش و نەرم زوریان لە گەڵ خەریک ئەبی لەو بیرە چەوتە پەشیمانیان بکاتەوە. کەلکی نابی. سەرەنجام پی یان ئەلی: «من چەکم بو ئازادی کوردستان هەلگرتوە، لە ئاشبەتالەکەوە تەمی خواردو بوم، بەلینم داوە تا کوردستان ئازاد نەبی جاریکی تر بە سالی چەک بو هیچ کەس و تاقم و لایەک دانانیم، مەگەر بمکوژن ئینجا چەکەکەم بیەن».

ئەبی بە میل راکیشان لەوی دا عەززەت ئەکوژری.

ئینجا لی یان ئەپرسن: «کی مسئولتانە؟»

عومەر ئیبراهیم و، قاسم محەمەد هەلئەسان ئەلین: «دوای ئەو ئیمە مسئولین».

عومەر فەرماندەی مەفرەزە و، قاسم خویندکاری کلیەی هندسەی زانستگای موسل و، رابەری سیاسی مەفرەزەکەیان بو، هەر لە وی دا عومەر و قاسمیش ئەکوژن.

۱۸ پیشمەرگە کە پاشماوەی هەردو مەفرەزەکە بون بە گەراوی بران تەسلیمی بارەگای قم کرا لە گوندی مەرگەهد لە نزیک ئولودەرە.

۱۵ ی ئابی ۷٦ تاقمی لە چەکدارەکانی قم بە سەرکردایەتی عەبدوللا رەمەزان، مەحمود گویی، یوسف گویی.. پیشمەرگە گیراوەکانی مەفرەزەکانی عەززەت و عومەریان دایە پیش بەرەو ئەشکەوتی «بالی» لە نزیک گوندی مەرگەهد. هەمویان کوشتن و لاشەکانیان لە ئەشکەوتەکەدا بە جی هیشتن. بە ریکەوت یەکی لە پیشمەرگەکان نامری و، خوی ئەگەیەنیتە مالی یەکی لە دانیشتوانی ناوچەکە، ئەوانیش دالدەیان دابو، تیماریان

کـرد بو، بەڵام ئەم پێ ی زانی بو، بو ئەوەی شـوێنەواری تاوانەکـەیان کـوێر بکەنەوە، ئەویشیان بە زوور لە کاپرا سەند و کوشتیان.

.٣ ی تابی ٧٦ لە کـاتێک دا کـە مـەفـرەزەکـەی چـەهاری مـەلا ئـەمنی لە سـەر کانیەک لە ناوچەی سندی نزیک زاخو خەریکی چایی لێنان بون، تاقمی لە چەکدارەکانی ئەم بە سەرکردایەتی محەممەد خالیـد دەوریان گرتن و دایانە بەر دەسـڕێژی گوللە. چـهار و ٣ پێشـمـەرگـەی تر لە هاوڕێکانی لەوێ دا کـوژران. ئەورەحـمـان حـسـێن شـەنگاری و ٣ پێشمەرگەی کە لە ناپلولەکە دەرباز بون و، بەڵام کەوتنە داوی جاشێکی عیراقەوە بە ناوی جەعفەر بیسفکی، ئەویش تەسلیمی عیراقی کردن. دوای ماوەیەک لە موسل هەڵواسران.

ئەورەحمان لە زیندانی موسڵەوە نامەیەکی ئازایانەی بە عەرەبی بو مامجەلال نوسی بو.

بەمجورە مەفرەزەکانی بادینان بە ناکامی لە ناو چون.

*

هاتنی عومەر مستەفا و جەوهەر نامیق بو سوریا

کاک عومەر ڕێستەوی بێتە سوریا. د. خالیـد تاقمی پێشـمەرگەی گورجوگوڵی بالەکایەتی هەڵبژارد بو. مانگی تشرینی یەکەمی ٧٦ لە گەڵ کاک عومەر بە ڕێ کەوتن بو بادینان. چەندی سوراخیان کرد بو هەواڵی پێشـمەرگـەکانی یەکـێتـیـان نەزانی بو. بە هوی چەند کـەسـێکی خەڵکی ناوچەکە زانی بویان هەندێ لە سـەرکـردەکـانی ئەم لە نزیک «چەلی» ن لە تورکیا بە هوی ماجید بەگی سەروکی شاروانی چەلیوە پەیوەندییان لە گەڵ کرد بون. کەریم سنجاری و جەوهەر نامیق هاتبون لە جێگایەکی سەرسنور بە ناوی «دولی ئەنفیران» یەکتریان دی بو. وا ڕێک کەوت بون کاک عومەر و جەوهەر پێکەوە بێن بو سوریا بو بەلاداخستنی ناکوکییەکان. هەر لەوێوە ئەچنە چەلی و بە ناو تورکیادا هات بون بو جەزیرە و، لەوێوە لە سنور پەڕی بونەوە بو ناو سـوریا. وەکـو دوایی دەرکـەوت، ئەم لەو ماوەیەدا ئیبراهیم و هاوڕێکانیان کوشت بو.

من لە دیرکی بوم کـە ئەوان گـەیشتن. کـاک عـومـەر دڵـپـڕی برایانی و شـێلوش و شـالاوی عـەلی عـەسکەری لە گـەڵ خوی هێنا بو. لە دیرکی هاتنە بارەگـامـان ئـێـمـە. من جەوهەرم نەشناسی. کاک عومەر وتی: «لە بادینان سوراخی پێشمەرگەکانی یەکێتی مان کـرد، بەڵام هیچ هـەواڵێکـیـانمان دەس نەکـەوت». منیش وتم: «وەکـو ئەمان ئەم هەمـویانی گرتوە و ئـەـسە هەیە هەمـویان کوشت بن»، ئینجا دابەزیمە سەر ئەم و باسی تاوانەکانیـانم کرد. جەوهەر هەڵی دایە. کاک عومەر وتی: «ئێمە فلانەو پێکەوە هاتـن ناکوکییەکان

چارەسەر بکەین». وتم: «کەواتە لەم بەرسە پێشمەرگەکانی بادینانی چی لێ کردووە؟». لە گەڵ جەوهەر بوو بە دەمەقاڵێمان. لە دێرک نەمانەوە بە ڕێ کەوتین بۆ شام.

ئەم پەیوەندی لە گەڵ حکومەتی سوریا دامەزراند بوو. ئەوانیش وەکو ئێمە ئازادی هاتوچوو و کاریان هەبوو. لە گەڵ دەزگا موخابەراتییەکان پەیوەندی بە هێزیان دروست کرد بوو. زۆرجار هەواڵ و دەنگوباسی دروستکراویان لە سەر ئێمە ئەدا بە دەزگا ئەمنییەکانی سوریا. زۆرجار کێشەو گیروگرفتیان بۆ ئێمەو پێشمەرگەو ئەندامەکانمان ئەخولقاند.

*

ڕێبوارێکی سەرنەکەوتوو

لە گەڵ سەرکردایەتی ولات وەها ڕێک کەوتبووین ئەوان خەریکی ئاواکردنەوەی ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکوک بن، ئێمەش هی بادینان. ٤ مەفرەزەی کە لە گەڵ ئیبراهیم عەزو گەڕانەوە لە ناوچوون. جگە لە بادینان لە هەموو ناوچەکانی تر پێشمەرگە کەوتنە جموجوڵ. بادینان گرنگییەکی جیوپۆلیتیکی هەبوو. سنووری بە تورکیاو سوریاوە بوو. ڕێگای هاتوچووی دنیا بوو. ڕێگای گواستنەوەی چەک بوو. نەمانئەتوانی وازی لێ بهێنین.

لە ناو تورکیا خەڵکێکی زۆرمان ڕێک خستبوو. زۆریان لەوانە بوون پێش ئاشبەتاڵ پێشمەرگە بوون و جێگەی خۆیان لە تورکیا کرد بووەوە. لە جزیرە، سلۆپی، شەرناخ، ئولودەرە، شەمزینان بنکەی سیاسی مان دامەزراندبوو. لە زۆر جێگاش چەکمان حەشار دابوو.

یەکێ لەوانەی پشتمان پێ بەست بوو کابرایەکی زاخۆیی بوو بە ناوی «عیصمەت دینو». عیصمەت دۆستی خالە بوزی و، ئاسیاوی صەبری ئەواڵ بوو. ئەوان باوەڕیان پێ کرد بوو بە ئێمەشیان بە ناسین دابوو. عیصمەت بە خێزان و دەروبەوەندەکانیەوە لە شوێنێکی سنووری عێراق و تورکیا دانیشت بوو. چەندین کلاشینکوف و ئارپیجی و تەقەمەنی مان لە لا دانا بوو. لە ئولودەرەش ڕێکخستنمان دروست کرد بوو لە ناو گوندە پێشمەرگەکانی گوێی دا و چەکدارمان کرد بوون و چەکی زیادمان لە لا دانابوون.

هێزەکانمان سازدا و، چەند مەفرەزەیەکمان لێ دروست کردن. ئەفسەرەکانمان کرد بە فەرماندەیان. دوا حەفتەی مانگی ١١ی ٧٦ ئامادەمان کردن بۆ جوولان. هەموومان نەمانئەتوانی پێکەوە لە سوریا بەڕێ بکەوین. لەبەرئەوە بۆ دەرباز بوون لە سنوور کردمان بە ٣ تاقم:

تاقمی یەکەم بە سەرکردایەتی حەسەن خۆشناو بە کەلەک لە ڕووباری دیجلە

پەڕینەوە. حەسەن ئەبو بچێتە ناوچەی گۆیی و، پێشمەرگەکانی ئەوێ ساز بدا.

تاقمی دووەم بە سەرکردایەتی فوئاد عومەر شەوێک دوای ئەوان بە کەلەک لە ڕووباری دیجلە بپەڕنەوە. فوئاد و جەمال ئەبو بچنە ناوچەی سلۆپی عیصمەت دینۆ و پێشمەرگەکانی ئامادە بکەن.

تاقمی سێیەم کە عادل موراد و سەید کەریم و سەردار دەلۆیی و فەرهاد شاکەلی و منیان لە گەڵ بوو ئەبو شەوی سێیەم ٧٦/١١/٢٤ لە دیجلە بپەڕینەوە، هەر ٣ تاقم لە لای عیصمەت دینۆ یەک بگرینەوە و، لەوێوە بەرەو بادینان بەڕێ بکەوین و، لە بادینان دابەش ببین بە سەر ناوچەکان دا.

ئەو شەوەی ئەبو ئێمە بپەڕینەوە ڕۆژەکەی بارانێکی زۆر باری بوو ئاوی دیجلە هەڵسا بوو. سواری کەلەک بووین لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا کەلەکەوانەکە گەڕایەوە بۆ دواوە. نەیتوانی بمانپەڕێنێتەوە. ئەو شەوە نەمانتوانی بپەڕین. بۆ ڕۆژی دوایی ناچاربووین لە وشکاییەوە بڕۆین هەرچەندە ڕێگاکەمانی دوور ئەخستەوە. شەوەکەی لە تەلبەندی سنوور دەرباز بووین. بەڵام پێشەنگی هێزەکەمان لە گەڵ دەورییەی جەندرمە پێکا هەڵپڕژان. هەرچۆنێ بوو تێپەڕین. بەڵام نەمانتوانی بگەینە جێگایەکی ئەمین. ڕۆژمان بە گردێکەوە بەسەر برد لە نزیک دێیەک. دامەزرابین بۆ شەڕ چونکە هێزی جەندرمە کەوتنە کەڕەمالی ناوچەکە بە دوای ئێمەدا ئەگەڕان. ئێمە ئەوانمان بینی بەڵام ئەوان ئێمەیان نەدی و، خەڵکی گوندەکەش کوردپەروەر بوون، نەک هەر زمانیان لێ نەداین، بەڵکو سەریان لێ تێک دان.

ئێوارە بەڕێ کەوتین بەرەو چیای جودی و لەوێوە بەرەو شوێنی دیاریکراو. کاتێ لە ناوچەکە نزیک کەوتینەوە زانیمان ڕۆژێ پێشتر عیصمەت تەسلیمی عێراق بۆتەوە. لە گەڵ هێزەکانی حەسەن و فوئاد یەکمان گرتەوە. چەند کەس و مەفرەزەی ئێمە لە بادینییەکان شەو لە ناو هەلاکن بۆ ناو قم. تۆمەز پێشتر پەیوەندییان لە گەڵ قم هەبوو ئەگیریان بۆ کرد بوون. تەسلیمبوونەوەی عیصمەت، کە بە تەمای ئەو بووین ڕێبەریمان بکا و، ڕاکردنی یەک لە دوای یەکی مەفرەزە بادینییەکان، نائومێدییەکی زۆریان تێ دا بڵاو کردینەوە. لە لایەک جەندرمە بە دوامانا ئەگەڕا، لە لایەکی ترەوە خەڵکی ناوچەکە هاوکارییان لە گەڵ نەئەکردین. تەنانەت خواردنیشیان پێ نەئەفرۆشتین. بۆ خۆپاراستن زۆرمان جێگۆڕکێ کرد. ڕێبەرەکانیشمان گۆیی بوون، ئەترسان بە هۆی ئێمەوە تووشی کێشە بێن، ئەیان ڕەتاندین و ئەیانویست ماندوومان بکەن بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە. لە هەورازێکمان دا ناوی چەکو بۆ هەرگیز ڕێگای وا سەخت و کووروم نەدی بوو. چووینە گوندەکانی شاخ و زیارەت. ئەمانە هەواری میری بۆتان بوون و کاتی خۆی میرمحەمەدخان هاوینانی لەوێ گوزەراندووە. شاخ

گوندێکی زۆر خۆش بوو.

عەلی شاخی یەکێ لە ڕێبەرەکانمان بوو خەڵکی ئەو گوندە بوو. ئەو پاش ماوەیەکی کورت کوشتمیان لە سەر ئەوەی چاوساخی ئێمەی کرد بوو. بە جێگایەکا ڕابوردین ناوی دۆڵی کورتان بوو بەرەو گوندی بلکێ. بلکێ لە سەر سنوور بوو. لە ناو سەرما خۆمان کرد بە ناو گوندا. خەڵکی گوندەکە بە ناپەڵی جێگایان کردینەوە. هەستمان کرد خۆیان ئامادە ئەکەن لێمان دامەزرێن. بەیانی زوو، پێش ئەوەی ئەوان بە خەو بکەون، بە وریایی و ڕێکوپێکی کشاینەوە. لام وایە لەبەر زۆری ژمارەی ئێمەو وریایی خۆمان زاتیان نەکرد پەلامارمان بدەن. ئەو خەڵکی ئەو ناوچانەی لە یەکێتی تێژ کرد بوو. کابرایەکیانم دواند، لێم پرسی بۆچی دوژمنایەتیمان ئەکەن؟ وتی: «هوون لە سەر خەڵکی سەرۆک نامەشن!»

من کەوتبوومە هەڵوێستێکی ناڵەبارەوە. هەمو توشی نائومێدی بوون. وایان ئەزانی خەڵک بە چەپڵەڕێزان پێشوازیمان ئەکەن. کەچی دوژمنایەتیمان ئەکردین. باوەڕم وابوو بەمجۆرە ئێپەڕین بۆ کوردستانی عێراق ناکرێ و، لەوە زیاتریش بمێنینەوە توشی هەمان چارەنوسی ئیبراهیم عەزۆ و هاوڕێکانی ئەبین. چونکە شاخی هەرەکۆڵ لەوێ بڕیارم دا هێزەکەمان هەمووی بگەڕێتەوە سوریا. من و سەید کەریم و حەسەن خۆشناو و عەبدوڵڵا خۆشناو لێیان جیا بووینەوە چووینە گوندی «رەبین» تەنیشت «ئولودەرە» بۆ ناو گوییەکان. گوییی دووبەش بوون. هەندێکیان لە گەڵ ئەو و هەندێکیان لە گەڵ یەکێتی بوون. هەندێکیان لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بوون. زۆربەیان بە کرێکاری چووبونە موسڵ و عەرەبییان ئەزانی. شارەزای بادینان بوون و، جۆری ژیان و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان فێری ژیانی عەسکەری کرد بوون. ویستمان لەوێوە ڕێگایەکی تازە بدۆزینەوە بۆ جارێکی تر. سەرکەوتوو نەبووین.

یەکێ لەو نوکتانەی هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە لەم سەفەرەدا گوێم لێ بوو. ئێوەرشەوێکی سەرەتای مانگی کانوونی یەکەم لە ڕووباری هێزل ئێپەڕینەوە. بۆ ئەوەی جلەکانمان تەڕ نەبێت خۆمان ڕووت کرد بووەوە. هەوا زۆر سارد بوو، ئاوەکەش ساردتر. ژان ئەچوە ئێسقانەوە. چاوساخێکی گوییمان هەبو ناوی حەمەرەشید بوو. کە لە ئاوەکە پەڕینەوە دنیا ئەوەندە تاریک بوو چاو چاوی نەئەبینی. حەسەن خۆشناو بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد: «حەمەرەشید! حەمەرەشید!» .وتم ئاخر ئەبێ حەمەرەشیدی بۆچی بێ؟ حەمەرەشید هات وتی: «بەڵێ کاک حەسەن ئەمرکە!». حەسەن زۆر بە خوێن ساردییەوە وتی: «سەیری گونم بکە بزانە ئەوەڕیوە!»

پاش هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، ڕێگاوبانەکانی، تێگەیشتم گەڕانەوەی

بە کۆمەڵ لە کردن نایەت. ئەبێ بیر لە شێوەیەکی تر بکەینەوە. ئێمەش بڕیارمان دا بگەڕێینەوە بۆ سووریا. چوینە جیلانپینار و بە شەو بە پارە لەگەڵ جەندرمە لە سنوور پەڕینەوە بۆ سەری کانی لە سووریا. دوو کەس لە سەرکردەکانی پ د ک ت مان لە گەڵ هات بوون. ئەچوون بۆ کۆبوونەوەی هاوبەشی ئەوان و یەکێتی.

هەرچەند سەفەرەکەمان ٣ حەفتە زیاتر درێژەی نەکێشاو، هەمو بە سەلامەتی گەیشتینەوە سووریا. بەلام بە ڕاستی ئەمە تێشکانێکی نەفسی و سیاسی ناخۆش بوو. بۆ من تەجروبەیەکی دەوڵەمەند بوو بۆ ڕۆژگاری داهاتوم. هەندێ لەوانەی هاوبەشی ئەم ڕێپێوانە سەرنەکەوتوە بوون، خەتای منیان ئەگرت و، بە یەکجاری چونە ئەورووپا.

من ئیتر نەچومەوە بۆ دێرک و، ئومێدێکی ئەوتۆشم بە کاری ئەوێ نەما. چومە شام.

*

کەم بژی و، کەڵ بژی!

گیراوەکانی کۆمەڵە: شەهاب و هاوڕێکانی، دوای لێکۆڵینەوەیەکی پڕ لە ئازاردانی چەند مانگە دران بە دادگا. شەهابی شێخ نوری و، جەعفەر عەبدولواحید لە سەرکردایەتی کۆمەڵە و، ئەنوەر زوراب لە ڕێکخستنی بەغداد حوکمی ئێعدام و، ئەوانی تر لە ٥ تا ١٥ ساڵ حوکم دران.

ڕۆژی ٧٦/١١/٢١ شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر لە سێدارە دران و، تەرمەکانیان برایەوە بۆ کوردستان. ئەمانە تاقمی یەکەمی تێکۆشەرانی کورد بوون لە سێدارە بدرێن. بە ئازایەتییەکی بێ وێنەوە ڕووبەڕووی دەزگاکانی لێکۆڵینەوە و، دادگا و، هەڵواسین بوونەوە. نەریتی ئازایانەی «کەم بژی و، کەڵ بژی» یان بۆ هاوڕێکانیان داهێنا. بە بۆنەی هەڵواسینی شەهاب و هاوڕێکانیەوە کۆمەڵە لە کوردستان بەیانێکی بە کوردی دەرکرد. بەیانەکە کاک ئارام نوسی بوی. لە سووریاش ژمارەیەکی «الشرارة» بۆ ئەم ڕووداوە تەرخان کرا.

*

گەڕەکێکی شام ناوی «حی الاکراد» بوو. ناویان گۆڕی بۆ بە «رکن الدین». حەسەن خۆشناو و سەید کەریم و من چەند مانگێ لە ڤیلایەک ئەژیاین لە «رکن الدین» بەرامبەر بە شاخی قاسیون و، «تاخی کرمانج». زۆر جار بە پێ بە قاسیون دا هەڵئەگەڕاین. زۆری ئێواران میوانمان ئەهات. ژیانی ڕۆژانەی خۆمان وا ڕێک خست بوو: سەید کەریم خواردنی دروست ئەکرد، حەسەن ماڵەکەی خاوێن ئەکردەوە، منیش قاپ و قاچاغم ئەشت و، پێکەوە بازاڕمان ئەکرد. لە کاتی پێویستیش دا یارمەتی یەکترمان

ئەدا. پێکەوە ٣ هاوڕێ ی گیانی بە گیانی و تەنیا بووین. شۆڕشی عەسکەری پش کەهاتە شام هاتە لای ئێمە، ئەو کاتە هەرزەکارێکی تازە پێگەیشتو بو.

*

جارێ یەکەم کە چوم بو شام چەند ڕۆژێ من لە گەڵ چەند کەسێکی کەدا پێکەوە لە ڤیلاێک دا بووین. ماوەیەکیش ئەنوەر شاکەلی لەوێ بو. ئەنوەر تازە ناوی خۆی گوڕی بو بو فەرهاد شاکەلی. دیوانێکی شیعری نوسی بو بە تەما بو چاپی بکا. دای بە من بیخوێنمەوە و ڕەئی خۆمی لە سەر بڵێم. من خوێندمەوە و بە وردیش خوێندمەوە. فەرهاد ئەندامێکی تازە پێگەیشتوی کومەڵە بو. بە سەنگ و تەرازوی ئەو کاتە بە ڕوشنبیر لە قەڵەم ئەدرا. بەڵام لە بیروباوەڕدا هەمتا بڵێی توندڕەو و کاڵ بو. دژی زوری ئەوانە بو لە دەوری یەکێتی کوبوبونەوە و، بە بورجوازی و دەمەیەگ و بێ کەڵکی دائەنان. لای وابو دوای گوران تەنیا شاعیر لە کوردا هەڵکەوت بێ خویەتی.

من هەوڵێکی زورم لە گەڵ دا هەندێ لەو بیروڕا چەوتانەی ڕاست بکەمەوە، بە هیوای ئەوەی ببێتە کادرێکی بە کەڵکی کومەڵە و یەکێتی. بەڵام بیروڕای لە سەر منیش گوڕا. بە تایبەتی کە ویستی، بەو جورەی خوی ئەیەوێ، پێشەکی بو دیوانەکەی بنوسم، وەکو شاعیری کومەڵە و جێگری گوران پێشکەش بە خوێنەوارانی بکەم. ڕاستیەکەی بە پێچەوانەی چاوەڕوانیەکانی ئەوەوە لە من، من ئامۆژگاریم کرد، ئەو وەکو گەنجێکی ڕوشنبیر کە سەرەڕای کوردی، زمانەکانی عەرەبی و فارسی ئەزانی، باشتر وایە واز لەو شیعرە بێ فەڕانە بهێنێ و خوی بە نوسینی شتێکی بە کەڵکترەوە خەریک بکا، بە تایبەتی لەو کاتەدا «الشرارە» دەر ئەچو، بە تەمای دەرکردنی «ڕێبازی نوێ» ش بووین.

مەبەستم لەم قسەیە، بێگومان، شکاندنی نرخی ئەو پیاوە نەبو، بەڵکو من وەکو بەرپرسێکی گوێ لێ گیراوی کومەڵە و یەکێتی، لە ڕوی دڵسوزی و دڵ پێ سوتانەوە ئەمویست ڕێگایەک پێ نیشانی کەسێکی لە خوم کەمتەجروبەتر بدەم، بۆ خوی و بو یەکێتی باشتر و سەرکەوتوتر بێ.

دیوانەکەی چاپ کرد و، شیعرەکانیشی هیچ شوڕشێکیان لە ئەدەبی کوردی دا هەڵنەگیرساند.

فەرهاد شاکەلی لە قسەکانی من توڕەی «خیبە امل» بو، بگرە وەکو ئەڵێن قوشقی بو. خۆیشی ماوەیەک بو توشی سەر لێ شێوانی سیاسی بو بو، ئەیویست بە یەکجاری بچێ بۆ ئەوروپا، وازی لە یەکێتی و کومەڵە هێنا، ماوەیەک لە گەڵ «وحدە القاعدە» و ماوەیەکیش لە گەڵ «سازماتی ئینقیلابی» کاری کرد، پاشان ڕوی کردە سوید. وازی لە

شیعر هێنا، بەڵام فەری «موهاتەراتی سیاسی» بو.

*

«زانستگای دیمەشق» هەمو ئەو خوێندکارە کوردانەی وەرگرت کە لە تەهران و عیراقەوە هات بون. بێگومان ئەمەش کارێکی نائاسایی بو. «ئیتیحادی قەومی» بە تایبەتی بو یەکێتی جێبەجێی کرد. هەر خوێندکارە پێشتر لە چ «کلیە»یەک و لە کام «پۆل»ێ بو بو، لە هەمان «کلیە» و «پۆل» وەرگیران. یەکێتی ژیانی هەمویانی دابین کرد بو: موچەی مانگانەی بو بڕی بونەوە و، کرێ ی خانوی بو ئەدان.

مامجەلال تەعقیبی خوێندکارەکانی کرد بو بۆ ئەوەی بزانێ لە خوێندن دا چۆنن، زۆریان دەوامیان نەکرد بو. مامجەلال کۆبونەوەیەکی لە گەڵ کردن بو ئەوەی لە گیروگرفتەکانیان بکۆڵێتەوە و، بۆیان چارەسەر بکا.

یەکێ لەم خوێندکارانە تازە لە عیراقەوە هات بو. دوستی کۆمەڵە بو. لە کلیەی هەندەسە وەرگیرا بو. ناوی شەماڵ بو. شەماڵ لە هیچی کەم نەبو، موچەی مانگانەی ئەوەندەی موچەکەی من بو، پارەی کتێب و کەلوپەلی زانستگاشیان بو دا بو.

مامجەلال لێ ی پرسی بو: «گیروگرفتەکانی چیە؟». وتبوی: «گیروگرفتم نیە». پرسی بوی: «ئەی بو دەوام ناکەی؟» شەماڵ وت بوی: «من ناتوانم لە وڵاتێک دا بخوێنم کوردی تێ دا بچەوسێتەوە. کورد لە سوریا ئەچەوسێنرێتەوە لە بەر ئەوە منیش تاقەتی خوێندنم نیە». شەماڵ خوێندنی تەواو نەکرد و چو بۆ ئەوروپا.

*

عارف تەیفور و وریا سەعاتچی و کەریم سنجاری کەوت بونە هاتوچو بو سوریا.

مامجەلال چو بو لەندەن. مەسعود و سامی بینی بو. یەکێ لە مەسەلەکانی باسیان کرد بو لێکۆڵینەوەی هاوبەش بو لە کوشتنی مەفرەزەکانی یەکێتی و، سزادانی بکوژەکان. مەسعود و سامی بێئاگایی خۆیان لەو رودلوە پیشان دابو. بەڵێنیان دابو کە ئەگەر لەگەڵ یەکێتی پێک بێن یا پێک نەیەن لەو رودلوە بکۆڵنەوە و سزای تاوانبار بدەن. مامجەلال پرۆژەیەکی سیاسی پێ دابون بو رێککەوتن. پاش دەسکاریەکی کەم قەبوڵیان کرد بو.

*

جموجوڵی بنەماڵەی بارزانی لە مانگەکانی شوبات و مارتی ۷۷ دا نمونەیەکە لە جۆری رەفتاری سیاسیی ئەم بنەماڵەیە لە گەڵ روداوەکان دا لەوەتی سەرکردایەتی جوڵانەوەی کوردیان گرتوتە دەس:

- مەلا مستەفا لە واشنتۆن خەریکی تازەکردنەوەی پەیوەندی بو لە گەڵ

بەرپرەبەرایەتی ئەمریکی.

- مەسعود لە شام خەریکی تازەکردنەوەی پەیوەندی بو لە گەڵ سوریا و ریکخراوە فەلەستینییەکان.

- ئیدریس لە کەرەج خەریکی سەرپەرشتی چالاکییەکانی ق م بو، کادر و مەفرەزەی ئەناردەوە بو کوردستانی عیراق.

- عوبید و لوقمان لە بەغدا بون. عوبید وەزیر بو لە وەزارەتەکەی بەعس دا.

لیرەدا بە پیویستی ئەزانم کرونولوجی هەندی لە رووداوەکان، پشت ئەستور بە بەلگە، بنوسم بو ئەوەی خویندەوار بتوانی لە گەڵ یەک بەراوردیان بکا و، پیکەوەیان گری بدا. ئەوسا من هەندی لە مانەم نەئەزانی سالانی دوایی تیەیان گەیشتم:

٩ ی شوباتی ٧٧   مەلا مستەفا نامەیەکی دریژ بو کارتەر ئەنوسی دەربارەی هەلومەرجی کوردستان. کارتەر نامەکەی پشت گوی خست و وەلامی نەدایەوە.

١٤ ی شوبات  مەلا مستەفا نامە بو سیناتور و نوینەرەکانی ئەمریکا ئەنوسی و، وینەیەکی نامەکەی بو کارتەری نارد بو، بویان ئەنیری و گلەیی ئەکا کە وەلامی نەدراوەتەوە.

٢٧ شوبات  ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی بانگ ئەکات و، دایئەنی بە سەرکردەی فەیلەقی یەک و، کوژاندنەوەی شورشی سەرلەنوی دەس پی کردوی کوردستانی پی ئەسپیری. النعیمی لەم رووەوە لە «مجریتی فی القیادە» دا نوسیویتی:

«٣٥٣. لقد کان الوقت مساء من یوم ٢٧ شباط ٩٧٧ وانا مشغول فی احد المؤتمرات الاسبوعیە لمناقشە کراسات التدریب واذا بالتلفون والمتکلم السید رئیس ارکان الجیش حیث طلب حضوری الی دائرتە وعند ذهابی الیە ابلغنی ان السید الرئیس القائد یطلب حضوری وقد ذهبنا معا الی دائرە السید وزیر الدفاع وبادرنی السید الرئیس القائد انە تم اختیاری قائد فیلق فی الشمال (مع العلم ان الحرکات فی شمال الوطن قد بدأت ثانیە) وقال انی اطلب منک ان تنهی المعرکە بسرعە فقلت لە سیدی سابذل کل جهدی من اجل ضرب العصاە ولکن لایمکن لای قائد عسکری ان یحدد موعدا لانهاء حرب عصابات یحرکها الاستعمار وهناک حدود مفتوحە لمجاورها دولە لها اطماع فی بلدنا وفی منطقە ملائمە لحرب العصابات»

١ ی مارت   سوریا ناکوکی یەکیتی و قم ی پی خوش نەبو. ئەیانزانی ئەوان لە تورکیا نفوز و دەسەلاتیان هەبو، بە بی کرانەوەی ریگای تورکیاش یەکیتی ناتوانی پەرە بە چالاکییەکانی بدا. سورییەکان مەسعودیان بانگهیشت بو سوریا. لە ئوتیلی «میریدیان»

میوانداریان کرد.

ناوبانگی پارتی له دوای ئاشبەتاڵ زۆر بوو. له ناو هێزە سیاسییەکانی عیراق و ناوچەکەدا سوک بوبون. مسعود و وەفدەکەیان له هەوڵی ئەوەدا بون پەیوەندی ئەم نوێ بکەنەوە له گەڵ هەمو لایەک. خەریکی گفتوگو بون له گەڵ حکومەتی سوری و، حیزبی بعس و، «التجمع الوطني العراقي» و، حیزبە کوردییەکانی سوریا و، ڕێکخراوە فلەستینییەکان.

مسعود و مام‌جەلال بە دوقولی و، نوێنەرایەتی هەردولا لە ئەم: مسعود و کەریم سنجاری و عارف تەیفور و، وریا سەعاتچی و، لە یەکێتی مام‌جەلال و د. فوئاد و، عادل و ، رەزاق و من چەندین جار دانیشتین و سەرداتمان کردن. سەرکردایەتی عیراقی بعس کە له سوریا بون هەوڵێکی زۆریان دا هەردولا له یەکتری نزیک بخەنەوە. ئەم لە گەڵ تجمع نەگەیشتە ڕێککەوتن. بەڵام ڕێککەوتنێکی مەیدانیی لە گەڵ یەکێتی و حیزبی بعس ئیمزا کرد. ئەمەش دەقی ڕێککەوتنەکە:

من اجل تحقيق التعاون العملي في ميدان العمليات العسكرية واتخاذ الخطوات الكفيلة بتنسيق جهود المقاتلين الثائرين على الحكم الفاشي في العراق وايصال الاسلحة والاعتدة والمساعدات المالية اليهم وتوفير سائر مستلزمات ديمومة وانتصار الثورة المندلعة في كردستان العراق باعتبارها جزءا هاما من الثورة العراقية الديمقراطية المناضلة من اجل تحقيق اهداف الشعب العراقي التي يشكل برنامج التجمع الوطني العراقي ارضية جيدة لها. اتفقت الاطراف الثلاثة على اقرار وتنفيذ الخطوات التالية:

اولا: اعتبار جميع المقاتلين الثائرين على الفاشية في كردستان العراق بصرف النظر عن انتماءاتهم الحزبية والسياسية جنودا لجيش الثورة العراقية الديمقراطية ومعاملتهم على قدم المساواة من حيث التسليح والتموين والاعتدة وتوفير سائر مستلزمات مواصلة القتال.

ثانيا: تاليف لجان تنسيق ميدانية من ممثلي الاطراف الثلاثة في مناطق القتال المختلفة لتوحيد جهود الانصار وزجها ضد الفاشية كقوى متحدة ومتضامنة في القتال وكذلك لحل الخلافات والاشكالات التي تنجم بروح الاخوة الكفاحية ورفقة السلاح في الجيش الواحد.

ثالثا: الشروع فورا بتاليف لجان التنسيق في المناطق الضرورية والممرات الهامة حسب مايتفق عليه لتامين ايصال الاسلحة والاعتدة الى المقاتلين على ارض الوطن وكذلك لاعادة المقاتلين الموجودين في الخارج مع بعضهم لينضموا الى اخوتهم المقاتلين في الوطن.

رابعا: بذل الجهود المشتركة والانفرادية المنسقة بين الاطراف المشتركة للحصول على الاسلحة المتطورة والاسلحة اللازمة لادامة الثورة بما فيها تشكيل لجنة مشتركة للتفتيش عن

الاسلحة وشرائها وتوحيد الجهود لامداد المقاتلين بها بالسرعة القصوى.

خامسا: وقف الحملات الاعلامية والكلامية وتوجيه القواعد بروح التعاون والاخوة.

سادسا: يقوم كل طرف من الاطراف الثلاثة بابلاغ قياداته وجهازه المسؤول بمضمون هذا الاتفاق والزامهم بتنفيذه وبذل كل الجهود اللازمة لوضع هذا الاتفاق موضع التطبيق العملي.

عن حزب البعث العربي الاشتراكي

باقر ياسين

عن الحزب الديمقراطي الكردستاني القيادة المؤقتة

مسعود بارزاني

عن الاتحاد الوطني الكردستاني

جلال طالباني ١٩٧٧/٣/١

هەمان ڕۆژی کە بەکەمین ڕێککەوتن لە نێوان مامجەلال و مەسعودا ئیمزا کرا، ئیسماعیل تایە تەلەعفەری پێش گەیشتنە کەرکوک، بۆ بارەگای فەیلەقی یەک، بۆ سەرکردایەتی لەشکرکێشییەکانی جەنگی عێراق دژی کورد. پاش چەند ڕۆژی لەشکرکێشیی گەورەی دەس پێ کرد بۆ سەر پێشمەرگەکانی کوردستان و بنکەکانیان. لەم ڕووەوە نووسیویەتی:

ولم تكن هناك حفلة توديع ولا حتى توديع للضباط والمراتب لان المطلوب التحاقي بسرعة الى منصبي الجديد قائدا للفيلق الاول في الشمال وهكذا كانت رحلتي دائما هي الالتحاق السريع بعد صدور امر نقلي ولذلك كان سفري للالتحاق يوم ١ اذار ١٩٧٧ حيث وصلت بالطائرة الى قاعدة كركوك الجوية وكان عدد من الضباط قد حضروا لاستقبالي في المطار ووصلت الى مقر الفيلق في معسكر كركوك.»

٣ ی مارت مەلا مستەفا نامەیەکی تری بۆ کارتەر نوسی داوای بینینی ئەکات. لە نامەکەی دا نوسیویەتی: «ئەم بینینەی دوایی ئێوە و بینینەکەی جێگری سەرکۆمار ماندیل لە گەڵ فلادەمیر بوکۆلسکی سەرلێی گەورەی ئێوەی لە گەڵی زوولێکراو و، ئارەزووی ڕاستەقینەی ئێوەی بۆ یارمەتیدانی بۆ پێشەوە چوونی «ئازادی و مافی دەربڕین»، بە ئاشکرا دەرخست. ئەم کارە بێگومان ورەی هەمو بەرهەڵستکارانی شورەوی بە هێز کرد. ٣ ملیۆن گەلی کورد لە عێراق دا کە بە هۆی ڕووداوەکانی پێش و پاش ڕێککەوتنی خیانەتکارانەی جەزائیرەوە لە ٦ ی مارتی ٧٥ دا ڕوویان لە دەس داوە، لە هەمو کەسی زیاتر شایانی ئاوڕ لێ دانەوەی ئێوەن. بینینی ئێوە و جێگری سەرکۆمار یارمەتییەکی گەورە ئەبێ بۆ بەرزکردنەوەی ورەیان و هەروەها پشتیوانی لە بار و دۆخی ئەوان لە

تاریکترین کاتی مێژووی کوردستان دا لە لایەن ئێوەوە، یارمەتی ئەدا. بە ئومێد و خۆشییەکی زۆرەوە چاوەڕوانی بینینتانم.»

*

مەسعود داوای لە مامجەلال کرد بوو: بادینییەکان بگەڕێنەوە بادینان و، سۆرانییەکان بگەڕێنەوە ناوچەی سۆران. مامجەلال ڕەزامەندی پیشان دابوو، بەلام بە نیەتی نەبوو. ئەمە خۆیشمان پێمان خۆش بوو بچینە ئەو ناوچەیەی لێی شارەزا بووین. خۆمان ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە. پێشمەرگەکانی بادینان سازدران بە سەرکردایەتی حسێن بابەشێخ بگەڕێنەوە. مەسعود ستایشی شێخ حسێنی کرد بوو. بەخۆشحالی خۆی دەربڕی بۆ بەوەی کە یەکێتی پیاوێکی نەرم و بەڕێزی وەکو شێخ حسێن لە بادینان دا ئەنێ. بەڵێنی دابوو هەمەو جۆرە هاوکارییەکی لە گەڵ بکەن.

*

## برادۆست: یەکگرتنەوەی براکان

•

بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتنەی لە شام بو «هاوکاری مەیدانی» لە نێوان مامجەلال و مەسعود بارزانی دا ئیمزا کرا بو، ئەم دو حیزبە ئەبو: لە هەمو مەڵبەندەکانی کوردستانی عێراق کومیتەی هاوبەش بو هاوکاری دابمەزرێنن. ئەبو ڕێ لە یەک نەگرن و یارمەتی یەکتر بدەن.

مانگی نیسانی ۱۹۷۷ خالید سەعید و هەندێ لە پێشمەرگەکانی بالەکایەتی هات بون بو هەلگورد و ناوچەی برادۆست. ماوەیەک لەوێ مابونەوە، چاوەڕوانی گەیشتنی هەندێ لە بەرپرس و کادرەکانی یەنک بون ئەکرد لە سوریاوە. کاک خالید لە چاوەڕوانی بێتاقەت بو بو ڕوێشت بو بو هەلگورد، بەلام دو مەفرەزەی لە ناوچەکەدا بەجێ هێشت بو. یەکێکیان ئەورەحمان بێشەیی و ئەوی تریان قادر ڕوستایی فەرماندەیان بو. لە گەڵ ئەوان دا جەوهەری براشی دانا بو. هەر لە گەڵ ئەوان دا بو شارەزایی و هاوەڵێتی پێشمەرگەیەکی جاماتەسوریان لە گەڵ بو بە ناوی ڕەشید گەردی. ڕەشید لە گەرەپیەکانی تورکیا بو بەلام لە شۆرشی ئەیلول دا پێشمەرگە بو. شارەزاییەکی زۆری لە ئەرز و دانیشتوانی ناوچەکە هەبو. جاروبار لە گەڵ ئەوان ئەگەرا و جاروبار خوی بە تەنیا ئەچو بو گوندەکانی سەرسنور لە تورکیا.

لە مانگی نیسان دا لە گەڵ شەهید نەجمەدین بێوک قەیا «نەجو» لە قامیشلیەوە چوینە نسیبین و دوایی دیاربەکر. لە دیاربەکر لە گەڵ سەرکردەکانی «پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا» کو بوینەوە. باسی هەلومەرجی کوردستان و پلانی کاری داهاتوی یەکێتی م بو کردن. نەجو لە گەڵ سەرکردەکانی پ د ک ت تیک چو بو. لە دیاربەکرەوە بە هوی ئەوانەوە چومە وان بو مالی عەلی شێر. لەویش بە ڕێبان کردم بو گوندی «بێوک سەکوا» بو لای مەلا حەقی. مەلا حەقیش بەرەو ڕوی کوردێکی عێراقی کردمەوە کە لە گوندێکی سەرسنور دانیشت بو، ناوی «موسا» بو.

موسا کوڕێکی خوێندەوار و لە گەرەپیەکانی هەولێر بو. دوای هەرەس بە مال و خێزانەوە چو بوە ناو گەرەپیەکانی تورکیا و لە گوندی «بێگور» دانیشت بو. پێشتر تالیب ڕوستەم و خالید سەعید لە گەڵ ئەم کوڕە پەیوەندیان دروست کرد بو. یەلیێنی هاوکاری دا بو. تالیب سەفەرێکی کورتی بو سوریا کرد. زۆر نەمایەوە و گەڕایەوە بو

کوردستان. هەردوجار موسای دی بو. بیگور یەکێکە لە گوندەکانی شەمزینان. لە شوێنێکی سەخت و عاسی دا بو. پەناگای بەردەوای زۆری لێ بو. زۆر بە زەحمەت دەستی جەندرمەی تورکی ئەگەیشتێ. لە گەڵ موسا وا ری کەوت بون کە ماڵەکەیان و گوندەکە وەکو بنکەیەکی نهێنی بۆ هاتوچو و شاردنەوەی چەک بە کار بهێنرێ. پێشتر بنک بە هۆی دەمەقاڵەوە هەندێ تفەنگی نارد بۆ ئێمە لە بیگور بشاردرێتەوە بۆ ئەو کادر و پێشمەرگانەی لە سورییاوە بە «هێڵی مزور» بە ناو تورکیادا ئەگەڕانەوە بۆ کوردستان. چەند تفەنگێکی کەم گەیشت بوە دەست موسا. لە گەڵ موسا چوینە بیگور. موسا ئاگاداری دەنگوباسی سەفەرەزەکانی برادوست و کاک خالید بو. تفەنگێکم بۆ خۆم لێ وەرگرت. سەیرێکی ناوچەکەمان کرد. لەو شوێنانەی کە بە تایبەتی چوم بۆ سەیر کردنی ئەو چیا و کەورگە سەختە بو کە لە سپیەکان دا خوشەوی خلیلی لێ کوژرا بو.

بە شەو چوینە «کەتینە». کەتینە تەنیا یەک ماڵ بو لە سەر ڕوباری سەرکەم لە بەری تورکیا. خاوەنی ماڵەکە کابرایەکی بە ساڵاچوی دەمودان گەش بو. ناوی مەلا عیسا بو. بەلام تا بڵێی پیاوێکی دڵسۆز و نەترس و دەس و دڵ فراوان بو. هەواڵی پێشمەرگەکانی ئەزانی لە کوێن. من تا ئەو کاتەش کراس و پانتۆڵی جینزم لە پێ دا بو. ئەیزانی لە ئەورووپاوە هاتومەتەوە. رادیۆیەکی ترانسیستەری لە لاوە بو. پرسیاری دەنگوباسی دنیای لێ کردم. هەروەها هەواڵی بارزانی لێ پرسیم. من هەندێ قسەی گشتیم بۆ کرد. مەلا عیسا وتی: «ئەتزانیەوە لەو بەینەی پێشودا سەرۆکی ئەمریکا چوتە مەجلیسێکی گەورە مەلا مستەفاشی لێ بوە. هەمو مەجلیسەکە لە بەر سەرۆک هەستا بون مەلا مستەفا نەبێ. سەرۆک زۆری پێ ناخۆش ئەبێ لە مەلا مستەفا ئەپرسێ ئەڵێ: «ئەوە بۆچی هەمویان لە بەر من هەستان تۆ نەبێ؟». مەلا مستەفا لە وەڵام دا ئەڵێ: «تۆ هەردو قاچی منت بڕیوەتەوە چۆن ئەتوانم لە بەرت هەستم».

چیرۆکەکەم بەلاوە سەیر و خۆش بو. بە لایەکەوە سەیر بو چونکە تازە بەتازە نامەکانی بارزانیم بۆ کارتەر خوێند بووە، بە لاکەیەوە خۆش بو چونکە تا رادەیەک تێ گەیشتم کە فۆلکلۆر چۆن دائەنرێ و، خەڵکی سادە ئارەزو ئەکەن سەرکردەکانیان چۆن بن.

هەر لە ماڵەکەی ئەو نانمان خوارد و تا دەمەوبەیانی نوستین. بەیانی بەر لەوەی دنیا روناک ببێتەوە لە گەڵ مەلا عیسا چوینە سەر ئاوەکە. خۆمان روت کردەوە. پەندە کۆنەکەی پێشینانم بیر کەوتەوە کە ئەڵێ: «قنگی رەش و سپی لە بوارا دەرئەکەوێ!». لە «بێ» یەکەوە لە ڕوباری هەستاری «سەرکەم» پەڕینەوە. «بێ» لەم ناوچەیەدا و، «بوار» لە

هەندی ناوچەی تر، بەو شوێنانەی ناوەڕوی ڕووبارەکەیان ئەوت کە لە چاو شوێنەکانی تری دا تەنگتر و بەرینتر بو، پیاو لە بەریکیەوە ئەیتوانی بپەڕیتەوە بۆ بەرەکەی تری. گەیشتمە مەقەرەزەکەی یەنک لە گوندی «دەریا سور». دەریا سوریش گوندێکی بچوک بو لە سەر ڕووبارەکە لە بەری عیراق. خەلکی هەردو بەر «گەردی» بون.

پێشمەرگەکان دەمی بو چاوەڕی بون کەسانی لە سوریاوە بگاتە لایان. هەوالی خوشی دەرمەوە و مژدەی پەیدا کردنی دوست و پشتیوان و، چەک و پارەیان بو بهێنیتەوە. کاک خالیدمان ئاگادار کرد هات و یەکترمان بینی و، دوای ئەوەی چەند ڕوژی بە یەکەوە بوین، گفتوگو و قسەی پێویستمان کرد، ئەو بو کارێکی پێویست چوە دولی لولان و، من لەوی مامەوە. نامەیەکی درێژم دەربارەی هەلومەرجی دەرمەوە بو کاک عەلی و هەڤالەکانی تر نوسی.

*

ناوچەی برادوست کەوتوتە نێوان ٣ سنور. لای سەروی هاوسنورە لە گەل شنوی ئێران و لای ڕوژئاوای هاوسنوری شەمزینانی تورکیایە. ناوەندی ئیداری ناوچەکە سیدەکانە کە سەر بە قەزای ڕواندز و ئەویش سەر بە محافظەی هەولێر بو.

کێوە بەرزەکانی سەپەرێزی خەیلانی و کێلەشین و دالانپەر لە ئێران و، ڕووباری سەرکەم، کە پێشی ئەلێن ڕووباری حاجی بەگ لە تورکیای جیا ئەکاتەوە. زنجیرەی کێوە بەرزەکانی ئەلیپ و شەکیپ بە سەر ڕووبارەکەدا ئەڕوانن. هیچ ڕێگایەکی قیرتاو یا خاکی ناوچەکەی بە هیچ کام لەم دو ولاتەوە نەئەبەست. لە دیوی شنو جادەیەکی خاکی تا نزیک کێلەشین و لە دیوی شەمزینان جادەیەکی خاکی تا گوندی «ڕووباروک» ئەهات بەلام نەبەسترا بون بە هیچ ڕێگایەکی دیوی برادوستەوە. بە لکو لە دیوی برادوست هیچ ڕێگایەکی قیر یا خاکی تی دا نە کرا بوە وە. ڕێگاکانی هەمو کوێرەڕێگای ولاخ بون. کاروانی هێنانوبردنی کەلوپەلی قاچاغ و هاتوچوی میگەل لە نێوان هەر ٣ سنورا بەردەوام بو.

*

ئاژەلداری یەکی بو لە کارە سەرەکییەکانی دانیشتوانی ناوچەکە. لەم ناوەدا چەند تیرەیەک هەبون برادوستیان پێک ئەهێنا: ڕەمەندوک، بنەجی و، خواکورک.. جگە لەمان هەرکییەکان بو لەوەڕخوری ئەهاتن بو کوێستانەکانی ئەم ناوچەیە. هەوارەکان لە زور کونەوە دابەش کراون. هەر تیرە و هوز و بنەمالەیەک ئەزانی شوێنەکانی کوی یە. وشەی «هەوار» لە ناوچەی سلێمانی دا بو ڕەشمال بە کار ئەهێنن بەلام لەم ناوچەیەدا بە ولاخ ئەلێن:

«دەوار» و، بە رەشماڵ ئەڵێن: «کۆن». چەند کۆنێک پێکەوە لە شوێنێک دا هەڵئەدەن پێ یان ئەڵێن «ئۆبە» و، چەند ئۆبەیێک کە سەر بە یەک تیرەن لە چەند شوێنێکی نزیک لە یەک هەڵئەدەن پێ یان ئەڵێن «هۆبە».

تام و بۆنی ماست و، کەرە و، دۆ و، پەنیرەکەیان بە هۆی گژوگیای بۆنخۆشی کوێستانەکانەوە زۆر خۆشە. هەروەها تامی گۆشتەکەشی. بۆ یەکەم جار لە کوردەواری بیستم پەنیری برژاو بخۆن لێرە بوو. سەلکە پەنیری تازەیان وەکو گۆشت ئەچنی و لە شیشیان ئەدا و، لە سەر ئاگر دایان ئەنا تا ئەبرژا. خواردنێکی خۆش بوو.

پەنیریان بۆ فرۆشتن دروست ئەکرد و، پەنیری پێستە و، ژاژی و، تەرماستیان بۆ زستان بۆ وەرزی بڕانی شیر هەڵئەگرت. یەکەم جار «تەرماست» م لەوێ بینی و خوارد. پاییزان کە ئیتر شیری ئاژەڵ خەست ئەبێتەوە و، بەرەو کەمبوون و بڕان ئەچێ، بەشێکی لە تەنەکە و گۆزەدا ئەکەن بە ماست و، رۆنی قرچاوی خۆماڵی بە سەردا ئەکەن تا چینێکی ئەستوور دروست ئەکا، لە شوێنێکی فێنک دایان ئەنا. ماستەکە ئەمایەوە، خەست ئەبووەوە و، تامی زۆر خۆش ئەبوو. لە زستان دا بە کەوچک سەرچینێکی رۆنەکەیان ئەشکاند و ماستەکەیان لێ دەرئەهێنا بۆ خواردن. بەم جۆرە ماستەیان ئەوت: «تەرماست».

ئاژەڵیان لە کوێستانەکان ئەلەوەڕاند. بۆ زستان، بۆ مەڕ گیایان ئەکرد بە «گزرە» و «گیش» و لە بەردەمی ماڵەکانی خۆیان دا لە شێوەی گومەزدا کەڵەکەیان ئەکرد، پێ یان ئەوت: «قوزی». بۆ بزن گەڵا و چڕوی ناسکی بەرویان ئەبڕی و لە نێوان دوولقی بەرزی داربەڕوویەک دا دایان ئەنا، پێ یان ئەوت: «گەڵ». جۆرێکیارە دەوڵەمەندەکان «پاوان» یان «قەدەغە» یان هەیە، بەشێکە لە لەوەڕواری ناوچەکە بەڵام خاوەنی ناسراوی هەیە، جگە لە خاوەنەکەی کەس بۆی نیە داری لێ ببڕێ، یا گەڵی لێ بکا.

شوانەکانی ئەم ناوچەیە هەریەکەی تەوورداسێکی کرد بوو بە بەر پشتێنەکەی دا. کە ئەگەیشتنە خەڵفی تازە پێگەیشتوو و، پەلی سەوز و ناسکی دارەکان، تەورداسەکەی دەرئەهێنا و ئەکەوتە بڕینیان. ئاژەڵەکەی تێ ئەوەڕکا.

زستان کە بەفری زۆر ئەباری و ئاژەڵ لە «هۆڵ» و «گەور» دا ئەمایەوە گزرەیان ئەدا بە مەڕەکانیان و چڕو بە بزنەکانیان. بۆ ئەوەی لە ناو بەفردا نەچەقن و تلوم نەبن، شتێکیان ئەکرد بە پێڵاوەکانیانەوە پێ یان ئەوت: «لیپان». لیپان لە دار دروست ئەکرا و، لە کەڵلەی هێلەک ئەچوو.

هەندێ جار لە پاییزدا کە لەوەڕ کەم ئەبوو «گوینی» یان بە تەوراس ئەچنی و ئەیان دا بە بزن. گۆشتی بزنەکەی ئەوەندە تاڵ ئەکرد لە خواردن نەئەهات. ئەبوو بزنەکە چەند رۆژی

دابەستن و ئالیکی ئاسایی بەرایەتی تا تالی لە گۆشتەکەی دا نەئەما، ئینجا بە کەلکی
کوشتنەوە و خواردن ئەهات.

ناوچەکە بەگشتی، لە گژوگیا و گوڵی کێوی دا زۆر دەوڵەمەندە. گیا بۆ خواردنی
مرۆڤ، گیا بۆ لەوەری ئاژەڵ، گیا و گوڵ بۆ جوانی و بۆنخۆشی، گیای رەنگ، گیای
ئابووری وەکو کەتیرە و گیا سالم، لە ناوچەکەدا زۆرە.

ژمارەیەکی زۆر پوورە هەنگ شاریان لە کلۆری دارە پیرەکان و کونەبەردی شاخەکان
دا کرد بوو. یەکێ لە نەریتەکانی ناوچەکە ئەوە بوو: هەر کەس پوورە هەنگێکی کێوی
ئەدۆزییەوە نیشانەی ئەکرد. پارچەیەک دەستەسڕی پێ دا هەڵئەواسی، یان بە چەقۆ
نیشانەیەکی لێ هەڵئەکەند. ئیتر هەرکەس ئەم نیشانەیەی ببینیایە ئەیزانی کە یەکێک لە
پێش ئەودا دۆزیویەتییەوە، ئەم دەستی بۆ نەئەبرد. لە وەرزی دەرهێنانی هەنگوین دا
ئەچوونەوە سەری. بەڵام وا بە نەزانی و چاوچنۆکی ئەیانبڕی هەنگەکە بە تەواوی ئەفەوتا.

پێش ئاشبەتاڵ ناوچەکە لە ژێر دەسەڵاتی بارزانییەکان دا بووبوو. «خودانی بارزان»
لە مێژ بوو راوی کەو و کێوی قەدەغە کرد بوو. ئەو بڕیارە لەم ناوچەیەش دا جێبەجێ کرا
بوو. بە سەدان پۆلی قەلەبالغی کەوی لێ بوو. خەڵکی ناوچەکە، ئەوسا، نەیانئەتوانی راو
بکەن چونکە لە ترسی حکومەت کەس نەیئەوێرا تفەنگ ئاشکرا بکات. دیمەنی ئەم پۆلە
کەوانە کە ئەفڕین و ئەیانخوێند جوانییەکی بێ وێنەی دابوو بە شاخ و شیوەکانی. تاکوتەرا
ورچ و نیشانەکانی، ئەبینرا.

•

بێگومان ئەم ناوچەیە لە کۆنەوە ئاوەدان بوە. لە نزیک ئاوایی «پیرەبنان» لێشاوی
باران کەندێکی دری بوو. چەند گۆزەیەکی ساغی، لەو گۆزانەی پێش ئیسلام لە سەرانسەری
ئەم ناوچەیەدا باو بوە، دەرخست بوو. وەکو باسمان کرد لە کۆتایی دۆڵی خواکورک دا
ئەشکەوتێکی لێ بوو شوێنەواری دێرینەی تێ دا بوو، «کەیل» یکی مێژوویشی لێ بوو.
هەلومەرجی ئەو کاتە ڕێگایان نەدام سەری هیچکامیان بدەم. بەڵام بە ناوبانگترین
شوێنەواری مێژوویی لەم ناوچەیەدا «کێلەشین» بوو.

«کێلەشین» بەردێکی شینە بالای لە دو مەتر کەمترە چەند نووسینێکی گرنگی لە
سەرە ئەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەک پێش زایین. کورد و شوێنەوارەکانی، کاتی خۆی،
بایەخیان بەم جۆرە شوێنەوارە مێژووییانە نەداوە، بەڵکو زۆر شوێنەواری بە نرخی لەم
بابەتەیان، بە بیانوی ئەوەی هی کافرە یان گاورکردە، لە ناو بردوە. ئەم کێلەش لە
دەستدرێژی مرۆڤی کورد دەرباز نەبوە. جێگای چەندین گوللە و بەردی پێوە بوو.

٥. مەڕدارەکان فێری شێوەی نوێ ی بڕینەوەی خوری بکرێن.

ب. کشتوکاڵ

ناوچەکە بە گشتی شاخاویە، زەوی بۆ کشتوکاڵی دانەوێڵە کەمە، بەڵام ئاووهەوای لە بارە بۆ ڕەز و باخ. لە لاپاڵی شاخەکان و، لە کەناری جۆگا و چەمەکان ئەتوانری سەدان ڕەز و باخ ئاوا بکرێتەوە، ڕەزی: تری ی دێمی و بەراو، باخی: قەیسی، هەرمێ، هەڵوژە، قۆخ، هەنجیر، هەنار. لە مانە هەمووی گرنگتر ئەتوانری بە درێژایی شیو و دۆڵەکانی، لە کەناری جۆگا و چەمەکان دا، هەزاران بن داری گوێز بڕوێنری و، بە خزمەتێکی کەم بەرهەمێکی زۆر ئەدەن. لەم ناوچەیەدا سمۆرە دەورێکی گەورەتری لە مرۆڤ هەبوە لە ڕواندنی داری گوێزدا.

لە ناو لێڕەوارەکەدا هەزاران داری قەزوان، کروسک، گوێژ، بەلاڵوک، چەقاڵەی تێ دایە، کە ئەکرێ موتوربە بکرێن بە پستە، هەڵوژە، هەرمێ...

ج. پەروەردەکردنی هەنگ

ئەم ناوچەیە لە گوڵ و گژوگیادا زۆر دەوڵەمەندە و، شوێنێکی لە بارە بۆ بە خێو کردنی هەنگ. هەنگوینەکەی زۆر نایاب و شانەکانی سپیە. لە شەمزینان لە دیوی تورکیا و، لە شنۆ لە دیوی ئێران، پەروەردە کردنی هەنگ بە شێوەی نوێ لە سنوقی ئەمریکی دا بو بە باو، بەڵام لێرە هێشتا بە شێوەی کۆنی کوردەواری لە «شەماڵە» ی خۆماڵی دا بە خێویان ئەکرد. زۆر جار تووشی نەخۆشی ئەبو و ئەفەوتا.

ئەتوانری چەندین هەنگەلانی گەورە لەم ناوچەیەدا دابمەزرێنری و، هەزاران پورە هەنگی بە شێوەی نوێ لێ بە خێو بکرێ، لە هەمان کات دا پارێزگاری شێوە کۆنەکەش بکرێ. ئەتوانری هەمو ساڵ چەندین تەن جۆری باشی هەنگوین بەرهەم بهێنری.

د. توریزم

ناوچەکە، بە درێژایی ساڵ و لە هەمو وەرزەکانی دا، زۆر لە بار بۆ بۆ توریزم.

لە زستان دا بەفرێکی زۆری لێ ئەبارێ، چەند مانگی ئەمێنێتەوە. چەندین جێگای تێ دایە بۆ یاری زستانە بە تایبەتی خلیسکێنی سەر بەفر «سکی».

لە بەهاردا سەدان کانی دروزنەی لێ ئەتەقێ و، گوڵی جۆراوجۆری لێ ئەگەشێتەوە.

بۆ هاوین زۆر جێگای لێ بە دیمەنی جوان و، هەوای فێنک و، ئاوی سازگار و ساردی مشەیە. ئەشێ هەوارگەی توریستی جۆراوجۆری لێ بینا بکرێ.

یەکێ لەو شوێنانەی ڕەنگە بۆ هەوارگەی توریستی خۆش بێ، هەواری «دێنارە» یە. دێنارە لە نزیکی هەڵگوردە، بە لوتکەی شاخێکەوەیە ٣ هەزار مەتر زیاتر لە ئاستی

دەریاوە بەرزە، گ.رایی و گەرمێکی شێنی جوانی لێ بە جۆگایەکی خۆری ساردی لە بەر ئەروا، سەدان جۆر گژ و گیا و گوڵی کێوی جوان و بۆنخۆشی لێ ئەروێ، بە سەر زۆر ناوچە و چیادا ئەروانی و، چاوئەندازێکی جوان و دڵڕفێنی هەیە.

لەم ناوچەیەدا ئەتوانرێ چەندین بەنداوی گەورە و بچوک، بۆ گلدانەوەی ئاوی باران و بەفراو و کانیەکان، لە ناو شیوەکانی دا، بۆ مەبەستەکانی: ئاودان، بەرهەمهێنانی کارەبا و، بۆ جوانی دروست بکرێ.

کردنەوەی جادە و ڕێگاوبان و، ڕاکێشانی کارەبا و، دروستکردنی خانوبەرەی نوێ ئەبێ شان بە شانی هەنگاوەکانی تر جێبەجێ بکرێ، بێ ئەمانە ناوچەکە ناتوانێ گەشە بکا لە مەیدانەکانی تردا.

*

دامەزراندنی بنکەی ئەمین

یەکێ لە مەرجە سەرەکییەکانی مان و درێژەپێدانی چالاکییەکانی جوڵانەوەیەکی چەکدار دامەزراندنی بنکەی ئەمینە.

شۆڕشی ئەیلول گیروگرفتی بنکەی ئەمینی نەبو، چونکە هەر لە سەرەتاوە زۆر شاخ و گوند و ناوچە و شارۆچکەی کوردستانی عێراق کەوتە دەس پێشمەرگە و بە ئازادی مایەوە. بنکە و بارەگا و شوێنی ژیان و حەسانەوە و زیندان و دەبو و چاپخانە و ڕادیو ... لێ دانرا بو. لە شۆڕشی ئەیلول دا جگە لە دەزگا سەرکردەییەکان، هەمو هێز و بەتالیۆن و لق و، هەمو لق و ناوچە و ڕێکخراوەکان بنکەی تایبەتی خۆیان هەبو، تارادەیەکیش ئەمین بون. واتە دور بو لە دەسەڵات و پەلاماری دوژمنەوە.

دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، سەرکردایەتی بەعس پلانێکی عەسکەری، ئەمنی، سیاسی... دانا بۆ دەس گرتن بە سەر کوردستان و دانیشتوانی دا. ناوچەی ئازاد، یا ناوچەی دەرەوەی ژێر دەسەڵاتی بەعس نەما بو. دەسەڵاتی بەعس لە هەمو جێگایەک یا هەبو یا ئەی توانی بە ئوتومبیل و بە هالیکۆپتەر بە ئاسانی و بە زویی بیگاتێ. توری جاسوسی بەعسیزی لە هەمو دێهاتەکان دا دامەزراند بو. هەمو موختارەکانی کرد بوە مورچە خۆری حکومەت و ئەبو هەواڵ و دەنگوباسی گوندەکەیان بە دەزگا ئەمنیەکان بگەیەنن. لە زۆر جێگای دور و چەپەک و شاخاوی و سەرسنور بارەگای ڕێکخستنی حیزبی بەعسیان دامەزراند بو.

بۆچونی ی ن ک بۆ دەس پێ کردنەوەی کاری پێشمەرگەیی جیاواز بو لە هی شۆڕشی ئەیلول، بە تایبەتی چونکە هەلومەرجی سیاسی - چەکدار و ڕێکخراوەیی جیاواز

و ته‌رازووی هێزی نێوان کورد و بەعس بە تەواوی گۆڕا بوو.

ی ن ک لەو قۆناغەدا ئەنیشتوانی «پێنگەی ئەمین» ی هەبی. هێزەکانی ی ن ک ئەیو دابەش بن بە سەر شوێنە جیاوازەکانی کوردستانی عێراق دا. مەفرەزەی پچووکی ٥ تا ١٠ پێشمەرگەیی بە چەندایەتی کەم و بە چۆنایەتی باش دروست بکەن. بە هەمو توانارە ئەیو خۆیان لە شەر و پێکدادانی ڕووبەڕوو لابدەن. ئەیو شوێن و بارەگای دیار و ئاشکرایان نەبی و هەمیشە لە گەڕان و سووڕان دا بن. بۆ چەواشە کردنی دوژمن ئەیو لە هەمو شوێنێک هەبن و لە هیچ شوێنێک نەبن. ماوە بە دوژمن نەدەن زەمان و زەمینی شەڕیان بە سەردا بسەپێنی. مەفرەزەکانی سەرەتا ناویان بە خۆیانەوە بوو: تیپی پووچاکانەی چەکدار «فرق الدعایە المسلحە» ئەرکی ئەمانەش بریتی بوو لە: بەرز کردنەوەی وره و زانی کۆمەڵانی خەڵک، دروست کردنی ڕێکخستنی سیاسی، سەرکوت کردنی جاسوس و نۆکەرەکانی بەعس.

لە هەندێ جێگا پەیرەوی ئەم سەرەتایانە نەکرا بوو. سەرکردەکانی بزوتنەوە چەندی توانی بوویان سەرانی خێڵ و کوێخای گوندیان ساز دابوو بێن بە پێشمەرگە. هێزی زلی خێڵەکییان لێ پێک هێنا بوون و پێنگەی ئاشکرایان، وەکو سەردەمی شۆرشی ئەیلول، لە ناوچەکان دا دامەزراند بوو. بە تایبەتی لە ناوچە عاسی و شاخاوییەکانی دۆڵی جافەتی، شێنکایەتی، بالیسیان، مەنگورایەتی و ئاکۆیەتی... ئەمەش ماوەی بە هێزەکانی جەیش ئەدا ئاگاداریی تەواو لە سەر ژمارەی پێشمەرگە و چەک و شوێنەکانیان کۆ بکەنەوە و، پەلاماریان بدەن.

*

شەر لە گەل کورد بوو بە بەشێکی سەرەکی پیشەی ئەفسەرانی جەیشی عێراق. بە هۆی ئەم شەرەوە زۆریان دەوڵەمەند بوون، دەسەلاتیان پەیدا کرد و، ناویان دەرکرد. شەر لە گەل کورد، کوشتن و سووکایەتی پێ کردنی، وێرانکردنی ماڵ و ناوایییەکانی و تالانکردنی، بۆ ئەوان لە هەمو شەرێکی تر ئاسانتر بوو. کورد کەسی نەبوو لە سەری هەڵ بداتی، خۆیشی هەرگیز نەیتوانیوە، یا بیری لەوە نەکردۆتەوە، سزای تاوانکارەکانیان بدات، لە بەر ئەوە هەر ئەفسەرێکی گەورە تەکلیف کرابێ سەرکردایەتی شەری کورد بکا، بە خۆشییەوە قبوولی کردوە و، بە پەلە خۆی گەیاندۆتە کوردستان. لە کوردستانیش هەر خراپەیەکی لە دەستی هات بێ درێغی نەکردوە. قانونەکانی عێراقی پێ شێل کردوە و، پێ ی لە شەرەفی عەسکەری خۆی ناوە، بەها بەرز و پیرۆزە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی تەنانەت خێڵایەتییەکانیشی فەرامۆش نەکرد، تەنیا بۆ ئەوەی ئالەرینی سەرووی خۆی بە دەس بهێنی

و، بە زۆری دەولەمەن بێ. بۆ پاساودانی ئەمەش، ئەوەی ئەکرد بە بیانۆ کە ئەم سیاسی نیە و، عەسکەری «محترف» ە «ئەوامیر» تەنفیز ئەکا.

سەرکردەکانی جەیش هەمیشە لە دو لاوە بۆ کێشەی کورد ئەروانن:

- تەرازوی جەنگیی هێزەکانی جەیش و کورد، ئەگەر ئەوە سەرکەوتو ئەبو،
- دەستی بێگانە لە کێشەی کوردا.

عێراق لە ژمارەی چەکدار و، چەک و، تفاقی جەنگ و، توانای مادیی دا.. بە سەر کوردا هەمیشە بالادەس بوە. سەرکردایەتی جەیش، کە بە گوێرەی ئەم بالادەستیە ڕێوشوێنی کوژاندنەوەی جولانەوەکەیان دائەنا و، دوای بەکارهێنانی هەمو ڕێگایەکی عەسکەری بۆیان دەرنەکەوت جولانەوەکەیان پێ ناشکێ ئینجا، تاوانی ژێرکەوتنی خۆیان ئەخستە پاڵ بێگانە. بیریان لەوە نەئەکردەوە کە هۆی هەڵگیرسانی جولانەوەکە و درێژە کێشانی و، سەرنەکەوتنی سەرکوتکردنی عەسکەری، ئەگەڕێتەوە بۆسیاسەتی چەوتی حکومەتی عێراق بەرامبەر گەلی کورد، نەک بۆ ستراتیجی جەنگیی و تاکتیکەکانی ئەوان و، دەستی بێگانە.

کاتێ ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی گەیشتە کەرکوک بۆ سەرکردایەتی فەیلەقی یەک، نزیکەی ١٠ فیرقە سەربازی جەیشی عێراق لە کوردستان مۆڵ درا بو. لە کەرکوک فیرقەی ٢ بە سەرکردایەتی ل ر سعدالدین عزیز، لە هەولێر فیرقەیەک بە سەرکردایەتی ع ر عبدالجواد ذنون، لە سلێمانی فیرقەیەک، لە موسڵ فیرقەیەک بە سەرکردایەتی ع ر حازم برهاوی، لە سەرسەنگ «قواتی نەهاوەند» بە سەرکردایەتی ع ر عبدالهر النعمە، لە زاخۆ «قواتی ذیقار» بە سەرکردایەتی ع ر کریم محمود گرجیە...

ئیسماعیل تایە ئەلنعیمی، سەرکردەی ئەوسای فەیلەقی یەک، کە خۆی سەرکردایەتی هێرشەکانی کردوە، لە کتیبەکەی دا: «تجربتی فی القیادة» بەمجۆرە بەرنامەی کارەکانی ئەگێڕێتەوە:

٣٥٨. لقد طلبت قادة الفرق للحضور الى مؤتمر حدد له يوم معين من اجل العمل بسرعة لضرب العصاة الذين استطاعوا ان يحققوا بعض الانتصارات مؤخرا الامر الذي شجعهم للقيام باعمال واسعة في المنطقة، لقد طلبت من قادة الفرق دراسة كافة الاوضاع في قواطعهم وبيان مقترحاتهم لتطوير العمل ضد العصابات وارسالها الى الفيلق قبل موعد المؤتمر.

٣٥٩. لقد سبق وقاتلت العصاة عندما كنت قائد فرقة ولدي خبرة لاباس بها في قتالهم كما استفدت كثيرا من قتالهم عندما كنت وكيل معاون العمليات حيث كنت في المعركة مباشرة منذ ابتدائها في آذار ١٩٧٤ وانتهائها في اذار ١٩٧٥ حيث صدر بيان الجزائر وانهيار

العصاة، ان قضية العصيان في شمال الوطن اصبحت ملازمة لاوضاع العراق حيث اصبحت كما وصفها السيد الرئيس القائد المهيب الركن صدام حسين في حينه «ان التمرد ليس قطريا بل دوليا».

لذا فان الصراعات الدولية المتشابكة اخذت تحرك العصيان بما يخدم مصالح الدول الكبرى وستراتيجيتها في المنطقة الامر الذي يتطلب ان نعرف كيف نتعايش مع هذا الحرب ونضع الحلول الستراتيجية البعيدة المدى للقضاء عليها نهائيا.

ستراتيجية العمل ضد العصاة

٣٦٠. لقد فكرت بوضع ستراتيجية للعمل لتامين الاستقرار في المنطقة وقد فاتحت القيادة العامة للموافقة على هذه الستراتيجية فحصلت الموافقة على ان يتم العمل بها بمراحل وحسب توفر الامكانيات لذا فقد وضعت ستراتيجية للعمل لاول مرة في الفيلق وهي:

ا. مسك الحدود بصورة جيدة وحسب خطة مدروسة.

ب. فتح الطرق في المنطقة الشمالية بشكل واسع مع اعطاء الاسبقيات للمناطق الصعبة والمحتملة للعصيان والطرق الحدودية.

ج. كسب سكان المنطقة الى جانب السلطة الوطنية.

د. الانتعاش الاقتصادي للمنطقة وامتصاص البطالة.

تطوير العمل العسكري في المنطقة الشمالية

٣٦١. لقد تطور عمل العصابات في المنطقة فليس من المعقول ان نبقى على اساليبنا السابقة لذا فقد تم التبديل «من مسك الارض» الى «قتل العصاة وملاحقتهم اينما وجدوا على ان تمسك الارض بقدر ما يحتاجه امن القطعات القائمة بالملاحقة».

لذا فقد تم اجراء تبديل رئيسي في اسلوب مقاتلة العصاة والتحول من الثبوت النسبي الى الحركة المستمرة.

٣٦٢. ان قتال العصابات يحتاج الى قوات كبيرة لمسك الارض وتامين الحماية لكل بقعة في المنطقة وهذا غير ممكن فكيف يتم تامين القوة المتحركة لمتابعة العصابات وقتلهم؟ لذا تم التفكير بما يلي لتامين القطعات الازمة:

ا. تقليل نسبة القوة التي تمسك الارض وزيادة القوة المتحركة.

ب. ترك بعض المناطق التي تاتي بالدرجة الثانية من الاهمية ومسك المناطق المهمة فقط.

ج. تامين وحدات من المتطوعين الاكراد واستخدامهم في القتال.

د. زيادة عدد المفارز الخاصة التي ترتبط بمديرية الاستخبارات العسكرية.

هـ. اتباع اسلوب المروحة من قواعد امينة لتعجيز العصاة ومنعهم من تشكيل قواعد لهم.

و. استخدام الطائرات السمتية في النقل والقتال بضرب قواعد العصاة.

ز. هناك ربايا ميتة واخرى حية وان عدد الربايا الحية قليل جدا لذا فان العصاة لا يابهون للربايا الميتة بل انهم يحسبون كل الحسابات للربايا الحية وان مواصفات كل منهما ما يلي:

اولا: الربيئة الحية تتصف بما يلي:

(١). فيها رصد مستمر لمتابعة تحركات العصاة في منطقة نفوذها.

(٢). على الربيئة القامة علاقات جيدة مع القرى القريبة للاطلاع على تحرك العصابات و اخبار مرجعها بذلك.

(٣). على الربيئة التحرك للسيطرة على منطقة نفوذها ولاتبقى قابعة في موضعها.

(٤). تبتكر وسائل جديدة من اجل ازالة الملل عن منتسبيها.

(٥). بعيدة عن الغفلة والاطمئنان ومنتبهة لما يدور حولها.

ثانيا: الربيئة الميتة تتصف بما يلي:

(١). التقوقع في الموضع وعدم التحرك ولا يخرج منها احد الا في الاجازات والادامة.

(٢). يعرف عنها العدو اكثر مما تعرف عنه.

(٣). لا تخبر مرجعها بالمعلومات التي تحصل عليها لاعتبارها غير مهمة.

(٤). لا تبالي بما يدور حولها من احداث بل عليها مسك جدار الربيئة فقط.

(٥). لا تعرف عن الاهلين في القرى القريبة منها ومشاكلهم واحيانا لا تعرف اسماء القرى نفسها.

(٦). لا تعرف ماذا تفعل بوقت الفراغ القاتل لذا فان معنويات جنودها هابطة لانهم يفكرون بعوائلهم وبموعد وجبة النزول.

*

به گویرەی ئەو ستراتیجەی نەیمی بۆ دامرکاندنەوەی خەباتی چەکداری کورد دای نا بوو:

١. لەشکرکیشی گەورە و، هیرش بردن بە هێزی زۆر بۆ سەر ناوچەی تەسک و

هێزی پچوک دەستی پێ کرد. هەندێ جار بۆ یەک هێرش لە ١ فیرقە تا ٤ فیرقەیان بە کار ئەهێنا.

٢. لە سنورێکی فراوان دا کەوتنە بەکارهێنانی هالیکوپتەر بۆ دابەزاندنی هێزی چەکدار لە شوێنی پێویست دا، لە هەمان کات دا بۆ لێدانی پێشمەرگە کە ئەیان دوزیەوە.

٣. لە سەرانسەری کوردستان دا هەزاران رەبیەیان دامەزراند. هەندێ لەم رەبیانە لە نێوان ٨٠ - ١٢٠ سەربازی تی دا دانرا بو. ئەمەش بەشێکی زوری جەیشی عێراقی زەمینگیر کرد. بە پێچەوانەی چاوەروانی ئەوانەوە بون بە هێزێکی لە کار کەوتو.

جەیشی عێراق بە تەنیا دژی سەروڵی کورد نەبو، بەڵکو دژی سروشتی کوردستانیش بو. بە هوی ئەم رەبیانەوە هەمو لوتکەی شاخ و گردەکانیان ناشیرین و پیس کرد. بە ملیون «مین» یان چاند و، بە هەزاران دارودەونیان لە بن دەرهێنا.

٤. «مدیریە الاستخبارات العسکریە» دەیان «مەفرەزەی تایبەتی» دامەزراند بە تایبەتی لە کەوتنە پێشمەرگەکانی ق م. ئەمانە بە ژمارە کەم بون، بەڵام زەڵامی دز و گورجوگوڵ و پیاوکوژیان تی دا کو کرد بونەوە. بەرامبەر بە کوشتنی هەر پێشمەرگەیەک پارەیان بە پاداش ئەدانێ.

٥. سەدان کیلومەتر رێگایان بە ناو شاخ و دولەکان دا راکێشا. رێگاکان بو مەبەستی لەشکرکێشی جەیش و، پەیوەندی نێوان سەربازگە و رەبیەکان دروست کرا بون، خەڵک زور کەم کەڵکیان لی وەرئەگرت. بەڵام ئەمە هەروەکو جولانی جەیشی ئاسان ئەکرد، جولانی پێشمەرگەشی خەراتر ئەکرد و، جێگای لە باری نانەوەی بوسە و دەسکەوتنی بو زورتر کردن.

٦. رەفتاری جەیش لە گەڵ خەڵکی کوردستان دڕندانە بو. وەکو لەشکرێکی داگیرکەر لە ولاتێکی داگیرکراوی گەلێکی تیشکاودا رەفتاریان ئەکرد. ریزی پیاو ماقوڵ و ریش سپییەکانیان و، ریزی ماڵی خەڵک و مزگەوت و قوتابخانەیان نەئەگرت. کەسوکاری پێشمەرگە، ئەوانەی بەر دەستیان ئەکەوتن، ئەیان گرتن لە زیندان دا گلیان ئەدانەوە تا پێشمەرگەکە تەسلیم ئەبوەوە یان ئەکوژرا. زور جار، بو ئەوەی خویان بە سەرکەوتو پیشان بدەن، ئەعالییان لە باتی پێشمەرگە ئەگرت یان ئەکوشت و، کە لە جێگایەک زەرەریان لی بکەوتایە تولەیان لە دانیشتوان ئەکردەوە.

٧. بەعس درێژەی دا بە راگویزانی گوندەکانی سنور، بو جێبەجێ کردنی ئەمەش جەیشی بە کار ئەهێنا: بو کەماروردان و داگیر کردنی گوندەکە و، چولکردنی لە خەڵک و،

تەقاندنەوە و سووتاندنی خانوو وماڵەکانی.

خەرجیی ستراتیجی تازەی فەیلەقی یەک و، لەشکرکێشییەکانی جەیش زۆر گران بوو، مەگەر هەر وڵاتێکی دەوڵەمەندی خاوەن نەوتی مشەی وەکو عێراق بەرگەی بگری، بێگومان هەر وڵاتێکی تری هەژار بوایە زوو زوو پەکی ئەکەوت. بۆ نموونە هەر دەقیقەیەک فڕینی هالیکۆپتەر ٦٠٠ دیناری عێراقی تێ ئەچوو، لەم هێرش و لەشکرکێشییانەدا ئەوەندەیان هالیکۆپتەر بە کار ئەهێنا نەیمی خۆی ناوی نا بوو: «تاکسی ئەبو خەلیل».

جەیشی عێراق لە کۆتایی مانگی مارتەوە هێرشێکی زۆر فراوانی بۆ سەر هەموو ناوچەکانی کوردستان دەس پێ کرد. هەموو ئەو فیرقانەی لە موسڵ، بادینان، هەولێر، کەرکووک، سلێمانی موڵ درا بوون بەشدار بوون. کەڵکیان لە شارەزایی هەموو ئەفسەرە شارەزاکانی جەیش وەرگرت و، پرسیان بە هەندێ لە کۆنە فەرماندەی هێز و بەتالیۆن و سەرلقی شۆڕشی ئەیلول کرد.

بۆ یەکەمین جار هالیکۆپتەر بۆ گوێزانەوەی سپا و بۆ شەڕ لە سنوورێکی فراوان دا بە کار هێنرا. ئەم تاکتیکە جەنگییە تازەیەیان ناو نا بوو: «اسلوب البساط» او «الشبكه». گوایە چۆن بە «بەڕە» یان بە «تۆڕ» ڕاوی مەل ئەکری، بەوجۆرە ڕاوی پێشمەرگەش ئەکەن. ئوسلوبی بیساط بریتی بوو لە گوێزانەوەی هێزێکی گەورەی سەرباز بە هالیکۆپتەر و، دابەزاندنیان لە لووتکە و شوێنە بەرز و گرنگەکان و، ڕێگاکانی دەرباز بوونی پێشمەرگەدا، ئینجا گەڕان بە دوویان دا تا ئەیان دۆزنەوە و ئەیان گرن.

جگە لەم ئوسلوبە، کە شانازییان بە داهێنانیەوە ئەکرد، ئوسلوبێکی تری دڕندانەیان بە کار ئەهێنا پێ یان ئەوت: «اسلوب الصيد الحر». تاکتیکی «ڕاوی ئازاد» بریتی بوو لەوەی هێزی ئاسمانی: فڕۆکەی جەنگیی و هالیکۆپتەر، لە ناکاو بە ئاسمانی ناوچە چۆڵکراوەکان، یا ناوچەکانی دوژمن دا، وەکو خۆیان ناویان لێ نا بوو، بگەڕێن. هەرچی زەلام، وڵاخ، ئوتومبیل، یا هەر جموجوڵێکیان بەدی کرد ئاگر بارانی بکەن.

هەندێ ئوسلوبی تریشیان بە کار ئەهێنا کە لە تەجرەبەی سوپاکانی تری دنیاوە وەریان گرت بوو، وەکو: ئوسلوبی «المطرقه والسندان»، «الطعم والصيد»، «القنفذ والثعبان»، «الروله».

ئەگەرچی ئەمانە چەندین «کراس»یان لە سەر نووسراوە و، بە وێنە و نەخشە و نووسین ڕوون کراونەتەوە، بەڵام لێهاتوویی جەیشی عێراق زۆر کەمتر بوو لەوەی بتوانی بە ڕێکوپێکی ئەم تاکتیکە جەنگییانە جێبەجێ بکا. جەیشی عێراق لە شەڕەکانی دا زۆرتر پشتی بە زەبروزەنگ، کوشتن و بڕین، سووتاندن و وێرانکردن، ئیهنەت، بە پێ ی

سەرەتاکانی: «شەلم کویرم، کەس نابویرم» و، «سوتاندنی تەڕ و وشک بە یەکەوە».

هێرشەکانی جەیش لە سەرەتادا هەندێ سەرکەوتنی بە دەس هێنا:

- هەمو ئەو ناوچانەی پەلامار ئەدارن ئەگیران و، ئەکەوتە دەس جەیش.

- هەندێ لە پێشمەرگە و فەرماندەکانیان، بە تایبەتی ئەوانەی ناوچە خێڵەکییەکان کە خێزانەکانیان گیرا بون، تەسلیم بونەوە.

- هەندێ مەفرەزە بەر هێرش کەوتن و، هەندێ پێشمەرگەیان کوژران یان بریندار بون.

بەڵام ئەمە گروکەفی بو زو کوژایەوە و، ئیتر پێشمەرگە لە گەڵی راهات. هێرشەکانی جەیش لە لای پێشمەرگە بون بە شتێکی ئاسایی چاوەڕوان کراو. ستراتیجی ئەیلەفی یەک بو کوژاندنەوەی شورشەکە سەری نەگرت.

*

هاوزەمان لە گەڵ لەشکرکێشییەکانی جەیش دا، حیزبی بەعس و داوودەزگا ئەمنییەکانی بو توقاندنی خەڵک کەوتنە راونان و گرتن و کوشتن و هەڵواسین. لە کەرکوک دەزگایەکی تایبەتییان بو لێکوڵینەوە دروست کرد بو، چەندین کەسیان بە ئەشکەنجە تێ دا کوشت و، ئەوانەی تریان حەواڵەی دادگایەکی روکەش ئەکرد بە زوری حوکمی ئیعدام ئەدران و، لە موسڵ هەڵیان ئەواسین. تەرمەکانیشیان ئەئەدایەوە بە کەسوکاریان. کاتی خوی، لە سەر بنچینەی ناسەی دەیان کەس لە گیراوەکان، من ڕیپورتاجێکم لە سەر ئەم دەزگایە نوسیەوە و، لە ژمارە ۳ ی مانگی ئەیلولی ۱۹۷۸ ی «هەواڵنامەی شورش» دا، بڵاوم کردوەتەوە. لێرەدا سەرلەنوێ وەکو خوی ئەینوسمەوە:

نمونەیەک لە جەهەننەمی فاشیزمی عیراق:

دەزگای تایبەتی لێکوڵینەوەی کەرکوک

«الهیئە التحقیقیە الخاصە - کرکوک»

یەکێک لە نیشانەکانی فاشیزم لە سەرانسەری دنیادا، پێشێل کردنی سەربەستی ویژدانە، واتە زەوت کردنی مافی ئازادی دەربڕینی بیروڕای سیاسی، فەلسەفی، کومەڵایەتی، دینی، مەزهەبی جیا جیایە. فاشیستەکان کە دژی مافی ئازادی بیروباوەڕی ترن، بە هەمو ڕێگە و شێوەیەک هەوڵ ئەدەن بو سەپاندنی بیروڕا تایبەتییەکانی خویان و لە ناو بردنی بیروڕاکانی تر بە ئاگر و ئاسن. بو ئەم مەبەستەش چەندین داوودەزگای سیر و سەمەرەی کوشتن و بڕین، ئازار و ئەشکەنجە، گرتن و هەڵواسین.. ئاشکرا و نهێنی دائەمەزرێنن، پارەی بێ شوماری بو تەرخان ئەکەن، پسپور و

شارەزای ئازاردان و کوشتن پەروەردە ئەکەن و پێ ئەگەیەنن، دەورەی مەشق پێ کردنی تایبەتی یان بۆ ئەکەنەوە لە سەر «هونەری ئەشکەنجە و کوشتن».

فاشیستەکانی عێراق کە گەنجینەیەکی گەورەی کوشت و بڕی ناهەق و چاو هەلکۆلین و سەربڕین و سزا و ئازاردانی سەردەمی خەلیفە و ئەمیرە دلڕەق و خوێنڕێژەکانی ئەمەوی و عەبباسی یان بە میرات گرتووە، تەجرووبەی زۆر و زەبەندی فاشیزمی جیهانیشیان لە بەر دەس دایە، هەر لە نازییەکانی ئەلمانیاوە تاکو فاشیستەکانی ئیتالیا و ئیسپانیا و پورتوغال، تا کوکس کلانی ئەمریکی و سەهیونیستەکانی ئیسرائیل و رەگەزپەرستەکانی رودیسیا و خوارووی ئەفریقا... لە مەیدانی بەربەرەکانی و لە ناو بردنی دوژمن و ناحەز و نارەزا و رەخنەگر و هەمو ئەوانەی لە سەر بیروباوەری ئەوان نین، یاخود ئەوانەی بە عورفی ولاتانی پێشکەوتو پێ یان ئەوترێت: ئۆپۆزیسیون «المعارضە»، شارەزایی و پسپۆرییەکی ئەوتۆیان پەیدا کردوە کە رەنگە ئەوانەی پێش خۆیان بۆر دابێت.

ڕێکخراوە جیهانییەکان، پارتی و تاقم و پیاوە سیاسییە گەورەکانی دنیا فاشیستەکانی عێراق ئەناسن، ڕێکخراوی جیهانی لێبوردن «ئەمنستی ئینتەرناشنال» کە خۆی تەرخان کردوە بۆ بەرگری لە مافی ئەوانەی لە سەر ئازادی ڕوودان توشی گیرەو کێشە ئەبن، حکومەتی عێراق لە ڕیزی دەولەتە هەرە فاشیستەکانی دنیادا داناوە، خۆ جموجولی پیاوکوژانە و تیرۆریستیی فاشیستەکانی عێراق لە لوبنان، کوێت، پاریس، لەندەن و پاکستان... لە دنیادا دەنگی داوەتەوە و پێویستی بە زیدە درێژە پێ دان نیە.

لەم ژمارەیەی هەواڵنامەکەمان دا یەکێک لە دەزگا فاشیستییە نهێنییەکانی عێراق ئەخەینە ڕوو، کە لە دەرەوەی ولات کەمتر ناسراوە و، لە ناوەوەی ولاتیش وەکو یەکێک لە قەسابخانەکانی ڕژێم ناوبانگی دەرکردوە سەبارەت بەوەی ڕێگەی سەدان تێکۆشەری گەلەکەمانی تێ کەوتوە، دەیان پێشمەرگەی دڵێری تێ دا ئازار و ئەشکەنجە دراوە، دەیان قارەمانی وەکو عەبدوللای ئاپشی، وەستا ئەنوەر عەبدورەحمان، عوسمان محەمەد ئەمین گیانی خۆیان تێ دا بەخشیوە بە کورد و کوردستان.

لێرەدا ڕاپۆرتێکتان پێشکەش ئەکەین هەڤاڵێکی تێکۆشەرمان، کە خۆی شایەتێکی ئەم ئەشکەنجەگایە بوە، پاش دەرباز بونی نوسیویەتی، هەروەها هەندێ پارچە لە نامەی ئەو شەهیدانەی بە «هێشە» دا تێ پەڕیون وەکو بەلگەیەکی مروڤایەتی لە سەر ڕەفتاری دڕندانەی فاشیستەکانی عێراق لە گەل گیراوی سیاسی و پێشمەرگەی دڵێر دا... بێ گوێ دانە دەستورە ساختەکە و قانونە درۆینەکانی خۆیشیان، وە بێ گوێ دانە ئەو

پەیمان و پرۆژە جیهانییانەی ئەم جەللادە خوێنڕێژانە بەو پەڕی بێ شەرمییەوە لە گەڵ ئەندامانی تری «کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان» لە سەر مافی مرۆڤ مۆریان کردووە.

*

فاشیستەکانی عیراق چەندین دامودەزگای ئاشکرا و نهێنییان لە سەرانسەری عیراق دا دامەزراندووە بۆ سەرکوتکردنی خەباتی گەلی عیراق بە گشتی و خەباتی گەلی کورد بە تایبەتی.

شتێکی تازە ئاشکرا ناکەین، ئەگەر باسی زیندانەکانی «نگرە السلمان» ، «قصر النهایە»، «الامن العامە»، «معتقل الفضیلیە» و چەندین شوێنی نهێنی جۆربەجۆری تر بخەینەوە یاد، ئەو شوێنە نزم و نسرم و تاریکانەی بوون بە هێلانەی بیرەوەری هەزاران خەباتگەر لە سەرانسەری عیراق دا و، دیوارەکانیان بوون بە لاپەڕەی یادگارنامەی بە خوێن ئالکراویان. ئەمە سەرەرای جەللادخانەکانیان لە بەغداد و موسل.

ئێستاش تازەترین دەزگای لە ناوبردن و سەرکوتکردنیان دامەزراندووە بە ناوی «الهیئە التحقیقیە الخاصە» وە، کە لە سەربازگەیەکی سوپایی دایە لە نزیک کانییەکانی کومپانی نەوتی کەرکوک، ئەو شوێنەی خۆیان ئەڵێن: «تایبەتیە بۆ کوردەکانی شیمالدا و، بۆ ئەوانەی هاوکاری لە گەڵ پێشمەرگە ئەکەن و یارمەتی ئەدەن».

ئەم دەزگایە وەکو ئوردوگایەک وایە، هەرچی ئەگیرێ لە لایەن دەزگای «امن» و «استخبارات» وە لە شار و قەزا و ناحیەکان، یاخود لە لایەن هێزە چەکدارەکانی رەگەزپەرستەکانەوە لە کاتی هێرش و پەلاماری سوپایی دا، پاش لێدان و لێپرسینەوەیەکی سەرپێی، بۆ ئەم جێگە نهێنیە ئەنێرێت.

کاتێک جاسوس و چڵکاوخۆر و خۆفرۆشەکان تێکۆشەرێک دەس نیشان ئەکەن، هێزێکی تایبەتی کە پێ ی ئەڵێن: «قوە خاصە» لە دەوروبەری نیوەشەو دا ئەدات بە سەر ماڵەکەی دا و ئەیگرێت، دەس و چاوی ئەبەستنەوە و بەرەو مەڵبەندی امن یا استخبارات ئەیبەن، خۆ ئەگەر لە ڕێگا یان لە کاتی گرتن دا سەرکێشییەک بکات، ئەوا پێشەکی لێدانێکی باشی لێ ئەدرێت. کاتێکیش ئەگاتە استخبارات لەوێ هەر خێرا ئەخرێتە ژووری لێدانەوە، پێش هەمو لێپرسینەوەیەک یەکەم کرژم لێدانی باشی لێ ئەدرێ بە دار و سوندە، زللە و شەق و بۆکس ئەبێتە تەواوکەری پەردەی یەکەم. پاشان بە چاو بەستراوی ئەبرێتە ژوورێکەوە بۆ لێپرسینەوە، لەوێ هەندێ پرسیاری جۆربەجۆری لێ ئەکرێ، جا ئەگەر لە وەڵامدانەوەیان سەرپێچی کرد و وای وەڵام نەدایەوە وەکو ئەوان ئەیانەوێت، ئەوا دەس ئەکرێتەوە بە لێدانی، تا ئەو شتانەی مەبەستیانە بە زۆر بە سەری دا ئەسەپێنرێت و

فایلێکی نارەوای بۆ ئامادە ئەکرێت.

ماوەی مانەوەی گیراو لەم شوێنەدا بە پێی ی خۆراگرتنی بەندەکە ئەگۆڕێت لە ڕۆژێکەوە هەتا شەش مانگ، بە ئازاردانی هەمیشەییەوە، تا ئەو شتانەی ئەیانەوێ لی ی هەڵ ئەهێنجن.

جۆری لێدان لە دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات دا، چ لە شار و چ لە قەزا و ناحیەکان بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە و نامرۆڤانە ئەکرێ. بە هیچ جۆرێک ناهێڵرێت بزانرێت کە لە کوێ گیراوە و بۆ کوێ ی ئەبەن، هەمو جۆرە پەیوەندییەک لە نێوان بەندەکە و کەسوکاری دا قەدەغەیە.

بەندەکان ئەکرێن بە دو بەشەوە: ئەوانەی بە تاوانی ڕێکخستن گیراون، وە ئەوانەی لە سەر هاوکاری لە گەڵ پێشمەرگە و کاروباری عەسکەری گیراون. بەشی یەکەم ڕاستەوخۆ ئەبرێن بۆ «هیئە»، بەشی دوەمیش بۆ «منظومە استخبارات المنطقة الشمالیە».

«منظومە» ش هەر لە سەربازگەی کەرکوک دایە، بریتیە لە خانویەکی گەورەی دو نهۆم، چەندین ژوری تی دایە و، کەوتوتە ڕۆژهەڵاتی سەربازگەکەوە.

کاتێک بەندەکە ئەبرێت بۆ «منظومە» بە چاو و پەل بەستراوی ئەیبەستریتە ژورێکی سەربەخۆ وە، هەتا ٢ - ٣ ڕۆژ لی ی ناپرسرێتەوە، پاشان ئەبرێت بۆ لێپرسینەوە، لێرە شێواز ئەگۆڕێت، لە پێش دا بە خوشی و دڵنەوایی و ڕێز لی گرتن، پاشان بە ئەشکەنجە و ئازاردان و ئیهانە کردن، لە بەر ڕوشنایی ئەو فایلەی بوی ئامادە کراوە پرسیاری لی ئەکرێت، ئەگەر شایەت یان جاسوس دەس بکەون ئەوا ئەوانیش ئامادە ئەکرێن.

لێدان و ئازاری نەفسی و ترساندن، بەشێکە لە ژیانی ئەم دەزگایە. لێدان بە سوندە و دار و کێبڵ، ئینجا هەڵواسین بە پانکەدا و لێدان بە دار، لە کاتی لێدان دا پەل ئەبەسترێت و پەروی سەرچاو لا ئەبرێت، هەندی جار هەردو پەل لە پشتەوە ئەبەستری و هەڵ ئەواسری بە شیشێکی ئاسن دا کە ئامادە کراوە بۆ ئەم مەبەستە.

ئەمانە هەمێ بە کار دێت لە کاتی لێپرسینەوەدا، ئەگەر ئەمانیش دەمی بەندەکەیان هەڵ ئەهێنایەوە ئەوا جیهازێک بە کار ئەهێنرێت کە هێزی ئەلەکتریکی تی دایە بریتیە لە وایەرێک کە ئەبەسترێت بە سەرەوە، جیهازەکە لە لایەن دەستی ئەجی، کارەبا لە سەری بەندەکە ئەدات. بە پی ی خۆراگرتنی بەندەکە، جۆری ئازاردان ئەگۆڕێت.. زۆر جار لە ڕۆژێک دا ٤ - ٥ جار ئەبری بۆ ژوری ئازاردان. لە کاتی پشودان دا عەریفێک یان سەربازێک ئەنێردرێت بۆ لای بەندەکە بۆ ترساندن و ترساندن و ورەڕوخاندن، بەوەی کە باسی چەندین بەندی پێشوی بۆ ئەکات کە چون لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا مردون، چون

ئەو جێگایە نهێنییە و کەس نازانێ کوێ یە و هەرچی بگاتە ئەوێ ئیتر ژیانی تەواو ئەبێ ئەگەر دان بە تاوانەکانی دا نەنێ..

ماوەی لێپرسینەوە لە هەفتەیەکەوە هەتا مانگێک ئەخایەنێت، هەموو جۆرە پەیوەندییەک لە گەڵ دەرەوە، بینینی کەسوکار قەدەغەیە، لێرە تینوێتیش وەکو چەکێکی تر بە کار ئەهێنرێ بۆ روخاندن، چونکە جارێ وا هەیە بە درێژایی یەک رۆژ ئاو نادرێ بە بەندەکە. ئەوەی بێتە «منظومە» ئەگەر تاوانباریش نەبێ بە زۆر تاوانبار ئەکرێ، ئیتر سا یان بە ئازاردان و ترساندن، یان بە بەکارهێنانی لەرینەوەی کارەبایی، یان بە هەڵبەستنی بوختان و درۆ.

لە کاتی لێپرسینەوەدا لە «منظومە» ٣ کەس بەشداری لێکۆڵینەوەکە ئەبن بە جلی مەدەنییەوە، بەڵام هەرسێکیان عەسکەرین، هەر خۆیشیان لە لێدان و ئازاردان دا بەشدار ئەبن، ئەم سیانە یەکێکیان بە رووتبەی نەقیب و دوانەکەی تر بە رووتبەی موڵازمن.

لە «منظومە» ش فایلێکی تر بۆ بەندەکە ئامادە ئەکرێ و، ئینجا ئەبرێ بۆ «هینە» کە ئەویش لە هەمان سەربازگەدایە.

لە «هینە» هەر بە گەیشتنی بەندەکان و کردنەوەی دەرگای بەندیخانە، لە حەوشەکەدا چەنێکی باش لە بەندەکان ئەدرێ بە سوندە و زللە و شەق و بۆکس.

«هینە» بریتییە لە ٣ خانووی پێکەوە نوساو، خانووی یەکەم جێگای لێپرسینەوەیە، خانووی دووەم هی بەندە تازەکانە کە هێشتا لە ژێر لێپرسینەوەدان، خانووی سێیەمیش جێگەی ئازاردان و، ئەو بەندانەیە کە چاوەڕێی «محکمە خاصە» ئەکەن.

خانووی یەکەم بریتییە لە ٢ ژوور، ژووری لێپرسینەوە و، ژووری یاساوڵ.

خانووی دووەم بریتییە لە ٣ ژوور بۆ بەندەکان و، ١ ژوور بۆ یاساوڵ. ژوورەکانی بچکۆلە و پیس و پۆخڵن. بەندەکان ئەخرێنە ئەم ژوورانەوە، هەر ژوورێ ٤٠ تا ٥٠ بەندی تێ ئەئاخنرێ، بە جۆرێک کە شوێنی دانیشتنیشی تێ دا نابێتەوە. رۆژێ تەنها ١ سەتڵ ئاو بۆ بەندەکان تەرخان ئەکرێ ژمارەیان هەرچەندێک بێت.

ژیانی رۆژانەی ئەم بەندیخانەیە بەیانیان سەعات ٥ دەس پێ ئەکات کە دەرگای ژوورەکان ئەکرێنەوە و بەندەکان هەموو لە حەوشەکەدا ریز ئەکرێن، ئینجا ٢ سەرباز بە سوندە تێ یان ئەکەون لە بەر ئەوەی گوایە نازانن بەریز راوەستن، ئەوەی لە حەوشەکەدا زیاتر سەرنج رائەکێشێ، ئەو هەموو پێڵاو و جل و جامانە و پشتێنەیە کە لە لایەکی حەوشەکەدا وەکو خەرمان هەڵ دراوەتەوە.

رەفتاری سەربازەکان لە گەڵ بەندەکان دا یەکجار درندانەیە، بە رادەیەک کە فەرمان

ئەدەن هەمو سەریان شور بکەن و سەیری ئەم لا و ئەو لای خۆیان نەکەن، ئەمە سەرەرای تف و شەق و زللە و هەزار جنێوی سوک وقسەی ناشیرین.

چونە سەر ئاودەست، دیسانەوە، وەکو چەکێکی تر، بۆ ئازاردان بە کار ئەهێنری، چونکە مولەتی دانیشتن نابی لە دەقیقەیەک تێ پەر بکات، کە زوربەی بەندەکان فریای هیچ ناکەون، هەر ئەمەشە ئەبێتە هۆی ئەوەی هەمو روژ چەندین بەند لە ژورەکان دا تەنگەتاو بێن و بە ناچاری لە ژورەوە بریێن.

هەر روژەی ٥ تا ٦ کەس بانگ ئەکرێن بو لێپرسینەوە، سەرلەنوێ لە سەرەتاوە دەس ئەکرێتەوە بە پرسیار، گوایە ئەوانەی پێشو، کە لە شارەکان و کە لە «منظومە» کراوە بایەخی پێ نادرێ یا سەرلەنوێ فایلێکی تازەی لێکولینەوە ئەکرێتەوە.

«هیئە» یەکێکە لە نهێنیترین شوێنەکانی لێکولینەوەو ئازاردان بو «ناوچەی ژورو» لە هەمو لایەکی کوردستانەوە روژێ چەندین کەس رایێچ ئەکرێ بو ئێرە، هەموشی لە چەند شتێک دا یەک ئەگرێتەوە؛ رێکخستن، پێشمەرگایەتی، هاوکاری پێشمەرگە. کە یەکێ بانگ ئەکرێ بو لێپرسینەوە، دو سەرباز بانگی ئەکەن، چاو و دەستی ئەبەستنەوە، بە لێدان هەتا ژوری لێپرسینەوە ئەیبەن، لەوێ پرسیاری لی ئەکرێ و داوای لی ئەکرێ هەرچی ئەزانی راست و رەوان بیلێ. پاش ٣ - ٤ پرسیاری هەرەمەکی ئەیبەن بو خانوی سێیەم بو ئازاردان. لەوێ، لە حەوشەکەدا پالی ئەخەن، هەردو قاچی بە شێشکەوە ئەبەستنەوە. شەش سەرباز دو دو ئەکەونە لێدانی بنی پێ ی بە سوندە تا هیلاکی ئەبن تا بەندەکە لە هوش خوی ئەچی، ئینجا سەتلێک ئاو ئەکەن بە سەر و پوتەکیا، کە هوشی پیا هاتەوە ئەکەونەوە لێدانی. بەم شێوەیە ٤ تا ٥ جار ئەیبەستنەوە و ئەیکەنەوە، لە پاش دا بو ماوەی چارەکە سەعاتی بە حەوشەکەدا راوی ئەنێن.

زوربەی بەندەکان زمانی عەرەبی نازانن، بو ئەم مەبەستەش چلکاوخورێکی خویان بە ناوی تەرجومانەوە ئەهێنن، ئەویش بە ئارەزوی خوی قسەی بەندەکان ئالوگور ئەکا.

ئازاردان و لێپرسینەوە لە حەفتەیەکەوە تا چەند مانگێک ئەخایەنی بە پێ ی خوراگرتنی بەندەکە هەتا لە پاشان فایلێکی بو ئامادە ئەکرێ و پەلەپەروری پێ ئەکەن.

لە گەل ئەو هەمو ئازار و ئەشکەنجەیە دا، سەدان رولەی ئەبەزی میللەتەکەمان، چەندین لاپەرەی شانازی و دلێریان ئەخشاندوە بە هیمەت و خوراگرتنیان سەری پاسەول و لێپرسراوە فاشیستەکانیان شور کرد و، ئیسپاتیان کرد کە رولە تێکوشەرەکانی میللەتەکەمان، ئازار و ترساندن و، هیلانە ئەهێنیەکانی رەگەزپەرستەکانی عێراق هەستی بەرەنگاری و خەباتیان خاپور ناکات.

پاش لێدانێکی زۆر بەندەکە ئەهێننەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، هەر خێرا لەوێ هاوڕێکانی دەوری ئەدەن و، ئاوی ئەدەنێ و، دەس ئەکەن بە شێلانی قاچی. پاش تەواو بوونی لێپرسینەوە بەندەکە ئەبەن بۆ خانووی سێیەم. ئەویش بریتییە لە ٣ ژوور، جگە لە ژووری پاسەوان. ئەوانەی ئەگەنە خانووی سێیەم بە ڕەسمیی ئازاردانیان نامێنێ و، چاوەڕێ ی «المحكمه العسكريه الخاصه» ئەکەن. مانەوەی بەندەکە لە خانووی سێیەم لە ٣ تا ٦ مانگ ئەخایەنێ. مەبەست لە مانەوەشیان تەنها زۆر بوونی ژمارەیانە، کە وەک مێگەل بە ڕەوە بیانبەن بۆ «دادگا».

«محکمەی عسکری خاص» بریتییە لە دەزگایەکی کاریکاتووری، تەنها بۆ بڕیاردانی خنکاندن و حوکمدانی تێکۆشەران و پیاوانانی گەلی کورد، دامەزراوە. هیچ سیفەتێکی قانونی و شەرعی و ڕاستی تێ دا بەدی ناکرێ. ئەو بڕیارانەی ئەیشدەرێن پێشەکی ئامادە کراوە ، ڕۆژی «مەحکەمە» تەنها ئەخوێنرێتەوە. بەندەکان بە هیچ جۆری مافی دیفاع کردنیان نییە، خۆ ئەگەر یەکێک بڵێ: ئەو ئیفادانە هی ئەو نییە و بە زۆر لە ژێر ئەشکەنجەدا پێ یان مۆر کردوە، ئەوا ئەیبەنەوە بۆ «هێنە» و ئیتر جارێکی تر چاوی بە مەحکەمەش ناکەوێتەوە.

کاتێک ڕۆژی بەستنی «دادگا» دیاری ئەکرێ، ئەو بەیانییە هەموو بەندەکان ڕیز ئەکەن و، هەریەکێک بە مقەستێکەوە دەست ئەکا بە سەر و ڕیش و سمێل هەڵپاچینیان بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین، کە مەبەست تەنها ئیهانە و ناشیرین کردنی سەر و سیمایانە لای «حاکمەکان».

کاتێ سەر و ڕیش و سمێلی بەندەکان هەڵ ئەپاچن ئینجا بە لۆری ئەیانبەن بۆ «دادگا»، لەوێ هەموویان ڕیز ئەکەن، بە جۆرێک کە ڕوویان لە دیوارەکە بێت، ئینجا بە سوندە و شەق و زللە تێ یان ئەکەون تا هیلاک ئەبن.

«دادگا» خۆی بریتییە لە شانۆیەکی گەڕەتاوی ئەم خەڵکە سەر و ڕیش هاتوە، بە پێ ی پەتی وەک مێگەل ڕیزیان ئەکەن، حاکمەکانیش بە گاڵتە پێ کردنەوە ئەڕواننە سەر و پرتەڵاکیان و بە جوملە حوکم ئەخوێننەوە کە لە پێش دا ئامادە کراوە.

لە هەر جارێک دا، دەستەیەک لە خەباتگێڕانی میللەتەکەمان، ڕەوانەی ژووری ئیعدام ئەکرێ. ئەوانەی کە ئەمری ئیعدامیان دەرئەچێ، دوای تەواو بوونی «شانۆی دادگا» دەستیان کەلەپچە ئەکرێ و لەوانی تر جیا ئەکرێنەوە.

ئەوانەی بە گرتنی چەند ساڵە حوکم ئەدرێن، پاش چەند ڕۆژێک ئەنێردرێن بۆ بەغداد بۆ «سجنی ئەبو غریب» و، ئەوانەش کە حوکم ئەدرێن بە ئیعدام ڕەوانەی موسڵ

ئەكرين.

كاتێک بنەكان ئەهێنینەوە بۆ «هێنە»، حوکمەداراو و ئیعدامەكان یەكتر ماچ ئەكەن و، دەست ئەكەن بە گۆرانی و وتنی سرودی نیشتمانی. دەنگی دلێریان دڵی داگیرکەری فاشیست ئەخاتە لەرزە و، بۆ جاری هەزارەمین، بۆ رەگەزپەرستەكانی ئیسپات ئەكەنەوە كە پەتی خنكاندن و دەزگای لە ناوبردن دڵی رۆڵە دلێرەكانی گەلی كورد سارد ناكەنەوە لە خەبات و تێكۆشان و خۆبەخت كردن، بەڵكو بە پێچەوانەوە ئەبزوێ و هەمەتیان ئەخاتە دڵەوە و، زیاتر هەستی بەرەنگاری و خەباتیان تیا زیاد ئەكات. هەڵوێستی هەمو ئەو رۆڵانەی، دلێرانە چونەتە بەر پەتی ئیعدام، ئەوەی بە داگیرکەران سەلماندوە.

*

دانانی بنكە

ئەوسا لە بەر پەلاماری كەتوپڕی هالیكۆپتەر هیچ هێز و مەفرەزەیەک نە ئەیو وە نەی ئەتوانی بە رۆژ لە ناو ئاوایی دا بمێنێتەوە. ناوچەكە ژمارەیەكی كەم گوندی تێ دا بو. گوندەكانیش بچوک بون. باری ژیانیشیان ئەوەندە باش نەبو هەمو رۆژ و هەمو ژەم لە ماڵەكانی ئەوان نان بخۆین. ئێمەش بە تەما بوین ئەو ناوچەیە بكەین بە پردی پەیوەندی لە گەڵ سوریا بۆ هاتوچۆ و، هێنانی چەک. ماوەیەک بە گوندەكانی دەرباسور، گەرمیچ، چەمەلۆ، هەدن، ئاری، بەرمیزە...دا سوراینەوە. چوینە ناو رەشماڵی رەوەندەكانی «هەركی» لە دەشتی بەرازگر. ئاگاداری كاک خالیدمان كرد بۆ بگەڕێتەوە ئەوێ. چاوەڕێی ئەومان نەكرد. ئەمان ویست كات بە سەر ببەین.

شارەزا ئەمینەكانی ناوچەكەم لە گەڵ خۆم ئەبرد بۆ ئەوەی شوێنە نادیار و عاسیەكانم پیشان بدەن بنكەیەكی نهێنی خواردن و حەسانەوەی تێ دا دابمەزرێنم. چەند شوێنێكمان نوری. شارەزایەكی خەڵكی «هەدن» لە ناو لێرەوارێكی چڕدا شوێنێكی كونجاوی لە باری بۆ دۆزینەوە. كانی خۆش و سێبەری خەستی هەبو. پەناپەكی نادیار و شوێنێكی عاسی بو. چەند سەعاتی لە كانی رەش دور بو.

لە بن دارپەروە پیرەكان دا جێگەمان بۆ دانیشتن و نوستن لە سەر ئەرزە رەقەكە خۆش كرد. یەكێ لە پێشمەرگەكان بە ناوی ئەحمەد گەلالی شارەزای دروست كردنی تەنور بو. بۆ ئەوەش پێویستی بە بەرد و هەندێ كەرەستەی تر بو وەكو دار و تەختە و تەنەكە... لە كاتی كۆكردنەوەی بەردا ئەوەی سەرنجی هەمرانی راكێشا ئەوە بو لە بن هەر بەردێک دا چەند دوپشكێكی تێ دا بو. ئەمە هەندێ ترسی لا دروست كردین. خەریک بو پەشیمان ببینەوە لەو شوێنە. یەكێ لە پێشمەرگەكان بە گاڵتەوە وتی: «عەسكەر

پانکۆژی باشترە لە دوپشکدا». کە گەڕاینەوە بۆ ناو دێ بۆ ئامادەکردنی پێویستییەکان، کابرای شارەزا ترسەکەی ڕەواندینەوە. وتی ولاتی ئێمە مەشهوورە بە پایتەختی دوپشک و پشکە. بەلام نە دوپشکەکەی کەس ئەگەزێ و نە پشکەکەشی مەلاریا بلاو ئەکاتەوە.

دوای ئاشبەتال کە حکومەت گەیشت بوو هەدن مەخفەرێکی گەورەی لێ دروست کرد بوو. زستانەکەی لە بەر توندیی سەرما و زوریی بەفر بە هالیکوپتەر زەلامەکانیان گوێزا بووەوە. مەخفەرەکەیان وەکو خۆی بە جێ هێشت بوو. موختاری هەدنیان ئاگادار کرد بوو ئاگای لە شتەکان بێ کەس نەی بات و دەسکاری نەکا. دەرگا و پەنجەرە و کورسی و مێزەکانی هەمو ساخ بوون. هەروەها چەندین تەنەکەی نەوتی پڕ و بەتال لەوێ بوو، ئەویش کەس دەستی تێوە نە دا بوو. تەنانەت هەندێ وێنەی احمد حسن البکر و صدام حسین و هەندێ شیعاری بەعسیش هەڵ واسرا بوو، هیچ دەسکارییەک نەکرا بوون. پێشمەرگەکان بۆ پێویستییەکانی تەنوورەکە دەرگایەکیان دەرهێنا گوڵنگی لەسەر بپڕن و هەندێ تەنەکەی بەتالیان بۆ ئاو تێ کردن برد بوو بنکە. بۆ ڕۆژی دوایی پێویستیان بە هەندێ شتی تر بوو چوون لە مەخفەرەکە بیبەن هیچی تێ دا نەمابوو. خەلکی ئاواییەکە دەرگا و پەنجەرەکانیان دەرهێنا بوو، هەروەها هەمو تەنەکە پڕ و خالییەکانیان برد بوو. تا ئەوکاتە لە ترسی سزادانی بەعس ئەیان وێرا بۆ دەستی لێ بدەن، بەلام دوای ئەوەی پێشمەرگە دەستکارییان کرد، ئەوانیش بیانوویان دەس کەوت بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا ئەگەر هێزی حکومەت گەڕایەوە، ئۆبالەکەی بخەنە ملی پێشمەرگە.

ئەو سەردەمە، پێشمەرگە ئەبو کولەپشت و زەمزەمی و یەکێ کوپێکی چاخواردنەوە و قاپێکی چێشت و کەوچکێک لە گەڵ خۆیان هەڵ بگرێت. پێشتر هەمو وتار و کتێبەکانی «ئارنێستو چی گیڤارا» م دەربارەی «جەنگی پارتیزانی» و «یادداشتەکانی پولیڤیا» م خوێند بووەوە، هەندێ بابەتیشم لێ تەرجومە کرد بوو. ڕاستییەکەی، هەرچەند لە خۆم و هاوڕێکانم ورد ئەبومەوە، ئەو مەرجانەی گیڤارا بۆ پێشمەرگەی دانا بوو، بە تایبەتی لە ڕووی توانای لەش و کوڵ هەلگرتن و ڕێگا ڕۆیشتنەوە، لە ئێمەدا نەبوو.

ئازوڵە و مەلحەیل و هەندێ ئاسنجاو پەیدا کرا بۆ بنکەکە، بەلام پێخەف نەبوو ئەبوو لە سەر ئەرز بنوون. چراش دائەنەگیرسێنرا.

*

لە ڕێکەوتنە مەیدانییەکەی سووریا بە ئەبو دائەنێی

هەر لەم ماوەیەدا نامەیەکم پێ گەیشت بە ئیمزای «سەربەست» یەکێ لە بەرپرسەکانی لم داوای کرد بوو: لە بەر ئەوەی هەندێ ڕووداوی تازە هاتوتە پێشەوە بە پەلە

یەکتر ببینین. سەرپەست ناوی نهێنی ئەوڕەحمان بیداری بو. د. خالید هێشتا نەهات بوەوە. تەنیا بەرپرسی لقی بۆ فەرماندەی کەرتی بو، ناوی رەحمان پیشەیی بو. ٤ - ٥ پێشمەرگەمان لە گەڵ خۆمان برد و، پێکەوە چوین بۆ دێتنیان. شەو گەیشتینە دەریا سور. ئەوڕەحمان بیداری و فاضیل جەلال و عەبدوللا صالح و هەندێکی تر لە کادر و بەرپرسەکانی ئەم لقی بون. ئەوە یاخچیەکی چەکداریان لە خۆیان کۆ کرد بوەوە. لە سەر ڕێگاکە چەندین کەمین و پاسەوانیان دانا بو.

شەو لە گەڵ فاضیل و چەند کەسێکی کەیان پێکەوە لە ماڵێک دا ماینەوە. پێش نوستن ویستمان بچین بۆ سەر ئاو. کورێکی خاوەن ماڵەکە دومان کەوت بۆ لیمان نەئەبوەوە. فاضیل ئەیویست کورەکە گوێ ی لە قسەکانمان نەبێ. چەند جاری داوای لی کرد بگەڕێتەوە ماڵی خۆیان چاوەڕێمان بکا. کورەکە وتی: «ئەترسم بزر بین». فاضیل لە وەلامی دا وتی: «بگەڕێوە ماڵی خۆتان، بە سەر دە دەولەت دا بە قاچاخ هاتوین بۆ ئێرە بزر نەبوین، ئێستا لە پەنی ماڵی ئێوە و چەمەکەدا بزر ئەبین؟»

کۆبونەوەی بەیانی لە گورەپانی گوندەکەدا بە بەرچاوی کادرو پێشمەرگەکانیانەوە بو ئەوە بو تەبلیغمان بکەن لەبەر ئەوەی یەنک زوری خروقات کردوە: بی ئاگاداری ئەم چەکی هێناوەتە کوردستان، هەندی ئەندامی ئەوانی بە تۆمەتی جاسوسی کوشتوە... ئیتر ئەوان التزام بە ڕێککەوتنەکەوە ناکەن و بە ئەیری دائەنێن و ئەگەر یەنک چەک بهێنی ئەوان ئەی گرن. من ئەوسا ئەمئەزانی ق م بوچی لەو ڕێککەوتنە پەشیمان بوتەوە. چەند ساڵی دوای ئەوە بیستمان: مەحمود عەوال و ناوەڕوکی ڕێککەوتنەکەی بە تەلەفون دابو بە موحسین دزەیی لە واشنتون، تا ئەویش بە مەلا مستەفای بلی. موحسین ئەم هەواڵە بە خۆشییەوە بو بارزانی باس ئەکا. کورەکەیان د. نەجمەدین کەریم و، د. شەفیق قەزازیشی لی ئەبی. بارزانی لە پاڵی ئەوەی ڕەزامەندی دەربڕی جنێوێکی ناشیرین بە مەحمود ئەدا لە سەر ئەوەی لە گەڵ مامجەلال ڕێککەوتنی ئیمزا کردوە.

مەلا مستەفا ئەمەنی لە حەفتا تی پەری بو. بە هۆی ئەخۆشیی «شێرپەنجەی سی» یەوە لە سەر مردن بو. ئەو دەرسی حیکمەت و گیانی لیبوردن و بە تەنگەوە هاتنی ئازاڵی کوردی بە کوڕ و شاگردەکانی دانەدایە. بەم هەڵوێستەی دوای مردنی خۆی دوژمنایەتییەکی خوێناوی بە میرات بو کورەکانی و نەوەکانی و، عەشیرەتەکەی و حزبەکەی بە جی هێشت، سەدان کوردی بێتاوانی تی دا کوژرا.

*

گفتوگۆی تورک و د خالد

شێخ کـوکس یەکێ لە نەوەکـانی شـێخ عـوبەیدوللا لە عـێـراقـەوە هەلات بۆ بۆ تورکـیـا. لە شـەمـزینان دانیـشـت بو. وەلامی ناردبو کـە نوێنەرانی حکومـەتی تورکی ئەیانەوێ هەندێ لە بەرپرسـەکـانی جولانەوەکە ببینن. کـات و شـوێنی یەکـتر بینین دانرا. نوێنەری تورک لە کـانی دیاری کـراوا هاتە گـوندی روبارۆک لە بەری تورکی روباری سەرکەم. د خالد چو بۆ دیتنی. کابرا لەم دیتنەدا گوت بوی: لە ئەنقەرەوە هاتوە. ئەیەوێ بزانی سەرکردەکانی ئەم جولانەوە تازەیە کێن. ئامانجەکانیان چیە. هەلویستیان بەرامبەر حکومەتی تورک چونە. پیوەندییان لە گەل حیزب و ریکخراوە کوردییەکانی تورکیا چیە. پیویستیەکانیان چیە و داواکانیان لە حکومەتی تورک چیە؟

کاک خالید وەلامی پرسیارەکانی دا بوەوە. پیویستیەکانی جولانەوەکەی، لە سنوری مەعقول و تیگەیشتنی تورکیا، پی وت بو. کابرا گوت بوی کە ئەو دەسەلاتی بریاردانی نیە بەلام قسەکان ئەگەیەنیتە دەسەلاتدارانی سەرو، لە حەفتەکانی داهاتودا خوی یا یەکیکی تر وەلامەکانی ئەهینیتەوە.

بینینی تورک لە چەند سەرەوە بو ئیمە پیویست بو:

پیشمەرگەی کورد و جەندرمەی تورک بو بون بە هاوسنور. هەمو روژی لە سەر سنور ئەمان لەمبەر و ئەوان لەوبەر یەکتریان ئەدی.

جولانەوەکە ئەگەر بوی بکرایە لە دوژمنایەتی دەولەتانی دراوسیی کەم بکردایەتەوە، بە تایبەتی هی تورک و، بیلایەنی بکردایە تا رادەیەکی زور بە هیزی ئەکرد

تورک لەو کـاتەدا لە گـەل عـیـراق لە سـەر مـەسـەلەی نەوت ناکـوک بـو. تورک قەرزاری عـیراق بو. عـیـراق بو ئەوەی تورک ناچار بکا قـەرزەکـانی بداتەوە، ئەی ویست رویشتنی نەوت بە لولەی ستراتیجی مینای جیهان دا رابگری. ئەوەش زەرەریکی ئابوری گەورەی لە تورک ئەدا.

ینک و دەدەقـادە دو هاوپەیمانی یەکتری بون. هەوالی ئەم دیتنەیان بو باس کرا. دەدەقادە زور بە توندی دژی راوەستا و پروپاگاندەیەکی فراوانی دەست پی کردو، هەرەشەی لە ینک کرد کـە ئەگەر پیوەندی لە گـەل تورک دوبارە بکەنەوە، ئەوان پیوەندی خویان لە گـەل ینک «قـرت ئەکـەن» واتە ئەبرن. گـازاندەیان لەم کـارە گـەیاندە لای مـامـجـەلال. سەرکـردایەتی ینک بو خـاتری پاریزگـاری پیـوەندی خـوی لە گـەل دەدەقـادە بریاری دا پیوەندی لە گەل تورک ببری. کـاتی کـابرای نوینەری تورک هاتەوە ناوچەکـە بو هینانی وەلامی دانیشتنی یەکەم، بە زمانیکی شیرین «جەواب» درا.

*

پنکەکەمان تا ئەحات قەرەبالغ ئەبو.

کاک خالید گەڕایەوە لامان. شوێنەکەی بە دڵ بو. ئەویش لەوێ مایەوە.

هێزێکی دوڵی بالیسیان، قادر خەیات فەرماندەیان بو، گەیشتن. گورجوگوڵ و چالاک و ئازا و گوێڕایەڵ بون.

هەندێ لە کادرە سورانییەکانی یەکێتی کە لە سوریاوە بە ناو تورکیادا گەڕا بونەوە، بە دو تاقم گەیشتنە لامان. لەوانە: حەسەن خۆشناو، سەید کەریم، د. خدر مەعصوم، سامان گەرمیانی، عادل شوکر، داود محەمەد عەلی، عەبدوڵلا خۆشناو... لە گەڵ خۆیان دو کادری «الجیش الشعبی لتحریر العراق» یان هێنا بو. تاقمی لەم کادرانە بێ چەک هات بونەوە. لە کاتی پەڕینەوەدا لە ڕوباری سەرکەم لە ئاستی گوندی دەرپا سور چەکدارەکانی ق م بۆسەیەکیان بۆ نابونەوە گرت بویانن. برد بویانن بۆ لای فەرماندەکەیان. گفتوگۆ و مشتومڕ لە نێوان ئەوان و کابرای ق م دا ڕوی دا بو. کابرای ق م وت بوی: «بۆچی ئێوە دوای جەلال کەوتون. جەلال جاشە!». ئەوانیش وت بویان: «مامجەلال جاش نیە. سەرکردایەتی بارزانی ئاشبەتالی کرد. بۆچی واز لە کورد ئاهێنن؟». کابرای ق م وت بوی: «بە کوێرایی جەلال و ئێوە هەتا مەلا مستەفا مابێ سەرۆکمانە. دوای ئەو ئیدریس، دوای ئەو مەسعود، دوای ئەو نێچیرڤان... ئەگەر هیچ کەسی لە مالی مەلا مستەفا نەما کەرێک لە مالی بارزانی ئەهێنین، جامانەیەکی سوری لە سەر ئەکەین و ئەیکەین بە سەرۆکی خۆمان»

هەر لەو ماوەیەدا زۆروی عەبدوڵلا ڕەبی لە ناوچەی سلێمانییەوە گەیشت. لە «پردی ناوەندە» کەوت بونە کەمینەوە. تێکۆشەری بە ئەمەن «حەمید باتاسی» و ۳ پێشمەرگە کوژرا بون. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد شیعرێکی بۆ دانابو، لە دیوێکی دا بە «ناشتەروتەکەی خاکی کوردستان» ناوی برد بو. دوا بە دوای ئەویش چەند کادرێکی تری کۆمەڵە گەیشتن لەوانە: ئەبو شەهاب، دلێری سەید مەجید.

هەمو بەیانییەک شوەکی کاک خالید هەمو هێزەکەی لە خەو هەڵئەستان و هەندێ قسەی سیاسی بۆ ئەکردن. زۆر جار دوێنک بە پێشمەرگەکانیەوە ئەدا بەڵام مەترسییان نەبو.

لەم ماوەیەدا عێراق سەرژمێری گشتی کرد. لە گەڵ سەرژمێرەکەدا بە هالیکۆپتەر لە زۆری گوندەکان دائەبەزین. لە ڕۆژی سەرژمێردا چەند هالیکۆپتەری هاتە ئاسمانی ناوچەکە. چەند شوێنێکیان ئاگر باران کرد و ئاگریان بەردایە پوش و پاوانی ناوچەکە و لە هەندێ شوێن دابەزین. هەرچەندە پێشمەرگەکان دامەزرا بون و چاویان لە ئیشتنەوە و

دابەزین و سواربوونەوە و فڕینی سەرباز و هالیکۆپتەرەکان بۆ ئەمانهێشت تەقەیان لێ بکەن. چونکە ئەوان پێشمەرگە و شوێنی بنکەکانیان نەبینی. تەقەش کوێرانەیان ئەکرد. کاک خالید بە چاکی زانی هەمو بارەگاکان بگوێزینەوە سەر ڕوباری سەرکەم لە دوڵ و شیوەکانی ئەمبەرو ئەوبەری دا جێگیر بن. چەند لانەیەکی نان برژاندنمان دروست کرد.

شێخ حەسەنی بەڕێزی زۆری پێشمەرگە بادینیەکانی کۆ کرد بووە بەرەو کوردستان هێنا بونی. لە ناوچەی گوێی لە نێوان ئولودەرە - زاخۆ دا ق م بە پێچەوانەی پەیمان و بەڵێنەکانی مەسعودەوە کەوتنە ڕاونانیان. ئەیانویست بیانگرن و چەکیان بکەن. خۆیان گەیاند بوە جێگایەکی قایم بە ناوی «کەیلی مەمی». ق م گەمارۆیان دا بون. لە سوریاوە بە هۆی «لیژنەی هاوکاری» وە هەوڵی دەرباز‌کردنیان دابو. کەڵکی نەبو. نامەی بۆ ئێمە نارد تەگبیرێک لە حاڵیان بکەین. من و حەسەن چوینە تورکیا و بە نهێنی خۆمان گەیاندە ناوچەکە. تراکتورمان بۆ پەیدا کردن. شەولەناو بە تراکتور هەمومان گوێزانەوە بۆ ناوچەی شەمزینان. حەسەن پێشیان کەوت گەیاندنیە بنکەکانی خۆمان. پێشمەرگەکان ماوەیەکی درێژ بو بە ئاسودەیی نەنوست بون و نانیان نەخوارد بو، بە تەواوی حەسانەوە.

*

لێرەوە پەیوەندی لە گەڵ بنکەی سوریا بە هۆی «پ د ک ت» وە و بە هۆی سەلاحەوە دامەزرێنرا. نامە و دەنگوباسی کوردستانی عێراق بە ڕێکوپێکی ئەنێردرا. ڕێگەی هاتوچو کردن و، ڕێگەی هێنانی چەک دۆزرایەوە. لە هەمان کات دا پەیوەندی دوستانە لە گەڵ زۆر لە دانیشتوانی گوندەکانی ماسیرو، گارە، گلێشم، سونە، دێرکێ، مەلاریا، شەپەتا، زەرن، ڕیبونس، نەهری...لە دیوی تورکیا دروست کرا. ئەوانە بۆ کڕینی ئازوقە و، هەندێ جار بۆ حەواندنەوەی پێشمەرگە و، بۆ هاتوچو کردن یارمەتی کادر و پێشمەرگەکانی بنک یان ئەدا. چەند کەسێ لە خەڵکی ئەم ناوچانە زۆریان خزمەت کردین و، زۆرمان پێوە ماندو بون لەوانە: محەممەد عارەب و، حاجی مەجید، لە ماسیرو. عەولا خان و، نوری خان، لە زەرن. صادق، لە شەپەتان. جەمال لە سونی، خورشید لە گلێشم و، هەندێکیان لە سەر ئێمە لە لایەن ق م و حکومەتی تورکەوە توشی گرتن و تەنگ پێ هەڵچنین بون.

نەهری شوێنێکی زۆر خۆش بو. چەند ماڵێکی کەمی لێ بو. کەلاوەی کۆشک و سەرای شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی سەرکردەی ڕاپەڕینی ١٨٨٠. هەروەها گۆڕستانی باووباپیرانی شێخ هێشتا ما بو. چەند جارێ بە نەهری دا تێ پەڕیم. جارێکیان لە ئارامگای سەید طەهای باوکی شێخ عوبەیدوڵلادا «عەزیزە»یەکمان دۆزییەوە کابرایەک لە

ڕێگای شێخەوە دابڕی بە «خوا» لێ ی ئەپاڕایەوە چاوەکانی کز بوون چاکیان بکاتەوە.

*

هاتنی چەند نەمسایەک

دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عێراق هیچ جۆرە هەواڵ، دەنگوباس یا لێدوانێکی لە سەر جولانەوەکە بڵاو نەدەکردەوە. ئەیویست بە بێدەنگی بیخنکێنێ. وەکو عەرەب پێ ی ئەڵێن: «تعتیم اعلامی» لە سەر بوو. ڕۆژنامەوانی بیانیش نەدەگەیشتنە لامان. جولانەوەکەش ئەوەندە ڕوونقی پەیدا نەکرد بۆ ڕۆژنامەوان خۆی بۆ بکوتێ. بەڵام هاوینی ٧٧ دوجار بیانە لە تورکیاوە گەیشتنە بنکەکانی ئێمە. جاری یەکەم دوو خوێندکاری کچی نەمسایی بوون، هەردووکیان لە شەمزینانەوە من لە گەڵ خۆم هێنامن بۆ بنکەکانی برادۆست، جارێکی تریش نەمساییەکی تر. ئەمانە کەسیان ڕۆژنامەوانی پیشەیی نەبوون. هەموویان «هاوڕێ» بوون. بەڵام هەردوجار دوو وتاری ڕێنداریان لە گۆڤارەکانی ئەڵمانیادا بڵاو کردەوە.

هەرچەند هەوڵم بۆ بەرخسایە نامەیەکم بۆ د. کەمال فوئاد، یان بۆ عومەر شێخموس ئەنووسی و، ئەمدا بە کەسێکی ئەمین لە ناو یەکێ لە شارەکانی تورکیاوە بیخاتە پۆستەوە، هەواڵ و دەنگوباسەکان و، بیروڕای خۆمم بۆ ئەنووسین.

*

هێنانی وەجبەی یەکەمی چەک

کاتی خۆی ئومێدێکی گەورەمان بە سەرانی «پ د ک ت» بوو کە یارمەتیمان بدەن بۆ گوێزانەوەی چەک بە ناو تورکیادا. دوایی بۆمان دەرکەوت کە هەم تواناپان لەو بوارەدا کەمە و، هەم ناپانەوێ خۆیان تووشی «تەڵوکە» بکەن. د. کەمال خۆشناو و عومەرمستەفا لە قامیشلی بنکەیەکیان دانا بوو بە زۆری بۆ گوێزانەوەی چەک بوو. بەڵام زۆری چەکەکان کە نەگەیشتنە تورکیا نەکەوتنە دەستی نائەمین و تەلەفوتان.

«پ د ک ت» بە پێچەرپێچەری وەجبەیەک چەک کە پێک هات بوو لە ٦٠ کلاشینکۆف گەیاند بوویانە گوندی «بەردەڕەش» لە نێوان وان - گەوەردا. ئامادە نەبوون لەوە زیاتر نزیکی بخەنەوە. مانگی تەمووز ئاگاداریان کردین کە بیگوێزینەوە. ناچار خۆمان کەوتینە هەوڵی هێنانی. ٦ ئێستری باشمان کڕی. ٦ کەسم لە پێشمەرگە بادینییەکانی شارەزای بار و وڵاخ بوون هەڵبژارد. حەسەن خۆشناو و من خۆمان ئامادە کرد بۆ هێنانی. لە پێشمەرگەی سۆرانی تەنیا «عەلی ئاغای مارونان»مان لە گەڵ خۆمان برد. وامان بە چاک زانی بە ژمارە کەم بین بۆ ئەوەی بە ئاسانی تێپەڕین و بگەڕێینەوە.

چیای بەرزی «زیرینجو» مان بری بەرەو نەخری و بیسەلاتە و بی شەمەسی و باوی... دووروژ زیاترمان پی چو تا گەیشتینە بەردەرەش. پارەکانمان بار کرد و بە هەمان ریگادا گەراینەوە. هەولمان نەدا کەس نەمان بینی و، لە گوندەکان لامان نەئەدا. لە نەخریوە کە ئەچوی بو «رەیسونس» ئەبو لە پردیکی دیرینەی بەردین بپەرینەوە ئینجا بە چیای «زیرینجو» دا هەلگەرین. بە ٨ سەعات ئینجا گەیشتینە سەر لوتکەی شاخەکەو دوای پشوودانیکی کورت شور بوینەوە بو دولی گوستە. داهێنینیشی بە ئەندازەی سەرکەوتنی ناخوش بو. یەکی لە پیشمەرگە بادینیەکان ناوی «یوسفی گەوهەر» بو. ریچەلەکی ئەرمەنی بو. لە قەتلوعامی ئەرمەنیەکان دا باوباپیریان موسولمان بوبون. کابرایەکی چوارشانە و بەهیز بو. زور شارەزای بار بو. قەپاسەی یەکی لە ئیسترەکان بن کلکی بری بو. خوینی لی ئەهات. ئیسترەکە هەلی ئەتیزان و بە تولەرپیەکی شاخی هەزار بە هەزاری زیرینجودا شور ئەبوینەوە. مام یوسف ویستی قەپاسەکەی چاک بکا ئیسترەکە لەقەیەکی لی دا. مام یوسف سست بو. کەوتەوە ری قسەی نەکرد. تومەز لەقەکە بەر گونی کەوت بو. کە گەراینەوە شوینەکەی خومان چو بو بو لای د. خدر مەعصوم. گونی ئاوسا بو. ئەبویست ئیزنی بدەین بو چارەسەرکردن بگەریتەوە بو سوریا. بە گالتەوە پیم وت: «مام یوسف زور لە میوژە ژنت هیناوە و خوا لیت نەسینی چوار کورت هەیە، خویشت گەورە بوی، تازە گونت بوچیە!؟» زور تورە بو ئەیوت: «چون ناەوی ئەگەر گونم نەمینی بمرم باشترە!»

بە سەلامەتی گەیشتینەوە بنکەکانی خومان. هەمومان هەستمان بە شانازی و خوشی ئەکرد. پیشمەرگەکان کە کلاشینکوفە تازەکانیان ئەدی لە ناو کیسەدا وایان ئەزانی یەکی لە مەرجە گرنگەکانی سەرکەوتن تەئمین بوە. ئەوە یەکەمین وەجبەی کلاشینکوفی یەکلاتی بو بگاتە کوردستانی عیراق بە هەموی ٦٠ دانە بو.

*

گەرانەوەی مامجەلال

چەند هەفتەیەک چاوەروانی مامجەلال بوین بگەریتەوە کوردستان. من هیزیکم لە گەل خوم برد بو لە نزیک سەرچاوەکانی سەرکەم لە بن دالاتیەردا لە سەر چەمەکە لە شوینیک دا بە ناوی «چەمکەیی» دامەزرا بوین. پیخەف و راخەر و چادرمان ئەبو. شەو لە ناو سەرما خومان لی ئەئەکەوت تا بەیانی بە دیار ئاگرەوە دائەنیشتین. کە روژ هەلئەهات خومان ئەدایە بەری و ئینجا ئەنوستین. هەتاو و تیشکدانەوەی بەفری کویستانەکان روخساری هەمومانی رەش داگەراند بو. روومەت و پیستی ملمان بە زوری سوتا بون.

چەمکەبی ژمارەیەکی زۆر بێ کونسەالی لێ بوو. هەندێکیان بەنەکانیان زۆر تەسکور بوو. زۆریەان هەلکەند و سوتاند. زۆر رۆژ بە شاخێکی سەخت دا نزیکەی سەعات و نیوی سەرئەکەوتین بۆ ئەوەی بچینە گوندی ماسیرو و، هەمان رۆژ ئەگەراینەوە بۆ چەمکەبی، گەرانەوەشمان ئەوەندەی پێ ئەچوو.

مامجەلال گەیشتە روما بۆ ئەوەی لەوێوە بیتە ئەستەمول و بەرەو کوردستان بگەرێتەوە، بەلام عەبدولئیلاە النصراوی ریبەری ئەوسای «الحرکە العربیە الاشتراکیە» و، عومەر مستەفا لە شامەوە تەلەفونیان بۆ کرد بوو. پێیان وت بوو: «لەبەر ئەوەی کارێکی گرنگ و پەلە هاتوتە پێشەوە پێویستە بگەڕێیتەوە شام». مامجەلال گەرا بووەوە شام. من زۆرم پێناخۆش بوو. دەرکەوت کار هەر نەبوو. گوایە عەبدولئیلاە ویست بوی مامجەلال لە گەرانەوە ژیوان بکاتەوە، بە بیانوی ئەوەی هەلومەرجی کوردستان خراپە و نابێ جاری مامجەلال موجازەفە بکا.

من نامەیەکم بۆ مامجەلال نوسی. باروودۆخی کوردستانم بۆ روون کرد بووەوە. باسی دوژمنەوەی ریگای هاتوچو و، پێویستی گەرانەوەی ئەو و، خراپی ژیانی ئەو هێزەشم بۆ نوسی بوو، کە چاوەرواتی ئەو بوون. ئاگادارم کرد کە ئەگەر بەو نزیکانە نەگەرێتەوە، وا ئیتر ئیمە ناتوانین لەوە زیاتر چاوەری بکەین. کاتی نامەکەی منی پێ گەیشت بوو، مامجەلال لە گەل هیرو خانی هاوسەری لە بیروت ئەبێ، هیروخان چەند رۆژێکی کەمی ماوە مناڵی ببێ، من ئاگاداری ئەمە نەبووم. بەلام مامجەلال دەستبەجی هاوسەرەکەی بە جێ هێشت بۆ گەرابووەوە دیمەشق و لەوێوە چوو بوە ئەوروپا و ئاگاداری کردبوین لە کات و شوینی گەیشتنی. ئیمەش نەجو و حەسەن خوشناومان نارد بۆ ئەستەمول بۆ پیشوازی. مامجەلال بە پاسپورتی خوالێخۆشبوو فاضیل تالەبانی لە تەموزی ۹۷۷ دا گەرابووە بۆ کوردستان. پاسپورتەکەی فاضیل ئیرانی بوو، خوی لە لەندەن لە نەخوشخانە کەوت بوو لە سەر مردن بوو، پاسپورتەکەی خوی دا بوو بە مامجەلال بۆ ئەوەی لە تورکیا بە کاری بهێنی. ئەو زەمانە پاسپورتی ئیرانی لە تورکیا بەرێزەوە رەفتاری لە گەل ئەکرا.

من هەر لە چەمکەبی بووم. نامەی حەسەنم پێ گەیشت لە دیاریەکردوە ئاگاداری کردم لە کاتی گەیشتنیان. لە هەمان کات دا خەلکی گوندی ماسیروش ئاگاداریان کردم کە چەند کەسێک لە بەرپرسەکانی یەکێتی گەیشتوننە لای ئەوان داوایان لێ ئەکەن بیانبەن بۆ سوریا. من ئەم هەوالەم بە لاوە زۆر سەیر بوو. ئاشکرا بەرپرسی یەکێتی بە بێ ئاگاداری ئیمە، بە سەر ئیمەدا باز بدەن و، بیانەوێ بچن بۆ سوریا. بۆ ساخ کردنەوەی ئەم هەواڵە من خوم چووم بۆ ماسیرو. سەعید کەریم و ساسان گەرمیانی چەند کەسێکی کەم لە گەل خوم

لە گوندەکە هەواڵی میوانەکانم پرسی. منیشیان برد بۆ لای ئەوان. جگە لە فاضیل جەلال «عادل» ی قیادە موەقەتە، من کەسیانم نەناسی. بە خێرهاتنم کردن و لێم پرسین: «ئێوە کێن؟» زۆریان پێ ناخۆش بوو، بە توڕەییەوە ئەوانیش لە منیان پرسی: «تۆ کێ ی؟». وتم: «من فلانم بەڵام ئێوە کێن و بۆچی هاتوونەتە ئێرە بە بێ ئاگاداری ئێمە؟». مەلا بەختیار عەلی دایە وتی: «من مەلا بەختیارم نوێنەری کۆمەڵەم، ئەوە کاک رەسول مامەند نوێنەری بزووتنەوەیە، ئەوە کاک عەلی کوێیە سەربەخۆیە، ئەوەش فاضیل جەلالە نوێنەری ق م». وتم: «بۆچی ئەچن بۆ سوریا و چ کاریکتان لەوێ هەیە». وتیان: «ئەچین بۆ سوریا مامجەلال ئەبینین و، کێشەی ئێوە و قیادە موەقەتە چارەسەر ئەکەین». منیش پێم وتن: «ئەگەر ئەتانەوێ کێشەی ئێمە و ق م چارەسەر بکەن پێویستە لێرەوە دەس پێ بکەن. هەر دولای کێشەکە لێرە ئامادەین. ئەگەر ئەتانەوێ مامجەلال ببینن. ئەوە پێویست ناکا بچن بۆ سوریا چونکە ئەمڕۆ ئەگاتە ئێرە.

ئەم برادەرانە لە قەندیلەوە بە نهێنی چووبوون بۆ شنۆ، لەوێشەوە هێنا بوویانن بۆ ئێرە. هەموویان پانتۆڵیان لە پێ دا بوو. لە وەڵامەکانی من و جۆری رەفتارم دڵگیر بوون و، باوەڕیشیان بە قسەکانم نەبوو. بە هەر حاڵ رازیم کردن و لە گەڵ خۆم هەموویانم برد بۆ گارە. لە بن سێبەری چەند داریکی گەورەدا جێگامان راخست. لەو نزیکانە قەرەقوڵێکی تورک لە سەر جادەکە بوو. ئەترسایین مامجەلال لە هاتنی دا تووشی کێشە بێ لە گەڵیان. پێشمەرگەکانم لە ناوچەکەدا دامەزران. خۆم و، صدیقی کریخا طەهای کانی کوردە «حەمەسوور» و خەبەری خۆدەبەدەی بەڕێیدیم برد و نزیکتر کەوتینەوە لە شوێنی گەیشتنی مامجەلال. زۆری پێ نەچوو مامجەلال گەیشت و هەمو سەرکردەکانی «پ د ک ت» بۆ ریز لێ نانی لە گەڵی هات بوون. هەروەها ٣ کادری «سازمانی ئینقیلابی حزبی تودەی ئیران لە دەرەوە» بۆ هاودەردی و هاودەنگی لە گەڵی هات بوون. ماوەیەکی درێژ مانەوە و، ق م یەکێکیان: بەشیری خوسرەوی، دوای بە دیل گیرانی لە کارەساتی هەکاری دا کوشت. حاجی فارسی موختاری گوند بەو بۆنەیەوە مەڕێکی بۆ سەربڕین. بە خێرایی نانمان خوارد و بەرەو بنکەکانی خۆمان کەوتینە رێ. رەسول و مەلا بەختیار و عەلی کۆ و فاضیلیش لە گەڵ ئێمە گەڕانەوە.

من ئەو چەند رۆژە چەند جاری بە شاخەکەدا ئەمدیو و ئەودیوم کرد بوو. بە چیای «ئەتلیب» دا سەرئەکەوتین. هەورازێکی رک و دوورودرێژ بوو. مامجەلال سواری ولاخ بوو، من پیادە بووم، لێ ی پرسیم: «وەزعی وڵات چۆنە؟». وتم: «ئێستا ماندوم لەم هەورازەدا

ناتوانم زۆر قسه بکەم، بەڵام هەر ئەوەندەت پێ ئەڵێم، نیسه، ئەوانەی دەرەوە، لە گەڵ ئەم برادەرانەی ئێرە، هەر ناوەکەمان یەکە، ئەگینا لە هەمو شتێک دا جیاوازین. وەزعی شۆڕشەکە بە هۆی هەرەسی جەنبش و تەسلیم بونەوەی زۆری پێشمەرگە خراپە، ئێمە خەریکی هەڵسانەوەی بوین، بە جێ هێشتنیان لەم کاتەدا عەیبە ئەگینا هەر لێرەدا پێشنیارم بۆ ئەکردی بە کام ڕێگادا هاتوی بە هەمان ڕێگادا بگەڕێیەوە بۆ دەرەوە».

مامجەلال قسەکانی پێ ناخۆش بو، بە تایبەتی هەمەری چەند سەعاتی بۆ گەیشت بوەوە کوردستان، چاوەڕوانی هەواڵی خۆشتری ئەکرد. بەڵام زۆر زو تێگەیشت لەم قسانەدا من ناهەق نەبوم.

ئەندامانی سەرکردایەتی و، کادرەکان و، فەرماندەکانی پێشمەرگە بە دوای یەک دا ئەگەیشتنە برادوست، بە تایبەتی دوای ئەوەی زانیبیان مامجەلال گەیشتۆتەوە کوردستان و، ناوچەکەش تا رادەیەکی زۆر لە چاو سەرانسەری کوردستان دا ئەمینتترە و، دورترە لە هەرەشەکانی جەنبشەوە. کاک خالید و شێخ حسێن و من هەر لەوێ بوین. عەلی عەسکەری، تاهیری عەلی والی، سەعدی گچکە، سەید کاکە، سالار، عومەری حاجی عەبدوللا، ئازاد هەورامی گەیشتن. هەروەها کادر و فەرماندەی کەرتەکانی پێشمەرگەش ئەهاتن. حاجی شێخەی بنزیری، کوێخاکانی مەنگور، ئەحمەدی فەقێ رەش، حاجی حاجی برایم و، زۆر کەسی تر هاتن.

*

گیروگرفتی سیاسی

پێکهێنانی یەکێتی لە شێوەی ئەمچە بەرەدا کە ڕێکخراوی جیاواز و بیروڕای جیاوازی تێ دا کۆ ببێتەوە تەجروبەیەکی تازە بو لە کوردستان دا، ئەو بیروبۆچونانەش کە بە ئاشکرا بڵاوی ئەکردەوە ئەویش شتێکی تازە بو. ئەم ڕێکخراوە تازەیە گیروگرفتی سیاسی سەخت و دژواری هەبو:

- لە ئاستی کوردستان دا

یەکێتی لە ناوخۆی دا باڵەکانی ئاتەبا بون و، لە هەندێ بیروبۆچونی بنەرەتی دا یەکیان نەئەگرتەوە: هەڵوێست لە چینە کۆمەڵایەتییەکان، لە ڕوخاندنی ڕژێمی عیراق، لە جۆری کۆکردنەوە و ڕێکخستنی پێشمەرگە... ناکۆکی لە ناودا دروست ئەکردن.

یەکێتی چەندی هەوڵی دا لە گەڵ ق م تەبایی دروست بکا سەرکەوتو نەبو. دوژمنایەتی لە گەڵ ق م تا ئەهات قوڵتر ئەبو.

- لە ئاستی عیراق دا

حشع هاوبەشی حکومەت و وەزارەت و جەبهە بو لە گەڵ حیزبی بەعس. ئەگەرچی دوا بە دوای ئاشبەتاڵ حشع هەوڵی دا ئەو بوشاییە سیاسی و ریکخراوەییە پر بکاتەوە کە هەرەسی پارتی و شورشەکە دروستیان کرد بو، بەلام نەک هەر هیچی پی نەکرا بەڵکو بەعسیشی وا لی کرد بیانخاتە ژیر گوشارەوە. حشع بو ئەوەی لە وەزارەت و جەبهەدا بمینیتەوە سەری بو گوشاری بەعسی دانەواند. لە بەیانیکی کومیتەی ناوەندی دا ئیشارەتی بو دەس پی کردنەوەی خەباتی سیاسی و چەکداری یەکیتی کرد بو بە وەی کە دیسان لە سەرەوی نیشتمانەکەیان دا پەلەی نیستیعمار کەوتوتەوە هاندانی گومانلیکراوەکان بو ئەوەی ئاژاوە و پشیوی دروست بکەن.

- لە ئاستی ناوچەیی دا

یەکیتی ئالاهەلگری پشتیوانی بو لە کوردایەتی لە سەرانسەری کوردستان دا.

ئیران بە گویرەی ریککەوتنی جەزائیر هاوکاری لە گەڵ عیراق ئەکرد. بە توندی دوژمنایەتی یەکیتی ئەکرد. دیموکرات حیزبیکی لاواز بو، سەرکردە و کادرەکانی لە دەرەوەی ئیران بون، تەجرووبەیەکی تاڵیان لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی هەبو، لە گەڵ حکومەتی بەعس پەیوەندی دوستانەیان دامەزراند بو، لە بەر ئەوە هاوکاری یەکیتی یان نەئەکرد.

تورکیا لە سەرەتاوە دژی جولانەوەی نەتەوەیی کورد وەستا بو. بە توندی دوژمنایەتی یەکیتی ئەکرد. لە ناو حیزب و ریکخراوەکانی کوردستانی تورکیادا تەنیا پ د ک ت هاوکاری یەکیتی ئەکرد. ئەویش تازە خوی ریک خست بووەوە، لە ناوچە سنورییەکان دا لاواز بو، سەرکردایەتییەکەیشی نەیان ئەویست بە هوی کوردستانی عیراقەوە توشی تەنگوچەڵەمە بن.

- لە ئاستی جیهانیی دا

یەکیتی دوژمنایەتی خوی لە گەڵ ئیمپریالیزمی جیهانیی بە تایبەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکی نەشئشاردەوە. هیچ دوستیکیشی لە ناو ولاتانی بلوکی روژهەلات دا پەیدا نەکرد بو. یەکیتی لە دنیادا هیچ دەولەتیکی دوستی نەبو.

بەمجورە یەکیتی لە هەمو لایەکەوە بە دوژمن گەمارو درا بو. تەنیا هیزی کە ئەبو پشتی پی ببەستی، هیزی کومەلانی خەلک بو، کە لە راستی دا هیزیکی گەورە و بەخشندە و لە بن نەهاتو بو.

*

گیروگرفتی لوجستیکی

ئەو چەند مانگەی لە دولی گوستە بووین لە کەناری رووبارەکەدا جێگامان لە بن دار و لە ناو کونەبەردا بۆ خومان چاک کرد بو. وەکو ئەلێن: ئەرزمان رائەخست و ئاسمانمان ئەدا بە خومان دا. حەسەن خوشناو، د. خدر و، من پێکەوە دەلاقەیەکی ئاوەرمان چاک کرد بو لە نزیک مامجەلال لەوێ ئەنوستین. ئاگردانێکیشمان تێ دا دروست کرد بو، چارویار چامان لە سەر لێ ئەنا، یا پەتاتەمان لە ناو ژیلەموکەی دا ئەبرژان. کاتێکی سازگاری لە لاوە بو. چەند سوورچنارێکی پیر و گەورە، بەلام کلوز سێبەرێکی خەستی کەریان لە سەر کرد بووین. لە سەرووی ئێمەشەوە سالار و عومەر و، هەندێکی تریش لە پێشمەرگەکان بە چوار دەوری سەرچاوەی کانیەکەدا جێگایان چاک کرد بو. تا حاجی شێخەی بنزیری گەیشت ئێمە ئێشکمان لە مامجەلال ئەگرت.

لەو ماوەیەدا گیروگرفتی لوجستیکی گەورەمان هەبو.

- هیچ خانو و نوایەکمان نەبو تێ یا بحەوێینەوە. چادرمان نەبو. ژمارەیەکی زور کەم رایەخ و پێخەفمان هەبو. من لە پێش دا لە سەر لم و دوایی‌تر لە سەر چلە نیسترێک ئەنوستم. هەر حەیواتێکمان سەرپەرایە پستەکێمان بو نوستن بە کار ئەهێنا.

- خواردنمان زور خراپ بو. زوری ژەمەکان نان و چا بو. زور بە زەحمەت و زور بە گران ئازوقەمان پێ ئەگەیشت. ق م دەوری عیراقی لێ بەست بووین هەر ئازوقەیەک بو ئێمە بهاتایە دەستیان بە سەردا ئەگرت و، ئەوەی کەلوپەل و خواردنی بو ئێمە بکڕیایە ئەیانگرت و، سزای قورسیان ئەدا. چەند کەسێکیان لە رووبار هەلکێشا بو لە سەر ئەوەی ناردیان بو ئێمە کری بو.

ئازوقەیان لە تورکیا بو ئەکڕین، گران ئەکەوت لە سەرمان.

- چەکمان کەم بو. بەعس چەکی چنی بووەوە. بە دەگمەن چەک بە کڕین پەیدا ئەبو. هێشتا نەگەیشتبووینە ئەو رادەیەی بە شەر بیگرین. ق م رێگەی سووریا - تورکیایان لێ گرت بووین.

چەکەکانمان سوک بو، بە زوری کلاشینکوف و برنەو بو، ژمارەیەکی کەم ئاربیجی و رەشاشی سوک. چەکی قورس و ناوەڕی مان نەبو. چەکی دژی ئاسمانیمان نەبو. ١٠ دوشکامان هێنا بوە ناو تورکیا دوای لێدانی کاروانەکەی حەسەن خوشناو دەس ق م کەوت. لە ناو ئەوانەش دا کە لە بنکەکانی برادوست بون پێشمەرگەی بێ چەکمان زور بو. بە هیوای گەیشتنی چەک بون.

- هیچ جورەکی پەیوەندی مان نەبو. دەزگای بێتەلمان نەبو. عومەر شێخەموس چەند «دووکی تورکی» یەکی بو نارد بوین لە بەر بێ کەلکی کەس بەکاری نەئەهێنا. تەنیا

هۆی پەیوەندیمان نامەنووسین بوو.

– هیچ هۆیەکی ڕاگەیاندنمان نەبوو. چاپخانەمان نەبوو ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی پێ چاپ بکەین. تەنانەت تایپرایتەر و ڕۆنیۆمان نەبوو. بڵاوکراوەکانی دەرەوەش: «الشرارة» و «ڕێبازی نوێ» بە ڕێکوپێکی نەدەگەیشتن. دوای گیرانەوەی مامجەلال لە دەرچوون وەستان. ژمارە کۆنەکانیش بە زەحمەت دەگەیشتن.

«دەزگایەکی ڕادیۆ» مان پێ گەیشت بوو. سەعید مورسەل زۆر بە وریایی هێنابوویە بۆ کوردستان. بەڵام بە هۆی نەبوونی پێویستییەکانی نەمانتوانی بیخەینە کار.

– لە مانەش هەمووی خراپتر پارەمان نەبوو بۆ دابینکردنی مووچە و ئازوقە و پێویستییەکانی پێشمەرگە، وەکو جلوبەرگ، پێڵاو، خەرجیی گیرفان. زۆری پێشمەرگەکان کەسوکاریان یارمەتییان ئەدان.

*

لە ئەفسانەی کۆنی کوردی دا ئەیان گێڕایەوە: قارەمانی سەرگوزشتە بۆ ئەوەی بە «مورادی دڵ» بگا ئەبوو «حەوت کەوش بڕی و، حەوت جووت پێڵاو بدڕی و، سەری حەوت دێو بڕی». پێشمەرگایەتی لەم سەردەمەدا زەحمەتتر بوو لە سەفەری ئەم کابرایە، سەرباری ئەوەش ئەمان کەسوکاریان ئەکەوتە بەر دەستدرێژیی دڕندانەی داودەزگاکانی بەعس. لە گەڵ هەموو ئەوانەش دا، بە دەگمەن هەبوو، لەم ژیانە پەشیمانی و لە دوژمن ترس دەربڕی. هەبوونی «موتیف»، یەکی ڕاستەقینە و ڕەوا مرۆڤی ئاسایی ئەکا بە مرۆڤێکی نائاسایی خاوەن باوەڕێکی پتەو و، وورەیەکی بەرز و، ئازایەتییەکی شێتانەی وەها، کە دەس لە هەموو خۆشییەکی ژیان هەڵگری و، بەرگەی هەموو ناخۆشییەک بگری. هەر ئەم «موتیف»ە پیرۆزە بوو: «باوەڕ بە ڕەوایی مەسەلەی کورد»، وای لە پێشمەرگەکانی شاخ و، تێکۆشەرانی شار و، گیراوەکانی زیندان ئەکرد لە مردن نەترسن و گوێ نەدەنە ژیان، وەکو جەواهیری وتوویەتی: «یهب الحیاة کأنه لا یفهم».

*

یەکەمین کۆبوونەوەی

کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

بە گەیشتنی مامجەلال ڕێوشوێنی یەکەمین کۆبوونەوەی سەرکردایەتی یەنک لە سەر ئەرزی کوردستانی عێراق دانرا. ئەم کۆبوونەوەیە گرنگییەکی تایبەتی هەبوو. چونکە تا ئەو کاتە یەنک سەرۆک یا سکرتێر و مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی دیاری کراوی نەبوو.

«دەستەی دامەزرێنەر» لە دەرەوەی وڵات بوو، سەرانی کۆمەڵە و بزووتنەوە نەیان توانی بوو لە سەر دیاریکردنی ئەندامەکانی «سەرکردایەتی وڵات»، و ژمارە و دابەشکردنی ئەرک و فەرمانەکانیان ڕێک بکەون. بۆ ئەوەی ناکۆکییەکە زل نەبێ، وەکو چارەسەرێکی کاتیی و مامناوەندیی تا گەڕانەوەی مامجەلال، لە سەر ئەوە پێک هات بوون: «سەرکردایەتی دوانە» بۆ ناوچەکان دروست بکەن. لە هەر ناوچەیەک دا دوو کەس؛ یەکێک لە کۆمەڵە و یەکێک لە بزووتنەوە دابنرێن، دەسەڵاتی هەردووکیان وەکو یەک بێ و، پێکەوە کاروباری پێشمەرگەیی و سیاسی و ڕێکخراوەیی ناوچەکە سەرکردایەتی بکەن. بەم پێ یە: ئارام - ڕەسوڵ مامەند بۆ کاروباری سیاسی، سالار - عەلی عەسکەری، تالیب ڕۆستەم - خالید سەعید، عومەر عەبدوڵڵا - تاهیر عەلی والی بۆ کاروباری پێشمەرگایەتی ناوچەکان دانرا بوون. «سەرکردایەتی دوانە» لە کاری سیاسی و پێشمەرگەیی دا، پێچەوانەی «یەکیەتی ویست و بڕیاردان» و «یەکیەتی کار و جێبەجێ کردن» بوو، ناکۆکی و ڕقەبەری دروست ئەکرد و، کارەکانی دوا ئەخست و، لە گەڵ بەرەوپێبردنی باشی کاروباری شۆڕش دا نەئەگونجا .

هەر ٣ ڕێکخستن وا ڕێک کەوتن مامجەلال بڕاگەوری هەموان و، سکرتێری گشتی یەک بێ و، هەر ٣ لا بە ئەندازەی یەک نوێنەریان لە سەرکردایەتی یەک دا هەبێ.

ناکۆکی قووڵ و زۆر لە نێوان سەرانی کۆمەڵە و بزووتنەوەدا هەبوو.

سەرانی کۆمەڵە گەنجی خوێنگەرم و توندڕەو بوون، خۆیان بە نوێنەری بیری پرۆلیتاریا و بزووتنەوەیان بە نوێنەری بیری بۆرجوازی ئەزانی. لە کتێبە مارکسییەکان دا خوێندبوویانەوە، کە شۆڕش بە سەرکردایەتی بۆرجوازی سەر ناکەوێ لە بەر ئەوە ئەبێ پرۆلیتاریا سەرکردایەتی بکا. ئەیان ئەشاردەوە کە ئەبێ سەرکردایەتی شۆڕشەکە بە دەس ئەوانەوە بێ.

کۆمەڵە، وەکو ڕێکخراوێکی سیاسی هێشتا لە ناو خەڵک دا خۆی ئاشکرا نەکرد بوو. بەشێکی سەرکردەکانی لە زیندان دا بوون. ئەوانەش کە کۆمیتەی هەرێمەکانیان دروست کرد بوو لە ژیانی سیاسی دا کەم تەجروبە و لە ژیانی پێشمەرگایەتی دا بێ تەجروبە بوون. گەنجی نەناسراو بوون و هەموویان ناوی خۆیانیان گۆڕی بوو. هەر یەکێکیان مەفرەزەیەکی کەمی لە گەڵ بوو زۆریان بێ چەک بوون.

بزووتنەوە، تازە دامەزرا بوو، بەڵام سەرکردەکانی هەموو کەسایەتی ناسراو بوون. هەر یەکێکیان ڕابردوویەکی درێژی لە کاری سیاسی و لە ژیانی پێشمەرگایەتی دا هەبوو. خەڵکی زۆریان لە شار و لادێ ئەناسی. سەرانی تیرەکان و کوێخای گوندەکان ڕێزیان لێ ئەگرتن و

پە قسەیان نەکردن.

پێش ئەوەی نوێنەرەکانی کۆمەڵە لە سەرکردایەتی یەکیەتی دا دیاری بکرێن. سەرانی کۆمەڵە، ئەوانەی لە برادوست بوون: سالار، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی، عومەری حاجی عەبدوڵڵا کۆبوونەوەیەکیان کرد. ئارام نەهات بۆ کۆبوونەوەکان. منیشیان بانگ کرد بۆ کۆبوونەوەکە. هەموویان داوایان لێ کردم منیش یەکێ بم لە نوێنەرەکانی کۆمەڵە. من خۆم پێم خۆش نەبوو. زۆریش بەهانەم هێنایەوە بۆ ئەوەی واز لە من بهێنن و، بە ڕاشکاوی وتم:

«ئەو چەند ساڵە من دوور بووم لە کاری کۆمەڵە. ئێوە ماندوو بوون و فیداکاریتان کردووە. نامەوێ من بێمە سەر حازری. چی بە من بکرێ بۆ پشتیوانیتان دریخی ناکەم، بەڵام ئەمەوێ لە دەرەوەی کۆمەڵە بم. من ئەندامی «دەستەی دامەزرێنەر»م، خۆم بە ڕوتبەی ئەندامی سەرکردایەتی یەکیەتیم وەکو هەڤاڵەکانی تر. چاکتر وایە ئەو جێگایەی بۆ منی تەرخان ئەکەن بیدەن بە برادەرێکی تر. سەرباری ئەمانەش لێتان ناشارمەوە: من باوەڕم بە کۆمونیزم نیە».

ڕاستییەکەشی ئەوە بوو: تووشی «خیبە امل» بوو بووم لێیان. ئەمویست بێ ئەوەی دڵیان بشکێنم، تێکەڵاوی کاری ناو کۆمەڵە نەبم. جگە لەوەش کەسانی وەکو کاک خالید و عەلی عەسکەری ڕەئیان وابوو بە هەموومان ڕێکخستنێکی تازە بە گوێرەی پێویستییەکانی شۆڕشەکە دابمەزرێنین. جێگەی بزووتنەوە و کۆمەڵە و خەتی گشتی بگرێتەوە.

قسەکانی من هیچ سوودێکی نەبوو. سوور بوون لە سەر ئەوەی بۆ ڕاستکردنەوەی نابەرامبەری لە گەڵ بزووتنەوە من یەکێ بم لە نوێنەرەکانی کۆمەڵە لە سەرکردایەتی یەکیەتی دا. مامجەلالیش هەمان ڕەئی هەبوو. لای وابوو کە پێویستە من لە ناو کۆمەڵەدا بمێنمەوە، بۆ ئەوەی بە باری باشەدا کاریان تێ بکەم. زۆر بە نابەدڵی وتم: باشە.

نوێنەرەکانی کۆمەڵە بەمجۆرە دانران: شاسوار جەلال «ئارام»، نەجمەدین عەزیز «سالار»، حیکمەت محەممەد کەریم «مەلا بەختیار»، ئازاد هەورامی «عادل»، عومەری حاجی عەبدوڵڵا «ڕەنجدەر» و، من.

نوێنەرەکانی بزووتنەوە: عەلی عەسکەری، ڕەسوڵ مامەند، خالید سەعید، تاهیری عەلی والی، سەعدی عەزیز. کاک عومەر مستەفا لە دەرەوەی کوردستان بوو، بەڵام ئەویش لە ڕیزی نوێنەرەکانی بزووتنەوەدا دانرا.

نوێنەرەکانی خەتی گشتی: شێخ حسێن یەزیدی و، هەموو ئەندامانی «دەستەی دامەزرێنەر» کە لە دەرەوە بوون.

کاک ئارام نەهات بۆ برادوست و بەشداری کۆبوونەوەکانیش نەبوو. چەند کەسی،

یەکی لەوانە کادریکی کومەلە دوایی دەرکەوت سەر بە ڕژیم بو. بە نامە و بە قسە لە کاک ئارامیان گەیاند بو؛ گەوا مامجەلال ڕیزی ئەندامەکانی کومەلە ناگری و، ئەگەر ئەویش بچی ڕیزی ئەویش ناگری.

مەکتەبی سیاسی پیک هینرا لە سکرتیری گشتی و ٤ ئەندام. دوان لە ئەندامەکانی: عەلی عەسکەری و رەسول مامەند نوینەری بزوتنەوە بون و، دوانەکەی تریش: ئارام و سالار نوینەری کومەلە بون. نوینەری خەتی گشتی یا دەستەی دامەزرینەری تی دا نەبو چونکە، جگە لە شیخ حسین و من، کەسیان هیشتا نەگەرابونەوە بو ولات.

لەم کوبونەوەیەدا بە وردی هەلومەرجی کوردستان و عیراق و، ڕیوشوینەکانی پەرەپیدانی خەباتی سیاسی، چەکدار، ڕیکخراوەیی و ڕاگەیاندن، باس کرا.

*

ڕیکخستنەوەی پیشمەرگە

کوردستان دابەش کرا بە ٨ هەریمی پیشمەرگایەتی و فەرماندەی هەریمەکان و جیگرەکانیان دیاری کران بەمجورە:

حسین بابەشیخ، فەرماندەی هەریمی بادینان

تایەری عەلی والی (ب)، فەرماندەی هەریمی پینجوین و هەورامان

سەید کاکە (ب)، فەرماندەی هەریمی دەشتی هەولیر

سەعدی عەزیز (ب)، فەرماندەی هەریمی خوشناوەتی

ئەنوەری مەجید سولتان (ک)، فەرماندەی هەریمی دەشتی کەرکوک

عومەری حاجی عەبدوللا (ک)، فەرماندەی هەریمی قەرەداغ

تالیب روستەم (ک)، فەرماندەی هەریمی پشدەر

من (ک)، فەرماندەی هەریمی شارباژیر.

کاک تایەر لە کوبونەوەکەدا وتی: «هیچ کاریکتان بو کاک خالید دیاری نەکرد».
کاک خالید خوی عەلی دایە وتی: «ئیوە لە ناو خوتان دا شەر مەکەن من هیچ مەسئولیەتیکم ناوی. گەروک ئەبم». لەمەش مەبەستی سەعدی گچکە و سەیدکاکە بو لە سەر هەولیر ناکوک بون.

ئەجرووبەی یەک سالی ڕابردوی ناپەرامبەریی هیزەکانی هەردولا و شەر و پیکداداتەکانی سەرانسەری کوردستان هەندی دەرس و پەندی دابو بە پیشمەرگە. لە هەندی ناوچە پیشمەرگە بارەگای گەورە و ئاشکرایان دانا بو. لە بەرامبەر هیرشەکانی جەیش دا نەیان توانی بو بیپاریزن. شەری ڕووبەرو توشی زیاتی ئەکردن. ئەو ئەیهیلن دوژمن زەمان

و زەمینی تێکهەڵچوونەکانیان بە سەرا بسەپێنێ، چونکە لە هەر جەبهەیەکدا دوژمن کات و شوێنی شەڕی بە سەر پێشمەرگەدا نەسەپاند، هەمیشە ئەوان سەرنەکەوتن و، ئەمان تووشی کشانەوە یا شکان ئەبوون.

بچووکترین یەکەی ڕێکخراوی پێشمەرگە مەفرەزە بوو. مەفرەزە ئەبوو پێک بێ لە ٥ تا ١٠ پێشمەرگە. هەر ٣ تا ٥ مەفرەزە ئەبوو یەک کەرت پێک بهێنن و، هەر چەند کەرتێکیش هەرێمێکیان پێک ئەهێنا. لە هەرجەبهەیەک فەرماندەی هەرێم ئەندامی بزووتنەوە بوایە ئەبوو یاریدەدەرەکەی ئەندامی کۆمەڵە بێ، هەروەها بە پێچەوانەوە.

مەفرەزە ئەبوو فەرمان لە کەرت و کەرت لە هەرێم و هەرێم لە مع و فەرماندەی گشتییەوە وەربگرێ. بە هۆی نەبوونی دەزگای بێتەل و دژواریی هاتوچۆی ئەتەرەوە، هەرێمەکان، بگرە مەفرەزەکانیش جۆرێ لە سەربەخۆیی پێشمەرگەیی و سیاسی و ڕێکخراوەیی و دارایی و ئازادی تەواوی کار کردنیان هەبوو.

ئەبوو پێشمەرگە گەڕۆک بێ. بە ڕۆژ خۆی دەرنەخات و لە شاخ خۆی حەشار بدات، بە شەو بچێتە ناو ئاوایی و پێویستییەکانی ڕۆژی دابین بکات و، لە پێش ڕووناک بوونەوەی دنیادا ئاوایی بە جێ بهێڵێ و ڕوو لە شوێنێکی نهێنی بکات. ئەبوو لە هیچ جێگایەک بۆ ماوەی درێژ نەمێنێتەوە. ئەبوو پێشمەرگە لەو گەنجانەی تەندروست و ناسراو و بە وزە بوون هەڵ بژێردرێن. باشتر وابوو سەڵت بن. لە بەر ئەوەی بنکەیان ئەبوو بڕۆی بچن، ئەبوو پێویستییەکانیان بە کۆڵی خۆیانەوە بێ. جگە لە تفەنگەکەی، ئەبوو چەندی بتوانی مەخزەن و فیشەک و نارنجۆک و، هەندێ جار دووربین و نیزە و دەمانچە و کتێبیشی هەڵ ئەگرت. سەرەڕای ئەمانە بە زۆری کوڵە پشت و کوپ و کەوچک و مەتارە و تاڵمی تەراشی خۆیان پێ بوو. خواردنەوەی مەشروبات بە توندی قەدەغە بوو. ئەبوو خاوەنی خووڕەوشتی بەرز و لە گەڵ خەڵک ڕووخۆش و زمان شیرین بێ.

*

ڕێکخستنەوەی کاروباری ڕێکخراوەیی

بنک ڕێکخستنێکی فراوان و یەکگرتووی ئەبوو. پێک هات بوو لە چەند ڕێکخستن و خەتی جیاواز. هەم بزووتنەوە و هەم کۆمەڵە ئایدیۆلۆجی تایبەتی، سەرکردایەتی جیاواز و ڕێکخستنی سەربەخۆی خۆیان هەبوو.

کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٧٠ەوە دامەزرا بوو بە نهێنی ڕێکخستنی درووست کرد بوو. بەڵام گیرانی شەهاب و هاوڕێکانی و چەندین کەس لە ئەندامەکانی کۆمەڵە و خۆشاردنەوەی بەشێکی تریان تەگەرەی لە پەرەسەندنی دا بوو. کۆمیتەی هەرێمەکان کە دوای ڕێکخستنی

کۆمەڵە لە شەهید ئارام، سالار، مەلا بەختیار و، شەهید ئازاد پێک هات بو، جگە لەوەی هەمویان لە داوودەزگا ئەمنیـیەکانی ڕژێم راکردو بون، هەموشیان گەلێ کەم تەجروبە و نەناسراو بون. کە خەباتی چەکداریش دەستی پێ کرد بوە وە هەمویان بە دوی یەکتری دا هات بونە ڕیزی پێشمەرگایەتییەوە. لە ناو شارەکان دا ژمارەیەکی کەم کەسانی شارەزای وەکو جەمال طاهیر، شازاد صائیب، حەمە چاوشین مابون بو کاری ژێرزەمینی.

بزوتنەوە ڕێکخراوێکی تازە دامەزراو بو لەو کادرانەی پ د ک کە لە تەهرانەوە گەرا بونەوە. لە بەر ئەوەی زوریان دور خرا بونەوە بو خوارووی عیراق و، لە ژێر چاودێری دەزگا ئەمنیـیەکان دا بون، نەیان توانی بو ڕێکخستنی فراوان دروست بکەن. عەلی عەسکەری و، عومەر مستەفا، رەسول مامەند، طاهیر عەلی والی هات بونە ڕیزی پێشمەرگایەتییەوە و، چەند کەسێکی وەکو صالح یوسفی، عەلی هەژار، کاردۆ گەلالی لە ناو شارەکان دا بو خەباتی ژێرزەمینی لە بەغدا بون.

خەتی گشتی لە ناو ولات دا هێشتا ڕێکخستنی نەبو. بزوتنەوە و کۆمەڵە هەریەکەیان بو خوی خەلکی ڕێکخست بو. د. خالیدیش کە سەرەتا سەر بە هیچ لایەکیان نەبو، سەرکردەکانی بزوتنەوە وەکو مەرجی پێشەکی داوایان لێ کرد بو کە ئەویش ببێتە ئەندامی سەرکردایەتی ئەوان، بو ئەوەی لە گەڵی بچنە شاخ و بەشداری بکەن لە هەڵگیرساندنەوەی شورش دا.

دەستەی دامەزرێنەر پەیڕەوێکی ناوخوی بو یەنک نوسی بو. هەمان پەیڕەو کرایە پەیڕەوی کارکردنی ڕێکخراوەیی هەمو یەنک. لیژنەی لقەکان و ناوچەکان ئەبو لە ٣ ئەندام پێک بێ؛ ١ ئەندامی کۆمەڵە، ١ ئەندامی بزوتنەوە و ، ١ ئەندامی خەتی گشتی. ئەمانە خەڵکیان لە پێش دا بو یەنک راتەکێشا و پاش ئاشنایەتی ئینجا بو یەکێ لەو ٣ ڕێکخراوە. سەرکردایەتی بزوتنەوە سور بو لە سەر ئەوەی کە ڕێکخستنی شارەکانیش تێکەڵاو بکرێن و، کومیتەی هاوبەشیان لێ پێک بهێنرێ. کۆمەڵە بەمە رازی نەبو.

ناوی بەرپرسی لقەکانی سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، بادینان و ئەندامەکانی دیاری کران. بو پڕکردنەوەی شوێنە بوشەکان زور جار خەڵکی را ئەهێنرانە پێشەوە شایستەی ئەو شوێنە نەبون. رەخنە و گازاندەی لە ناو ئەندامەکانی یەنک دا ئەخرۆشاند.

کۆبونەوەکان کە لە ٨/٣١ دا دەستی پێ کرد بو لە ١٩٧٧/٩/١٢ دا کوتایی هات.

مامجەلال «پلانی خەباتی» کۆبونەکانی بە عەرەبی نوسی. لە براەوست هیچ هویەکی چاپکردنمان لە لا نەبو، لە بەر ئەوە ناردمان بو سوریا. لەوێ چاپیان کرد و لە

«الشرارە» ش دا بلاویان کردەوە. بەلام ئەندامەکانی دەستەی دامەزرێنەر کە لە سوریا بون، هەندێ لەناوەکانی کە لە مسوودەی بەلاغەکەدا نوسرا بو، لەوانە ناوی ئەندامی مەکتەبی سیاسیهان، کوژاند بوەوە.

*

ئەوانەی لە نزیک مامجەلال بوبن بە تایبەتی ئەوانەی لە سوریاوە هات بوینەوە لە گەل بەرپرس و پێشمەرگەکانی کومەلە تاسایشی مامجەلال و بارەگەکەمان گرت بوە ئەستو. لە سەر پێشنیاری من، کوریکمان کرد بە لێپرسراوی بارەگەکەمان، بۆ دابەشکردنی ئەرکەکانی روژ و شەوی خەفارەت و حەراسەت و هەندێ جار کەمین، ناوی عەبدوللا بو.

عەبدوللا ئەیوت من مولازمی قوات خاصەم و هاوڕێکانی ئەنکاریان نەکرد کە ئەسلەن مولازم بو بێ. تورە و کەم چەکلانە بو. لە یەک سەعات دا چەند جاری تورە ئەبو خاو ئەبوەوە پی ئەکەنی لە پر ناوچەوانی ئەدا بە یەکاو تورە ئەبوەوە. روژیکیان لە ناو خومان دا وتمان: بو حالەتی نەفسی روژانەی عەبدوللا تەخمینە بەر لیکولینەوەی زانستی؟ لە سەر کاغەزیک جەدولی خەتی بەیانی مان دروست کرد.

- لایەکیان ٢٤ سەعاتەکەی روژمان سەعات بە سەعات نوسی بو،

- لاکەی تری حالەتی نەفسی عەبدوللامان تی دا رون کرد بوەوە. لە ناوەراستی خەتەکەدا ئاسایی و، بەرەوژوری زور خوشحال، خوشحال، کەم خوشحال و، بەرەو خواری زور تورە و، تورە، کەم تورە... لە ناو هەمو ئەو خانانەدا وردە حالەتی وەکو: پیکەنین، زەردەخەنە... مان دیاری کرد بو. چەند روژی د. خدر، حەسەن خوشناو، سەید کەریم و، من دەقیقە بە دەقیقە چاودێریمان ئەکرد و، لە سەر جەدوەلەکە تومارمان ئەکرد. کێرڤەکان بەرزبونەوە و دابەزینیکی سەیریان تی دا بو. بە گویرەی خواروخیچی کێرڤەکان ناچار ئەبوین روژانە بە جوری دابەشکردنی موفرەداتی جەدوەلەکەدا بچینەوە.

ئەو چەند روژەی ئەم لیکولینەوەیەمان ئەکرد لای کەس باسمان نەئەکرد لە بەر ئەوە بە سەلامەتی تەواو ئەبو. حەسەن خوشناو قسەی لە لا رانەئەوەستا. روژێکیان کاک عەلی بە میوانیمان هات بو. حەسەن سەرگورشتەکەی بو گێرابوەوە. کاک عەلیش حەزی بە سوعبەت و گالتەو قشقیات ئەکرد. عەبدوللای بانگ کرد و، پی ی وت: «ئەوانەی کومەلە پیت رائەبوێرن و بو گالتە تویان کردوە بە لێپرسراوی خویان». عەبدوللا جنێویکی سەرەوانە هەمو ئەوانەی پی ی رائەبوێرن و کەوتە «لەحدی» کەس ئاتوانی بەو رابوێری. کاک عەلی جەدولەکانی پیشان دا. عەبدوللا لە پێستی خوی دەرچو. هەرچی بە دەمی دا هات وتی. ئیمە وەکو ریک کەوت بوین لە ناو خومان دا کەسمان گویمان نەدایە قسەکانی

و تووڕە نەبوون. لە گوێی پێ نەدانەکەی ئێمە زیاتر تووڕە بوو. کاک عەلی ئەمەی بۆ خۆشکردنی بەزمەکە کرد بەڵام بە پێچەوانە شکایەوە. عەبدوڵڵا وازی هێنا و، ئێمەش کارەکەمان لێ تێکچوو. پاش چەند حەفتەیەک عەبدوڵڵا بە یەکجاری بێزار بوو لە پێشمەرگایەتی. گەڕایەوە سووریا و لە وێوە چوو بۆ ئەورووپا.

*

قم لە ناو تورکیا لە چەندین شوێن بنکەی دانا بوو. چەکدارەکانی بە درێژایی ناوچەکانی سنوور هاتوچۆیان ئەکرد. ئێلە کوردەکان، بە تایبەتی زۆری هێزەکانی ئێلی گەورەی ئەرتووشی و، گوێی هاوکارییان ئەکردن. پ د ک (تورکیە کوردستان دیموقرات پارتیسی) کە نیمچە نهێنی بوو وە لە ناو پیاوە دەسرۆیشتووەکانی کوردستانی تورکیادا نفووزی هەبوو زۆر بە توندی دوژمنایەتی یەنک ی ئەکرد. بە تورکی لە سەریان ئەنووسی و بڵاویان ئەکردەوە. لە نووسینەکانیان دا بە یەنک یان ئەگوت: «چاشی ٧٦». لە هەمان کات دا حیزبێکی سیاسی ئاشکرای ماوی کە ڕۆژنامەی «ئایدنلک»ی دەر ئەکرد دۆستەکانی یەنک و، شوێنی هاتوچوو و، ڕێگەکانی لە ڕۆژنامەکەی دا ئاشکرا ئەکرد. هەواڵەکانی بە ناڕاستەوخۆ ئەگەیاندەوە دەزگا جاسووسییەکانی تورکیا بە بیانووی ئەوەی یەنک «ئاژانی سۆڤیەتە».

چەکدارەکانی قم لە ناو گوندەکانی تورکیا و لە بادینان لە هەرجێیەک سووسەی دۆستێکی یەنکیان بکردایە ئازاریان ئەدا و زەبرییان لێ ئەدا بۆ ئەوەی لە یەنک ی دوور بخەنەوە. گەمارۆی بنکەکانی یەنکی دا بوو. نەی ئەهێشت خەڵکی ناوچەکە هاتوچۆیان بکەن. هەرکەسی کڕین و فرۆشتنی لە گەڵ بکردنایە، بە تایبەتی ئەگەر ئارد و ئازووقەی بۆ بکڕینایە، جگە لەوەی کەلوپەلەکانیان لێ ئەسەند سزاو ئازاری خۆیشیان ئەدا و، چەند جار ئەوانەیان لە ناو هەڵ کێشا.

کادر و پێشمەرگەکانیان لە هەمو جێ لە ناو گوندەکانی عێراق و تورکیا دژی یەنک و مامجەلال ئەدوان و، تاوانی ناڕاست و قسەی نارەوایان بە پاڵ ئەدان. لە دەرەوەش لە سووریا و، ئەورووپاو، ئەمریکا درێغییان نەئەکرد.

دوژمنایەتی قم لە گەڵ یەنک گەیشتە ڕادەیەک، لە هەر جێیەک بیان توانیایە بۆسەیان بۆ دائەنان، چەکیان ئەکردن و، ئەیان گرتن و سووکایەتییان پێ ئەکردن. سەرەنجام گەیشتە ئەوەی سەرلەنوێ دەستیان خستەوە خوێنی پێشمەرگەکانی یەنک.

لە چەند شوێنێکی تر کە چاری هێزەکانی یەکێتییان پێ نەئەکرا دەستیان لە گەڵ هێزەکانی جەیش تێکەڵاو ئەکرد و بە هاوکاری ئەوان دەستیان لە پێشمەرگەکانی یەنک

ئەوەشاند.

*

**داهێنانی ئەریتی جاش - پێشمەرگە**

لە چەند جێگا بەرپرسەکانی ق م خۆیان تەسلیمی حکومەت ئەکردەوە و، مەفرەزەی تایبەتییان دروست ئەکرد بۆ راوی پێشمەرگەکانی یەکێتی.

تەحسین شاوەیس، قادر فەرەج... بە فێڵ محەممەد غەفور ئاغجەلەرییان، بە ناوی هاوکارییەوە، بانگ کرد بۆ لای خۆیان، بۆ ئەوەی پێکەوە کاری هاوبەش بکەن. حەمە غەفور فەرماندەی دەستە چەکدارەکانی کەرکوک بو. شەوی ۹۷۷/۷/۲۳ هەمو پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەی یەکێتی یان لە گوندی «کانی بی» کوشت و، رۆژی دوایی هالیکۆپتەریان بۆ هات، بۆ گوێزانەوەی خۆیان و لاشەی کوژراوەکان. لە گەڵ حەمە غەفور ئەم پێشمەرگانە کوژران: ئەنوەر کەریم، ئەحمەد محەممەد، عەبدوللا تۆفیق، حەمید عەزیز، رەمەضان سەعید، رەضا عومەر.

هەر لەو دەوروبەرەدا خلەی رەشە بەحری، صابیری ئەحمەی مینە رەنان، حەمەخانی حاجی دارا، مەفرەزەی جاشیان دروست کرد بۆ شەڕی پێشمەرگەی یەکێتی.

ئەم ئەریتە دزیوە: «ئەریتی جاش - پێشمەرگە»، واتە لە پێشمەرگایەتییەوە بێن بە جاشی حکومەتی عێراق و، بە ئاشکرا شەڕی پێشمەرگەی یەکێتی و، بە نهێنی کار بۆ پارتی بکەن، کە ق م دای هێنا زۆر لە بەها پیرۆزەکانی کوردایەتی و شۆڕشگێڕیتی و پێشمەرگایەتی هەڵتەکاند.

*

**کوشتنی حەسەن خۆشناو**

دوای ئەمە ق م کەوتە هەوڵێکی زۆر بۆ هاندانی کوردەکانی تورکیا بە تایبەتی ئەو ناوچانەی رێگای کاروانی یەکێتی پی دا ئەڕۆیشت، بۆ گرتنی رێگاکە. بە دانیشتوانی ئەو ناوچانەیان وت بۆ تفەنگەکانیان و شتەکانیان بۆ خۆتان و سەریان بۆ ئێمە.

حەسەن خۆشناو جارێکی تر چو بۆ هەمان شوێن بۆ گوێزانەوەی وەجبەیەکی تر. بە سەرکەوتویی گەڕایەوە.

. ۱ دوشکاو وەجبەیەکی تر کلاشینکوف و داوودەرمانیان لە هەمان پەردەرەش دانا بو. چەند کەسێکیش لە سوریاوە گەیشت بون بێن بێن بە پێشمەرگە لەوانە چەند کوردێکی سوریاشیان تی دا بو. ئەمجارەش حەسەنیان راسپارد بچی بیانهێنێ. مەفرەزەیەکی تێکەڵاویشیان بۆ دروستکرد لە پێشمەرگەی هەرێمە جیاوازەکان. ئەمجارەیان ق م بە

هاوکاری دانیشتووانی ناوچەی راشیدان، بە تایبەتی خەڵکی گوندی باریان، لە بەیانی ١٣/١٠/١٩٧٧ دا بۆسەیەکی گەورەیان بۆ دانان.

حەسەن و ئەم پێشمەرگانەی لە گەڵی بوون کوژران: باهیر ئەحمەد (مهرەدی)، کەمال محەممەد حسێن (ماوەت)، نەجات نوورەدین (کەرکوک)، عەلی کوێخا هومەر (باوزیا)، خدر ئەحمەد (قەلادزێ)، عەبدولمەلیک بەرزنجی «سەرهەنگ» (توزخورماتو)، لە کوردەکانی سووریاش عەزیز چەرکەس و خالید و حسێن. چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بوون. ئەوانی تریان هەمو گرت و بە دیلی بردیانن بۆ گوندی شەمزینی تورکی لە سەر سنووری عێراق. کاروانەکەیان رووت کردەوە. بریندارەکانیان ئێمزن دایە بۆ ئەوەی چاری یەکیەتی پێ بترسێنن. ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو لە یەکیەتی یان دا. سەرلەنوێ ئاگری شەری ناوخۆی هەڵگیرسانەوە.

حەسەن خەڵکی گوندی زیارەتی خۆشناوەتی بوو. ئەفسەری یەک ئەستێرە بوو لە جەیشی عێراق دا. لە ریزی شۆرشی ئەیلول دا، لە هێزی کاوە، فەرماندەی بەتالیون بوو. کورێکی قسەخۆش، نوکتەباز، ئازا، سادە و راستگۆ بوو. من بە کوشتنی حەسەن زۆر نارەحەت بووم. لە هەمویان زیاتر هاوڕێ ی من بوو. ماوەیەکی درێژ حەسەن و سەید کەریم و من لە شام پێکەوە لە فلاتێک دا بووین. برایەتیمان زۆر بە هێز بوو. حەسەن بۆ من پشتیوانێکی جێگەی باوەر بوو.

دووبارە بوونەوەی ئەم رووداوە خوێناوییانە، دوای رووداوی کوشتنی ئیبراهیم عەزۆ و مەلەرمزەکانی بادینان و چاوپۆشینی یەکیەتی لە خوێنی ئەوانە و، دوای ئیمزا کردنی رێککەوتنی «هاوکاری مەیدانی» شام، کارێکی زۆر خراپی کردە سەر ورەی پێشمەرگەکانی ینک و، سەر دەروونی بەرپرسەکانی. قم بریاری دا بۆ ینک ئەحیلی بۆ ئەو مەبەستەش پەنای ئەبردە بەر هەمو رێگایەکی ناجوامێرانە. ینک کە بروای بە فرە - پارتی و ململانێی ئایدیولوجی و سیاسی هەبو، ئەیویست ئەزمونێکی تازەی ژیانی دیموکراتی و بووژاندنی پارتایەتی دابهێنێ، لە بەردەمی تاقی کردنەوەیەکی دژواردا بوو. مەیدان چۆڵ بکا بۆ قم و ئاشبەتاڵی لێ بکا، یان رابوەستێ و بەربەرچی قم بداتەوە؟ ئەم مەسەلەیە ئەوەندە کۆبوونەوەی لە سەر کراو، بریاری تێ دا درا و هەڵ وەشێنرایەوە، ئەو دوڵەی لێ ی بوون ناوی گوستە بو، لە ئەنجامی ئەو هەمو کۆبوونەوە بێ ئەنجامەدا ناوی «دوڵە گوستە» یان کرد بە «دوڵە لقە».

ینک لە لایەکەوە قورسایی رووبەروو بوونەوەی گوشاری جۆربەجۆری بەعسی لە سەر بو لە لایەکی ترەوە قورسایی دوژمنایەتی قم.

هەولەکانی یەنک بۆ پێکەوەژیان بە ئاشتی لە گەڵ ئەم سەری نەگرت. یەنک بڕیاری دەسکردنەوە و تەقەی کـردنی لەم ی دا. لەم لە سنووری تورکـیـا تەقە نەکـران. لەوی قولایەکی ستراتیجیان هەبوو. تیلە کوردەکانی ئەوی پشتیوانیی و، کاربەدەستانی تورک چاوپۆشییان لێ ئەکردن. بەلام لە مەلبەندی سوران لاواز بوون ئەگرا لەوی سزا بدرین.

رەسول مامەند بۆ گەشتی سیاسی چو بۆ سوریا و هەندی لە ولاتانی ئەوروپا. د. خالیدیش چو بۆ سەردانی خیزانەکەی لە شام. چەندین پێشمەرگەی بریندارش بۆ چارەسەر چون بۆ سوریا. ئەمانە هەموی بە ناو تورکیادا ئەرویشتن.

*

گفتوگو لە گەل بەعس

هەر لەم ماوەیەدا عیراق بە هۆی شێخ محەممەدی لولانەوە وەلامی بۆ سەرکردایەتی یەنک نارد بۆ گفتوگۆ. سەرکردایەتی بزوتنەوە هەر لە سەرەتاوە کە هات بونە شاخ، بە هیوا بون ئەوە بیبەنە گوشاری بۆ سەر بەعس و ناچار بی بۆ گفتوگۆ و ریک کەوتن. ئەمەیان لە بەیانیکی دریژا بە عـەرەبی لە لوبنان و دەرەوەی ولات راگـەیاند بو. بەرپرسـەکـانی تری بزوتنەوە لە کوبونەوەکانی ک س ـ یەنک دا بیروبوچونی خویان دەربارەی گفتوگو لە گەل سەرکردایەتی عیراقی نەئەشاردەوە. راستیەکەی سەرکردایەتی یەکیتی پێش ئەوی ئەتوانی بە ئاسانی داوایەکی عیراقی بو دەسپیکردنی گفتوگو بو چارەسەرکردنی بە ئاشتی کیروگرفتی کـورد لە عـیـراق دا رەت بکاتەوە. رەتکردنەوەی باسـیـکی لەو بابەتە بیـانوی ئەدا بە کەسانیکی تر. سەرکردایەتی یەنک تاوانبار بکەن بەوەی کە شەر بو سوریا ئەکەن نەک بو کورد، ئەگینا ئەگەر عیراق ئامادە بی بە ئاشتی بیتە پیشەوە ئەبی سەرکردایەتی یەنک بوچی رەتی بکاتەوە؟

سەرکردایەتی عیراقی لە کاغەزیکی سپی بی سەرناو و بی ئیمزا بە مەرەکەبیکی سەوز بە خەتی صدام حسین ئەم چەند نوقطەیەی نارد بو:

«ان الخط العام الذي تنهجه الثورة في معالجة المسألة الكردية وبناء مؤسسات الحكم الذاتي خط صحيح ولا تراجع عنه، والثورة متوجه بشكل مبدئي وجدي في تطوير مؤسسات الحكم الذاتي وممارساتها. ومن الامور الطبيعية ان ترافق الاعمال الكبيرة والمعقدة كالحكم الذاتي ومعالجة القضية الكردية بعض الاخطاء، غير ان القسم الاكبر من هذه الاخطاء سببه ... ومنها انتم.

نعلن استعدادنا للعفو عنكم و عن من هم بمعيتكم و تاريخ التعامل يؤكد التزامنا بوعدنا و ابتعادنا عن اساليب الغدر

ان الاطلاع على وجهه نظركم في المسائل السياسيه ودرجه تفاعلنا معها ترتبط بتغيير موقفكم وموقعكم المضاد من السلطه

لن الفرص المتاحه لكم في المساهمه في البناء والتفاعل مع الثوره وموقفنا نحن من التفاعل لا يمكن تصورها الا عندما تكونوا مواطنين صالحين تعمرون وتثبتون بجديه عن رغبتكم في العمل من اجل البناء المشترك بناء العراق الواحد الاشتراكي القوي

ان ماضي العلاقه مع جلال وماضي علي العسكري يتيحان فرصا جديه لبناء علاقات من شأنها خدمه شعبنا العراقي بعربه و اكراده

نؤكد ان الفرص المتاحه لكم الان قد لا تتوفر في المستقبل وعلينا ان نتعظ بالماضي القريب»

له پاش زنجیرەیەک کۆبوونەوە، کە تەک هەر ئەنداماەکانی سەرکردایەتی، بەلکو هەمو ئەو کادر و فەرماندەی کەوت و مەفرەزانەی لە پرادوست بون بەشدار بون، بریار درا گفتوگۆ لە گەڵ عیراق بکری. بۆ ئەو مەبەستەش مامجەلال، علی عەسکەری و عومەر عەبدوللا چون بۆ لولان. وا بریار بو ئەگەر پەیوەستی کرد بو چون بۆ بەغدا بۆ دیتنی سەرکۆمار ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر - مامجەلال و، بۆ دیتنی جیگری سەرکۆمار صەددام حسین - علی عەسکەری و، بۆ دیتنی خوار ئەوان - عومەر عەبدوللا بچی. بۆ ئەوەی بهانوی گلدرانەوەش نەبی لە پەکی زیاتر نەچی. لە لایەن ک س - ینک بە هەمان شیوەی حکومەت خوی کاغەزیکی بی سەرناو و بی ئیمزا نوسرا کە بدری بە کاربەدەستان:

« اولا - ان العراق يستطيع القيام بدوره في حركه الامه العربيه المجيده في نضالها ضد الامبرياليه والصهيونيه والرجعيه في تحرير فلسطين وصيانه الخليج العربي. ولكي يستطيع العراق اداء دوره القومي يجب عليه:

١. تعزيز وحده الشعب العراقي الوطنيه التي تشكل الاخوه العربيه الكرديه حجر الزاويه فيها.

٢. وحده القوى التقدميه العراقيه واتحاد تياراتها الاساسيه (الحقيقيه و الفاعله) في نضالها الموحد.

٣. اطلاق الحريات الديمقراطيه بما فيها حريه العمل السياسي للاتحاد الوطني الكردستاني.

٤. اخذ العراق بمبادره عربيه جديده في الدعوه الى جبهه عربيه تضم العراق، سوريه، منظمه التحرير الفلسطينيه، اليمن الديمقراطيه، ليبيا، الجزائر لتصدي المؤامره الاستعماريه الصهيونيه.

٥. تعبئة العراق المادية والعسكرية لزجها في معركة الامة العربية ضد العدوان الصهيوني الاستعماري

٦. التنسيق مع القوى والدول العربية دفاعا عن الخليج العربي.

٧. دعم الثورة الفلسطينية بجميع فصائلها حتى تحقق التحرير التام الكامل للتراب الفلسطيني.

ثانيا - المعالجة الاتية للمشكلة الكردية:

١. انهاء سياسة التهجير وتغيير المعالم القومية واعادة جميع المهجرين الى اماكنهم.

٢. تنفيذ جميع بنود اذار وتطبيق قانون الحكم الذاتي على ايدي ممثلي الشعب الكردي وتطويره.

٣. اطلاق سراح جميع المحكومين والموقوفين.

٤. تخويل القوى التقدمية الكردية مهمة الدفاع عن الحدود العراقية في المنطقة الكردية.»

عەلی عەسکەری لە تشرینی دوەمی ٧٧ دا لە لولانەوە بە هەلیکوپتەر براپە «نادی عەسکەری کەرکوک» و، لەویشەوە راستەوخۆ بۆ بەغداد. لە بەغداد سەعدون شاکیر سەرۆکی جیهازی مخابرات و، عەدنان خەیروللا وەزیری دیفاع و چەند کەسێکی تری لە کاربەدەستانی بەعس دی بوو. لە دوای هەموویان صەددام حسێن، کە زۆر بە راشکاوی وت بوی، دوایین بریار لە دەس خۆیایەتی. جولانەوەی کورد لەو کاتەدا لاواز بوو. لە ناوەوە هەرەسی هێنا بوو. سەرباری ئەوەش تووشی ناکۆکی دوژمنانەی ناوخۆیی بو بوو. لە دەرەوەش دوستێکی ئەوتوی نەبو لە سەری هەڵ بدانی و پشتیوانی بکات. لە بەر ئەوە ئەبو «بەغلەد بەرەی خۆی پی رابکیشی». خواستەکانی کورد کەم و سادە و رەوا بون. زمانی نوسین و دەربڕینەکانیشی، لە مەسەلەی عەرەبی و فەلەستینی دا، لە هی بەعسیەکان دور نەبو، بگرە لە وانیشی تی پەڕاند بو. هەندی لەوەش بو راکیشانی فەلەستینیەکان بو کە ئەوانیش زور بو بەعس بهێنن؛ کیشەی کورد چارەسەر بکات.

صەددام خواستە گرنگ و سەرەکیەکانی رەت کرد بوەوە. وت بوی راگویزانی دیهاتەکانی سنور پیوەندی بە ئاسایشی عیراق و پاشەروژیەوە هەیە، لە بەر ئەوە ئەگەر هەمو جیهێشی عیراقی تیادەش بێ هەر جی بەجیی ئەکەین.

گفتوگو سەری نەگرت. عەلی عەسکەری گەڕایەوە برادۆست. هەمو سەفەرەکە ٣ روژی خایاند.

لایەنەکانی «التجمع الوطنی العراقی» و، کاربەدەستانی سوری و لیبی لەم

گفتوگۆیە دڵگران بوون. بە توندی هێرشیان کردە سەر یەنک. تاوانباریان کرد بە پەیمانشکێنی. چونکە ئەبوو یەنک درێژە بە خەبات بدا و هەرگیز گفتوگۆ نەکا تا ڕژێمی دیکتاتۆری عیراق ئەڕوخێنی. لەم پێش کەرەسەیەکی باشی دەست کەوت بۆ دووبارەکردنەوەی پەلامارەکانی بۆ سەر یەنک.

یەنک ئەندام بو لە «التجمع الوطني العراقي»دا. لە کاتێکدا یەنک بڕیاری دەس پێ کردنەوەی خەباتی چەکداری دا، وا بڕیار بو ئەوانیش هەم لە کوردستان بەشداری بکەن؛ مەفرەزەی چەکدار بنێرن، هەم لە ناوەڕاست و خوارووی عیراق دا ئەوانیش خەباتی چەکدارەدس پێ بکەن. وا بڕیار بو بەشێکی پێویستییەکانی پێشمەرگەی کوردستان ئەوان دابینی بکەن. تجمع لە سوریا و لیبیا و لە ناو کوڕە عەرەبی و جیهانییەکان دا خۆی بە چالاکییەکانی یەنک وە هەڵ ئەکێشا، بەڵام هیچکام لە بەڵێن و گفت و ئیلتیزاماتی خۆی بە جێ نە هێنا بو. پەیوەستە بە جێبەجێنانی ئیلتیزامات لە هەردوو لاوە بێ، نەک لایەک هیچ ئیلتیزامێکی خۆی بە جێ نەهێنێ کەچی داوا لە لاکەی تر بکا هەمو ئیلتیزاماتی خۆی جێ بە جێ بکات.

سورییەکان کە ئەوەندە دژی گفتوگۆی یەنک ـ بەعس بون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، زۆری نەخایان خۆیان کەوتنە گفتوگۆی دو قۆلی لەگەڵ سەرکردایەتی عیراق بۆ یەکخستنی هەردو حیزب و هەردو جەیش و هەردو دەوڵەت.

سەرکردەکانی ئەو لایەنە فلەستینییانەش کە دژی ئەم کارەیان نوسی بو: زۆری پێ نەچو خۆیان لە بەغدا بون بە لایەنی گفتوگۆ لە گەڵ بەعس.

بە واتایەکی تر بۆ خۆیان هەمو شت ئەشێ، بەڵام بۆ کورد ناشێ!

ئاسایی کردنەوەی پەیوەندییەکان ماوەیەکی خایان.

فەریق ڕوکن اسماعیل تایە النعیمی، قائیدی ئەسای فەیلەقی یەکی جەیشی عیراق لە کتێبەکەی دا: «تجربتي في القيادة، الجزء الاول، دائرة التدريب، مديرية التطوير القتالي، تشرين اول ١٩٨٥»، لە ژێر سەرناوی «علي العسكري يسلم ويواجه المسؤلين» نوسیویتی:

«٣٩٨. كان علي العسكري من قادة العصاة وهو ينتمي الى جماعة الطلباني الذين يعادون زمرة الملا مصطفى البرزاني، لقد اشتغل هذا الرجل بامرتي عندما كان جلال الطلباني يعمل الى جانب الحكومة عام ١٩٦٩ عندما كنت قائدا للفرقة الثانية وكنت اعرفه جيدا فهو مقاتل شجاع وشريف لذا فقد وجهت جهود استخبارات الفيلق من اجل اعادة علي العسكري الى الصف الوطني لقد بذل العميد الركن محمد زهاد ضابط استخبارات الفيلق جهدا في ذلك

وكانت هنالك اتصالات مع علي العسكري بواسطة محمد رشيد لولان وفي احد الايام زارني محمد رشيد لولان في كركوك واخبرني ان علي العسكري سوف يسلم الى السلطة الوطنية بعد اعطاء كلام من قبلي وفعلا تم اتخاذ الموافقات من المراجع العسكرية والسياسية حول هذه الخطوة وارسلت له رسالة وبعد فترة عاد علي العسكري واستصحبته الى بغداد حيث واجه السيد وزير الدفاع الفريق الاول الركن عدنان خيرالله والفريق الاول الركن عبدالجبار خليل شنشل رئيس اركان الجيش ثم بعد ذلك زار المسؤولين في القيادة السياسية وقد علمت انه قدم طلبات الى القيادة السياسية والتي يمكن اعتبارها شروط ولذلك عاد ثانية الى المنطقة الشمالية وقد اخبرني بعد ذلك انه سيعود ثانية ولكن يظهر انه لم يستطع اقناع جماعة الطلباني بالعودة الى جانب السلطة وانهاء العصيان مع العلم ان اتفاق الجزائر قد اثبت عمالة العصيان في شمال الوطن الى الاستعمار والصهيونية.... »

ئەم گێڕانەوەیەی ئەلنعیمی لەری بەسەر راستییەوە نیە. هەرچی لەوی دا نوسیویەتی دەربارەی عەلی عەسکەری درۆی هەڵبەستراوی خۆیەتی. ئەمەی لەرەدا نوسراوەتەوە هەردو «ورقە عمل» ی یەعسی و کوردی بو، کە پێنچینەی سەفەرەکەی عەلی عەسکەری و گفتوگۆکانی بو لە گەڵ کاربەدەستانی ئەوسای عێراق لەوانە: صەددام حسێن. ئەم بەلگەنامانە کاتی خۆی لە سوریا و لوبنان و هەندێ شوێنی تردا بڵاو کراونەتەوە.

ئەلنعیمی ئەو درۆیانەی بۆ زلکردنی خۆی و سوک کردنی کاک عەلی نوسیوە. یەکی لە ئوسلوبە نزمەکانی سەرکردەکانی جەیشی عێراق و دەزگای «ئیستیخباراتی عەسکەری» بۆ زڕاندنی ناوی کەلەپیاوەکانی مێژوی کورد و شێواندنی ناوبانگیان هەڵبەستنی قسەی ناراست و درۆی بێ بناغەیە. بێگومان رۆژێ لە رۆژان ئارشیفی نهێنی عێراقیش بۆ پشکنین و لێکۆڵینەوەی زانستی ئەکرێتەوە.

ئەلنعیمی پیاوێکی درۆزنی بێ بەڵێنە. هەر ئەم بۆ دەستی کاک عەلی و هاورێکانی بری، کە ئەوسا لە تەهران بون و، دوایی بزوتنەوەیان پێک هێنا. بەڵێنی پێ دان کە ئەگەر بگەڕێنەوە عێراق، یەعس ماوەیان ئەدا سەر لە نوێ پارتی دیموکراتی کوردستان رێک بخەنەوە و، بەشدار ئەکرێن لە داوودەزگاکانی حکومەت و حوکمی زاتی دا. کە گەڕانەوە چالاکیی سیاسییان لێ قەدەغە کردن و، وەکو ئاوارەی ناو دەرک هەر یەکەیان بە لایەک دا بڵاو کردەوە. کاک عەلی یان کرد بە سەرۆکی شارەوانی «رمادی» لە خوارووی عێراق.

ئەلنعیمی بۆ پاراستنی پلەوپایەکانی خۆی زۆری چاپلوسی درو بۆ صەددام ئەکرد و، لە جەنگی ئێران دا کورێکی کوژرا، لە بەر ئەوە ناوی لە خۆی نا بۆ «ئەبولشەهید».

بەڵام ئەمانە هیچی دادیان نەدا، سەددام بۆ ئەوەی سووکی بکا، کرد بووی بە سەرکردەی ئەیلەکی پیر و پەککەوتەکان. خۆیشی زۆری پێ خۆش بوو.

کە عەلی عەسکەری لە بەغدا گەڕابوەوە، گفتوگۆکە بە ئەنجامێکی باش نەگەیشت. حکومەت هەڕەشەیان لە شێخ محەممەد کرد بوو کە ئەگەر هێزەکانی یەکێتی ناوچەکەی ئەوان بەجێ نەهێڵن وەکو شێخ محەممەد نووسی بووی: هێزەکانی حکومەتی عێراق «تەیارەیەکی بە شەددەت» ئەکاتە سەر گوندەکانی ئەوان. بۆ ئەوەی گوندەکانی برادۆست تووشی زەرەر و زیان نەبن هەموومان چووینە گوندەکانی گارە، گەڵەشم، مەلایان... لە بەری تورکیا، چونکە چاوەڕوانی گەیشتنی وەجبەیەک چەک و گەڕانەوەی هەندێ لە هەڤاڵانی دەرەوە بووین.

*

خەوی گران

تەنیا پزیشک لە ناو هێزەکەمان دا د. خدر مەعسووم بوو. لە بەر ئەوە ئەرخەیەکی زۆری هەبوو بۆ ئێمە. شەرکەر بە ئاسانی پەیدا ئەکرا، بەڵام پزیشک بە ئاسانی دەس نەئەکەوت.

جاریکیان هەموو ڕۆژەکەی بە شاخێکەوە بووین ڕۆژمان بە سەر ئەبرد تا بیی بە ئێوارەو دابەزینە ناو ئاوایی. پرسێتی تەنی بۆ هێنام. پرسیم کێ شتێکی پێ یە پەتاتی بیخۆم. کاک عەلی وتی هەندێ «معلبات»مان پێ یە. یەکێکیان «پاپرلخی قوتو»ی دەسکردی تورکیا بوو. لە شوێنێکی وەها و کاتێکی وەهادا ئەمە یەکێ لە خواردنە نایابە خۆشەکان بوو. دەستم کرد بە خواردنی. ئێوارە چووینە ناو گوند. دوای شێو و قسە کردن جێ ڕاخرا بۆ نوستن. جگە لە ئێشکگرەکان ئەوانی تر هەموو نوستن. مامجەلال و کاک عەلیش لە هەمان ژووردا بوون.

لە پڕ پێستی سەرم، پێستی ورگ و بن باخەڵ و هەموو شوێنە ناسکەکانی لەشم، کەوتە خوورویەکی بێ ئەندازە. هەموی بوبو بە لیر. ئارامم لە بەر بڕا بوو. سکم پێچی زۆر بە ئازاری پێ دا ئەهات. کەوتمە ڕشانەوە و ڕەوانی. چەند جاری د. خدرم خەبەر کردەوە، ئەیوت: «هەستە نەخۆشم چارێکم بکە!». بەتانییەکەی ئەدایەوە بە سەر خۆی دا. ئەیوت: «بڕۆ تا بەیانی چاک ئەبی». توومەز د. خدر شەکەت و خەوگران بوو. بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ وەڵام ئەداتەوە. وازم لەو هێناو تەسلیمی چارەنوس بووم. شەوێکی سەختی پڕ ئازارم بە سەر برد. بەڵام ئیتر بەرەو چاکبوونەوە ئەچووم. بەیانی د. خدر بینیمی بە گلەییەوە وتی: «بۆچی منت هەڵنەستاند!». باسەکەم بۆ گێڕایەوە بە شەرمەوە گوێ ی

لی ڕاگرت.

دوای ئەوەش چەند جارێکی تر کە خواردنی ناو فڕۆکەم ئەخوارد تووشی هەمان دەرد وات: «تسمم» ئەبووم. لەو ساوە ئیتر لە ناخۆشترین هەلومەرجی ژیان دا نان و ئاوم ئەخوارد و دەمم لە خواردنی فڕۆکە نەئەدا.

*

جوورجان یا دوورجان خۆیان بە گوندیان دائەنا بەڵام لە ڕاستی دا بە گوند دائەنرێ. دوو یا سێ ماڵ بوو. خدری مەلا عەزیز و براکەی لەوێ ئەژیان. لە چاو زۆربەی ئێمە و کەسی ئەوان و، توانای داراییان دا هەتا بڵێی میوانپەروەر و نانبدە بوون.

چەند ڕۆژێ ئێمە: د. خدر مەعسوم، شەوکەتی حاجی موشیر، قادر جەباری، من... لە ژوورێکی ماڵەکەی ئەودا بووین. شەوێکی پایز کردی بە ڕەهێڵەی بارانی سەر بە کلاو. ژوورەکەمان کەوتە دڵۆپە. کەس نەیئەتوانی بنوێ. لە هەمو لایەکەوە دڵۆپە ئەهاتە خوارێ. ناچار هەموومان دەرپەڕین بانەکە بگێڕین و درزەکانی بشێلین. د. خدر، ئەگەرچی لە چەند لاوە دڵۆپە لێی ئەدا، لە ناو جێگاکەی نەبزووت و نەهاتە دەرێ. بیرم نەماوە شەوکەت بوو یا یەکێکی تر تیرەی ژنی وتی: «هەستە لە کوردەواری ئەڵێن ئەوەی دڵۆپە قبووڵ بکا کەوادیش قبووڵ ئەکا». د. خدر لە جێگاکەی نەهاتە دەرێ. بە دەم خەوەوە وتی: «هەڵناستم و من هەردووکی قبووڵ ئەکەم». ئەو شەوەم بیر هاتەوە، کە خەریک بوو بە تسمم ئەمردم و چی لە گەڵ خەریک بووین لە خەو هەڵنەستا. ئینجا تێ گەیشتم لە لای هەندێ کەس خەو چەند خۆشە و، بە ڕاستی زانیم کە هەڵنەستانەکەی «لاشعوری» بوو، نەک «متعمد».

د. خدر لە زانستگای «عین شمس» ی «قاهیرە» پزیشکی خوێند بوو. ماوەیەک لە پێش ئاشبەتاڵ دا لە مەرگەسوور پزیشکی کرد بوو. وازی لە هەمو خۆشییەکی قاهیرە و عێراق هێنا بوو. کابرایەکی بە وزە بوو بە هەستانێکی پڕ لە کەرەستەی پزیشکییەوە بەو کێوانە گاڵتەجاڕییەوە بەرەنگاری هەمو ناخۆشییەکان ئەبووەوە.

*

چەک و گەڕانەوەی هەندێ لە کادرەکان

ئەو چەند ڕۆژەی مانگی تشرینی دووەم کە لە گارە و گەڵێشم چاوەڕێ بووین دوو کاری خۆش بە دوای یەک دا هاتن:

یەکەمیان، کاک خالید، ڕەسوڵ، لە گەڵ ئەوانیش د. کەمال خۆشناو، د. مەحموود، شەمسەدین موفتی، قادر جەباری، مستەفا چاوڕەش گەڕانەوە کوردستان. سالار بوو گەشتی

سیاسی چو بو ئەورووپا، ئارامیش، تا شەهید کرا، لە قەرەداغ نەجولا. مەکتەبی سیاسی نوێنەری کۆمەڵەی تێ دا نەبو. ئازاد هەورامی مابوەوە لە گەڵ مام جەلال بو ئەوەی نوێنەرایەتی کۆمەڵە بکا.

دوەمیان، چوارتەن و نیو چەک و تەقەمەنی مان پێ گەیشت. وایان ڕێک خست بو بە لوری هەتا نزیک خومان بیهێنن. قورسایی چەک و تەقەمەنیەکە چوار تەن و نیو بو. خستبویانە ژێر چەند تەنیک ئارد و مەعکەرونیەوە. ئەم لوریە بەهزادی لە گەڵ هات بو. بەهزاد نامەیەکی نارد نوسی بوی کە لوریەکەیان لە هەورازەکەی نێوان گەوەر - شەمزینان گیری خواردوە، ئەگەر پێی را نەگەین شوفێرەکە کەلوپەلەکە فڕێ ئەدا و ئەگەڕێتەوە. چەند وەخت بو ئیمە چاوەڕوانی ئەم بارە بوین. گرنگیەکی ژیانی هەبو هەم بو چەکدارکردنی هەریمەکان و، هەم بو بەرزکردنەوەی وورەی پێشمەرگە.

لە چاو برادەرەکانی تردا من لە هەمویان باشتر شارەزای ناوچەکە و ڕێگاوبانەکانی بوبوم. کاک خالیدیش لە هەمومان زیاتر پەرۆشی هێنانی چەکەکانی بو. پێشتر چەند وەجبەیەک چەکمان هێنا بو، هەندێکی من خوم هێنا بوم، بەڵام هیچی بەر من نەکەوت بو. کاک خالید لە منی پرسی چون تەگبیری هێنانی بکەین. منیش وتم: «من چەکم ناوێ، کێ بە تەمای چەکە با ئەو بچی بیهێنێ». هەندێ لە بەرپرسەکان خۆیان لە قەرەی هیچ کارێ نەئەدا ماندوبون یا مەترسی تێ دا بوایە. کاک خالید زور بە سەرەم دا هات کە نابێ من قسەی وا بکەم و، لە گەڵم خەریک بو تا قانیعی کردم بچین چەکەکان بگوێزینەوە. من پێشنیارم کرد کە هەمو هێزەکەمان بکەین بە دو بەشەوە. بەشێکی کەمی لە گەڵ ئەو و من بە تراکتور بچین بو لای لوریەکە. بو ئەوەی ئەگەر لوریەکە پەکی کەوت بو لە پەنایەک دا چەکەکان داگرین و پارێزگاری بکەین. بەشەکەی تری بە پێ بێن و، هەر کەسە چەکێ یا زیاتر بە کول هەلبگری تا ئەیگەیەنێتە شوێنێکی ئەمین.

کاک خالید و من نزیکەی ٤٠ کەسمان لە پێشمەرگە وریاکان هەلبژارد. بە تراکتور رویشتین تا گەیشتینە لای لوریەکە. زور لە شوفێرەکە پاراینەوە هەول بدا لوریەکە لێ بخوڕێ، گوێ ی لێ نەگرتین، وتی سەر ناکەوی و، من لوریەکەم بابی ئەوەندە ملیون بانقەنوتە ئەگەر ڕوژ بیبینەوە خوم و لوریەکەم ئەگیرێین و مالمان وێران ئەبێ، لە بەر ئەوە شتەکانی خوتان داگرن و من ئەگەڕێمەوە. قسەکانی ڕاست بون. زوری لە گەڵ خەریک بوین وتمان: «چارەنوسی کوردستانی عێراق بەمەوە بەستراوە ئەگەر ئەگاتە دەست پێشمەرگە لەوانەیە جولانەوەکەمان بشکێ...» لەم بابەتە زورمان بو وت، بەڵام ئەو هیچی نەبیست. سەیرمان کرد ئەگەر وا بڕوا ڕوژمان لێ ئەبێتەوە. ناچار کەلوپەلی

لۆرییەکەمان لێ سەند و بە پێشمەرگەیەکی شارەزامان وت هەوڵی لێخوڕینی بدا. پێشمەرگەکە لۆرییەکەی خستەوە گەڕ بەڵام چی هەوڵی دا سەرنەکەوت. وتی: «بارەکەی گرانە بۆیە سەر ناکەوێ، ئەگەر بارەکەی سووک بکەن ئەڕوا». چەند کەسێکمان سەر خست زۆری فەردە نارد و مەعکەرۆنییەکەیان فڕێ دا و، لۆری سەرکەوت. شۆفێرەکە لە ناو لۆرییەکەی هاواری ئەکرد و رازی بۆ خۆی بۆمان لێ بخوڕی. منیش لە تەنیشتییەوە سوار بووم و ۲۰ کەسێک سواری لۆرییەکە بوون. ترسمان هەبوو توشی جەندرمەی تورک بین. لۆری بەڕێ کەوت بەرەو گەلییشم. بە سەلامەتی گەیشت. کابرای شۆفێر هەندێ جنێوی دا بە خۆی و، بەوەی نارد بوی. سوێندی خوارد: هەتا ماوە «کوردینی» ئەکا. جوابیان بۆ ئەو هێزە نارد کە بە پێ بەڕێ کەوت بوون بگەڕێنەوە. ئەگەرچی هەموویان شەکەت بووبوون و، بەو سەرمایە چونکە دوسێ جار لە ڕووبارێکی ساردیان دابوو، گورد بووبوون، بەڵام کە چەکەکانیان بینی لە بن دیوارێکا هەڵپەسێردرا بوون، هەموو بوژانەوە. ئیتر هەر یەکە شتێکی لێ هەڵگرت بۆ ئەوەی بە تەواوی لە مەترسی تورک دووری بخەینەوە.

دابەشکردنی چەک هەمیشە بوتە هۆی دروستکردنی کێشە. لە بەر ئەوەی بەشی پێویستییەکانی هەموانی نەئەکرد و، هەرکەسێش ناوچەکەی خۆی و، پێشمەرگەکانی خۆی بە پێویستتر یا شایانتر ئەزانی لە هی ئەوانی تر، زۆر جار لە پاتی ئەوەی ببێ بە هۆی سوپاس و پێزانین و خۆشی بینینی، توڕەبوون و توران و، گلەیی و گازاندەی ئەخولقاند.

چەکەکان بریتی بوون لە: کلاشینکۆف، ئارپیجی ۷، دیکتاریوف، هاوەنی ۶۰ ملیم، مینی دژی تانک، نیشەک، نارنجۆک، دووربین... بە سەر بەرپرس و هەرێمەکان دا دابەش کرا. ۲۰ کلاشینکۆف و ۵ ئارپیجی ۷ بەر هەرێمەکەی من کەوت. ئیتر خۆم ئامادە کرد بەرەو ناوچەی کاری خۆم بگەڕێمەوە.

*

ئیسماعیل نەعیمی ۱ ساڵ و ۲ مانگ سەرکردەی فەیلەقی یەک بو. ستراتیجی تازەی دانا و، هێزی ۱۰ لیوای عەسکەر خرا بوە بەردەس. ژمارەی پێشمەرگە لەو سەردەمەدا هیچ کاتی لە ۱۵۰۰ کەس تێ نەئەپەڕی. کەچی بەو هەموو توانایەوە کە خرا بوە بەردەستی و، بەو هەموو دەسەڵاتەوە کە درا بوویە و، بەو هەموو پشتیوانییەوە کە لە لایەن سەرکردایەتی بەعسەوە لێ ی ئەکرا، نەک هەر نەیتوانی جوڵانەوەکە بکوژێنێتەوە، بەڵکو جوڵانەوەکە - سەرەڕای هەموو گیروگرفتەکانی ناوخۆی - تا ئەهات زیاتر پەرەی ئەسەند و، تەشەنەی ئەکرد و، پشتیوانی لە ناو خەڵک دا زۆرتر ئەبو.

نەعیمی یش، بۆ پاساودانی سەرنەکەوتنی خۆی، وەکو هەموو سەرکردەکانی تری

بەعس و جەیش، هۆی مانی جولانەوەکە ئەماندوە بۆ بیگانە، لەم رووەوە نووسیویتی: «...

...والسؤال الذي يطرح نفسه هل نستطيع القضاء على العصيان لو استمرينا بتطبيق الستراتيجية التي وضعناها لو استمريت في قيادة الفيلق لسنين اخرى؟

فاقول ان العصيان اصبح دوليا ومرتبط بالدول الطامعة في الوطن العربي واخضاعه لسياسة مناطق النفوذ وبما ان العراق بقيادة حزب البعث العربي الاشتراكي ينتهج سياسة مستقلة ويهدف الى توحيد الوطن العربي وتخليصه من مناطق النفوذ الاجنبية فان العصيان الذي تحركه الايادي الاجنبية وبعض الدول المجاورة الطامعة في العراق سيستمر...».

لە چەند جێگایەکی تردا کە باسی سەرنەکەوتنی خۆی ئەکا هۆیەکەی ئەماندوە بۆ بیگانە: ئێران و، ئەلێ بنکەکانیان لە ئێرانە و لە ئێرانەوە یارمەتییان بۆ دێ. ئەم قسەیەی ئەمیش راست نیە و، خۆیشی ئەزانێ درۆیە. لەو کاتەدا سوریا و لیبیا پشتیوانیان لە یەکێتی و، ئێران پشتیوانی لە عیراق ئەکرد. سوریا و لیبیا لە لایەک و، ئێران لە لایەکی ترەوە دوژمنی یەکتری بون. ئێران ساوەی بە یەکێتی نەئەدا هیچ بنکەیەک لە ئێران دا دابمەزرێنی و، هیچ یارمەتییەکی نەئەدا. ئێران دوژمنایەتی یەکێتی و جولانەوەکەی ئەکرد و، بە گوێرەی ریککەوتنی جەزائیر هاوکاری لە گەڵ عیراق ئەکرد. جەنەراڵ ئەزهاری، سەرۆکی ستادی ئەرتەشی ئێران، لە ١٩٧٨ دا سەردانی عیراقی کرد و، لە گەڵ سەرکردەکانی جەیش کۆبووەوە، بە تایبەتی سەردانی فەیلەقی ١ ی کرد و، لە گەڵ ئەمیش دانیشت. هەر بۆ ئەم مەبەستە:

١. لە هەمو شارە سنورییەکان، لە شنۆ وە تا قەسری شیرین و، لە خانەقینەوە تا سیدەکان «لجان التنسیق العسکری» بۆ هاوکاری سپایی ئێران و عیراق دروست کرا بو.

٢. زانیاری و ئاگادارییان لە سەر جولانەوەکە ئەدا بە یەکتری.

٣. ئێران هەر تێکۆشەر و پێشمەرگەیەکی یەکێتی ئەگرت تەسلیمی عیراقی ئەکردەوە.

٤. ئێران چاوپۆشی لە هێزەکانی عیراق ئەکرد ئاسمان و ئەرزی ئێران بە کار بهێنن بۆ پشت گرتن لە پێشمەرگە و پەلاماردانی لە ناکاو، هەروەها بۆ راگوێزانی گوندەکانی سنور.

ساواک و، حکومەتی ئێران، چاوپۆشییان لە بنەماڵەی بارزانی کرد کە: ق م دابمەزرێنیتەوە، هەندێ لە کادرەکانی لە ئێرانەوە بنێری بۆ عیراق و تورکیا و ئەوروپا و ئەمەریکا، هێزەکانی بە ناو خاکی ئێران دا بڕوا و، بنکە لە نوکان (لای سەردەشت) و، دزلی (لای مەریوان) دابمەزرێنن. بەلام ئەمە بۆ یارمەتیدانی کورد نەبو بەڵکو بۆ ئەوە بو

ملوزمەیکی کوردی بۆ یەکیەتی دروست بکەن. ناکۆکی و ناتەبایی و شەر بخاتە ناو ریزەکانی جولانەوەی کوردەوە.

*

چۆلکردنی برادوست

ساڵ بەرەو زستان ئەچوو. هەوا سارد ئەبوو. وەرزی باران و بەفر نزیک ئەبووەوە. هێزەکانی یەکێتی خانو و پێخەف و رایەخ و خەمرەتیان نەبوو. ئازوقە زۆر بە زەحمەت و بە گران دەست ئەکەوت. زستانان ریگاوبانەکان ئەبەستران ئەبوو لە پایزەوە زەخیرەی خواردن و سووتەمەنی بکڕی. هاتوچۆ کردن زۆر کەم ئەبووەوە. توانای دارایی یەکێتی کز بوو. نەی ئەتوانی پێویستیەکانی چەند مانگێکی هەمو هێزەکە دابین بکا.

مانەوەی بە کۆمەڵی هەمو هێزەکە لە برادوست کارێکی راست نەبوو، هەروەها چۆل کردنیشی شتێکی راست نەبوو. ناوچەکە گرنگیەکی ستراتیجی هەبوو. چۆل کردنی ئەبوو بە هۆی دابڕانی یەکێتی و جولانەوەکەی لە دنیای دەرەوە. لە بەر ئەوە بڕیار درا بەشێکی هێزەکە لەوێ بمێنێتەوە و، ئەوی تری هەر بەشەی بچێتە شوێنی کارکردنی خۆی. ئەبو کاک خالید و شێخ حسین و پێشمەرگە بادینیەکان لەوێ بمێننەوە بۆ درێژە پێدانی پەیوەندی بەستنی ناوەوە و دەرەوە، ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی سەرکردایەتی و فەرماندەی هەرێمەکان بە کوردستان دا بڵاو بنەوە. هەر کەس و هێزە ڕو یەکانە ئەو شوێنەی بۆی دیاری کراوە.

*

# لە نزیک سلێمانی: گەڕانی بەردەوام

•

من کاروباری پێشمەرگەکانی هەرێمی سلێمانی یا وردتر شارباژێڕیان پێ سپارد بوم. بەرپرسی پێشمەرگەکانی ناوچەکانی دوکان ـ چوارتا بوم. لە ئاوی زێی بچوکەوە بۆ سنوری پێنجوێن سنوری کار کردنی من بو. ک س حاجی حاجی برایمیان بە جێگری فەرماندەی هەرێمەکەی من و لە هەمان کات دا بەرایەری سیاسی دانا بو. هەردولا؛ بەرپرسەکانی کومەلە و بەرپرسەکانی بزوتنەوە، ناوچەی شارباژێڕیان بە لاوە گرنگ بو، بە دەروازەی سلێمانیان دائەنا، بۆیە لە کۆبونەوەکانی ک س و لە کاتی دابەش کردنی هەرێمەکانی پێشمەرگایەتی دا هەردولایان پێ یان لە سەر ئەوە دائەگرت: شارباژێڕ بۆ ئەوان بێت. وەکو چارەیەکی ناوەڕاستی هەردولایان بە منیان سپارد.

لە گوندێکی شەمزینانەوە، گەلیشم، کەوتینە خۆ سازدان بۆ گەڕانەوە بۆ سلێمانی. من خۆم هێشتا مەڵبەزەم بو خۆم پێک نەهێنا بو. هیچ پێشمەرگەیەکم لە گەڵ نەبو. ئەو کادر و پێشمەرگانەی لە برادۆست بون و سەر بە هەرێمەکەی من بون و ئەوانەی بە هەمان رێ دا ئەرویشتن ئەبو کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی پێکەوە بە رێ بکەوین. هێزەکە تێکەڵاو بو لە کەس و تاقمی جیاوازی پێکەوە نەگونجاو:

- عومەری حاجی عەبدوڵلا، کە دانرا بو بە فەرماندەی هەرێمی قەرەداغ، خۆی و مەڵبەزەکەی.

- عەزیز مەحمود، کە دانرا بو بە لێپرسراوی لقی کەرکوکی یەکێتی.

- حەمەی حاجی مەحمود، کە فەرماندەی کەرت بو لە هەرێمەکەی کاک تاهیر و، دکتور رەزا (حەمە سەعیدی خورمالی)، ئەویش کرا بو بە لێپرسراوی ناوچەی هەڵەبجەی یەکێتی.

- مستەفا چاورەش، کە تازە لە هۆڵەنداوە هات بوەوە.

- عەبدولقادری هەلەدنی، حاجی مەحمودی گەورەدێ، محەمەدی چوخماخی، شێخ صدیقی چوخماخی، عەلی حیکمەت (علی ئامەخان)، عوسمانی قادر منەوەر، دکتور چالاک (کەریمی دادەسەنە)، هاوری جەبار (جەباری حاجی عەبدوڵلا)، هەژار (ئەرشاد یاسین)، سەلامی مەلا عەبدوڵلا... کە سەر بە هەرێمەکەی من بون.

بە هەمومان ۳۵ کەس بوین، بۆ شارەزایی رێگاکەیانیش قادر خەیات و خدری

کامەڵای پاڵەپیمان لە گەڵ خۆمان برد. ١٠ ئێسترمان کڕی بوو. بارمان لێ نا بوو. زۆری بارەکان چەک بوو.

یەکێ لە گەورەترین گیروگرفتەکانی ڕێگە درێژەکەمان ئەوە بوو؛ زۆری پێشمەرگەکانمان شاری بوون، نەیان ئەزانی چۆن ڕەفتار لە گەڵ وڵاخ بکەن و چۆن بار بکەن. من لە تەجرەبەی پێشوومەوە هەستم بەم کێشەیە ئەکرد، پێشنیارم کرد ١٠ کەس لە پێشمەرگە لادێییەکان، کە خۆم باشم ئەناسین هەڵبژێرم و، لە گەڵ خۆمان بیانهێنین لە ڕێگا بۆ بار کردن و، بەڕێوەبردنی وڵاخەکان یارمەتی مان بدەن. عومەر تووڕە بوو. وتی: «تۆ باوەڕت بە هاوڕێیانی کۆمەڵە نیە و ئەتەوێ بیانشکێنیی، ئەگینا ئەمان چییان لەوان کەمترە». منیش وتم: «باشە نەیهێنین».

ڕۆژی ٧٧/١١/٣٠ چووم بۆ خواحافیزی لە مامجەلال و مەکتەبی سیاسی. سالار خۆی ئامادە کرد بۆ بچی بۆ سووریا و، لەوێوە بۆ گەشتی سیاسی بۆ ئەورووپا. مامجەلال ئەیویست هەردوولا ڕازی بکا: لە بزووتنەوە ڕەسوڵ مامەندی نارد بوو، ئەیو لە کۆمەڵەش یەکێ بنێری. بڕیاری دا بۆ سالار بنێری. سالار لە گەڵ مامجەلال هەندێ ناخۆشییان بووبوو. من خواحافیزیم لێ کردن و، گەڕامەوە لای هێزەکەی خۆمان.

ڕۆژی ١ی ١٢ی ١٩٧٧ لە گوندی «جوورجان»ەوە لە برادۆست بەرەو شارباژێڕ لە سلێمانی بەڕێ کەوتین. لە بەر هێزەکانی قم و هێزەکانی حکومەت نەمانئەتوانی بە ناو خاکی کوردستانی عێراق دا بە دەشتی بەرازگردا بەرەو هەڵگورد و چۆمان بڕۆین. بە تایبەتی ئێمە بارمان پێ بوو. لەبەر ئەوە ملی ڕێگای کێلەشینمان گرت.

چیاکە بەفر گرتبووی هەتا چاو بڕی ئەکرد سپی ئەچووەوە. هەمو ڕۆژەکە بە ڕێگاوە بووین نەگەیشتینە نوا یا ڕەشاییەک پشوی تێ دا بدەین، یا ستاری تیا بگرین. قادر خەیات و خدری کامەلا هەردووکیان کوری لەندیل بوون. مەترسی بەفر و ونبوونی ناو بەفریان ئەزانی. کە چوینە دیوی ئێران بۆ ئەوەی لە ناو بەفرەکەدا بزر نەبین چوونە سەر سەرچاوەکانی چەمی «گادەر» بە کناری چەمەکەدا بردیانین. خۆمان و وڵاخەکان زیاتر لە ٦٠ کەڕەت لە چەمەکە ئەپەڕین و ئەپەڕەمان کرد. لە کناری چەمەکەدا بووین بارانێکی بەخوڕیش دای کرد. بە تاریکی شەو گەیشتینە جێگایەک هەندێ چلۆچێو و چیلکەی لێ بوو. ٢٠ سەعات زیاتر بوو بە ڕێگاوە بووین. هەمومان شەکەت بووبووین. لە ژێر ڕەهێڵەی باران دا خۆمان دا بە ئەرزدا و هەندێ ئاگرمان کردەوە.

بۆ بەیانییەکەی خۆمان گەیاندە کوێرە دێ یەک ناوی «ڕەشان» بوو. چەند ماڵێکی

کەم بو. کەوت بوە ڕۆژھەڵاتی «شنۆ». لە شوێنێکی تەختایی دا بو. ئەمانتەتوانی لێ ی بپینینەوە چونکە لە شنۆ وە نزیک بو. خاوەن ماڵەکان کەسانی باش و کوردپەروەر بون. هۆرسمانی قالە منەوەر لێرە لێمان جیا بوەوە وتی من بە پێ بڕ ناکەم. چوە شنۆ بو ئەوەی بە ئوتوموبیل پێمان بگاتەوە. لەوێوە بەرەو کەوتین بو «زیوکە».

زیوکەش بەفر گرت بوی و بەفری لێ ئەباری. بو ئیمە هەلێکی زێڕین بو ماوەیەک بێ ترس بپینینەوە تا ماندوێتی مان دەرئەچێ. لە ناو گوندەکەدا جاسوسی ساواکی تێ دا بو. هەوڵمان دا تا گوندەکە بە جێ ئەهێڵین کەس لە دێ دەرنەچێ. مستەفا چاوڕەش تازە لە ئەوروپاوە هات بوەوە. چەند دانەیەک ڕۆژنامەی «کوردستان» ی حیزبی دیموکراتی لە گەڵ خوی هێنا بو. بێ ئاگاداری من هەندێکی لە زیوکە بڵاو کرد بوەوە و، باسی حیزبی دیموکراتی بو کرد بون. کە بویان باس کردم پێم سەیر بو. وتم: «ڕێوی خوی نەشێچو بە کونەوە، هەژگێکیشی ئەبەست بە کونەوە!». ئاگادارمان کرد شتی وا دوبارە نەکاتەوە. شەوێک لەوێ ماینەوە بوژاینەوە. لەوێوە بە بناری شاخ دا بە ڕێ کەوتین بەرەو «قەسەتەران» و «قزقاپان».

ئێوارەیەکی درەنگ بو، دنیا تاریکی کرد بو، گەیشتینە قزقاپان لە نزیک «خانە». پاسگایەکی لێ نزیک بو. چەند کەسی لە خەڵکی دێ چو بون لە لای فەرماندەی پاسگاکە خەبەریان لێ دابوین. هێشتا لە نانخواردن نەبوبوینەوە گەیشتنە سەرمان. کابرا داوای لێ کردبین دەستبەجێ ناوچەکە بە جێ بهێڵین. زلێری لە گەڵ خەریک بوم چەند سەعاتی مۆڵەتمان بدا تا وڵاخەکانمان ئەحەسێنەوە، گوێولی نەکرد. هەڕەشەی لێ کردبین ئەگەر نەڕوین ئاگاداری خانە ئەکا هێز بهێنێتە سەرمان. پاسگاکان خویان ئەوەندەیان هێز تێ دا نەبو چاری هێزێکی ئەوەندەی ئێمەی پێ بکرێ. جنێوێکی بە خەڵکی ئاواییەکەش دا وتی: «ئەگەر ئەوان بەم تاریکایی و سەرمایە گوزارشیان بۆ من نەهێنایە من لە کوێ ئەمزانی و، ئەگەر منیش بە دەنگ گوزارشەکەیانەوە نەیەم، دوایی توشی ئەبم». کابرای فەرماندەی پاسگا کە عەجەم بو، لە ئاغای دێ یەکە کە کورد بو، شەریفتر بو. خومان کۆ کردەوە ملی ڕێگامان گرت.

دەمەوبەیان گەیشتینە «زیوەی کزنە لاجان». گوندێکی گەورە بو، ئەمیش پاسگایەکی تێ دا بو. کەوت بوە لای سەرەوەی ئاوایی. دێ کە بە تەواوی کشومات بو هیچ دەنگێکی تێ دا نەئەبیسترا جگە لە وەڕینی سەگ. هیچ کەس بە دەرەوە نەبو. لە دەرگای چەند ماڵێکمان دا لێ یان نەکردینەوە. لە ناو خومان دا وامان تەگبیر کرد بو ڕۆژەکە لە ناو دێ دا بپینینەوە و، هیچ کەسێکمان لە ماڵەکان دەرنەچن. ئاگاداری خاوەن ماڵەکانیش

بکەین کە ئەگەر خەبەرمان لێ بدەن و، هێزی ئێرانیمان بهێننە سەر لە ناو دێیەکەمان دا نەیکەین بە شەڕ. زۆرمان لە دەرگای ماڵێک دا. کوڕێک پرسی ئێوە کێن و چیتان ئەوێ. هەرچۆنێ بو دەرگاکەمان پێ کردەوە و، چوینە ژوورەوە وتمان: «ئێمە پێشمەرگەی کوردستانی عێراقین، لێرەوە رائەبوورین. تازە خەریکە ڕۆژ ئەبێتەوە، ناتوانین بە ئاشکرا تێپەڕین، لەم دێ یەدا ئەمێنینەوە تا ئێواری. ئێواری ئەڕۆین. ئەگەر خەبەریشمان لێ بدەن لە دێ کەتان دا نەیکەین بە شەڕ».

ئەم کوڕە پیاوێکی چاک و تێگەیشتوو بوو. وتی: «باشە بێننەوە، بەڵام چەند ماڵی لە دێ کەمان دا هەیە گومانم لەوان هەیە خەبەرتان لێ بدەن، بۆ هەر ماڵێکیان چەند کەسێک بنێرن و، بە ڕۆژ لە ماڵ دەرمەچن. هەمان هەرشەی لەمنی ئەکەن، لەوانیشی بکەن. بزانین خوا چی ئەکا». بە قسەمان کرد لەو ماڵانە دابەش بوین کە ئەو بۆی دیاری کردین. نانی جەژن مان لە گەڵ ئەوان خوارد و، هەموو ڕۆژەکە بە سەلامەتی لە ناو ماڵەکان دا ماینەوە. کەس پێ ی نەزانین. ڕاستییەکەی خەڵکی دێیەکە کوردپەروەر و دڵسۆز بون. هەندێکیان بون بە دوستمان و تا چەند ساڵی هاتوچۆیان ئەکردین.

هەر لەوی لۆرییەکمان بۆ پەیدا کردین، ولاخەکانمان بۆ بگەیەنێتە گوندی «کونە مشکە» ی لای سەردەشت و، یەکێ لە خاوەن ماڵەکانیش تراکتۆرەکەی خۆی بۆ ئامادە کردین، بە شەو خۆمان و یارەکان، بۆ ئەوەی توشی گێچەڵی ژاندارمەری نەبین، بە لاڕێ دا بگوێزێتەوە بۆ هەمان گوندەکەی ئەو ولاخەکانی بگاتێ.

ئێوارە بە دەشتی لاجان دا بە تراکتۆر کەوتینە ڕێ. حاجی قادری کۆیی لە سەردەمی فەقێ یەتی دا بەم شوێنەدا ڕابوردوە و، ئافرەتێکی قەشەنگی دەوارنشینی لێ دیوە. دوای گەڕانەوەی یەکێ لە شیعرە غەرامییە هەرە جوانەکانی بەم بۆنەیەوە داناوە و، بە «بادی سەبا» دا بۆی ناردوە. لە بەیتێکی دا ئەڵێ:

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت یەعنی: «لاجان»
ئاهەستە بڕۆ، نەک وەکو دیوانەیی هەرزە

لە بەر تاریکیی و، لە ترسی ڕێگا ئێمە نە ئەو «دەشتی بەهەشت» مان بینی و، نە هیچ کچێکی جوانی لە پایەی ئەوەی حاجی شەیدای بو بو، بەڵکو لە کۆتایی ڕێگاکەمان دا توشی جیپێکی عەسکەری بوین، داوای لێ کردین ڕابوەستین. ئێمە سەری تراکتۆرەکەمان داپۆشی بو، نە پێشمەرگەکان و نە یارەکان دیار نەبون. سەربازێک دابەزی دەستی کرد بە ژێر پەردەی هەرمانەکەدا دەستی بەر چەک و پێشمەرگەکان کەوت. بە فارسی هاواری کرد: «ئاقای سەروان پێنتی لە چەکدارا». کابرای سەروان دابەزی. من لە

تەنیشت شوفێرەکەوە دانیشت بووم. پرسی: «ئێوە چین؟». وتم: «پێشمەرگەی کوردستانی عێراقین. ڕێگامان لێ تێکچووە. ئەگەڕێینەوە بۆ کوردستانی عێراق». وتی: «ئەم تراکتۆرەتان لە کوێ هێناوە؟». وتم: «بە زۆر هێناومانە». وتی: «زۆرجار پێشمەرگەی کوردستانی عێراق دێنە ئەم دیو، هەموو جار ئێمە دەمەوەتیان ئەکەین بۆ پادگان. پاش حسانەوە بە ڕێ یان ئەکەینەوە بۆ ولاتی خۆیان. ئێوەش وەرن دوای من بکەون تا ئەوێ». سەروان دوو کەسی لە گەڵ بوو. نەیئەتوانی بە زۆر پانیا نەیویست بە قسەی لوس تەفرەمان بدا. منیش وتم: «فەرموو پێشمان کەوە ئێمەش بە دواتا دێین». ئەوان بە ڕێ کەوتن بەرەو ئالوەتان. ئێمەش ڕێگەکەمان گۆڕی بەرەو جێگایەک ناوی «گوێزیلە» بوو.

بارەکانمان لە نزیک گوێزیلە داگرت و، کەوتینە ناو ماڵەکان هەرچی ولاخێکی لێ بوو لە ئێستر و گوێدرێژ بە پەلە هەموویمان هێنا و بارمان کرد و، بە خێرایی کەوتینە ڕێ بەرەو شوێنی ئامادە بوونی ولاخەکانی خۆمان. بۆ خۆشبەختی ولاخەکان لە پێش خۆمان دا گەیشتبوون.

لە کوێنەشک پشوومان دا و، دیسان ولاخەکانمان بار کرد و بەرەو «شێنێ» بەڕێ کەوتین.

*

تەقوتوق لە گەڵ قم

کاروانەکە لە گوندی «داوداوا» وە بە ڕێگاوە بوو بەرەو «گۆزمشێر» بۆ ئەوەی لەوێوە بچینە شێنێ، لە لێرەوارەکەی پشتی «نزکان» دا تووشی تاقمی چەکدار بوون بەرەو ئێران ئەڕۆیشتن، پاش هەندێ لە یەک خوڕین پێکا هەڵپژان. لە ماوەیەکی کورتا یەکێکیان بە کوژراوی و یەکێکیان بە بریندارێ بە جێ هێشت و ئەوانی تر هەڵاتن. دەرکەوت ئەمانە چەند کەسی لە کادر و پێشمەرگەکانی قم بوون لەوانە: جەوهەر ئاغای ئێندزی، عەلی کوردە ڕە، مەلا شێخ محەممەد... قم بارەگای سەرکردایەتی هەرێمی سلێمانی و کەرکوکی لە نوکان بوو. پێش گەیشتنی کاروانەکەی ئێمە بە چەند ڕۆژێکی کەم فاضیل جەلال (عادل) ئەندامی قم و لێپرسراوی سلێمانی و کەرکوک تەسلیمی ڕژێم بو بووەوە. لە بەرپرسەکانی پێک پێش پایز ئاغای عەباس ئاغای ئاکۆ لە گەڵ چەندین فەرماندەی کەرت و مەفرەزەی ئاکۆ و بالەیی تەسلیم بو بونەوە.

هەرچەندە دەرکردنی هێزەکانی قم لە ناوچەکانی سلێمانی لە بەرنامەی کاری ئێمەدا بوو. بەڵام لەو سەفەرەدا ئێمە بە تەمای پەلامار دانی قم نەبووین. هێزەکەشمان بۆ ئەوە کۆ نەکرا بووەوە. بەڵکو مەبەستی سەرەکیمان ئەوە بوو چەکەکان بە سەلامەتی بگەیێنینەوە

هەرێمەکانی سلێمانی. تازە تووشی شەڕ ببووین. بۆ حەسانەوەی شەو لامان دایە بارەگاکانی کوێخاکانی مەنگوڕ لە دۆڵێکی نزیک گورەشێر. کوێخاکانی مەنگوڕ: کوێخا عەلی قەلاوی، کوێخا قادری زودی، کوێخا محەممەدی مەلا شەریف، کوێخا محەممەدی سەوەیس هەروەها چەند کەسێکی تر لەوانە کوێخا بایزی سامەش، بەکر پیرووت لە هەمان دۆڵ دا بنکەیان دانا بوو. ئەمانە هەموو پێشمەرگەی یەکێتی بوون.

کوێخاکانی مەنگوڕ نەیان ئەویست پشێوی بکەوێتە ناوچەکەوە. ویستیان بێن بە ناوبژیکەر لە بەینی ئێمەو چەکدارەکانی قم دا. ئێمە قبوڵمان نەکرد. پێمان وتن نابێ ئەوان لە یادبنان پێشمەرگەکانی ئێمە بکوژن و ئێمەش لێرە لە پاڵ خۆمان دا بیان حەوێنینەوە. ئاگاداری ئەوانی قم مان کرد؛ ئەبێ واز لە قم بهێنن و بێنە ریزی یەکێتییەوە، یان ئەبێ ناوچەی سۆران بە جێ بهێڵن. ئەگەر هیچیان ناکەن، وا با خۆیان بۆ شەڕ ئامادە بکەن. هەموو چەکدارەکانی قم هەر ئەو شەوە کەلوپەلی خۆیان پێچا بوو بارەگاکانی خۆیان لە «نزکان» جێ هێشت بۆ چوو بوونە «کانی زەرد». ئێمەش بۆ پشوودان و چاودێری چەکدارەکانی قم چووینە شێنێ.

چەکدارەکانی قم هەندێکیان تەسلیمی ڕژێم بوونەوە و، هەندێکیان چوونە ناو دیهاتەکانی ئێرانەوە و، هەندێکیشیان هاتنە ناو یەکێتییەوە. خانوەکانیان پاش چەند ڕۆژێ کرا بە بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتی. مامجەلال و عەلی عەسکەری و رەسوڵ مامەند و ئازاد هەورامی و د. مەحموود عوسمان و شەمسەدین موفتی چوونە ناوی.

*

شێنێ گوندێکی گەورە بوو. بەرەوژووری ۲۰۰ ماڵ بوو. مزگەوتێکی گەورەشیان هەبوو. گوندێکی خۆش بوو. لەو کاتەدا بەفر سپی کرد بوو. دوو کوێخایان هەبوو: کوێخا خدر و، کوێخا عەبدوڵلا. هەر یەکەیان سەرپەرشتی چەند بەرمالێکی ئەکرد. کوێخا خدر لە کۆنەوە لە گەڵ دەزگاکانی حکومەت تێکەڵاو بوو. ماوەیەک ئەم پۆستەی قەلادزەی بە سەردەشت گەیاند بوو. کوێخا عەبدوڵلا تێکەڵاوی لە گەڵ داوودەزگاکانی حکومەت نەبوو.

هەندێ لە شێنێ ییەکان لە گەڵ ق م رۆیشت بوون. نامەمان بۆ نووسین بگەرێنەوە. بە کۆمەڵ هاتنەوە. ئێمەش وەکو بەڵێنمان پێ دا بوون ڕێزمان لێ گرتن.

کوێخاکانی مەنگوڕ لایان وابوو ناوچەکەمان لێ شێواندوون. لە بەر ئەوە حەزیان نەکرد زوو ناوچەکە بە جێ بهێڵین. خەلکی شێنێ یش هەروەها. سەرەرای ئەوەش مانەوەی ئێمە لە ناوچەکەدا لەوانە بوو ببێ بە هۆی هێرشی جەیش. هەمویان ئەیانویست پاڵمان پێوە بنێن. ئێمەش خۆمان ئەمانویست بە زووترین کات بڕۆین. نیوەڕۆیەک لە «شێنێ» وە بەرەو

«پیدەلان»، بەری کەوتین بە نیازی ئەوەی بە دەشتی قەڵادزەدا بچین بۆ «ئاسۆس». خەلیل جەلال و یەکدوو پێشمەرگەی تر، بۆ چاوساغی و شارەزایی، لە گەڵمان هات بوون. سەعات ٩ ی ئێوارە ڕابورد بوو ٩ سەعات زیاتر بوو بە ڕێگاوە بووین، هێشتا ماوەیەکی کورتمان بری بوو. لە دەشتی قەڵادزێ بووین. ڕووناکی و ئاگر و تەقوتۆقی ڕەبییەکانی دەوروپشتمان لەبارەی هێزەکانی دوژمن و جۆری دابەشبوونیانی لە ناوچەکەدا دەرئەخست.

*

هەر ٢ کەس ١ ولاخمان پێ سپارد بوو. ئەبو ئاگایان لێ ی بێ بۆ خزمەتکردن و بارکردن و پاراستنی. شارییەکان هێشتا پێ یان ئەگبەر نەئەکرا. زۆرجار بارەکانیان ئەکەوت. و گوریس و قەیاسە بنکلک و ورگ و پشتی ولاخەکانی بریندار ئەکرد. کەچی لادێییەکان ١ کەسیان بۆ بەڕێوەبردنی ٣ ولاخ دائەنا، بێ گیروگرفت و کێشە، کارەکەی ئەنجام ئەدا.

کە بە دەشتی قەڵادزەدا ئەڕۆیشتین. ئەبو پێ هەڵگرین بۆ ئەوەی پێش ئەوەی دوژمان لێ بیبستەوە بگەینە سەر زێ بۆ پەڕینەوە. کاروانەکە زۆ زۆ ڕائەوەستا و دوا ئەکەوت. منیش گەڕامەوە دواوە بۆ ئەوەی بزانم هۆی ئەم دواکەوتنە چییە. سەیرم کرد هاوڕێی جەبار و ولاخەکەی ئەو هۆی دواکەوتن و تێکدانی ڕیزی کاروانەکەن. منیش بە توڕەییەوە پێم وت: «مەردوت مری ئەوە چییە؟ بۆچی لە ناو ئەم کاروانە درێژەدا هەر ولاخەکەی تۆ ئەکەوێ؟». یەکسەر وتی: «چزانم، قابیلە من پاشقولی لێ بگرم. خۆی ئەکەوێ!»

*

هەرچەند بیرم لێ ئەکردەوە بەو جۆرە ڕۆیشتنە و، بەو ماندوێتییە هەرچۆنێ بووین ناگەینە مەنزڵێکی ئەمین و سەلامەت. بە ڕۆژ ئەبو لە دەشتی قەڵادزەدا بمێنینەوە. دەشتی قەڵادزەش سەربازگەیەکی گەورە بوو. خەلیل و دەلیلەکانی ترم بانگ کرد. قۆناغی داهاتوی مانەوەی ڕۆژ و، ڕادەی سەلامەتی شوێنەکەم لە گەڵ باس کردن. دوژمن بە ئاسانی ئەگەیشتە سەرمان و ئەیکردین بە «پووزی خوراو». لە بەر ئەوە بڕیارم دا بگەڕێینەوە بۆ دواوە ڕێگایەکی سەلامەت بدۆزینەوە. هەندێ لە پێشمەرگەکان نەشارەزا بوون، یان نەزان بوون، ڕادەی مەترسیی ناوچەکە و، خەتەری تێکەوتنی ناپەرامبەریان نەئەزانی، کەوتنە پرتەوبۆلە. من گوێم نەدانێ گەڕاینەوە دواوە بۆ پیدەلان و شێنێ.

بەفر چیاکانی گرت بوو. چیاکان لوس بووبوون. بەردەوام بەفر ئەباری. لە شێنێ پرسیمان بە هەندێ لە شارەزاکانمان کرد. هەندێ ڕێگەوشوێنیان بۆ داناین کە بچینە سەرچاوەی «هەڵشۆ»، ئینجا بۆ «نوورەدین» و لەوێ لە زێ بپەڕینەوە بۆ بەری ئاسۆس.

ئەبو بە پشتی «تۆژەڵە» دا تێ پەڕین ئەویش کوێستانێکی سەخت بو. بۆ شارەزایی و، شکاندنی ڕێگا و، ئاسانکردنی باری ولاخەکان، لە گەڵ خۆمان ۱۰ کاروانچی مان لە گەڵ ولاخەکانیان بە کرێ گرت و، زیاتر لە ۱۰ کەسی خەلکی شنێی مان بە خاکەنازەوە لە گەڵ خۆمان برد.

*

لە شنێی کە خەریکی بارکردنی ولاخەکان بوین، مامۆستا عەزیز، پیاوێک بو بە خۆ وە بو، دەنگی گەورە و سمێلی زل، پوزەوانەی لێ هەلکێشا بو، خەریکی بارکردنی ولاخەکەی خۆیان بو. نەیزانی بو چۆنی بار بکا. لە کاتی توندکردنی گوریسەکەدا پێ ی لە ورگی ئیستەرەکە گیر کرد بو، ئیستەرەکە هەلی تەیزان بو. کابرایەکی شنێیی کە ئەم دیمەنە ئەبینی، لە مامۆستا عەزیز نزیک ئەکەوێتەوە و ئەلێ: «ئەری کابرا عەیب ناکەی بەم سەر و قەلافەتەوە نازانی بار باربکەی؟»

مامۆستا عەزیزیش ئەلێ: «ئەی تۆش عەیب ناکەی بەو سەر و قەلافەتەوە نازانی ئوتومۆبیل لێ بخوڕی و، سوئالی ریاضیات حەل بکەی؟ ئەگەر بزانیایە تۆشی ئەمە ئەیم هەر لە منالیەوە ئەیرمە خانەکەی گەرەکی خۆمان ئەبوم بە قەتارچی!»

مامۆستا عەزیز نمونەیەک بو لەو پێشمەرگە شارییانەی بە تەواوی بێگانە بون بە ژیانی لادێ و بە ژیانی پێشمەرگایەتی. جارێکیا لە کۆبونەوەیەک دا لە بەری قەرەداغ، بە ئامادە بونی کاک ئارام، پێشنیاری کرد بو لە باتی ئەوەی بە شەو «حەراسەت» دابنێن و، پێشمەرگە بە هۆی سەرماوە نەخۆش بکەوێ، هەر مەطرەزەیەک بو حەراسەتی شەوانە «قاز» یەک ڕابگرێ. هەر لەم بابەتە برادەرێکی تری شاری ئەیوت: من شتێ ئەنوسم لە سەر «مضار الحراسه الليليه على صحه المقاتل الثوری».

*

بە لای تۆژەڵەدا هەلگەراین. دنیا سپی ئەچوەوە. ماوەیەکی باش مان بڕی بو. زریان دەستی پێ کرد. بەفرێکی وردی ورد، لە زیخ ئەچو، بە باوە لە دەموچاوی ئەداین. لە هیچ لایەکەوە ڕەشایی مان لێ دیار نەبو. دەست و پێ مان تەزی بو. ولاخەکان ئەگلان زور بە زەحمەت ڕاست ئەکرانەوە. لە ترسی تەزین و ڕەق بون لە هیچ جێگایەک نەمانئەتوانی بو پشودان ڕابوەستین. ئەوجارە هەستم بە ترس و سامی بەفر کرد بو. زوری کاروانەکەمان، بە تایبەتی شنێی بیەکان، لایان وابو هەموومان ڕەق ئەبینەوە، چەند کەسێکیان ئەگریان و لە بەر خۆیانەوە جنێویان ئەدا. خەریک بو شەومان بە سەردا ئەهات. من وام بیر لێ کرد بوەوە کە ئەگەر تا شەو نەگەینە ڕەشایی. ئاهلونی زور و بەتانی

زوورمان پێ بوو. لە سەر بەفرەکە نایلۆن ڕاپەخەین و، بەتانی لەسەر نایلۆنەکە ڕاپەخەین و، هەموومان کۆ ببینەوە و، پشت بنێین بە پشتی یەکتریەوە و، لە شێوەی چادردا بەتانی تر بدەین بە سەر خۆمان دا و، بەتانییەکانی سەرپشمان بە نایلۆن داپۆشین.

هەرچۆنێ بوو گەیشتینە بەرزایی شاخەکە. وامان بە چاک زانی بارەکان داگرین و لەوێ بە نایلۆن دایان بپۆشین و، بە جێیان بهێلین. خۆمان بە نشێوەکەدا شۆڕ ببینەوە بۆ خوارێ. شەو لە دۆڵەکەدا بە سەر بەرین و ڕۆژی دوایی بچینەوە بۆ بارەکان. بارەکانمان بە جێ هێشت. شۆڕ بوینەوە بەرەوخوار. ڕەشایی مان لێ دەرکەوت، نیتر شێنی بییەکان و کاروانچییەکان ناوچەکەیان ناسییەوە و ڕێگایان دەرنەکرد.

شوێنەکە «دۆڵی ئاوەسپی» بوو. ئاشێکی ئاو و، ماڵی ئاشەوانەکەی لێ بوو، نزیک بوو لە گوندی «بێنگەلاس» و «مەمەسکرێکی» گەورەی جەیش، ناوچەکە بە ڕەبیە تەنرا بوو. کە سەرت هەڵئەبڕی لە هەمو شوێنە بەرزەکان نیشانەی دزێوی دوژمنی داگیرکەرت بە دی ئەکرد. هاوڕێکانمان چوونە ماڵی ئاشەوانەکە. من لە گەڵ کاروانچییەکان و، شێنیی بەکان چوومە ئاشەکە. کەس مان لێ نەئەناسین و بە نابەدڵی ڕاپێچمان کرد بوون بۆ ئەم بێگارە پڕ مەترسییە. نەئەبوایە بە جێ یان بهێلم، ئەوان شارەزا وریا و گورجوگۆڵ بوون، ئەترسام یەکێکیان خۆی بدزێتەوە، بچێ لە ڕەبییەیەک خەبەرمان لێ بدا، یان بگەڕێتەوە باری چەک ببا و بڕوا. کاک عومەر و چەند پێشمەرگەیەکیش لە بەر من مانەوە. ئاگرمان کردەوە و چامان دەم کرد. گەرمان بوەوە و حەسانەوە. لە گەڵ شێنی بییەکان و کاروانچییەکان کەوتینە قسەی خۆش و گاڵتە و باسی جۆراوجۆر. بوین بە ئاشنا و دۆست. تا بەیانی بەمجۆرە ماینەوە.

*

مامۆستا عەزیز و مولازم عومەر لە منالییەوە هاوڕێ ی نزیکی یەکتری بوون. لە پێشمەرگایەتی دا هاوڕێیەتییەکەیان پتەوتر بوو بوو. بەیانییەکەی کە ئەبو کۆببینەوە بۆ داگرتنی بارەکان لە سەر شاخ. مامۆستا عەزیز خۆی دواخست. عومەر کردی بە گلەیی و بوڵە و قسە. عەزیز جوابی دایەوە. عەزیز بۆ بەهانەیەک ئەگەڕا خۆی لە سەرکەوتنی شاخەکە لا بدا.

عومەر وتی: «تۆ بۆیە وا ئەکەیت بۆ ئەوەی خۆت بدزیتەوە».

عەزیز وتی: «بەڵێ وایە. من سەرناکەوم. چی ئەکەی بیکە!».

عومەر وتی: «مامجەلال باشتان ئەناسی، مەم لامەکەی تۆ: مارکسییەتی لینینی نییە، مریشک لێدانە».

خەریک بو زیاتر دەمیان لە یەک گیر بی و قسەکانیان لەوە تی بپەری. ناچار بوم خومم تی هەلقورتان و قسەکەم پی برینەوە.

بەیانی هەموومان کۆ بووینەوە: پیشمەرگە، کاروانچی، شینی بیەکان. بەو ریگایەدا کە ئیواری ی پیشو شکاند بومان، جاریکی تر بە شاخەکەدا هەلگەراین بو لای بارەکان. بارەکانمان بە کول هینایە خواری. ئیتر پەیوەستی مان بە کاروانچی و شینی بیەکان نەما بو. خومان لیرە بە دواوە شارەزای ریگا و ناوچەکان بوین. کری ی خویانمان دانی و ئیزنمان دان.

لە ناو «غەل» یک دا لە سەر بەفرەکە مولازم عومەر چوارمشقی دانیشت بو شتی ئەنوسی. بە لامەوە سەیر بو، وامزانی نامە ئەنوسی بیدا بە کاروانچییەکان بوی ببەن بو شینی یان جیگایەکی تر. لیم پرسی: «ئەوە چی ئەکەی؟»

وتی: «نامە ئەنوسم»

وتم: «بو کی؟»

وتی: «بو تو!»

وتم: «من ئەوە خوم لە بەردەمتا راوەستاوم چ پیویست ئەکا نامەم بو بنوسی؟»

وتی: «ئیستیقالە ئەنوسم لە پیشمەرگایەتی!»

ئەو سەردەمە سەرچاوەی هەلشو بوبو بە ناوەندیکی گرنگی ئالوگوری قاچاغی کەلوپەلی ئیرانی و عیراقی. هەندی لە ولاخەکانی خومان وەستا بون، ناچار بوین هەندی ولاخی تر لە خەلکی سەرچاوەی هەلشو بە کری بگرین. چەند «بەرمقە» یەکی خیرامان بە کری گرت بو. هیشتا نەکەوت بوینە ری لە یەکی لە ولاخدارەکانم پرسی: «مەخفەرەکەی هەلشو چەندە لە ریگاکەمانەوە دورە؟»، وتی: «ساچمەزنهاویژی». یەکەم جار بو ئەم وشەیە ببیستم. بە لامەوە خوش و رەسەن بو. دیارە مەبەستی لەم وشەیە «المدی المؤثر» ی تفەنگی ساچمەزن بو، کە لە هەمو تفەنگەکانی تری وەکو برنەو و، کلاشینکوف، کەمتر بر ئەکا. ئەم وشەیە چەند زاراویکی تری بیر خستمەوە کە زمانی نەزانینی «مەتر» و «مەترموکەعەب» و «کیلو» کورد بو پیوانەی دورایی و بو کیشانی قورسایی و نیشاندانی قەوارە، بە کاری هیناوە. وەکو ئەلی: خنزر یەک «درم» لە کەل بەرز بوتەوە. ریگاکە «روژە ری یەک» دورە. جوگاکە دو «ئاشگیر» ئاوی لە بەر ئەروا. فلان بە قەد «گاجوتی» بەهیزە...

دولی هەلشو یەکیکە لە شوینە هەرە خوشەکانی کوردستان. دیمەنی جوانە. ئاووهەوای خوشە. کانی و ئاوی زورە. چیاکانی جوان و، لیرەوارەکانی چر و سەوزن.

هەڵشۆ خۆی گوندێکی گەورە و قەرەباڵغ بو. چەند «مۆچە» یەکیشی هەبو.

لە ناوچە سنورییەکانی پشدەر، ئاڵان، سیوەیل، شلێر ئەم جۆرە دابەش بونە بەرچاو نەکەوت. ئاوایییەکی گەورە چەند ئاوایییەکی بچوکی لی کەوت بوەوە. ئاواییە بچوکەکە خۆی بە سەربەخۆ دانەئەنا. بەڵکو خۆی بە بەشێ لە ئاواییە گەورەکە ئەزانی، وەکو دایک و بێچکە. بە ئاواییە بچوکەکانیان ئەوت: «قـزخ» و، بە ئەرزەکانیان ئەوت: «مۆچە». خێزانێک یان چەند خێزانێک، هەمویان برا یا خزمی نزیک بون، پێکەوە لەو مۆچەیەدا کشتوکاڵ و ئاژەڵداریبان ئەکرد و، چەند خانوێکیان دروست ئەکرد. ئەرزەکان هی خۆیان بو. «قزخ» یکیان لە سەر ئاوەدان کرد بوەوە.

«قزخ» بو خۆ حەشاردانی پێشمەرگە جێگایەکی لەبارتر بو. دانیشتوانی قزخەکە داخراو و هەمو خزمی یەکتری بون، زۆر کەم هاتوچۆی ئاوایییەکانی تریان ئەکرد، لەبەرئەوە هەواڵ و دەنگوباسیان لی دەرئەئەچو. قزخەکانیش بە زۆری لە شوێنی شاخاوی عاسی دا ئاوا کرابونەوە.

بارەکانمان بار کرد و بەری کەوتین، بە ناو هەڵشۆدا بە خێرایی تێپەڕین بەرەو سالکی. «سالکی» و «نورستە» دو قوخی هەڵشۆ و، لە دۆڵەکەدا ئەمبەر و ئەوبەر بون.

*

دەمەو ئێوارە بە ناو نورستەدا هەڵکشاین و، بە لای «دارشمانە» دا بەرەو «نۆرەدێن» رۆیشتین. دارشمانە «مەعسکر» یکی گەورەی لی بو. لە نۆرەدێن گیر نەبوین، چەند بەلەدەوانێکمان پەیدا کرد لە ئاستی «هەڵاریزە» وە ئێمە و بارەکان و وڵاخەکانیان پەڕاندەوە بو گوندی «بێخری» لە بەری ئاسۆس.

ڕێگایەکی دور و ناخۆشمان بڕی بو بەڵام هێشتا نەگەیشتبوینە شوێنێکی ئەمین، ئەبو چەند سەعاتێکی تر بە ئاسۆس دا هەڵگەڕێین تا بگەینە «سەرتەنگ». هەندی لە پێشمەرگەکان پێ یان داگرت لە «بێخری» بمێننەوە تا بەیانی. ئەویش بو مانەوە دەستی نەئەدا. بەهانەییان کرێکاری ڕێگاوبان ئەهاتن لەوبەر ئاوەکە جادەیان چاک ئەکرد، هەمو ڕۆژێ بو پاراستنی مەکینەکان سەرباز و زرێپۆشیان لە گەڵ ئەهات. ئەترساین بە ڕۆژ تۆشی شەڕ بین لە گەڵیان. ئێمە درێژەمان دا بە ڕۆیشتن، بەڵام هەمو شارییەکان «مان» یان لی گرتین و، لە گەڵمان نەهاتن. ئەوانەی لە گەڵ ئێمە هاتن: عەبدولقادری هەڵەدنی و پێشمەرگەکانی و، حاجی مەحمودی گەورەدی و، حەمەی حاجی مەحمود و، دو پێشمەرگەی لای ملازم عومەر بون.

*

سەرتەنگ گوندێک بوو بە ئاسوسەوە. کانی و ئاوییان نەبوو. هەندێ بیرییان هەبوو بارانی زستان پڕی ئەکرد و، ئاوەکەی تێ دا ئەمایەوە، زستان و بەهار ئاوییان لێ هەڵ ئەهێنجا بۆ خواردنەوە. ئاوەکەیان پاک نەبوو. پڕ بوو لە سەرمێکوتە و جۆروجانەوەر. لە بەر ئەوە پێش خواردنەوەی ئەیان پالاوت. هاوینان چۆڵیان ئەکرد ئەچوون بۆ هەواری کوێستان. کشتوکاڵیان نەبوو. ئاژەڵداری بەرهەمی سەرەکییان بوو. خانووەکانیان تاریک و تەنگ و ناخۆش بوو.

ئێمە کە گەیشتینە سەرتەنگ بە دەگمەن پیاوی تێ دا ما بوو. ژنەکان کاروباری ناوماڵ و ئەرکی ئاژەڵدارییان بە جێ ئەهێنا. لە مانگی نیسانی ئەمساڵ دا (١٩٧٧) جەیش هێرشێکی بۆ ناوچەکە کرد بوو لە شوێنێکی نزیک سەرتەنگ بە ناوی «کانی شیلان» شەڕێک لە نێوان جەیش و پێشمەرگەدا بووبوو، چەند سەربازی کوژرا بوون. لە تۆڵەی ئەمەدا سەرکردەکانی جەیش هەرچی پیاوێکیان لەم دێ بە بەر دەس کەوت بوو دەربەدەریان کرد بوو. زیاتر لە ٢٠ کەسیان لێ حوکم دا بوون بە ٥ تا ٢٠ ساڵ. لە گەڵ ئەوەش دا خەڵکی دێ ڕووخۆش و میواندۆست بوون. پێشمەرگەیان خۆش ئەویست و بە خۆشییەوە پێشوازییان لێ ئەکردن.

سەرتەنگ شوێنێکی لەنەبی بوو بۆ حەسانەوەی پێشمەرگە. ئێمە لە مزگەوتەکەی لامان دا. بارەکانمان لەوێ خست. مزگەوتەکە بریتی بوو لە ژوورێکی تەنگ و تاریک و دوکەڵاوی پڕ کوڵەکە. چاوەڕوانی گەیشتنی هاوڕێکانمان کرد.

*

لە سەرتەنگەوە چووین بۆ «بێترخێ». ئەمیش ئاوی کەم و کشتوکاڵی نەبوو. ئاژەڵدارییان ئەکرد. هەندێ لە کەسوکاری «صالحی دەرویش قادر» لێرە بوون. یەکێ لە کچەکانی هەواڵی باوکی لێ پرسین. باوکی تەندروست بوو، بەڵام مەکتەبی سیاسی لە لای خۆیان بە گیراوی گلیان دابووەوە.

صالح خۆی و فەعلی قادری کوڕی پێشمەرگە بوون. قادر کادری بزووتنەوە بوو لە ناوچەی قەلادزە. بە فێل دوو کادری دیموکراتی گرت بوو و، تەسلیمی ساواکی کرد بوون. خۆیشی چوو بوو بۆ ئێران دانیشت بوو. حیزبی دیموکرات لە سەر ئەمە بەیانێکیان دژی یەکێتی دەرکرد. قم و ناحەزەکانی یەکێتی ئەمەیان بە هەل زانی بۆ زڕاندنی ناوبانگی یەکێتی. بۆ ئەوەی ڕووداوی لەو بابەتە دووبارە نەبێتەوە یەکێتی صالحی بۆ لێکۆڵینەوە گرت بوو.

بێترخێ گوندێکی بچووک بوو. بەڵام لە شوێنێکی عاسێ دا بوو. شەوێکمان لێ بە

سەر برد و بەیانییەکەی بەرەو «زەروێن» بە ڕێ کەوتین.

*

زەروێن یەکێ بوو لە ئاوایییەکانی شینکایەتی. «شینکێ» تیرەیەکی بچووک بوو لە چەند گوندێک دا دانیشتبوون: گەلالە، سەرە، زەروێن، بەرگورد، قاسمەش، دری...ناوچەکەش بە ناوی تیرەکەیانە وە پێی ئەڵێن: «شینکایەتی». ناوچەی شینکایەتی هەموی شاخ و داخە. ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە لە گەڵ ئەرز و ناوی ناوچەکە نەئەگونجا. دانیشتوانی زۆر و ئەرزی تەخت و زەوی کشتوکاڵیان زۆر کەم بوو. بەڵام دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە هونەری چاککردنی ئەرزی لێژی قەدپاڵی شاخەکان و، پەروەردە کردنی ڕەزی دێمی تری و، ترش و، چواڵە دا شارەزایییەکی زۆریان هەبوو. زۆری قەدپاڵی شاخەکانیان چاک کرد بوو، بەردیان لێ بژارد بوو، ڕێکیان خست بوو و، سنووری ڕەزەکانیان لە یەکتری جیا کرد بووەوە و، لە بنی شاخەکەوە تا نزیک لوتکەکەیان کرد بوو بە ڕەز. لە بەر لێژی و سەختی ولاخ نەیئەتوانی جوتی تێ دا بکا، ڕەزەوانەکان ئەبوایە خۆیان بە پاچ بیکێڵن.

تری، دۆشاو، مێوژ، باسوق و سنجوق.. لە بەرهەمە سەرەکییەکانیان بوو. هەندێکیان بۆ خواردنی خۆیان و، ئەوی تریان بۆ فرۆشتن ئامادە ئەکرد. هەروەها ولاخداریشیان ئەکرد، بۆ گوێزانەوەی بار.

چاککردنی ئەرزی شاخاوی و ڕەزەوانی، بەو شێوەیەی لە شینکایەتی دا کرا بوو، نموونەیەکی چاک بوو بۆ ئەوەی دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان بۆ گەشەپێدانی ناوچەکانیان چاویان لێ بکەن.

*

ڕۆژی ٢٥ ی کانوونی یەکەمی ٧٧ گەیشتینە «گەوروەدێ».

ڕۆژی ٢٥ ی مانگ لای خەڵکی گەوروەدێ و دانیشتوانی ناوچەکە و، لای پێشمەرگەکانیش، وەکو ڕۆژەکانی تر وابوو.

ڕۆژی ٢٥ ی مانگ لە دنیای مەسیحی دا پیرۆزییەکی تایبەتی هەیە. لەم ڕۆژەدا لە ماڵ دەرناچن، بە دیار «داری کریسمس» ەوە دائەنیشن و، خۆشترین خواردن دروست ئەکەن، چونکە لایان وایە مەسیح لەم ڕۆژەدا لە دایک بووە.

ڕۆژی پێشتر لە زەروێن بووین. سەربازگەیەکی گەورەی جەیش لە گەلالەی شینکایەتی بوو. بەلەریکی ئەستوور شاخی «گزجار» ی گرت بوو. بارەکان لێرە داگیران و چەکەکان تا کاتی دابەش کردن هەڵ گیران. ئەرکێکی قورسمان لە کۆڵ بووەوە و،

ئازادییەکی زۆرتری بزووتنمان بە دەس هێنا.

«گەلالە» و «گۆجار» و «زێوە» وەکو ناو لە چەند جێگای کوردستان دووبارە بوونەتەوە.

- شاری «گەلالە» لە بالەکایەتی و، گوندی «گەلالە» لە شێنکایەتی و، چەمی «گەلاڵ» لە بەرزنجە و چیای «گەلاڵ» لە مەنگورایەتی...

- گوندی «گۆجار» لە بناری چیای «ماسەرووت» ی بالەکایەتی و، هەواری «گوجار» لە بناری چیای «کارۆخ» و، گوندی «گوجار» لە پشدەر و، چیای «گوجار» لە جافەتی.

- گوندەکانی «زێوە» و «زێوکە» ی شنۆ، «زێوەی کۆنە لاجان» ی پیرانشەهر، «زێوە» ی سەردەشت کە بە سێوە لاسوورە بە ناوبانگە، «زێوە» و «بەرزێوە» بالەکایەتی، «زێوە» و «دەرە زێوە» ی خۆشناوەتی، «زێوی» ی پیرمەگروون، «زێوەسەر» ی قەرەداخ، گەرەکی «زێوی» ی کەرکوک...

*

یەکی لەو مەسەلانەی لە مێژ بوو سەرنجی راکێشا بووم جیاوازیی و سەیریی ناوی شوێن؛ شاخ، گرد، گوند، شار، کانی، جوگا، رووبار... کوردستان بوو. کە چوومە جەزیرە و ناوی گوند و شوێنەکانی ئەوێم بیست و، دواییتر کە چوومە شەمزینان و برادۆست و، ئینجا پشدەر و دۆلی جافەتی و شارباژێر و شلێر، ئەم مەسەلەیە زۆرتر سەرنجی راکێشام.

لە کوردستان هەمو شوێنێک ناوێکی تایبەتی هەیە، دانیشتوانی ناوچەکە بەو ناوەوە ئەیناسن. حکومەتەکانی تورکیا و سوریا ناوە ناوچەییەکانی هەمو شار و گوندە کوردنشینەکانی تورکیا و سوریایان گۆڕیوە، لە سەر زمانی دانیشتوانی ناوچەکە ناوێکی هەیە و، لە نووسینی رەسمیی حکومەتی دا ناوێکی تر. بەلام دانیشتوانی ناوچەکە هەر بە ناوە کۆنەکەی ناوی ئەبەن. ئەوەی سەرنج راتەکێشی ئەوەیە، لە پاڵ ناوی کوردی کۆن و تازەدا بە هەزاران ناوی یونانی، سریانی، ئەرمەنی، ئیرانی، عەرەبی، مەغولی، تورکی... هەیە.

کوردستان کەوتوتە ناوجەرگەی رۆژهەلاتی ناوەراستەوە. ناوچەکە ۳ قاررەی گرنگی دنیا: ئاسیا، ئەورووپا، ئەفریقیا بە یەکەوە ئەبەستێ. رێگای ئاوریشم و، رێگای لەشکرکێشیی هێزە گەورەکانی یونان و رومان و ئیسلام و مەغول بە ناو کوردستان دا رۆیشتوە. چەند سەدە لە ژێر دەسەلاتی ئیرانی و یونانی و عەرەب و مەغولی و تورک دا بوو. لە سەردەمی جیا جیا دا دینی جیاجیای وەکو زەردەشتی، جو، دیانی تیا بلاو

بوتەوە تا سەرەنجام ئیسلام زاڵ بووە. دراوسێ ی فارس و ئەرمەن و تورک و عەرەب بووە.
ئەم رووداوانە هەموو تەئسیریان لە زمانی کوردی و، ناونانی شوێنەکانی کوردستان کردووە.

ئێمە ناوی

- چیاکانی: جوودی، هەرەکوڵ، شەکیف، نەقیب، قەندیل، سەلم، شەگەور، ماکوک، هەندرێن، کاروخ، ئاسوس، مالیموس..

- گوندەکانی: موزەلان، پلەمیە، بیملانە، بیشەمسی، سونی، دیرکی، شاورتە، گەلیشم، گارە، هەدن، بیشوش، بیسوش، بیعوات، سفرە، زەرون، هەلەدن، مالومە، چوخماخ، گاپیلون، ولاغلو..

- شارەکانی: سلوپی، وان، گەوەر، سەقز، دوکان..

- رووبارەکانی: دیجلە، خابور، لیشخابور، هیزل، سەرکەم، زێ، گادەر، گوگسور، سیروان..

ئێمە ئەم ناوانە لە چی وەرگیراون و، سەر بە چ زەمان و زمانێک بوون و، چۆن کەوتوونەتە سەر زمان؟

دانیشتوانی ناوچەکان خۆیان بۆ زۆر لەم وشانە مەعنا ئەدۆزنەوە و، لێکی ئەدەنەوە، بەڵام زۆری تێکەڵاوە بە ئەفسانە و سەرگوزشتەی ناڕاست، پشت ئەستوور نیە بە هیچ بەڵگەیەکی زانستی. ناوی شوێن لە زمانی کوردی دا ئەهێنێ لێکۆڵینەوەی زمانەوانی قووڵی لە چەند لایەنەوە لە سەر بکرێ، وەکو:

١. تەئسیری زمانی هێزە داگیرکەرەکان و، گەلانی خاوەن فەرهەنگی بەرز، لە سەپاندنی وشەکانی زمانی خۆیان دا بە سەر ناوی شوێنەکانی کوردستان دا.

٢. ساغکردنەوەی بنچی وشەکان و، گۆڕان و گەشەکردنیان، لە باری مەعنا و فۆنەتیکەوە، لە کۆنەوە تا ئێستا.

*

لە گەورەدێ بارەکاڵمان خست و، ئەوی زیاد بوو شاردمانەوە. ئەرکێکی قورسمان لە کوڵ بوەوە و، هەناسەیەکی ئاسودەییمان هەڵکێشا. گەورەدێ یەکێ لە گوندەکانی ناوچەی جالەتی بوو. ژیانی دانیشتوانی لە سەر چراڵە بادەم و، ئاژەڵداری بوو. کانی و ئاوی خۆشی هەبوو، بەڵام زەوی‌وزاری کشتوکاڵی کەم بوو.

ناوچەی جالەتی پێک هاتوە لە ژمارەیەکی زۆر گوند و ئاوایی گەورە و ئاوەدان. سەرێکی کارێزە، کونەماسی، گاپیلون، گەرەدێ، گەورەدێ و سەرەکەی تری دوڵمازەلە، قەڵەم پاشا، سابورا، ترەزاوا و دوکانە. بالغ، چوخماخ، مالومە، هەلەدن، باخسەمەر،

چالاوا، سەرگەلو، سێکانیان، سێدەر، شارستێن، باخێیان، خورخورە، سەرمەرە، قەمچوغە، سورداش، هومەرقەلەم و تەلان لە گوندە قەرەداغەکان و، قومرغان، مەولان، گوێزیلە لە ئاوایییە بچووکەکانی بو. ماوەیەکی زور «سورداش» ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە بوە، تا گزمی دوکان دروست کرا و، لە سەرەتای شەستەکانەوە دوکان لە گوندێکی بچووکەوە بو بە شارێکی گەورە و، ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە.

بویە پێی ی ئەلێن: «ناوچەی جافەتی» چونکە دانیشتوانی ناوچەکە خویان بە تیرەیەکی جاف دائەنێن، بەڵام لە ناو جاف دا بەمانەی تیرە ئەڵێن: «جافە رەشکە». جگە لە جاف، لە هەندێ لە گوندەکانی ناوچەکەدا بنەماڵەی شێخانی لێ یە وەکو: کاریزە، بەردەشێن، سەرگەلو، چوخماخ.

ناوچەکە شاخاوی و بەردەڵانە و «ئاوی سەرزەوی» کەمە. چینەکانی ئەرزەکەی وا دروست بوە بە ئاسانی ناگاتە ئاو و، «ئاوی ژێرزەوی» ی زور لە قوڵایی دایە. چەندین چەم و ڕوباری گەورە لە نزیکی هەیە و، «گزمی دوکان» یش کەوتوتە لای ڕوژئاوای. بە هوی بەرزی ئاستی ئەرزی ناوچەکە لە چاو ئاستی ئاوی ڕوبارەکان و گزمی دوکان دا، ئاوی ناگاتێ. ئاوی هەندێ لە گوندەکان بە تەنیا بەشی خواردنەوەی خویان و ئاژەڵەکانیان ئەکا.

ئاو و ئەرزی بەراوی بو کشتوکاڵ کەمە. بو ڕەزی ترێ و چوالەی دیم و، سماق و، هەندێ میوەی وەکو قەیسی و هەڵهێر و، بە خێوکردنی ئاژەڵ لە بارە. لە شاخەکان لەوەڕگای باشی لێ یە. چەندین شیو و دوڵی تێ دایە ئەکرێ ئاوی باران و بەفراوی تێ دا کو بکرێتەوە. خورخورە و باخێیان بە پەنیری باش و بە تام بە ناوبانگن، لە بەهاران دا «پەنیری سەلک» و لە پایزان دا «پەنیری پێستە» دروست ئەکەن.

ناوچەی جافەتی ناوچەیەکی سەخت و عاسێیە کەوتوتە ناو زنجیرە چیاکانی چەرماوەند، گوجار، ژێلولان، ئاسنگەران، سارا و قەرە سردەوە.

*

بەنداوی دوکان یەکێکە لە پروژە گرنگ و ستراتیجییەکانی عێراق. ئەگەر کەڵکی بو عێراق هەبوبێ ئەوا زیانی لە کورد داوە.

گزماوی دوکان ۷۰ هەزاردونم زەوی بە پیتی کشتوکاڵی ۷۳ گوندی دەشتی بیتوێنی داپوشیوە، لە ئەنجامی ئەمەش دا ۱۲۳۷ خێزان بو شوێنانی تر گوێزراونەتەوە. جگە لەوەش چەندین جێ ی پڕ شوێنەواری کونی کردوە بە ژێرەوە.

جوتیارانی کوردستان، تەنانەت جوتیارانی دەوروبەری گزماوی دوکانیش، بویان نیە بو ئاودێری کەڵک لە ئاوی ئەستێلی دوکان وەربگرن. یەکەمیان لە بەر ئەوەی

حکومەتی عیراق ڕێگایان نادا، دوەمیان چونکە ئاستی ئاوەکە لە ئاستی ئەرزەکانی ناوچەکە نزمترە.

لێرەدا بە کورتی هەندێ زانیاری پێویستی لە سەر ئەنوسم کە لە باسێک دەرم هێناوە شورش حاجی، کاتی خۆی لە سەر داوای من، لە سەر ئاوەکانی کوردستان ئامادەی کرد بو.

- یەکەمین لێکۆڵینەوە لە سەر پرۆژەی دوکان لە سالی ١٩٣٨ دا لە لایەن «دامەزراوی ویلسون» ی بەریتانییەوە کراوە. ڕاپورتەکەی ئەمان لە سالی ١٩٤٦ دا درا بە دەستەیەک شارەزای تر، ئەوانیش دکتور سعاتسفیلد هێگن یان ڕاسپارد لێ ی بکۆڵێتەوە.

هێگن لە ناو چوار شوێن دا تەنگی دوکانی هەلبژاردە، چونکە چینە بەردەکانی قایم و باش و، تەنگەکەش قوڵ بو، لە «دەرزی کەمتاوی» دا پانایییەکەی ٤٠ م و، لە «دەرزی زورئاوی» دا ١٠٠ م ئەبی و، لاشانەکانی شاخەکە ستونیین. ئەمانە هوی لە بارن بو دروستکردنی بەنداو لەم ناوچەیەدا.

- بەنداوی دوکان لە تەنگی دوکان دا لە سەر زێ ی بچوک دروست کراوە. ٦٠ کم لە خوارووی ڕوژئاوای شاری سلیمانی و، ٨٠ کم لە سەرووی ڕوژهەلاتی شاری پردی داپە. ١٨٠ کم لە دواوانی زێی بچوک و دیجلە و، ١٠٠ کم لە کەرکوک و ٣٠٠ کم لە بەغداد، دورە.

- لە ١٩٥٤/٢/٣ جێبەجێ کردنی پرۆژەکە درا بە کومپانیای «دی میز» ی فەرەنساوی بە تێچونی ٨,٨١٧,٤٦٠ دینار. ئەبوایە لە ٤٠ مانگ دا واتە لە حوزەیرانی ١٩٥٧ تەواو بێ، بەلام بە هوی لافاوە چاوەڕوان نەکراوەکانی سالانی ٩٥٤ و ٩٥٧ تەواو بونی پرۆژەکە دواکەوت بو حوزەیرانی ١٩٥٩.

لە شوباتی ١٩٥٩ هوە ئاوەکەیان گرتەوە. بەلام لە ئەیلولی ١٩٦٠ دا دەرکەوت بن دیواری بەنداوەکە ئاو ئەدزێ. کومپانیای دوکراکو بو چارە کردنی، بەربەستێکی پڕکردنەوەی بە درێژی ٣٤٠ م دروست کرد. بە ئەنیشتەکانیەوە گەیشتە ٢٤٥٠ م.

- لاشەی بەنداوەکە پێکهاتوە لە دیوارێکی گەورەی خەرسانە، لە سەر شێوەی کەوانە. درێژاییەکەی ٣٦٠ م و، بەرزاییەکەی لە بناغەوە ١١٦,٥ م و ئەستوری بناغەکەی ٥٤ م لە ژێرەوە «واتە لە بن زێ یەکە» ٣٢,٥ م و لە سەرەوە ٦,٢ م.

بەرزی ئاوەکە لە بەردەم سەدەکە ١٠٠ م و لە ئاستی دەریاوە ٥١١ م، بەرزی لوتکەی سەدەکە لە ئاستی دەریاوە ٥١٦ م. درێژی نیوەتیرەی کەوانەکە لە روی پێشەوەی ١٢٠ م.

- کۆی گشتی تێچووی هەموو سەدەکە و پاشکۆکانی و کارە تەواوکەرەکانی گەیشتوەتە ٢٣ ملیۆن دینار.

- عێراق لە پلانەکانی بەنداوی دوکان چەند مەبەستێکی هەبوو:

١. کۆکردنەوەی ئاوی بارانی وەرزی زستان و بەفراوی بەهاروو، بە کارهێنانەوەی لە وەرزی هاوین و پاییز کاتی وشکی دا.

٢. نەهێشتنی مەترسی لافاوی بەهارانی زێ ی بچووک.

٣. بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا.

٤. پەروەردە کردنی ماسی و مەلی ئاوی.

٥. گەشتوگوزار.

- درێژایی ئەستێلی ئاوی دوکان ٤٠ کم و پانایییەکەی ٢٠ کم ە.

ئەو کاتەی بەرزیی ئاوەکە لە ئاستی دەریاوە ئەگاتە ٥١١ م، ئەستێلەکە ٦.٨ ملیار م٣ ئاوی تێ دا کۆ ئەبێتەوە و ڕووبەرەکەی ئەبێ بە ٢٧٠ کم ٢.

بەشێکی ئاوەکە پێی ئەوترێ «ئاوی مردوو» چونکە بۆ «ترسبات» بە کاردێ و ئەکەوێتە ژێر ئاستی ٤٦٩ م و ئەگاتە ٠.٧ ملیار م٣. بەشەکەی تری کە لە نێوان ٤٦٩-٥١١ م دایە و ٦.١ ملیار م٣ ئەبێ پێی ئەوترێ «ئاوی زیندوو» چونکە سوودی لێ وەرئەگیرێ.

بەشێ لە ئاوی ئەستێلەکە ئەبێ بە هەڵم و بەشێکی تری بە ناخی ئەرزدا ئەچێتە خوارێ، بەڵام ئەمە لە چاو زۆریی ئاوی گۆمەکەدا شتێکی کەمە.

ئەم ژمارانە بە پێ ی ساڵ و زۆر و کەمی ئاوەکە ئەگۆڕێن.

- لە دامێنی سەدەکەدا ٥ گوڵجی ئاسنین بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا دانراوە. تیرەی هەر گوڵجێکیان ٣.٦٥ مەترە، ١٢٠ م٣/س ئاوی پیا ئەڕوا و، توربایینێک و جەنەرەیتەرێکی تێ دا دانراوە، بە هەر پێنجیان توانای بەرهەمهێنانی ٥ X ٨٠ = ٤٠٠ میگاوات کارەبایان هەیە.

*

ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان کورد دەسەڵاتی هەبوو قازانجی لەوەدایە: ئەستێلەکەی دوکان لە ئاو خاڵی بکات و، ئەو ئەرزانەی ژێرئاو کەوتوون بۆ کشتوکاڵ بە کار بهێنێ و، هەموو داوودەزگاکانی بەنداوەکە بکاتە پرۆژەی توریستی. بە درێژایی زێ چەندین جێگای تر هەیە بۆ کشتوکاڵ کەمتر بەکار ئەهێنرێن، بەڵام ئەتوانرێ بۆ کۆکردنەوەی ئاو سوودیان لێ وەربگیرێ.

لە سەردەمی شێخ مەحمودا دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەشداری شۆڕشەکانی کورد بون. شێخ مەحمود، دوای ئەوەی سلێمانی بە جێ هێشتوە، ماوەیەک لە ئەشکەوتی «جاسەنە» بوە و، بارەگای سەرکردایەتی ئەوردوی کوردستان و، چاپخانەکەی سلێمانی بۆ ئەوێ گواستوتەوە. ٣ ژمارەکەی «بانگی حەق» لە ئەشکەوتی جاسەنە چاپ کراوە. ئەمەش یەکەمین چاپخانە و ڕۆژنامەی ئەشکەوت بوە لە مێژوی کوردا. دوای ئەوەی ئینگلیز جاسەنەی بۆردومان کرد و ئەشکەوتەکەی گرت، شێخ مەحمود کشایەوە دولی جافەتی. فڕۆکەی ئینگلیز چەند جاری بۆردومانی ناوچەکەی کردوە و، زەرەری گیانی و ماڵی لێ داون. هەر لەم ناوچەیەدا بوە وەفدێکی شێخ مەحمود و وەفدێکی حکومەتی عێراق، بۆ گفتوگۆ یەکتری ئەبینن. یەکێ لە ئەندامانی وەفدی حکومەت لە ئەندامانی وەفدی کورد ئەپرسێ: «ئێوە دەریاتان نیە. چوار دەورتان بە دوژمن گیراوە. ئەگەر بون بە حکومەت بە کوێ دا هاتوچۆ ئەکەن». یەکێ لە ئەندامانی وەفدەکەی شێخ مەحمود ئەڵێ: «لە حکومەتی ئیسویچەرە (سویسرا) ئەپرسین بە کوێ دا هاتوچۆ ئەکەن»

لە دەسپێکردنی شۆڕشی ئەیلول دا ئەم ناوچەیە بو بە یەکێ لە بنکە سەرەکیەکانی تا لەت بونی پارتی، بارەگای مەکتەبی سیاسی و، لقی سلێمانی لە ئەشکەوتەکەی «مالومە» بو، تا ئاشبەتالیش بارەگای هێزی ڕزگاری لە «سەرگەڵو» بو. بەو هۆیەوە ناوچەکە زۆرجار بۆردومان کراوە. هۆشی کوردایەتی لە ناو دانیشتوانی ناوچەکەدا بە هێز بو.

کاتی خۆی کاکەحەمەی تەلان سەرۆکی جاڵەکانی ئەم ناوچەیە بوە و، دوای ئەوەی لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا لە دەربەندی بازیان ئەو کوژراوە، کوێخا سمایلی برای جێگای گرت بوەوە. کوێخا سمایل لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بو، دوای ئاشبەتاڵ دور خرا بوەوە بۆ «ڕوطبە» لە خواروی عێراق. پەیوەندی خێڵەکیی هێشتا لە ناویان دا ماوە.

سەرەتای شۆڕشی ئەیلول هەندێ لە خەڵکی دولی جافەتی پێشمەرگە ئەبن و، ئەوانیش لە سەنگەرگرتنی ناوچەکانی کانی سارد و ڕێگای دوکان و دەربەندی بازیان دا بەشدار ئەبن. کە فڕۆکەی عێراقی دێتە سەریان و بۆردومانیان ئەکا، پلاوەی لێ ئەکەن. ناحەزەکانیان بۆ گاڵتە پێ کردن، بالورەیەکیان بۆ هەڵبەست بون، ئەیان وت:

یا شێخ سمایلی عەودالانێ

لاکم درێژکەی بۆ هاردانێ

زو بکەمەوە پاخیبانێ

شەرم پێ ناکرێ لە گەڵ ئاسمانێ

بۆ یەکەمین جار، لە تەمموزی ١٩٦٣ دا من ئەم ناوچەیەم دی بوو. بەعس لەو کاتەدا بەو پەڕی دڕندایەتییەوە خەریکی هێرش بوو بۆ سەر کوردستان. ئەو کاتە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی و بارەگای لقی سلێمانی لە ئەشکەوتەکەی مالومە بوو. ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتی و، عەلی حەمدی لێپرسراوی لقی سلێمانی بوو. ئەو زەمانە من خوێندکار بووم لە زانستگای بەغداد، لە سکرتارییەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووم، دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە بەغداوە هەڵات بووم بۆ هەولێر و، بە دەشتی هەولێر و کۆیەدا گەڕابوومەوە ئەم ناوچەیە.

بۆ دووەمین جار، لە شوباتی ١٩٦٤ دا سەردانی ئەم ناوچەیەم کرد بوو. لەو ساڵەدا کۆنگرەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان مان لە مزگەوتەکەی چوخماخ دا بەست. لە سەرانسەری عێراقەوە نوێنەری قوتابیانی کورد بەشدار بوون، تەنانەت لە شارەکانی خوارووی عێراقەوە وەکو نوعمانیە، قەلعەصالح و عەمارە نوێنەری ڕێکخستنەکانی یەکێتیی قوتابیان هات بوون. عەلی حەمدی و مەحموودی حاجی تۆفیق لە کردنەوەی کۆنگرەکە دا بەشدار بوون. ئێمە لە کۆنگرە بووین، کە ڕاگرتنی شەڕ لە نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتی عێراق دا ڕاگەیەنرا و، گفتوگۆی بارزانی - عارف دەستی پێ کرد. ئەوەش سەرەتای لەت بوونی پارتی و، هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ بوو.

لەوساوە تا ئێستا ناوچەکە هەندێ ئاڵوگۆڕی بە سەردا هات بوو. بە تایبەتی ئەوسا ناوچەکە دارودەوەنی زۆر زیاتر بوو. دوڵەکە داری زۆرتری تیا بوو، ئێستا ڕووت بوو بوو. بەرووبومی ئابووری ناوچەکە کەم و، ئاستی گوزەرانی دانیشتوانی نزم بوو. «خەڵوز کردن» لە کۆنەوە یەکێ لە پیشە پڕ دەرامەتەکانی خەڵکی ناوچەکە بوو. خەڵوزەکانیان لە بازارەکانی سلێمانی و کەرکوک دا ساخ کردووەتەوە. خەڵوز داری ناوچەکەی کەم کرد بووەوە.

*

سەرەتای شۆڕشی حوزەیران ژمارەیەکی زۆر لە پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە بوون بە پێشمەرگە. کوێخا عەبدوڵڵای چوخماخ، عەبدولقادری هەڵەدنی، سلێمی قەڵەم پاشا، لەتی سمایلی باخچیان، حاجی عەزیزی قامیش، حاجی سلێمی قامیش... ئەمانە زۆریان لە سەر داوای عەلی عەسکەری چەکیان هەڵ گرت بوو، بەڵام کەمال کەرکوکی و شێرکۆی شێخ عەلی سەرگەڵو کە ئەندامی ق م بوون، لە ئێرانەوە دێنەوە و، چوونە بن کلیشەیانەوە هەندێکیان، بە نامەی ئیدریس و، بە پارە و، بە پلەی سیاسی و پێشمەرگایەتی بەرز، تەفرە دابوون کرد بوویانن بە قم لەوانە: لەتی سمایلی باخچیان و سلێمی قەڵەم پاشا.

جەیشی عێراق چەند لەشکرکێشییەکی بۆ سەر ناوچەکە کرد بوو. هێرشەکانی

جـمیش یەک لە دوای یەک بەردەوام بو. جـمیش لە هەرچی یەک ئەشکا، یا هیـچی دەس نەئەکەوت، تولەی لە خەلک ئەکردەوە. لەم هیرشـانەدا چەندین هاوولاتی لە گـوندەکـانی: شارستین، باخچیان، سیدەر، هەنجیرە، سیکانیان، دولەبی، خورخورە، قامیش، سەرگەلو، سەرتەنگ... کوشت بو. لەوانە: مەلای گوندی شارستین: حاجی مەلا رەسول مستەفا و، مەلای گوندی خورخورە: مەلا مـحەمـود ئیسمـاعیل. لە شـارسـتـین ٦ کـەسیـانو و چەند پیـاویکی کوشت بو. لەم هیرشـانەدا بە زوری هالیکوپتەریان بە کار ئەهینا. گوشـاریکی زوریان خست بوە سەر دانیشتوانی ناوچەکە و، پیشـمەرگەکانیـان بە تەواوی سەغلەت کرد بو. سـەختـی ناوچەکـە لە بەردەمی جـموجـولی هالیکوپتەردا کـەلکیکی ئەوتوی نەمابو. «لاکی دریژ بو ئـاوردان بەرەو باخـچیـان» و ناوچە سـەختـەکـان لە بەرامـبـەر تاکتـیکی تازە داهینراوی سوڕانەوە و هیرش و نیشتنەوەی ئاسانی هالیکوپتەردا کەلکی نەما بو.

لە ئەنجامی ئەم لەشکرکیـشیـیـانەدا زوری ئەوانەی سەر بە قم بون بە سـەرکردایەتی فـەتی سـمایلی باخـچیـان بە کـومـەڵ تەسلیم بە رژیم بونەوە. شیرکوی شیخ عـەلی پیش تەسلیم بوەوە و کـەمـال کـەرکـوکی پیش گـەرا بوەوە ئیـران. بە دوای ئەوانیش دا کـویخـا عەبدوللا و حاجی سەلیم و حاجی عەزیز تەسلیم بونەوە. لە راستی دا ئەمان پیر و بە ساڵا چو بون، فـیـری ئەم جـورە پیشـمـەرگـایەتـیـە نەبوبون و، بەرگـەی ئەو زەحـمەتی و شـاخـەو شاخەیان نەئەگرت، دوای تەسـلیم بونەوەشیان بە دلسوزیی مانەوە، گەنجەکانیان هان ئەدا بچن بە پیشمەرگە و، خزم و عەشیرەتەکانی خویان هان ئەدا هاوکاری لە گەڵ پیشمەرگە بکەن.

*

من کە گـەیشـتـمـە ناوچەکە هەمـو فـەرمـاندەی کـەرت و مـەفرەزەکـان و، کـادرەکـانی هەریمەکەم بانگ کرد.

هەندی لە فـەرماندەکـانی هەریمـەکە لە گـەڵ خوم گەرا بونەوە، لەوانە: عـەبدولقادر هەلەدنی، حاجی مـحەمودی گـەوردەیی، عـەلی ئامـەخان، عوسمـانی قالە مەنوەر، کەریمی دادە مـەنە... ئەوانی تریشم بانگ کرد. ورده ورده هەمـویان پەیدا بون: صـەلاح سـەعـیـد «چاوشین»، جەمالی عەلی باپیر، مـحـمـود «نەبەز»، غـەفور سـەعـیـد «دەرسیم»، حەمـەی مامە سەلام، جەلالی کویخا عـەبدوللا، ئیسمـاعیل گەوردەیی، عـەلی مام ئەحمـەد و، مام ئەحمەدی حاجی محەمەدی قەرەتەپە.

هەریمەکەم گیروگرفت و کیشەی قولی تی دا بو.

- ئەو مـاوەیەی هەمـو بەرپرسـەکـان لە ئیرادوست بون. ئەمـان بە ئارەزوی خـویان کاریان کرد بو. کـەسـیـان کـاغـەزی ئەوی تریانی نەخوینـد بوەوە. بەرتەلایی و پاشاگەردانی

بڵاو ببووەوە. بە زۆر و بە بیانووی پووچ پارەیان لە خەڵک سەندبوو. لە هەندێ جێگا بە بێ سەرج و تاوان لە خەڵکیان دابوو. هەندێکیان سەرسەرییەتییان کردبوو و، بە ئاشکرا عارەقیان خواردبووەوە. ئەمەش بۆ ناوبانگی پێشمەرگە و یەکێتی خراپ بوو.

- یەکەی پێشمەرگایەتی لە یەک نەئەچوو، بە گوێرەی هەر فەرماندەیەک جیاواز بوو، هەندێکیان زۆر و هەندێکیان کەم بوو. لە سەر پلە و پایە ملمڵانێیان ئەکرد و، زۆریان ئەیانویست بە فەرماندەی کەرت ناو ببرێن و، کەمیان هەبوو ئامادە بێ ناوی فەرماندەی مەفرەزە بێ. هەر یەکەیان ئەیویست خۆی بە تەنیا بسووڕێتەوە و، چاوی لێپرسینەوەی کەسێکی لە خۆی سەروتری لێ دیار نەبێ. ناوچەکە پڕ ببوو لە مەسئوول.

- پێشمەرگەکان و فەرماندەکانیان تێکەڵاو بوون لە خەڵکی سلێمانی و، خەڵکی ناوچەکە. شارییەکان و لادێییەکان ناکۆک بوون و، ئامادە نەبوون سەر بۆ یەکتری دانەوێنن. گاڵتەیان بە یەکتری ئەکرد و، کارەکانی یەکتریان تێک ئەدا. هەردووکیشیان بۆ جوڵانەوەکە پێویست بوون. بێ پێشمەرگەی خۆجێی کارکردن لە ناوچەکەدا دژوار بوو.

- هەندێ لە فەرماندە و کادرەکان ئەندامی کۆمەڵە و هەندێکی تریان ئەندامی بزووتنەوە بوون. هەریەکەیان هەوڵی ئەدا پێشمەرگە و ئەندام و لایەنگر بۆ ڕێکخراوەکەی خۆی زیاد بکا. بۆ ئەمەش زۆر جار لە ناو خەڵک دا دژی یەکتری ئەدوان و، ڕێگای ناڕاستیان ئەگرت بۆ بەهێزکردنی خۆیان و لاوازکردنی لایەنەکەی تر.

- لم لەم ناوچەیەدا کز ببوو، بەڵام هێزێکیان لە شارباژێڕ و هێزێکیان لە سورین مابوو. جاروبار بۆ ڕاوەڕووت ئەهاتنەوە بۆ ئەم ناوچەیەش.

حاجی حاجی ئیبراهیم دانرا بوو بە جێگری من و، ڕابەری سیاسی هەرێم. ئەویش کارەکەی خۆی بە دڵ نەبوو. نەئەهاتە هەرێمەکە و، لە ناوچەی نۆکان مابووەوە. زۆری کارەکان کەوت بووە سەر شانی خۆم.

هەوڵێکی زۆرم دا ئەم گیروگرفتانە چارەسەر بکەم. تەبایی لە نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوەدا دروست بکەم. چەند جاری کۆبوونەوەم بە فەرماندەکان کرد و، چەند جارێکیش کۆبوونەوەی گشتیم بە زۆری پێشمەرگەکان کرد. ئەو کاتە، بۆ خۆپاراستن لە هێرشی کتوپڕی هێزەکانی جەیش، ئەبوو شەوەکی لە دێ دەر بچین و، بچینە شوێنێکی نهێنی قایم تا ئێوارە خۆمان حەشار بدەین. لەم ماوەیەدا بە کۆبوونەوە و قسە و باسی سیاسی گشتییەوە خەریکم ئەکردن. زۆر جاریش هەوری تێرە و تاریک و لێزمەی باران و کڕێوەی بەفر، هەلی بۆ ئەڕەخساندین، بە ئاسوودەیی و ئازادی بە ڕۆژ، لە ناو ئاواییەکان دا بمێنینەوە.

ساڵی ١٩٧٧مان بە ڕێ کرد. شەوی سەری ساڵ لە مزگەوتەکەی چۆخماخ بووین.

بۆ ئێمە ئەمشەویش وەکو شەوەکانی تر بوو. «کریسمس» و «سەری ساڵ» لای خەڵکی چۆخماخ و، لای زۆری پێشمەرگەکان هیچی نەئەگەیاند.

ئەوەندەی فریا کەوتم گوندەکانی چۆخماخ، مالومە، هەڵەدن، چالاوا، گوێزێلە، باخەسەر، قزلەر، قەیوان، خەمزە.. گەڕاین. لە گەڵ ڕیش سپی و پیاوماقوڵی ناوچەکە دانیشتم. دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی باش بوون، بە ڕووی خۆشەوە پێشوازییان لی ئەکردین و، لە هەموو ڕوویەکەوە هاوکارییان ئەکردین. بە دڵسۆزییەکی قوڵ و پەرۆشییەکی بێ ئەندازەوە پشتیوانییان لە جووڵانەوەکە ئەکرد. هەر کارێکی سەخت و خەتەرم پێ ئەسپاردن، بە تایبەتی هاتوچۆی سلێمانی، بێ دوودڵی و سڵەمینەوە بۆیان ئەنجام ئەدام.

حاجی قادری مالومە، یەکێ لە کەسایەتییە ناسراوەکانی ناوچەکە بوو. پیاوێکی کوردپەروەر و، دڵپاک و قسە خۆش بوو. بە ناوبردنی وشەی «دیگەل» تووڕە ئەبوو. هەر کەس بیوتایە: «دیگەل» جنێوێکی بە دایکی ئەدا، ئەو کەسە هەر کەسێک بوایە و لە هەر پلە و پایەیەک دا بوایە. زۆرجار سەریان ئەکردە سەری تووڕەیان ئەکرد و، ئەیان ورووژاند. هەندێ جار دوای جنێودان پەشیمان ئەبووەوە و، لە داخانا ئەگریا. بە گەڕانەوەی ئێمە و، گەیشتنی چەکی نوێ و، ڕێکخستنەوەی هێزەکان زۆر خۆشحاڵ بوو. لە ماڵەکەی خۆی میواندارێی کردین و، بۆ ڕۆژێ دوایی چوو بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە خۆشانەیان پێ بگەیەنێ. لە سلێمانی، بە تایبەتی لە ناو بازار دا، ناسیاوی زۆری هەبوو.

حامید حەمە ئەمین، گەنجێکی باخەسەری، کادری ڕێکخستن بوو لە ناوچەکەدا، ئەندامی کۆمەڵە بوو. خۆی بە تەنیا ئەگەڕا و، تێکەڵاوی مەفرەزەکان نەئەبوو. بۆ خۆپاراستن پشتی بە خۆشاردنەوە ئەبەست. چەند کادرێکی لەم بابەتەمان هەبوو. ئەمەش کارێکی ڕاست نەبوو. ئامۆژگاریمان کرد بۆ خۆی بە تەنیا نەبێ و، بۆ سەلامەتی خۆی هەمیشە لە گەڵ یەکێ لە مەفرەزەکان بێ، ئامۆژگارییەکەی لە گوێ نەگرت بوو. لە هێرشێکی جەیش دا بۆ سەر ناوچەکە گیرا. حوکمی ئیعدام درا و، لە موسڵ ئیعدام کرا. لە «زیندانی موسڵ»ەوە چەند نامەیەکی نووسی بوو، نموونەی ئازایەتی بوو.

مامۆستا عەزیز مەحمود، دانرا بوو بە لێپرسراوی لقی کەرکوکی یەکێتی، ئەبوو بچێتە بەری قەرەداخ لەوێوە کارەکانی ئەنجام بدا. ئەیویست لە پێش دا بچێتەوە بۆ سلێمانی پشوو بدا و هاوڕێکانی ببینێ و، لەوێوە بچێتە ناوچەی قەرەداخ. ئەمەم بە هەڵ زانی نامەم بۆ هەندێ لە هاوڕێ کۆنەکانم، لەوانە شازاد و، جەمال تاهیر نووسی. هەندێ «مارک»ی ئەڵمانیم لە مامجەلال وەرگرت بوو بۆ خەرجی هەریەم دام بە عەزیز بیدا بە شازاد بۆمان بکڕێتەوە.

*

زەردە و دەرزی

ئەو هەمو پێشمەرگەکان پێش ئەوەی دنیا روناک ببێتەوە لە خەو هەستان، نانی ٣ ژەم لە گەڵ خۆیان هەڵبگرن و، لە ئاوایی دەرچن و، بچن بۆ شوێنێکی قایمی چۆڵی نەزانراو، لەوێش بە درێژایی رۆژەکە لە حالەتی ئامادەیی دا بن بۆ روبەروبونەوەی هەمو روداوێکی کتوپڕ تا ئێواری.

خۆئامادەکردنی ئێواران بۆ چونەوە ناو دێ، ئینجا بڵاو بونەوە و دامەزران بۆ نان خواردن و، کۆبونەوە بۆ دانانی حەراسەت و کەمینی دەوری دێ و، نوستنی پڕ ترس و لەرز و، دیسانەوە کۆبونەوەی شەوەکی بۆ بە جێ هێشتنی ئاوایی بەرەو شوێنێکی چۆڵی نەزانراو... دوبارەبونەوەی رۆژانەی ئەمسان ژیان هەستێکی ناخۆشی لای هەموان دروست ئەکرد. بۆ ئەوەی توشی بێزاری نەبن و لە ژیانی پێشمەرگایەتی وەڕز نەبن ئەبو رابەری سیاسی یا کادری ناوچەکە باسێکی سیاسییان بۆ بکا، یا شتێ لە ئەدەبیاتی یەکێتییان بۆ بخوێنێتەوە. سەرەڕای ئەوەش، هەندێ کەس پاش ماوەیەک لەم جۆرە ژیانە ماندو ئەبو، ئەگەیشتە بێهودەیی ئەمجۆرە خەباتە. وازی لە پێشمەرگایەتی ئەهێنا.

لە یەکێ لەو هێرشانەدا کە جەیش و جاش بەردەوام بۆ ناوچەی قەرەداغیان ئەکرد، دو پێشمەرگە: یەکێکیان لادێی و نەخوێندەوار و، ئەوی تریان شاری و خوێندەوار، بۆ ئەوەی خۆیان لە هێرشەکە بشارنەوە، پێکەوە بە «شاخی زەردە» دا هەڵئەگەڕێن. پێشمەرگە لادێییەکە ناوی : شاهۆ (حەمەی ئەلە) بو، خەڵکی گوندی «دەرەدزێن» بو لە لوتی بابای لای دەربەندیخان. هەمو ژیانی خۆی لە شاخ بە سەر بردبو. لە ئاشبەتالەکەش دا نە چو بو بۆ شار. خوێندەوارەکە، خەڵکی سلێمانی و دەرچوی کولیجی ئاداب و، لە رێکخستنی کۆمەڵە بوبو، لە کتێبە سورەکەی «ماوتسیتونگ» دا، چەپۆکی پیاوە پیرەکەی خوێند بوەوە کە چۆن کێوێکی لە بن هێنا بو. لە گەڵ ئەوەش دا لە شاهۆی پرسی بو: «زەردە بە دەرزی کون ئەکری؟!»

شاهۆش وەڵامی دابوەوە: «زەردە چۆن بە دەرزی کون ئەکری؟!»

خوێندەوارە شارییەکە وت بوی: «ئێشەکەی ئێمە وەکو ئەوە وایە زەردە بە دەرزی کون بکەین!»

هەندێکی تر قسەی لەم بابەتەی بۆ شاهۆ کرد بو تا روخاند بوی و، بە یەکەوە چوبون بۆ دەربەندیخان تەسلیم بونەوە. شاهۆ پاش چەند رۆژێ پەشیمان بوەوە و گەڕایەوە شاخ، سەرلەنوێ بوەوە بە پێشمەرگە.

لە گەڵ هەموو ئەو ناخۆشییەدا، هەمیشە ئەوانەی ئەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی زۆرتر بوون لەوانەی وازیان لە پێشمەرگایەتی ئەهێنا. هێزەکە تا ئەهات زیادی ئەکرد و گەورە تر ئەبوو. مەفرەزەکان ئەبوژانەوە و قەرەباڵغ ئەبوون و، بەری ئەگران بۆ سنووری چالاکی خۆیان.

*

دوژمن هێزێکی درندەی مەشق دادراوی گەورەی هەبوو. بەڵام ئێمە فێرگەیەکمان ئەبوو پێشمەرگەی نوێ مەشقی تێ دا بکا. زۆر لەوانەی ئەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی بە کار هێنانی تفەنگ و ئەرکەکانی پێشمەرگایەتییان نەئەزانی، چ جای شەڕ و، هێرش و، خۆپاراستن و کشانەوە.

هەموو فەرماندەی مەفرەزەیەک ئەبوو وەکو مامۆستا پێشمەرگە تازەکان فێری کردنەوە و بەستنەوەی تفەنگ و، پاککردنەوە و، بەکارهێنانی بکا. هەروەها فێری ئیشک گرتن و، ڕێگاڕۆیشتنی شەوانە و ڕۆژانە و، دەرچوون و وریایی و چاو هەڵستنی بەیانیان بکا... زۆر شتی تریش ئەبوو خۆی لە ژیانی ڕۆژانە و لە تێکەوتن و دەرباز بوون و بۆسەدا فێر بێ.

*

لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی دا، عومەری حاجی عەبدوللا بە فەرماندەی هەرێمی قەرەداغ و، ئەنوەری مەجید سوڵتان بە فەرماندەی هەرێمی دەشتی کەرکووک دانرا بوون.

بەڵام ئەنوەر ئەو بەرزکردنەوەیەی بە دوورخستنەوە دائەنا لە ناوچەکە. وەکو خۆی ئەیوت: حەزی ئەکرد بە پێشمەرگایەتی لە شارباژێر بمێنێتەوە، نەک بەرزترین پلەی پێشمەرگایەتی لە ناوچەیەکی تر بەرێتی. لە سەر داوای کۆمەڵە بۆ بوو بە پێشمەرگە و، لە سەر پێشنیاری سەرانی کۆمەڵەش، دوای مشتومڕێکی زۆر لە گەڵ سەرانی بزووتنەوە، دانرا بوو بە فەرماندەی هەرێمی کەرکووک، بەڵام ئەنوەر خۆی پەرۆشی هیچ «ئیلتیزامێکی» حیزبی نەبوو. هەر لە شارباژێر مایەوە.

ئەنوەر لە جەیشی عێراق دا ئەفسەر بوو، لە شۆڕشی ئەیلوول دا بوو بوو بە پێشمەرگە. کوڕێکی ئازا و دەستپاک و دڵسۆز بوو. بەڵام کابرایەکی ساویلکە و کەللەڕەق بوو. ئەوانەی لە گەڵی بوون بە ئاسانی کاریان تێ ئەکرد. زۆری حەز لە ئازاردانی خەڵک ئەکرد. ئەچوو بۆ هەر دێیەک چەند کەسێکی فەلاقە ئەکرد و ئەشکاند. لای وابوو مەسئول بەوجۆرە هەیبەت پەیدا ئەکا. هەوڵێکی زۆرم لە گەڵ دا وازی لەم خووە خراپە بهێنێ.

بە درێژایی ڕێگا لە گەڵ عومەر پێکەوە بوون، هیچ ئارەزوویەکی ئەبوو بچێ بۆ

قەرەداغ و کاروباری هەرێمی قەرەداغ وەربگری، تاقمێ لە پێشمەرگایەتی چو بو ئەبوێست ڕیگە بدری بچی بو دەرەوە. حەزی ئەکرد جاری هەر لە گەڵ من بمێنێتەوە. ئەوی ڕاستی بی بو من یارمەتیدەرێکی باش بو. لەو ڕووەوە نامەمان بو کاک ئارام نوسی و، من بیروراکانی خومم دەربارەی هەلومەرجی کوردستان و جولانەوەکە بو ڕوون کرد بوەوە و، هەولم دابو زور لەو قسە ناڕاستانەی پی یان گەیاند بو، ڕاست بکەمەوە. وەلامی نامەکانی بو نوسینەوە و، مەفرەزەیەکی نارد بو بەشی هەرێمەکەیان لەو چەکانەی هێنا بومان بویان بنێرین. مەفرەزەکە ڕیتی بو لە شەماڵ (شێخ محەممەدی شێخ مەحمودی باخ)، ڕوستەم (حەسەن حەمید) و ئازد محەممەد غەریب و، چەند پێشمەرگەیەکی تر. بەشەکەی خویان وەرگرت و گەڕانەوە. لە گەڵ کاک ئارام وا ڕیک کەوت بوین، دوای ڕیکخستنەوەی کاروباری هەرێمی قەرەداغ بپەڕێتەوە بو لای ئیمە و ماوەیەک بە یەکەوە بین.

*

سەرەرای تەرونوشی هەوا، ناوبەناو هێزەکانی جەیش هێرشیان ئەهێنایە سەر گوندەکان و بو دوزینەوەمان بە هالیکوپتەر دائەبەزین. ئیمە هەولێکی زورمان ئەدا تووشی شەر و پێکادان نەبین. بو ئەو مەبەستە حسابی سنوری جولانی لیواکانی ناوچەکەمان کرد بو. لە سنوری هەر لیوایەک دا چەند ڕوژیکی کەم زیاتر نەئەمانەوە. هەر کە ئەمان زانی زانیاری تەواو گەیشتوتە ئیستیخباراتی لیوا و کاتی پەلاماردانمان هاتوە، ئەمان گویزایەوە بو سنوری لیوایەکی تر. بەمجورە خومان لە ڕووبەڕووبونەوە ئەپاراست. لە گەڵ ئەوەش دا لە هەندی شوین هەندی هێزی بچوکمان تی ئەکەوتن و توشی شەر ئەبوین.

*

کاروباری هەرێمەکەم تا ئەندازەیەک ڕیکخستەوە. فەرماندەی کەرتەکان و مەفرەزەکانیان و، سنوری کارکردن و، دەسەڵاتەکانیانمان دیاری کرد. خومان ئامادە کرد بەرەو شارباژێر بچین.

جادەی سلیمانی - چوارتا ناوچەی جافەتی لە ناوچەی شارباژێر جیا ئەکردەوە. شارباژێر خوی ناوەکەی سەیرە: «شار» و «باژێر» هەردوکیان یەک مەعنایان هەیە. پی ئەچی کاتی خوی بازاری کڕین و فروشتن لەم ناوچەیەدا بوبی، بە تایبەتی چونکە سەردەمێکی درێژ بنکەی ئەمارەتی بابان لە قەلاچوالان بوە.

ئیوارەیەکی درەنگ چوینە «سەرمەمیرگ» و، شەو بە ناو «تەگەران» دا لە جادەکە پەڕینەوە بو ناوچەی شارباژێر. ڕوناکی چراکانی شاری چوارتا، ناوەندی قەزای شارباژێرمان، لی دیار بو. لە سەردەمی ئەمارەتی بابان دا «قەلاچوالان» و، لە سەردەمی تورک دا

«سەنەک» ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی شارباژێر بوە. دوای تێشکانی شۆرشی شێخ مەحمود، ئینگلیز ناوەندی قەزاکەی گواستوتەوە بۆ «چوارتا».

پەیوەندی کۆمەلایەتی لە شارباژێر پێشکەوتوتر بو لە چاو ناوچەکانی تردا. تیرە یا هۆزێکی کۆمەلایەتی دیاریکراو لە ناوچەکەدا زاڵ نەبو. بەلام ژمارەیەکی زور بنەمالەی شێخ لە هەندێ لە دێهاتەکانی دا هەبون. زۆری جوتیارەکان خاوەنی زەوی و رەز و باخی خۆیان بون و، میوە بەرهەمێکی سەرەکییان بو.

شاباژێر نزیک بو لە سلێمانیەوە. هاتوچوی خەلکی ناوچەکە لە گەل شاری سلێمانی دا لە کۆنەوە بەهێز بو، هەندێ لە گوندەکانیشیان لە چاو گوندەکانی هەندێ ناوچەی تردا پێشکەوتوتر و خۆشتر بو، خوێندەوارێشیان زورتر بو. لە هەندێکیان دا قوتابخانە، نەخۆشخانە، حەمام، دوکان و چاپخانەی تێ دا بو.

لە شارباژێر بە پێچەوانەی ناوچەی جافەتییەوە پێشمەرگەی خۆجێی مان کەم بو. زۆری فەرماندە و کادرەکانی خەلکی سلێمانی خۆیان بو ئەم ناوچەیە ئەگوتا و، لەم ناوە کۆ بوبونەوە. دەستیان وەرتەدایە کاروباری یەکتریەوە. بو ئەوەی خۆیان جێگەیان پێ لێژ نەبی، حەزیان نەئەکرد خەلکی ناوچەکە بێن بە پێشمەرگە و، لە پلەی پێشمەرگایەتی دا سەر بکەون. چنگنیان، بزەینان، عازەبان، گورگەدەر، ویلەدەر و، بناویلە... لەو گوندانە بون کە بە زۆری پێشمەرگەکانی سلێمانی لی کۆ ئەبونەوە. شایەکەی «بناویلە» مەسەلەیکی مەشهورە. پیرەمێرد لە «گالتە و گەپ» دا بە درێژی باسی کردوە.

ناوچەکە چەند شاخێکی گەورەی لی یە.

گوندەکانی چنگنیان، نودێ، باراو، حاجی مامەند، پارەزان، دولەبەر، هەرمێلە و هەولو لە دەوری شاخێکی بەرزدا دروست کرا بون، ناوەراستەکەی گەلی بو. «گەلی» دێ یەکی چەند مالی بو بە هوی هەرەسی بەفرەوە ویران بوبو. شاخەکە دار و دەوەنی چڕ و پڕی لی ما بو. دانیشتوانی هەندێ لەم گوندانە هەمو شێخ بون. زانای بە ناوبانگ؛ «شێخ مارف» لە گوندی نودێ لە دایک بوە.

شاخێکی تریان «کەتو» ە. کەتو شاخێکی دابڕاوە لە شاخەکانی تر، بەلام سەخت و پڕ لە دارە. لە پەلپاکان دا مەکۆگای خولە پێزە و چەتەکانی بوە.

شاخێکی گەورەی تر «کوڕەکاژاو» ە. وشەی «کوڕ» لە ناوی چەند جێگای تریش دا بەر گوێ ئەکەوێ، وەکو : کوڕە کاژاو، کوڕە داوێ، کوڕ کوڕ، کوڕپەس، کوڕی گەپلە، کوڕەک...

قم له ناوچەی سلیمانی

هێزەکانی قم کشابونەوە بو سیوەیل. خویان لە گوندەکانی شاخی سورکیو قایم کرد بو. لە مەلبەندەکانی سوران دا لە چەند جیگایەکی کەم مابون یەکیەکیان ئەم ناوچەیە بو. عەبدولمەلیک عەلی عوسمان و ستاری سەعید خەلەف لە بەرپرسە ناسراوەکانیان بون. ستار لە سەر داوای کومەلە و عەبدولمەلیک لە سەر داوای یزوتنەوە هات بونە شاخ و بو بون بە پیشمەرگە. لە سەر ئەوەی پلەی بەرزی لیپرسراوەتیان نەدرا بویە؛ وازیان لە یەکیتی هینا بو، بوبون بە قم.

ئەم تاقمە جگە لەوەی لە رووی سیاسییەوە لە گەل ئیمە ناکوک بون، وەکو باندیکی ناسیاسی جەردە رەفتاریان لە گەل خەلک ئەکرد. خەریک بون ئابروی شورش و پیشمەرگایەتیان ئەبرد. پارەی زوریان لە خەلک ئەسەند. ریگایان بە کاروانی قاچاقچی ئەگرت. لە خەلکیان ئەدا. خەلکیان ئەکوشت. لەوەش خراپتر دەستدریژیان ئەکردە سەر ناموسی خەلک و، لە مالی هەندی لە پیاوماقول و ریشسپیەکانی ناوچەکەدا بە تزیزی بەزمی خواردنەوە و رابواردنیان ساز ئەکرد.

ئیتر کاتی ئەوە هات بو چارەسەر بکرین.

چەند نامەیەکمان بو نوسین کە: یان بگەرینەوە ریزی یەکیتی، یان ناوچەکە بە جی بهیلن برون بو بادینان، یاخود خویان بو شەر ئامادە بکەن. بە دریژی باسی رەفتاری قم مان بەرامبەر پیشمەرگەکانی یەکیتی و، کوشتنی ئیبراهیم عەزۆ و، هاوریکانی و حەسەن خوشناو و هاوریکانی مان بو نوسی بون. هێزەکانیشمان کو کردەوە و سازمان دان بو پەلاماردان و راونانیان. کەریمی دادە مەند دوستی ستار بو نامەکانی برد و هەندی راسپاردەشی پی بو پیهیان بلی. ستار و هێزەکەیان کوبونەوەی ناوخویان کرد بو بریاریان دا بو تەسلیم بینەوە.

کەریم وەلامی نامەکانی هینایەوە. ستار نامەی بو چەند کەسی نوسی بو لەوانە: مامجەلال، عەلی عەسکەری، طاهیری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوللا و، من و چەند ناسیاویکی پیشمەرگەی. لە نامەکانی دا زور بە کورتی و دوستانە نوسی بوی: باوەری بە قم نیە تا لە سەر ئەوان شەر لە گەل یەکیتی بکات، بە جوانیشی نازانی بیتە ناو یەکیتیەوە، لە بەر ئەوە مەیدان بو پیشمەرگەکانی یەکیتی چول ئەکات، خوی و هەمو ئەوانەی بە قسەی ئەکەن تەسلیم ئەبیتەوە. پیوەندیان لە گەل حکومەت کرد. چەند هالیکوپتەریکیان بو ناردن بو ... لەوی خوی و عەبدولمەلیک و هەمو پیشمەرگەکانی لەگەلیان بون بە کومەل سواری هالیکوپتەر بون رویشتنەوە.

ئەم خەمەمان بە بێ ماندو بون لە کۆڵ بوەوە.

عەلی چوارتایی زۆ خۆی لێ دزی بونەوە و نامەی بۆ ئێمە نوسی بو کە: ئەو نایەوێ تەسلیم بە ڕژێم ببێتەوە و، ئەیەوێ بێتە ناو ڕیزی پێشمەرگەکانی یەکێتیەوە خزمەتی گەلەکەی بکا. جەمالی عەلی باپیرمان نارد بۆ پێشوازی و بەخێر هێنانی. عەلی چوارتایی هاتە ناو پێشمەرگەکانی یەکێتیەوە. پێشمەرگەیەکی لێوەشاوە و وریا بو. شارەزایی زۆری لە هەڵگرتنەوە و دڵتانی مین دا هەبو. کرایە فەرماندەی کەرت و دوایێتر بە فەرماندەی تیپ. بە دڵسۆزی و ئازایەتی ئەرکی قورسی پێشمەرگایەتی بە جێ هێنا تا شەهید بو.

جگە لەم تاقمەی تەسلیم بونەوە کە نەتوانرا بە هێزی سەرەکی قەڵاچۆ بکرێن و بۆ پیرمەرد برێن، دو تاقمی تریان مابون: تاقمێکیان پاشماوەی ئەوانەی تورکان بون لە دەوروبەری سەردەشت خۆیان پەنا دابو. ئەوی تریان بە سەرکردایەتی نادر هەورامی بنکەیان لە شاخی سورێن بو، کە تەنگاویش ئەبون ئەچونە دزلی و مەریوان لە ئێران.

هێزەکانی هەرێمی پشدەر چونە سەر ئەوانەی ناوچەی سەردەشت. پاش کەمێ تەقوتۆق هەندێکیان گیران و هەندێکیان چون بۆ قوڵایی ئێران و، ئەوانی تریان هاتنە ناو ڕیزی یەکێتیەوە. هەڵوەشاندنی هێزەکەی نادر هەورامیش بە هەرێمەکەی کاک طاهیر سپێردرا بو. بەڵام کاک تاهیر هێشتا لە لای م س بو نەگەرا بوەوە هەرێمەکەی خۆی.

*

قولەی ئەدەبی کوردی

هەندێ کەسم ڕاسپاردە بو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردی و عەرەبییەکانمان بۆ بنێرن. هەمو ڕۆژ چەند جارێ ئۆتومبێل لە سلێمانیەوە ئەهات بۆ گوندەکانی شارباژێر، بە تایبەتی بۆ چنگنیان. ئەمە لە لایەکەوە ئازایی هەبو، ئاگاداری هەواڵەکانی سلێمانی ئەبوین و، پێویستییەکانیان بۆ ئەهێناین، لە لایەکی ترەوە زیانی هەبو چونکە هەواڵەکانی ئێمەش بە ئاسانی و خێرایی ئەگەیشتەوە حکومەت.

ڕۆژێکیان تۆپەڵێ گۆڤار و ڕۆژنامەم بۆ هات بو. یەکێکیان گۆڤاری کوردی «بەیان» ی بەغدایی بو. لە لاپەڕەی دوایەرگی گۆڤارەکەدا نوسینێکی کورتی تێ دا بڵاو کرا بوەوە بە بۆنەی کۆچی دوایی کابرایەکەوە، وەکو نوسەرێکی گەورە و ڕۆژنامەوانێکی زل و ئەدیبێکی مەزنی... کورد زۆریان هەڵ دا بو. من ئەو ناوەم هەرگیز نە بیست بو. لە دڵی خۆما وتم: ڕەنگە ئەو ماوەیەی من لە کوردستان دور بوم، ئەم و چەند کەسێ کە هەڵکەوت بن و، من ئەیان ناسم. کورەکەمان هەمویان خوێندەوار بون، لێم پرسین: ئەم

نوسەرە گەورەیە کێ بە مردوە؟ کەسیان نەیان ئەناسی و نەیان بیست بو. یەکێکی قسە خۆش لە کورەکەدا بو، سەیری وێنەکەی کابرای کرد و، نوسینەکەی خوێندەوە، وتی: «ئەزانی ئەمە لە چی ئەچی؟». وتم: «لە چی؟» وتی: «لە سەر دەرگای هەندێ «مەلهـا» نوسراوە: «الفنانە العالمیە المشهورە والراقصە الساحرە المعروفە... فوفو. بەڵام فوفو کێ یە؟ خاوەنی مەلهاکە هەر خۆی ئەیناسی. ئەمیش لەو بابەتەیە!»

*

پولیس و پێشمەرگە

شەوێکیان لە حاجی مامەند بوین. یەکێ بو لە ساردترین شەوەکانی ئەوساڵە. ۲۰ کەس زیاتر بوین. لە مزگەوتەکەدا نوست بوین. لە ٤ لاوە حەرەسمان دانا بو. منیش هەر لەوێ نوست بوم. درەنگانێ لە کاتی گۆڕینی ئیشکگرەکان دا لە مشتومڕی هەندێ پێشمەرگە خەبەرم بوەوە. پرسیم: «چیە؟». یەکێکیان وتی: «یەکێ لە حەرەسەکانمان دیار نیە!». هەستام کەوتمە پرسین و گەڕان. چەند مەفرەزەیەکم بە ڕێگاکان دا نارد دوای حەرەسی هەڵاتو بکەون. لەڕێی ئەکەوتن. یەکێ لە باشترین تفەنگەکانیشی لە گەڵ خۆی برد بو. دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت ئەمە پولیس بوە چەند ڕۆژێ لەمەو پێش هات بو بۆ پێشمەرگایەتی.

زۆر گەنج ئەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی لەوانە هەندێکیان منال و هەندێکیان پولیس بون. لەو کاتەدا گەلی عێراقی کە تەمەنی ئەگەیشتە ۱۸ ساڵی لە باتی بەجێهێنانی خزمەتی عەسکەری ئەیتوانی بچێ بە پولیس. ماوەی ٤ ساڵ بە پولیسی ئەمایەوە. معاشێکی باشتری وەر ئەگرت و حەسانەوە و پشودانیشی زۆرتر بو. کارەکەشی بە خزمەتی عەسکەری بۆ حساب ئەکرا. هەر پولیسێک ئەهات بە پێشمەرگە و تەسلیم ئەبوەوە دەستبەجێ «تەسریح» یان ئەکرد. هەندێ پولیس ئەم دەرفەتەی بە هەل ئەزانی ئەهات ماوەیەکی کورت پێشمەرگایەتی ئەکرد و لە پڕ بە دزیەوە تەسلیم ئەبوەوە بۆ ئەوەی تەسریحی بکەن. هاتوچوی ئەم پولیس ـ پێشمەرگانە کارێکی خراپی لە ورەی پێشمەرگەکانی تر و لە ڕێکخستنی پێشمەرگەیی مەفرەزەکانیان ئەکرد. ناچار بوین چەند مەرجێکی قورس بۆ وەرگرتنیان دابنێین.

هاتنی خالید سەعید و شێخ حسێن

لە گوندی حاجی مامەند بوین لە نزیک بەرزنجە نامەیەکی د خالیدمان پێ گەیشت. د خالید و حسێن بابەشێخ و پێشمەرگە بادینیەکان گەیشت بونە شوێنێکی نزیک ئێمە. پێشمەرگەکان دانیان بە خۆیانا ئەگرت بۆ لە برادوست بێننەوە. پێیان وابو

زستان لە هەموو هێزەکانی یەک داتەپین لە ژێر گوشاری سروشت و قەڵ دا پەرێشان ئەبن. بڕیاریان دا بۆ بەسەر بردنی زستان بێنە ناوچەکانی هەولێر.

چۆلکردنی برادوست هەڵەیەکی کوشندە بو. یەکێتی لە بەهاردا نرخەکەی دا و، توشی کارەساتی هەکاری بو.

لە ناوچەی خۆشناوەتی هێزێکی زۆری جەیشیان لە سەر کۆ بوبوەوە. کشابونەوە کوسرەت لەوێوە بڕیاریان دابو لە کۆمی دوکان بپەڕنەوە بۆ ناوچەی سلێمانی و، بە تایبەتی بۆ سنوری هەرێمەکەی من. ئێوارانی من لە گەڵ هەردووکیان زۆر خۆش بو، هەردووکیان بە دۆستایەتی من خۆشحاڵ بون. لە دەرەوەی گوندی حاجی مامەند پێشوازییەکی گەرمان لێ کردن. بە تایبەتی چونکە شێخ حسێن و پێشمەرگە بادینییەکان بۆ یەکەم جار بۆ بێنە ناوچەی سلێمانی. سەرلەنوێ لە گەڵ د. خالید و شێخ حسێن یەکمان گرتەوە.

*

پاسوک

لە گەڵ جەلالی حاجی حسێن ناسیاویمان ئەگەڕایەوە بۆ سەرەتای شەستەکان. ئەو کاتە هەردووکمان هەرزەکار بوین. تازە شۆڕشی ئەیلول دەستی پێ کرد بو. لە خەباتی ژێرزەمینیی سەردەمی «زەعیم صدیق» دا یەکتریمان ناسی. ئەگەرچی دوایی‌تر جیاوازیی هەڵوێستی سیاسی بو بە هۆی ئەوەی هەر یەکەمان ڕێبازێکی جیا لەوی تر بگرێ، بەڵام برایەتییەکەمان هەر مابو. تەنانەت لە ڕوداوەکانی ٦٤ دا من کە ناچار بوم خۆم بشارمەوە، ماوەیەک لە ماڵی ئەوان بوم. جەلال بە بیروباوەڕ نەتەوەیی بو چو بوە ڕیزی «کاژیک» ەوە، بەڵام بە دڵسۆزی خزمەتی شۆڕش و بارزانی ئەکرد. «کاژیک» جاران خۆی ئاشکرا و، ئەندامەکانی بە ئاشکرا کاریان نەئەکرد، ئەندامەکانی فێری «خۆحەشاردان» و «دزە» کرد بو لە ناو داودەزگاکانی پارتی و بارەگای بارزانی دا. هەوڵیان ئەدا «شمقاوە» و «پیاوکوژ» لە خۆیان کۆ بکەنەوە. لە ڕوداوەکانی ١٩٦٤ - ١٩٦٥ دا دەورێکی خراپیان گێڕا و، لە پەنای پارتی و بە ناوی پارتییەوە لە سلێمانی تاوانی گەورەیان دژی هەندێ لە شیوعییەکان و، پارتییەکان و، کەسانی نیشتمانپەروەر کرد. لە بەر ئەوە ناوبانگی سیاسی و کۆمەڵایەتی کاژیک باش نەبو.

دوای ئاشبەتاڵ هەندێ لە تێکۆشەرانی کاژیک بڕیاریان دابو خۆیان ڕێک بخەنەوە. ویستیان کەڵک لە هەڵەکانی ڕابردویان وەربگرن و، لە سەر بنچینەیەکی نوێ و، بە ناو و بیر و ئۆسلوبێکی تازەوە بێنە مەیدانەوە. «پاسوک: پارتی سوسیالیستی کورد» یان دامەزراند. جەلال یەکێ بو لەوانە و، لە گەڵ کۆمەڵە کەوتبونە گفتوگۆ بۆ بەشداری لە

شۆڕشەکە دا.

کە شۆڕش دەستی پێ کردەوە دوای ماوەیەک جەلال بە ناوی پاسۆکەوە هات بۆ شاخ و، مەفرەزەیەکی ڕێکخست بو، لە شارباژێر و شلێر کەوت بوە چالاکی. توانای پاسۆک کەم بو. کەم کەس بە دەنگ بیروباوەڕەکانیانەوە ئەچو. لە بەر ئەوە هەر بە بچوکی مابۆوە.

دوای چەند ساڵ لە «پارەزان» لە گەڵ جەلال یەکترمان بینیەوە. گفتوگۆی پەیوەستمان کرد. من پێم خۆش بو ئەمجارە پاسۆک بە ئاشکرا و بە ناوی خۆیەوە هاتۆتە مەیدانی خەباتەوە، نەک وەکو کاژێکی جاران لە ناو حیزبەکانی ترا دزە بکەن و، لە ڕێگەی «ئینتەریزم» ەوە کە جۆرێکە لە «پیلانگێران» مەبەستەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن. جەلال تەئکیدی کرد: کە ئەوان سەربەخۆن. گرێدراوی پارتی نین. ناکۆکیی یەکیتی و ئەم یان پێ ناخۆشە و، لەو ناکۆکیەدا ئەوان لایەن نین. وتی: جگە لەو مەفرەزەیەکیشیان لە شلێر هەیە، بەختیاری مەجیدخان مەسئولیانە.

منیش بەڵێنی ڕێزلێنان و هاوکاری و یارمەتی خۆی و پێشمەرگەکانیان و حیزبەکەمانم پێ دا.

*

شێخان

یەکێ لە ناحیەکانی شارباژێر بەرزنجەیە. زۆری سادات و شێخانی کوردستانی عێراق و، هەندێکی کوردستانی ئێران، لە خێزانێکی ئەم دێ یە کەوتونەتەوە و، بڵاو بونەتەوە.

لە سەرانسەری کوردستانی عێراق دا ژمارەیەکی زۆر شێخ هەیە. شێخەکان بە گشتی ئەکرێن بە دو بەشەوە:

- هەندێکیان خۆیان بە نەوەی پێغەمبەر، لە بەر ئەوە خۆیان بە «سەید» دائەنێن و شەجەرەیان هەیە ئەیانبەنەوە سەر یەکێ لە ئیمامەکان.

- هەندێکی تریان لە ڕێگای خوا پەرستیەوە، بە تایبەتی لە ڕێگەی «ئیرشادی تەریقەت» ی قادری یا نەقشبەندیەوە بون بە شێخ. ئەمانە بە ڕەچەڵەک ناچنەوە سەر پێغەمبەر، بە مانە ئەڵێن: «شێخی بەرماڵ».

شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی «خانەقا» و، شێخەکانی قادری «تەکیە» یان هەبوە. هەردوکیان مورید و مەنسوب و خەلیفەیان ڕاکێشاوە و، سۆفی و دەرویش یان ڕاگرتوە. هەم دەوڵەت و هەم موسوڵمانانی خێرومەند، گوند و زەوی‌وزار و باخ و ئاش و دوکان و بازاڕیان کردوتە وەقفی خانەقا و تەکیەی شێخەکان. شێخەکان و نەوەکانیان بە

مووری زەمان دەستیان بە سەردا گرتوە و کردوویانە بە مولکی خۆیان. شێخایەتی یەکێک بوە لە ڕێگەکانی دروست بونی «دەرەبەگایەتی زەوی» لە کوردستان دا.

لە ناوچەی سلێمانی دا دو بنەماڵەی گەورەی شێخان ئیدیعای سیادەت ئەکەن:

- ساداتی بەرزنجە، وا ئیدیعا ئەکەن ئەچنەوە سەر شێخ عیسای نوربەخش، کوڕی باباعەلی هەمەدانی، نەوەی ئیمامی هەشتەمی شیعەکان: ئیمام موسای کاظم.

- شێخانی تەکیەی قەرەداخ وا ئیدیعا ئەکەن ئەچنەوە سەر ئیمام حەمزە.

لە سەردەمی عەبباسیەکان دا کە نەوەکانی ئیمامی عەلی کەوتونەتە بەر شاڵاوی قڕ کردن، گوایە ئەمان لە ناو چەوسانەوە و، لە ترسی کوشتن، هەڵاتون بۆ چیاکانی کوردستان و لەوە جێگیر بون و، ئەم نەوانەیان لێ کەوتوتەوە.

ئەم دو بنەماڵەیە چەندین «بحر الانساب» و «شەجەرە» یان نوسیوە و، کاربەدەستانی سەردەم مۆری ڕاست بونیان پێ دا ناوە، بەڵام ئەم «بەحر» و «شەجەرانە»:

١. هەمویان لەم دوسێ چەرخەی دوایی دا لە بەر یەکتری نوسراون، هیچ بەڵگەیەکی کۆن بە دەستەوە نیە پشتیوانیان لێ بکا.

٢. تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بۆ ساغ کردنەوەی ڕادەی ڕاستی و دروستییان نەکراوە و، کەسیش نەیوێراوە خۆی لە قەرەی باسێکی وەها بدا. بە تایبەتی شێخەکان هەمیشە لە لایەکەوە پشت ئەستور بون بە کاربەدەستانی سەردەم و، لە لایەکی ترەوە خۆیشیان لە ناوچەکەدا دەسەڵاتدار و دەسرۆیشتو بون.

ئەدمۆندز بەشێکی کتێبەکەی: «کورد و تورک و عەرەب» بۆ لێکۆڵینەوەی ڕیچەڵەکی شێخان و سادات تەرخان کردوە. بە پێ ی توێژینەوەی ئەدمۆنز لە «شەجەرە» ی ساداتی بەرزنجە دا، لە نێوان شێخ عیسای دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیە و ئیمام موسای کاظم دا بۆشاییەکی زەمانی هەیە، بە حەوت پشت ئەنجا پڕ ئەبێتەوە.

صەفەوییەکان، لە پێش دا شێخەکانی تەریقەتیان و، دوایی‌تر شاهەکانیان، وایان ئیدیعا ئەکرد، سەیدن و ئەچنەوە سەر ئیمام جەعفەری صادق. مێژونوسی ناوداری ئێرانی «احمد کسروی» نوسەری مێژوی «مەشروطە» و «ئازەربایجان»، دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد کتێبێکی نوسی لە ژێر ناوی: «شیخ صفی و تبارش»، واتە شێخ صەفی و بنەچەناوانی. لەم کتێبەدا سەلماند بوی بابیرە گەورەی صەفەوییەکان لە چیای شنگاری کوردستانی عێراقەوە چوتە ئازەربایجان، نە سەیدە و نە تورک بەڵکو کوردێکی سوننی بوە. هەندێ لێکۆڵینەوەی تری لەم بابەتەی نوسی. لە سەر ئەوە کوشتیان.

باسەکە وەکو بابەتێکی پیرۆزی دینیی ئەوەندە ناسک بوە کەس زاتی نەکردوە لێ

ی بدوی. له بەر ئەم هۆیانە ئەدیبەکانی شیخەکان سەری گرتوە و، لە لایەن خەلکەوە بی مشتومڕ قبول کراوە.

شیخانی تەکیە تیکەلاوی ژیانی سیاسی نەبون، لە ریگەی مەلایەتییەوە نفوزیکی کەمیان هەبوە. بەلام ساداتی بەرزنجە لە ماوەی قەرن و نیوی رابردودا سەرەرای دەسەلاتی دینیی، نفوزی سیاسی، کومەلایەتی و ئابوریشیان هەبوە.

ساداتی بەرزنجە لە سەردەمی شیخ مارفی نودی(؟ - ۱۸۳۸) وە ناوبانگی دینیی و زانستییان بلاو بوتەوە، دوای ئەویش کاک ئەحمەدی کوری و، شیخ سەعیدی نەوەی کاک ئەحمەد، سەرەرای دەسەلاتی دینیی، دەسەلاتی دنیاییشیان پەیدا کرد. لەوەش دا چەند هۆیەک یارمەتی داون:

۱. دروستبونی بوشایی دەسەلات و، بوشایی رابەری لە ناوچەی سلیمانی دا لە ئەنجامی روخانی ئەمارەتی بابان دا.

۲. هاوکاری ئەمان لە گەل دەسەلاتدارانی عوسمانی و، پشتیوانی دەسەلاتدارانی عوسمانی لە مان.

۳. هەبونی گوند و زەوییزاری فراوانی وەقف لە سەرانسەری ناوچەی سلیمانی دا.

بیگومان ئەم بوچونە بو ئاتە دان نیە لەم بنەمالە بەریزە. لە ناو ساداتی بەرزنجەدا، پیاوی زور گەورەیان لە بواری جیا جیادا تیا هەلکەوتوە، لە میژوی سیاسی، ئەدەبی، روشنبیریی کوردا پایەی بەرزیان هەیە. شیخ مەحمود لە سالانی یەکەمین جەنگی جیهانیەوە تا سەرەتای سییەکان پیشەوای جولانەوەی کورد بو لە کوردستانی جنوبی دا.

لە ناوچەی شارباژیر و دولی جافەتی دا سەدان بنەمالەی شیخی تیایە بە تایبەتی لە گوندەکانی: بەرزنجە، کاژاو، نودی، باراو، حاجی مامەند، پارەزان، دولپەمو، قولەگیسکان، بەردەزەرد، سویرەلە، سەرگەلو، شەدەلە... زوری ئەمانە جوتیاری هەژار و ماماوەجین، زور کەمیان تیا بو دەولەمەن و دارایی.

شیخەکان، بە تایبەتی ئەوانەی سەیدن، دەولەمەن بن یا هەژار، باقی خەلک بە دژمی و، لە خویان بە نزمتر دائەنین، ژنیان لی ئەهینن، بەلام بە دەگمەن روی داوە ژنیان دابی بە ئومی.

لە ناو گەلانی موسولمانی ناعەرەب دا، گیرانەوەی ریچەلەکی بنەمالەیەک یان تیرەیەک بو سەر پیغەمبەر یان یەکی لە خەلیفەکان، یان سەحابەکان زور جار روی داوە. زوریشی بو مەبەستی سیاسی یا دینیی یا کومەلایەتی هەلبەستراو و دروستکراون. رەنگە هوی ئەمەش بگەریتەوە بو روداوەکانی سەردەمی ئەمەوی.

پێش لە ئیسلام سەرزەمینی کورد لە ژێر دەسەڵاتی دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی ئەو زەمانەدا بوون: ڕۆژهەڵات و لای ژووری لە ژێر دەسەڵاتی ساسانی و، لای ڕۆژئاوای و بەشی ژووری لە ژێر دەسەڵاتی بیزەنتییەکان دا بوو. ساسانییەکان فارس بوون یا کورد؟ خۆی باسێکە ئەمێنی زۆری لە سەر بکۆڵرێتەوە.

هەردوو کۆمەڵی ساسانی و بیزەنتی لە سەر بنچینەی چینایەتی دامەزرا بوون. چینەکانی سەرەوە حوکمی وڵاتیان ئەکرد و، سەرکردایەتی لەشکر و لەشکرکێشییەکان، چینەکانی خوارەوەش کار و پیشە و هەندێ جار سەربازی شەڕکەر بوون. ئیسلام وەکوو دینێکی تازە کە هات سنووری چینەکانی لە ناو ئەم کۆمەڵانەدا تێک دا و، بانگی دوو جۆرە یەکسانی بە گوێ ی مرۆڤایەتی دا دا؛ یەکسانی لە نێوان عەرەب و هەموو نەتەوەکانی تردا و، یەکسانی هەموان لە ناو کۆمەڵی ئیسلام دا. تەنیا شت کە ئەبوو بە هۆی جیاوازی لە نێوان نەتەوەیەک و نەتەوەیەک و، مرۆڤێک و مرۆڤێک دا خواپەرستی «تقوا» بوو.

ئیسلام ئەگەرچی یەکسانی لەو بوارانەدا هێنا، بەڵام ئەمیش مرۆڤایەتی لە سەر بنچینەی دین کرد بە ۳ پۆلەوە: ئەوانەی باوەڕیان بە ئیسلام هێنا بوو: «الامە الاسلامیە». ئەوانەی باوەڕیان بە ئیسلام نەهێنا بوو بەڵام «ئەهلی کیتاب» بوون وەکوو جوو، مەسیحی، سوبی، زەردەشتی و، لە «دار الاسلام» دا ئەژیان: «اهل الذمە». ئەوانەی باوەڕیان بە ئیسلام نەهێنا بوو و «ئەهلی کیتاب» یش نەبوون: «الکفار والمشرکین».

ئەم دابەشکردنە سنووری ئەرک و فەرمانەکانی هاوڵاتی جیا ئەکردەوە:

- ئیسلام لە باج ئەبەخشرا.

- «ئەهلی کیتاب» کە لە سەر دینەکەی خۆیان ما بوون، بەڵام لە ژێر سایەی ئیسلام دا ئەژیان، پێ یان ئەوترا «اهل الذمە». بەرامبەر پاراستنی سەر و سامانیان ئەبوو سەرانە «جزیە» بدەن.

- ئەوانەی ئەهلی کیتاب نەبوون و، ئیسلامیش نەبوون، بە «کافر» دائەنران، سەر و ماڵیان بۆ موسوڵمانان حەڵاڵ بوو.

ئەمەوییەکان داوودەزگای حکومەتیی گەورەیان دامەزراند، بۆ دابینکردنی خەرجی داوودەزگاکانی حکومەتەکەیان و، کۆشک و سەراکانیان پێویستیان بە سەرچاوەی تازەی دەرامەت بوو. یەکێ لە سەرەتا گرنگەکانی ئیسلام: «یەکسانی موسوڵمانی عەرەب و موسوڵمانی ناعەرەب» یان، هەڵوەشاندەوە. بەو گەلانەیان ئەوت «موالی» کە موسوڵمان بوون بەڵام عەرەب نەبوون. وەکوو جاران موسوڵمانی عەرەب لە باج بەخشرا بوو، بەڵام باج خرایە سەر «موالی» یش، وەکوو «جزیە» لە سەر «ئەهلی ذیمە» بوو.

کاروباری دەوڵەت و دەسەڵاتداری لە دەس عەرەب دا کۆ کرا بووەوە. لە ناو عەرەبیش دا «قورەیش» لە پێش بوون. سەردەمێک «بەنی ئومەییە» و سەردەمێک «بەنی عەبباس». شیعەش بە نهێنی لە چالاکییەکی بێ پسانەوەدا بوو بۆ پرووپاگاندەی دینی – سیاسی بۆ «ئالی عەلی» کە نەوەی محەممەد بوون لە ڕێگای فاطیمەی کچییەوە. هەموو موسوڵمانێک لە نوێژ و دوعادا ئەبوو «صەلات و سەلام» بۆ «محەممەد و ئالی محەممەد» بنێری.

ئەمەوییەکان گیانی خۆبەزلزانینیان لە ناو عەرەب دا بڵاو ئەکردەوە، بە چاوی سووک سەیری گەلانی ناعەرەبیان ئەکرد موسوڵمان بوونایە یا ناموسوڵمان. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم «خۆبەزلزانینەی عەرەب» بزووتنەوەی «شعوبی» پەیدا بوو. لە ناو شعوبییەکان دا زانا و نووسەری گەورە هەبوو. زۆریان بە عەرەبی ئەیان نووسی. ئەمانیش لە نووسینەکانیان دا لە پایەی عەرەبیان ئەهێنایە خوارێ.

«عەرەب بوون»، لە ناو عەرەبیش دا «قورەیشی بوون» پلەی مرۆڤی بەرز ئەکردەوە و، ئیمتیازی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دارایی پێ ئەبەخشی. فەقیهەکانی ئیسلام بە دەیان باس و لێکۆڵینەوەیان لە سەر مەرجەکانی حاکم نووسیوە، زۆریان پێیان لە سەر ئەوە داگرتووە ئەبێ بە ڕەچەڵەک قورەیشی بێ و هەندێکیان وتوویانە ئەبێ هاشمی بێ و، کەمیان وتوویانە مەرج نییە لەوان بێ، بەڵام ئەبێ عادڵ و بە تەقوا و سالح بێ. فەقیهەکانی شیعە «ئیمامەتی»یان بە تەنیا بە حەقی عەلی و نەوەکانی عەلی ئەزانی.

ئیتر موسوڵمانەکانی ناعەرەب بۆ خۆپاراستنی خۆیان خستوونە پەنای یەکێ لە قەبیلە ناودارەکانی عەرەب بەرامبەر پێشکەش کردنی هەندێ خزمەت. زۆر کەس و زۆر تیرە لە سەرانسەری وڵاتانی ئیسلامی دا بۆ ئەوەی کەڵک لە ئیمتیازەکانی عەرەب وەر بگرن ڕەچەڵەکی خۆیان بردوەتەوە سەر یەکێ لە نەوەکانی عەلی، یان یەکێ لە خەلیفەکان، یا سەحابەکانی پێغەمبەر.

جورجی زەیدان، لە یەکێ لە کتێبەکانی دا چیرۆکێکی لەم بابەتە لە سەر سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی ئەگێڕێتەوە. کە سەلاحەددین جێگیر ئەبێ هەندێ لە دەسوپێوەندە نزیک و شارەزاکانی ئامۆژگاری ئەکەن، بۆ ئەوەی بنچینەکانی حوکمی ئەم و دوای ئەم نەوەکانی بە تەواوی بچەسپێ، «شەجەرە»یەکی بۆ دروست بکەن بیبەستنەوە بۆ سەر پێغەمبەر. سەلاحەددین پرس بە باوکی ئەکا. باوکی ڕازی نابێ و پێی ئەڵێ: «تۆ کە ئێستا خوا بەم پایە بەرزەی گەیاندووی چ پێویستییەکت بە شتێکی دروستکراوی وەها هەیە. هەمان تاقمی ئێستا شەجەرەکەت بۆ ڕێک ئەخەن، لە پاشەڕۆژدا، کە لە گەڵت تێکچوون،

تانەی لێ ئەدەن».

شەرەفخان لە مێژووەکەی دا: «شەرەفنامە» کە باسی ڕەچەڵەکی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان ئەکا، هی زۆریان ئەباتەوە بۆ سەر کەسایەتییەکی عەرەب، بۆ نموونە: میرەکانی هەکاری و ئامێدی و چەمشکەزەک ڕەچەڵەکی خۆیان بردۆتەوە بۆ سەر خەلیفەکانی عەبباسی و، میرەکانی مەرداسی و کلیس بۆ سەر عەبباسی مامی پێغەمبەر و، میرەکانی سلێمانی بۆ سەر مەروان ئەلحیماری خەلیفەی ئەمەوی و، میرەکانی جزیرە بۆ سەر خالیدی کوڕی وەلید و، میرەکانی سۆران بۆ سەر عەرەبێکی بەغدادی و، میرەکانی زەرقی و دونبولی بۆ سەر عەرەبێکی شامی.

بێگومان شەرەفخان ئەمانەی لە خۆیەوە دروست نەکردوە، بەڵکو لە زمانی خۆیانی بیستوە و لە بەڵگەکانی ئەو زەمانەی وەرگرتوە. بنەماڵەی میرانی جزیرە و بۆتان ڕەچەڵەکی خۆیان بردۆتەوە سەر خالیدی کوڕی وەلید، کەچی وا باوە خالید کە مردوە وەجاخی کوێر بوە. جەلادەت بەدرخان ڕوونکردنەوەیەکی لە سەر ئەمە نووسیوە و، بە هەڵبەستراوی داناوە.

ڕەچەڵەکی «عەرەبی» زۆر لەم بنەماڵانە ئەبێ لەم چوارچێوەیەدا لێک بدرێتەوە.

*

شلێر

شلێر گوڵێکی کوێستانیی جوانە بەهاران ئەگەشێتەوە. بە ناوی ئەم گوڵە جوانەوە زۆر کچ ناو نراون. هەروەها ناوە بۆ ناوچەیەکی خۆش لە پێنجوێن. لە پێش پێنجوێن دا «قزلجە» ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە بوە. ناوی قزلجە وەکو ناوچەیەکی سنووری لە ڕێککەوتننامەی زەهاو دا هاتوە.

ناوچەی شلێر لە نەخشەی عێراق دا وەکو زمان چوتە ناو ئێرانەوە. شلێر کەوتۆتە نێوان شاخەکانی «لەری» و «تارێدەر» و، بە درێژایی دۆڵەکە گوندەکانی مەشیاو، شاهەن، باریکەدەر، لارەدەر، هاریر، شەهرزاد، وینە، داروخان.. دروست کرا بوون. یەکێ بوو لە شوێنە ئەمنییەکانی خۆحەشاردان و حەوانەوەی پێشمەرگە. خانووەکانی ئەمانیش وەکو گوندەکانی تری کوردستان تەنگ و تاریک و دووکەڵاوی بوو.

شلێر ناوچەیەکی دڵگیر و، ئاووهەوای خۆش و دیمەنەکانی جوان و، کانی و ئاوی زۆری هەبوو. لەوەڕواری چڕی ما بوو. ڕەز و باخی زۆر کەم بوو. کاتی خۆی ئاغاکان ڕێگای جووتیارەکانیان نەداوە باخ بکەن چونکە دەسکەوتی ئابووری کەم بوە. لە باتی ئەوە توتن و مەرەزە و گەنم و سپیدارییان پێ چاندوون. جووتیارەکان هەژار بوون و، ڕووتاندنەوەیان پێوە دیار بوو.

دانیشتوانی شلێر سەر بە خێڵێکی دیاریکراو نەبوون و، پەیوەندی خێڵەکیبان لاواز بو. زەمانێک حەمە ڕەشید خان دەسەڵاتداری بە هێزی ناوچەکە بوە و، بۆ گرتنی بانە و، بۆ بەشداری لە جمهوریەتی مەهاباددا خەڵکی ئەوێشی لە گەڵ خۆی بردوە.

*

قەم لە تەورانەوە چەند کەسێکی نارد بوەوە لە ناوچەکەدا کاربکەن، وەکو: خەلەی ڕەشە بەحری، شەریفە کەچەڵ، صابیری مینە ڕەندان. ئەمانە هەمویان پاش ماوەیەک تەسلیم بوبونەوە و، مەقەرەزەی جاشی ئیستیخباراتیان دروست کرد بو. تەنها هێزی قەم ئەوە بو لە گەڵ نادر هەورامی لە سورین بون. بەڵام یەکیەتی چەندین مەقەرەزە و فەرماندە و کادری لە ناوچەکەدا هەبو.

هێزەکەمان بە ئاوایەکانی شلێر دا دابەش بون.

کۆبونەوەی هێزەکە لە شلێر بۆ چەند مەبەستێ بو: یەکەمیان، پشو پێ دان و ڕێکخستنەوەی. دوەمیان، دانانی ڕێوشوێنی هەڵکەندنی قەم لە سورین و هەڵوەشاندنی هێزەکەیان.

لەو ماوەیەدا کاک تایەریش بە ناو تەوران دا بە نهێنی لە تورکیاوە گەیشتەوە هەرێمەکەی خۆی. لە گەڵ خۆی نامەی مامجەلال و مەکتەبی سیاسی بۆ ئێمەش هێنا بو. مامجەلال داوای کرد بو بەر لە نەوروز بگەینە شێنێ بۆ کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی.

*

کوژرانی کاک ئارام

ئێوارەیەکیان لە گوندی «چاژ» بوین ئاگاداریان کردم کە یەکێ لە سلێمانیەوە نامەیەکی بە پەلەی بۆ هێناوم. نامەکەیان بۆ هێنام. نامەکە لە «کومیتەی هەڵمەت» ەوە بو. ئەوسا کومیتەی هەڵمەت ناوی ڕێکخستنی سەرەکی کومەڵە بو لە ناو شارەکانی کوردستانی عیراق دا.

لە نامەکەدا بویان نوسی بوم کە ڕوژی ٧٨/١/٣١ مەقەرەزەیەکی جاش بە ڕێکەوت چونەتە گوندی تەنگیسەر لە قەرەداغ. کاک ئارام خۆی لەو گوندەدا شارد بوەوە. کە جاشەکان ئەیبینی تفەنگەکەی تەکاتە شانی و ئەیەوی بە خێرایی لە ئاوایی دەربچی. جاشەکان بەدی ئەکەن و تەقەی لی ئەکەن. کاک ئارام ئەپیکری و هەر لەوێ دا گیانی دەرئەچی. جاشەکان ئەچنە سەری گیرفانی ئەپشکنن «هەویە» یەکی پێ ئەبی بە ناوی «انور» ەوە. جاشەکان نای ناسن و لاشەکەی بە جی ئەهێڵن. بەڵام «هەویە» کەی ئەبەن و،

ئەدەن بە دائیرەی «ئەمن» لە سلێمانی. «ئەمن» یش ئەیزانی بۆ ئەو «ئانور» ناوە کاک ئارامە. ڕووداوەکە یەک ڕۆژ بۆ قەوما بوو.

کۆمیتەی هەڵمەت بە داخ و پەژارەیەکی بێ ئەندازەوە ئەو هەواڵەیان بۆ من نووسی بوو. هەروەها باسی دەوری کاک ئارامیان کرد بوو لە سەرپەرشتی و ئامۆژگاری ڕێکخستنی نهێنی شارەکان دا. شەهید بوونی کاک ئارام جگە لەوەی خەمێکی گەورەی بە هاوڕێکانی ئەدا، بۆشاییەکی گەورەی لە ژیانی ڕێکخراوەیی دا دروست ئەکرد.

کۆمیتەی هەڵمەت داوایان لێ کرد بووم لەمەرە بەدواوە لە باتی کاک ئارام من پەیوەندییان لە گەڵ ببەستم. سەرپەرشتی کار و چالاکییەکانیان بکەم. کاک ئارام دۆستێکی نزیک و خۆشەویستی من بوو. لە بیروباوەڕدا لە یەکەوە نزیک بووین. لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا لە گروپەکەی ئێمە بوو. دوای پانزەی ئازاری ٧٠ لە بەغدا زۆر جار، من و ئەو و حیلمی عەلی شەریف، یەکترمان ئەبینی و، من هاتم دا ڕێگەی ڕۆژنامەوانی بگرێ. پێش ئەوەی سەفەری لەبەنانا بکەم لە گەڵ کاک ئارام پێکەوە چووین بۆ چومان بۆ خواحافیزی لە مامۆستا ئیبراهیم و کاک عەلی و کاک عومەر.

شەهید بوونی ئاوەختی کاک ئارام بۆ هەموومان جێگەی داخ بوو. چاوەڕوانی گەیشتنی بووین. بە نامە وا ڕێ کەوت بووین .کاروباری پێشمەرگەکانی قەرەداغ و کاروباری ڕێکخستن تەواو بکاو لەو ماوەیەدا بگاتە لای ئێمەو پێکەوە بە کۆمەڵ بەرەو پشدەر بچین بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی دا.

وەڵامی نامەکەی کۆمیتەی هەڵمەتم نووسییەوە. بەڵێنم دانی بۆ هاوکاری و یارمەتی هەرچی بە من بکرێ دریغی نەکەم. مسودەی بەیاننێکیشم بە ناوی کۆمەڵەوە بەو بۆنەیەوە نووسی و، بۆم ناردن کە ئەگەر پەسند بێ چاپی بکەن و بڵاوی بکەنەوە. نامەیەکی پەلەم بۆ مامجەلال و مەکتەبی سیاسی نووسی، کە ئەوانیش بەیاننێکی لە سەر دەربکەن. هەروەها هەمو ئەو کادرانەی کۆمەڵە کە لەو نزیکانە بوون بانگم کردن بۆ کۆ بوونەوە. هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاندن. پێم وتن پێویستە خۆیان بۆ کۆبوونەوەی فراوانی کادرەکان ئامادە بکەن بۆ ئەوەی کاروباری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە بە جۆرێکی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی نوێ سەر لە نوێ ڕێک بخەینەوە.

*

خەشا!

ماوەیەک بوو نەخۆش کەوت بووم. کە هەناسەم ئەدا، بە تایبەتی کە ئەکۆکیم یا ئەپژمیم، ئازارێک لە ژێر پەراسوەکانی لای چەپی سنگم دا، بروسکەی ئەدا و، ئەیگەیاندمە

شەرای مەرگ. زۆرم لە خۆم ئەکرد و خۆمم ڕائەکێشا. بە دەم گەران و سورانی بەردەوامەوە چەپنە گوندی باریکەدەر، یان وەکو خۆیان ئەیانوت: بالیکەدەر. ژمارەمان زۆر بو. خالید سەعید و شیخ حسین و بەکری حاجی سەفەر... پێکەوە بوین. کابرایەک پرچی بەردا بوەوە هات بە پیرمانەوە. من چومە مزگەوتەکە لە پەنای زوپاکەدا ڕاکشام. پێشمەرگەکانی لای خۆمم ئیزن دا بۆ نان خواردن بڕۆن بۆ ناو دێ. هەمو هێزەکەی دامەزراند.

کابرای دەرویش هاتە مزگەوت منی دی ڕاکشاوم. وتی: «هەستە بتبەم لە مالیک دائەمەزرێنم».

وتم: «دەرویش گیان من برسیم نیە و ناساغم حەز ئەکەم لێرە بۆ خۆم ئیسراحەت بکەم».

وتی: «نابێ! هەرچی بێتە ئەم ئاواییەی ئیمە ئەبێ لەگەڵمان بکا. ئەتبەم بۆ مالیک هەم نان بخۆ هەم ئیسراحەت بکە!»

زۆری لە گەڵ خەریک بوم. گوێی نەدا و وازی لێ نەئەهێنام. ناچار لە گەڵی ڕۆیشتم. بە هەورازێک دا سەری خستم بۆ دوایین خانو. هەناسەم لێ بڕا بو. لە تاو ئازاری سنگم خەریک بو بکەوم. بەدەس ئیشارەتی بۆ کردم وتی: «بچورە ئەو ماڵە لەوێ نان بخۆ و هەر لەویش ئیسراحەت بکە». منیش سوپاسم کرد. ئەو ڕۆیشت و منیش چوم بۆ ماڵەکە. سەیرم کرد نزیکەی ۲۰ پێشمەرگە لە بادینییەکان لەو ماڵەدا دانیشتون. یەکسەر گەڕامەوە دواوە. چومەوە بۆ مزگەوت. مزگەوتەکە ژورێکی ڕوناک و پاک و گەرم و خۆش بو. خۆم لێ دا بە ئەرزا.

جارێکی تر دەرویش پەیدا بو. کە منی لەوێ بینیەوە تورە بو.

وتی: «ئەی ئێستا من تۆم نەبرد دامەزراندی، بۆ هاتیتەوە!»

وتم: «دەرویش ماڵەکە خەڵکی تری زۆر لێ بو. بە جوانم نەزانی منیش بچم بە سەربار»

وتی: «دەی لەمیناکا هەستە بتبەم بۆ مالیکی تر».

سوپاسم کرد وتم: «حەز ئەکەم لێرە بم».

پێ ی لێ کردمە کەوش کە هەر ئەبێ هەستم. وتم: «دەرویش نەزانی ئازار و نەخۆشیی چیە؟!».

وتی: «بەلێ منیش خۆم ناساغم».

وتم: «کەواتە وازم لێ بێنە. تاقەتم نیە و نان ناخۆم».

وتی: «تا ئێستا چەند جار پێشمەرگە هاتونەتە ئێرە، هەمو جار من دامەزراندون

تا ئیستە هیچ کەسێکیان گلەیی نەکردوە، ئەمە چیتە تۆ ئەلێی ی لرزەنگەری خوتت داوە بە ئەرزەکەدا خیشت کردوە!»

ئەوە یەکەم جار بو وشەی «خیش» بیبیستم. وای ئەزانی من دلگیر بوم بویە نان ناخوم. ئیتر گەیشتە ئینم خومم پی رانەگیرا. راست بومەوە بە توڕەییەوە قسەیەکم پی وت و، وتم: «ئەگەر ئەوری هەلئەستم لە لیغەی بەر مزگەوتەکەت هەلئەکیشم».

دەرویش بیست بوی پیش من پیشمەرگە خەلکی تریان لە ناو هەلکیشاوە، لە ترسی هەرەشەکەی من، لی ی دا رویشت. پاش توزیکی تر هاتەوە. لە پیشەوە منی ئەناسی بو، وای زانی بو پیشمەرگەیەکم وەکو پیشمەرگەکانی تر، ئەمجارە زانی بوی من کیم و چیم. دیسان بەروکی گرتمەوە. داوای لی بوردنی لی ئەکردم کە ئەیناسیوم و، زوری لی ئەکردم لە گەلی بروم میوانی مالی ئەوان بم. لە راستی دا لەو کاتەدا خوشترین خوارەنی دنیا لە لای من یەک تار پشودانی بی دەنگ و سەنگ و ئارامگرتنی بی قسەی ئەشەهینا. بەلام دەرویش لەمە تی ئەئەگەیشت. مەعنای «خیش» م لی پرسی. بوی روون کردمەوە. لەمەوە ئیتر وشەی «خیش» لە ناو پیشمەرگەدا بلاو بوەوە.

*

بەختیاری مەجیدخان

لە نیوانی چەمەک و سیمبار دا بوین، توشی چەند کەسیکی بی چەکە بوین. ئەوانە پیشمەرگەی مەفرەزەیەک بون شەوی رابردو لە مزگەوتیکا. لە گەل مەفرەزەکەی بەختیار پیکەوە واجباتی شەوانەیان دانا بو. مەفرەزەکەی بەختیار لە وەختی نوسان دا هەمویان چەک کرد بون. ئەم کارە ناڕەزایەکی قولی لە ناو هەمو هیزەکەدا وروژان. ئەمەش بە سوکایەتییەکی گەورە دائەنرا بو یەکیتی.

هیزەکەمان بەرەوژوری ۰ ۰ ۵ کەس ئەبو. زوری بەرپرسەکانی ناوچەی سلیمانی یەکیتی لە گەل بون. هەمو هیزەکە کرا بە ۳ ریز بو کیومالی ناوچەی شلیر بە دوی بەختیار و مەفرەزەکەی دا. بەختیار لە گوندی رینە بو. چواردەوری دی گیرا و هەلیان کوتایە ناو دی. بەختیار و مەفرەزەکەی پییان زانی. شاوری کوبونەوەیان لی دا. بە راکردن لە ناو دی دەرچون. بە بەردەمی عومەری کویخا قادری ئاوەکەلە و تاقمەکەی دا تی پەری بون، دەنگیان لە گەل نەکرد بون.

بەختیار و پیشمەرگەکانی هەر هەمان شەو تەسلیم بونەوە. حکومەت بردنی بو کەرکوک و پاش چەند روژی بە چەکداری هیناتیەوە بو پینجوین. مەفرەزەیەکی یەکیتی چو بون بو کاریکی پیشمەرگانە لە ناو پینجوین دا. هەندیک لە پیشمەرگەکانی ئەم

مەفرەزەیە لە وانە بوون بەختیار چەکی کرد بوون. ئەو هەڵەیان بە دەرفەت زانی بۆ کەمینێکیان بۆ بەختیار دانا بو. ڕۆژی ٧٨/٢/١٢ کوشتیان. مەفرەزەکە ئەو کارەیان سەربەخۆ، بێ پرسی هیچکام لە بەرپرسەکانی یەکێتی، کرد بو.

مردنی بەختیار بەو شێوەیە مەخابن بو. بەختیار کوڕی مەجید خان و نەوەی حەمەرەشید خان بو. حەمەرەشید خان یەکێ بو لە ٤ جەنەراڵەکەی کۆماری مەهاباد. مەجید خانیش یەکێ بو لە فەرماندەکانی هێزی دیموکراتی بانە. لە سەر کوردایەتی تووشی دەربەدەری و ناخۆشییەکی زۆر بو بون. لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا حەمەرەشید خان و کوڕەکانی و خزمەکانی هاوکاریمان لە گەڵ بەرپرسەکانی شۆڕش کرد بو بۆ ئازاد کردنی پێنجوێن. بە درێژی ساڵانی شۆڕش دڵسۆزی کورد بون. لە دوای ئاشبەتاڵ ڕوویان لە تەیران کرد بو. لە گەڵ دەس پێ کردنەوەی شۆڕشی حوزەیران دا بەختیاریش لە تەیرانەوە هات بوەوە لە ناوچەی شلێری پێنجوێن بو بو بە پێشمەرگە.

*

چەککردنی عومەری ئاوەکەڵە

ئەنوەری مەجید سوڵتان و، کەریمی دادمەنە کابرایەکی فەراشی قوتابخانەی یەکێ لە گوندەکانی ئەو ناوەیان گرت بو. نامەیەکی لە «مودیری ئەمن»ی سلێمانییەوە بۆ عومەری کوێخا قادری ئاوەکەڵە هێنا بو. نامەکە وەکو لە وەڵامی نامەی عومەردا نوسرابی وا بو. عومەر پێش ئەوەی بێتە شاخ مامۆستای سەرەتایی بو.

عومەر فەرماندەی کەرت بو لە هەرێمەکەی من. هەروەها ئەندامی کۆمەڵە بو. بەڵام ئەمیش هەندێ «موخالەفاتی» هەبو بە تایبەتی پارە سەندن. لە بەر ئەوە سڵی لە من ئەکرد و خۆی دوور ڕائەگرت. نازانم بۆچی ئەنوەر و کەریمیش حەزیان لە چارەی نەبو.

عومەر کوڕێکی گورجوگۆڵ و، شارەزا و وریا بو. تاقمی پێشمەرگەی گورجوگۆڵی لە خۆی کۆ کرد بوەوە. لەو کاتەدا چو بو بۆ میشیاو. خزمایەتی لە گەڵ حەمەصدیق خان و سەرحەدی خەلیفە یونس دا هەبو، کە هەردوکیان ڕوخزایی بون. بڕیار درا خۆی و پێشمەرگەکانی چەک بکرێن. خۆیشی بگیرێ و لێکۆڵینەوەی لە گەڵ بکرێ. بۆ چەک کردن و گرتنی عومەر، د خالید، شێخ حسێن، عومەر عەبدوڵلا، ئەنوەری مەجید سوڵتان، مستەفا چاورەش و خۆم چوینە میشیاو. لەو ڕۆژانەدا من و مستەفا هەردوکمان نەخۆش بوین. من جگەرم ئازاری ئەدام.

بۆ ئەوەی حەمە صدیق خان لێمان دڵگران نەبێ، بە چاکمان زانی عومەر لە ماڵەکەی ئەودا چەک نەکەین. عومەرمان بانگ کردە مزگەوتەکەی میشیاو لەوێ خۆی و

هەمو پێشمەرگەکانی مان چەک کرد. عومەرمان سپارد بە پێشمەرگە بادینییەکان.

عومەر لای کاک خالید و شێخ حسێن پاکانەی کرد بو. هەردووکیانی خست بوە سەر ئەو باوەری غەدری لی کراوە.

هێشتا لێکۆلینەوەی تەواو نەبو بو. عومەر فرسەتی هێنا و هەلات. لە بەر کەمتەرخەمی پێشمەرگە بادینییەکان هەلات بو، یا خۆیان بە ئەنقەست چاوپۆشییان لی کرد بو، مەعلوم نەبو. عومەر ئەگەر پێشتر پیلاوانیش بوبی، وەکو خۆی لە کاتی گیرانی دا ئەیوت، لە دوای راکردنی بە ئاشکرا و بە دلسۆزی هاوکاری لە گەل دەزگاکانی «دوژمن» دا ئەکرد و دوایی بو بو بە «موڵن» یکی دری ئەمنی سلێمانی.

*

دوای ئەوەی گەیشتینە ناوچەکە و، گەوڵە گەران و خەلک بینین، زور کەس سکالایان لە دەس هەندی لە فەرماندەی مەفرەزە و بەرپرسەکانی ناوچەکە لە لا کردم و شکاتیان لی ئەکردن. چاوەروان بون سزایان بدەم. بەلام من لەو کاتەدا سزادانی ئەوانم بە چاک نەئەزانی. چونکە هەندێکیان ئەچونە ناو قم و، هەندێکی تریان یاخی ئەبون. زورم ئامۆژگاری کردن و هەرەشەی لێپرسینەوە و سزادانی قورسم لی کرد بون.

کە کاک خالیدیش گەیشت بو، هەمان سکالا و شکاتیان لای ئەویش کرد بو. چەند جاری کاک خالید ئەو باسەی لە گەل کردم، کە هەندی لەمانە چەک بکەین و، بگرین، ئەگەر دەستیشیان کردەوە بیانکوژین. من ئەو شێوەیەم بو لێپرسینەوەیان بە راست نەئەزانی. لە گەرانەوەمان دا کاک خالید راپۆرتێکی سیاسی و پێشمەرگەیی دریژی بو مەکتەبی سیاسی نوسی، گلەیی لە منیش کرد بو، کە نەرم بوم لە سزادانی ئەواندا. راستییەکەی من نەرم نەبوم، بەلکو بە شێوەی خۆم لێم پرسی بونەوە، هەمو ئیشێکم لە دەرسیم و کەریمی دادەستە سفند بوەوە. دەرسیم و کەریم تەسلیمی عێراق بونەوە. ئەوانی تریشمان برد بو بەشداری لە سەفەری پرادۆست دا.

*

کشانەوە لە شلێر

ئیمە خەریکی تەگبیری هێرش بوین بو سەر بنکەکەی قم لە سوریێن، لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەواڵمان بو هات: هێزێکی گەورەی جەیش خۆی بو پەلامار دانی هێزەکەی ئیمە ئامادە کردوە. بە پەلە بەرپرسەکانی هێزەکە: تایەری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوللا، بەکری حاجی صەفەر، ئەنوەری مەجید سولتان، خالید سەعید و شێخ حسێن و، خۆم کۆبوینەوە بو لێکدانەوەی هەواڵەکە و بریاردانی کاری پێویست.

هێزەکە زۆر بوو. وردی بەرز بوو. ناوچەکەش بۆ بەرەنگاری و لێدانی دوژمن لە بار بوو. بەڵام کـیـوەکـانی شلێـر بەفـریکی زۆریان لێ باری بوو ئەمـان ئەتوانی بە شـەو لەوی بپەڕینەوە، بە تایبـەتی ئەگـەر هـێزەکانی حکومەت لە گوندەکان دا پاناپاتەوە. سـەرەرای ئەوەش تەقەمەنی هەر ئەوەمان هەبو کە بە پێشمەرگەکان خۆیان بوو. هیچ تەقەمەنییەکی احتیـاط و شـاردراوەمـان نەبو. لە بەر ئەوە بڕیاری کشـانەوەمـان دا. ئێـوارەیەکی درەنگ بە تاریکی هەمو هێزەکە بە لای «سەیرانبەن» دا کشاینەوە دوڵێکی نزیک «سیپال». بو رۆژی دوایی هالیکوپتەر بە ئاسمانی ناوچەکەدا کەوتنە فڕین و هێزێکی گەورە بە هەمو گوندەکان دا بڵاو بونەوە. ۳ رۆژ لەو ناوەدا مانەوە. شوێنەواری پێشمەرگەیان نەدی. بێ ئەوەی توشی شەر بێن یا هیچ دەسکەوتێکیان هەبێ کشانەوە.

خۆ لادان لە شەڕی نابەرامبەر و، خۆ دزینەوە لەو شەڕانەی دوژمن زەمان و زەمینی هەڵ ئەبژاردن، یەکێ بو لە تاکتیکە سەرەکییەکانی کاری پێشمەرگەیی سالانی دەس پێ کردنەوە. سەلامەتی ئەمەش لایەکی بو پاراستنی پێشمەرگە بو لە فەوتانی نابەجێ و، لایەکی تریشی بو ماندو کردنی بێهودەی دوژمن و سەر لێ تێکدانی بو.

ئەو هێزەی هات بون بو سەر ئێمە بو شلێر، ئێمەیان بەر دەس نەکەوت، هەندێکیان پەلاماری سوریێنیان دا، قم بنکەکانی خۆی چۆڵ کرد و، چونە ناو ئێرانەوە.

لە دوای کشـانەوەی هێزەکەی عـیراق و، ئەمانی بنکەی قم لە سورێن، ئیتر کاتی ئەوە هات بو هـێزەکەی ئێمـەش بڵاوەی لێ بکا. هەر تاقـمە بچێـتـەوە سنوری کـارکـردنی خۆی. ئەندامەکـانی سەرکردایەتیش نامـەی مەکـتـەبی سـیـاسـیـیـان بو هات بو، ئەبو پێش نەورۆز بگەنە پشدەر بو کوبونەوە.

*

سـەردانی گوندەکانی جارخ، مکل، چەمەک، سپیار، سورەبان، گوڵی، مێشەرو، شیوەگوێزان و سیاگوێز... مان کرد. هەندێ لە گوندەکانی ناوچەکە بژێنی مەڕەزیان راگرت بو. لە ماڵەکانیان دا دەزگای جولاییان دانا بو بو دروستکردنی «شاڵ».

سیاگوێز ۲۵ ماڵ ئەبو. کەوت بوە سەر سنوری ئێران. بەیانییەکیان لە دەرگای مزگەوتەکەی هاتبو‌دەرەوە رێزێک ئەوالیتی بە چیمەنتو دروست کراو بەرامبەری بو. خۆمم پێ ساکرد. کە حاڵە دەرەوە زۆر لە پێشـمەرگەکـان پێ ئەکـەنن. وتم: «ئەوە بە چی پێ ئەکەنن؟» وتیان: «هیچت نەدی؟» وتم: «چی ببینم لە ئاودەستخانە دا؟» وتیان: «ئەوە کانی ژنان بوا». لە خانوی هیچ گوندێکی کوردستان دا ئەوالیت نەبو. ئەوالێتی پیاوان لە مزگەوت و ئەوالێتی ژنان لە کانی ژنان بو. دیارە کورە ئەوالێتی بە پێویست نەزانیوە.

خنکانی بەختیاری سەعید والی

من و هەندێ لە فەرماندە و کادرەکانی هەرێمەکە بۆ هەندێ کاری پێویست بەرەو شارباژێر بەڕێ کەوتین. کاک تاهیری عەلی والی و هێزەکەی لە پاش ئێمە ئەوانیش بەڕێ کەوت بوون بەرەو پارێزان. لە کاتی پەڕینەوەدا لە چەمی گوڕگەسوور بەختیاری ئامۆزای لە داری پردەکە خزا بو کەوت بوە ناو ئاوەکەوە. چەندێ بە دوای دا گەڕا بون لاشەکەیان نەدۆزی بوەوە. ڕۆژی دوایی خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر بەدرێژایی چەم لە ئاوەکەیان نۆڕی بو بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکیان هەبێ. دوایی چەند مەلەوانێک کە لە دەوروپشتی پردەکە ئەگەڕان دیبیان لاشەی بەختیار لە بن داری پردەکەدایە. شەرواڵەکەی لە دارەکە ئاڵاوە و بە بنی پردەکەیەوە نوساند بو. ئێمەش بۆ بەشداری لە ناشتنی تەرمی بەختیار و سەرەخۆشی لە ئەنوەر و عوسمانی برای و، لە کاک تاهیر و ڕەئوف بەگ و ڕۆستەم بەگی ئامۆزایان گەڕاینەوە گوندی قولەگیسکان.

*

تێکەوتن

مەلازم عومەر دەمێک بو تاقەتی لە پێشمەرگایەتی چو بو. بە زۆر خۆی ڕائەکێشا و، لێ ی بوبو بە کوردەناموسی. لە زۆر شتی بچوک دڵگیر ئەبو. ڕۆژێکیان لە گەڵ پێشمەرگەیەکی هەڵەبجەیی : فەرەج، دەمیان لێک گیرا بو. لە سەر ئەوە تا دەستی گرتبوی تفەنگەکەی فڕێ دا بو بۆ ناو دۆڵێکی قوڵ و، بە توڕەیی و بە تەنیایی ڕۆیشت بو. لەو کاتەدا لە سەر سنوری ئێران بوین، چو بو بۆ لوخێکی ئاتەشین. وەهاب و شۆڕش و هاوڕێ جەبارم ناردە لە گەڵی بن تا دڵی چاک ئەبێتەوە. هەرچەندە دەری کرد بوین، بەڵام ئەمان هەر بە دیارییەوە مابونەوە تا بەیانی یەکمان گرتەوە. هەوڵی زۆرم لە گەڵ دا دڵی بێنمەوە جێگای خۆی، سودی نەبو.

عومەر بەرەو چنگنیان ڕۆیشت، ئەیویست بە ئەهێنی بچێتەوە بۆ سلێمانی و، لەوێوە بڕوا بۆ بەسرا. گوایە بەڵێنیان پێ دا بو لە بەسراوە بە ئەهێنی بیگەیەننە کوەیت. خواحافیزیم لە جەماعەت کرد و، بە ناچاری شوێنی کەوتم بۆ چنگنیان. زۆرمان قسە کرد. مەترسییەکانی چونە شار و گیران و ئابڕوچونم بۆ باس کرد. سەرەنجام ڕازیم کرد کە لە گەڵمان بمێنێتەوە و، پێکەوە بچینەوە بۆ لای مەکتەبی سیاسی و لەوێوە بچێ بۆ سوریا و، لە سوریاوە بۆ ئەو شوێنەی خۆی حەز ئەکا.

ڕۆژی یەکەمان لە چنگنیان بەم مشتومڕە بە سەر برد. شەوەکەی لەوێ ماینەوە و، ڕۆژی دوەم خەریکی کاروباری هەرێم بوم. دەرسیم زۆری قسە لە سەر بو. بانگم کرد بو

بو لیپرسینەوە. فەرەج هونگەرینەیی، ئەوسا لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵە بو هێشتا ئەبو بو بە پێشمەرگە، بەرەو ڕووی بوەوە. سەفەرەزەکەیم هەڵوەشاند و، چەکە زیادەکانم لێ وەرگرتەوە. دەترسیم بو پاساودانی مەرخاڵەفەکانی ئەیوت: «من پێشمەرگەی دەستەی سەرەتاییەکانم. جەماعەتی کاک ئارام بوم. کاک ئارام نەماوە بۆیە شەرم پێ ئەفرۆشی».

پاش نیوەڕۆکەی بە کۆمەڵ لە ژووری میوانی ماڵێک دانیشت بوین. خەریکی قسە بوم لە گەڵ هەندێ لە فەرماندەکانی پێشمەرگە. فاضیل ڕەحیم خۆی کرد بە ژووردا. هەمویان ئەیانناسی. هەریەکە گاڵتەیەکی لە گەڵ کرد. لێ یان پرسی: «بوچی هاتوە؟» وتی: «هاتوم بزانم بەختیاری سەعید والی لە کوێ نێژراوە. کەسوکاری ئەیانەوێ تەرمەکەی بهێنەوە بو سلێمانی»

لە گەڵ فاضیل کەوتنە قسەڵۆکات. من چومە دەرەوە. ئەویش هات و، هاتە نزیکمەوە. فاضیل لاڵ بو پچڕ پچڕ قسەی بو ئەکرا. وتی: «قسەیەکم پێ یە، ئەمەوێ بە تەنها پێت بڵێم کەس نەزانێ!». بو ئەوەی هەستی کەس ڕانەکێشم وتم: «بەڵێ.. گوێم لێتە» وتی: «با بچینە جێگایەک بوت باس بکەم» وتم: «بەدەم ڕێگاوە قسەکانت بکە. وەها سەلامەتترە»

وتی: «لێم مەپرسە کێ ناردومی. ئەم قسانەیان ڕاسپاردوم پێت بڵێم: حکومەت هێزی کۆ کردوتەوە لە سەرتان. لە ئان و دەقیقەدایە هێرشتان بو بکەن. هەرچی زوە لێرە بکوێزنەوە! لای برادەران ناوی من مەهێنە!»

قسەکانی لە شێوەی تەلگراف دا بو بە خێرایی وەرم گرت. لە سەری نەڕۆیشتم. دڵنیا بوم دروی نەئەکرد. لە یەکتری جیا بوینەوە. منیش یەکەم جار بو لە ڕەوشتی سەختەکانی پێشمەرگایەتی، کە بەشێکی خوم دام نا بو، لا بدەم: دو ڕوژ بو بە هەوای خوش سەرخوش بوین لە چنگیان ما بوینەوە، چنگکانیش لە نزیک سلێمانی بو.

ماوەیەک خومم مەشغول کرد. سەرێکی مزگەوتم دا. سەردانی دوکانەکانم کرد. لە گەڵ هەمو بەرپرسەکانی پێشمەرگە و، زوری پێشمەرگەکان قسەی ئاسایی م کرد و، لێم ئەپرسین چەندن و چەکەکانیان چیە و، لە کەیەوە پێشمەرگەن و، خەڵکی کوێ یان کام گەرەکی سلێمانین.. ژمارەی هەمومان نەئەگەیشتە ٤٠ کەس. بەشی زوریان مەسئول بون، زور کەم پێشمەرگەیان تێ دا بو. گەڕامەوە ماڵەکەی لێ ی میوان بوین.

هەمان تاقمی بە جێم هێشت بون، هێشتا لەوێ بون و، درێژەیان بە قسەکانیان ئەدا. منیش چومەوە بو ناویان و بەشداری گفتوگوکانیان بوم. پاش نەختێ قسەکانم پێ بڕین وتم: «هەواڵم بو هاتوە عێراق هێزی کو کردوتەوە لە ئان و دەقیقەدایە پەلامارمان

بدا...».

یەکێکیان لێ پرسیم: «ئێستا تەلی ی چی بکەین؟».

وتم: «بە ڕەئی من هەتا قاچمان هێزی تیایە لەم ناوچەیە دوور بکەوینەوە. بیان بەیانی زوو هەستین و لە شاخەکە دابەزرێین».

مولازم عومەر عەلی دایە وتی: «تو هەموو پێشمەرگەکانت ڕوخاندوە. لە سەر ئێخبارییەی درو، بەم سەرما و بەفرە هەمومانت ئەوەندە بردوە بو شاخ هەمومان ڕەنگوڕومان ڕەش هەلگەراوە. هیچ جارێکیش توشی شەڕ نەبوین».

وتم: «من قاچم لە قاچی ئێوە درێژترە. لە یەکەم دەسرێژدا نەکوژرێم لە ڕاکردن دا کەس پێما ناگات. کەیفی خوتانە بریاری مانەوە ئەدەن یا ڕویشتن. بەلام بزانن ئەمجارە هەوالەکە ڕاستە»

بریاریان دا بمێنەوە و، کەمێن و حەراسەتی مەزبوت دابنێن. زوور لە مێژ بو من، نە خوم شت بو ، نە جلەکانم. خاوەنی مالەکە بە زور جلەکان و قەمسەلەکەمی لێ وەرگرتم بوم بشون. جلەکانی لە بەرم دا بو هاوینە بون. قەمسەلەی ترێشم پێ نەبو.

سەعات چواری بەیانی ڕوژی ٢٥ ی شوباتی ١٩٧٨ بو، ئێمە لە ژووری مێوانی خانەخوێکمان دا نوست بوین، لە دەنگی دەسرێژی خەبەرمان بوەوە. هەمومان هەستاین و خومان کو کردەوە. ئەگەر ئەو دەسرێژە نەبوایە بە خومان نەئەزانی یان لە مالەکەدا ئەگیراین، یان توشی شەڕێکی قورس ئەبوین لە ناو چنگیان دا. مجەوری مزگەوتەکەی چنگیان لە ئێمە وریاتر بو، بونی هێرشەکەی کرد بو، لە مایکروفونی مزگەوتەوە هاواری ئەکرد: «ڕەحمەتی خوا لەوەی نوێژی لە مزگەوت هەیە، بیباتەوە»

لە مالەکە هاتینە دەر، چوین بو مزگەوت، زوری پێشمەرگەکان کو بوبونەوە. عوسمانی قالە منەوەر و، مستەفا چاورەش و، جەمالی عەلی باپیر و عەلی چوارتایی ئەو کەمینەکانیان دانابی. عوسمان هەندی پێشمەرگەی نارد بو بو قەیماسە. هێشتا نەمانئەزانی دەورمان گیراوە. پێم وتن یەکسەر بڕوە و شاخەکەی بەرامبەرمان ڕابگرن و بەرەو گەلی برون. هەر چواریان وتیان ئێمە ئەچین بو لای کەمینەکانی خومان. من زورم پێ خوش بو.

لە چنگیان دەرچوین بەرەو شاخەکەی بەرامبەری، بە گوللە دایان گرتینەوە دەیان هەزار فیشەکیان پێوە ناین. بە ڕاکردن خومان گەیاندە بناری شاخەکە. ملازم عومەر لە گەل خوم بو. مستەفا و عوسمان پێش من گەیشت بونە شاخەکە. وتیان ڕێگاکە گیرا بو ئەمان توانی بگەینە کەمینەکە. توەمز کەمینەکەی عوسمان نارد بونی بو قەیماسە،

هەرزەکاری بێ تەجروبە بون، لە ناو سەرما لە چاخانەکەدا نوست بون. جاش هەمویانی گرت بو. جەمال و عەلی پێکەوە بون، ئەبو کەسینیکیان لە پشتی چنگنیان هەبێ، کەسینەکەیان دانەنا بو، بەر لەوان جاش شوێنەکەی گرت بو. کە ئەمان چو بون توشی تەقە بون و گەرا بونەوە.

بە زەحمەتێکی زۆر دەرباز بوین. بە پێشمەرگەکانم وت چاوەڕوانی من نەکەن بە خێرایی بە شاخەکەدا هەڵگەڕێن بۆ سەرەوە و لەوێ دابمەزرێن. من و عوسمان و مستەفا ماینەوە بە شێنەیی بە شاخەکەدا هەڵگەڕاین. دنیا ڕوناک بوەوە. جاشەکان هات بونە ناو چنگنیانەوە. ئێمەیان نەدی. بە لەناسە زوریان نیشانە لێ گرتینەوە. بەر نەکەوتین. ئێمەش گەیشتینە سەر شاخەکە. شاخەکە بەفر گرت بوی و، بایەکی ساردی هەبو. پاش ماوەیەک شۆڕ بوینەوە بۆ دولەکەی دولەتو و سوێرملە بەرامبەر شاخی «کەتو». چاومان لێ بو لەوێش بە هالیکۆپتەر هێزێکیان دابەزاند. هالیکۆپتەر کەوتە سوڕانەوە بە ئاسمانی ناوچەکەدا ئێمە شوێنەکانمان قایم بو. هەندێ تەقەی کوێرانەیان کرد. زیان بە کەس نەگەیشت. تا ئێواری لەوێ ماینەوە. لە ئێوارەدا هێزەکانی دوژمن کشانەوە. ئێمەش هەمومان کۆبوینەوە. تاقمێکمان کە لەو سەری دێ بون، لە ئێمە دابڕا بون ڕویان کرد بوە باراو. ئێمە شەو چوینەوە بۆ ناو چنگنیان.

لە تەقەرتوقی یەکەمجاردا تەنیا پێشمەرگەیەک بەر کەوت ناوی: «ئەبوبەکر عەبدوللا» بو، لە مەقەڕمەزەکەی من بو، ماڵیان لە گەڕەکی خانوە قوڕەکانی سلێمانی بو. لاشەکەیمان لە بن دارێک دا لە گۆڕستانەکەدا بە جێ هێشت بو. جاشەکان بویان نەدۆزرابوەوە. لاشەی شەهیدەکەمان هەڵگرت و چوین بۆ باراو ڕۆژی دوایی لەوێ ناشتمان و، نامەیەکم بۆ کەسوکاری نارد لە ڕوداوەکە ئاگادارم کردن.

دوایی دەرکەوت ئەوی هەواڵەکەی بۆ نارد بوم، فەرهادی مەلا ڕەزا بو. فەرهاد بۆ ئیستیخبارات کاری ئەکرد. هەر لەو ماوەیەدا لە شەڕدا لە گەڵ پێشمەرگەی یەکێتی لە بەری قەرەداخ کوژرا.

ڕاستییەکەی هۆی ئەم «تێکەوتن» ە: کەمتەرخەمی خۆمان بو.

بە درێژایی ماوەی ڕابردو من خۆم بەیانیان هەڵئەستام و، سەرپەرشتی کەمین و حەراسەتی بەیانیانم ئەکرد، ئەو ماوەیە منیش وازم لەمە هێنا بو، دوای ئەم تێکەوتنە چومەوە سەر خوەکەی جاران. بەیانیان خۆم سەرپەرشتی کەمینەکانی پارێزگاری و چاودێریم ئەکرد.

*

## راوەکەو

چەند ڕۆژی لە باراو، نۆدێ، هەولێر، هەرمێلە مابینەوە ئینجا پەڕینەوە بۆ ناوچەی سیوەیل و ئالان. سەردانی گوندەکانی کوڕەداوێ و کەنارۆ و سەرین و باری.. مان کرد. بە درێژایی ئەو ماوەیە عەلی چوارتایی مان لە گەڵ بو. عەلی زۆر شارەزای ناوچەکە بو.

سیوەیل ناوچەیەکی زۆر خۆش بو. گوندەکانی ئاوەدان و قەرەبالغ بو. ڕەز و باخەکانیان گەورە و جوان بو. کانی و ئاوی زۆریان هەبو. چەمەکانی کەوتوتە قوڵاییەوە کەلکیان لی وەر نەدەگرت.

ڕاو، بە تایبەتی هی کەو، لە کۆنەوە یەکێک بوە لە سەرگەرمییەکانی دانیشتوانی ناوچەکە. شاخەکانی دابەش کراوە بە سەر ڕاوگەی دیاریکراودا. هەر بنەماڵەیەک ڕاوگەی تایبەتی خۆی هەبو لە کۆنەوە حەشارگە و سەنگەری تیا دروست کرا بو. هیچ کەس بۆی نەبو لە ڕاوگەی خەلکی تردا ڕاو بکا. ئەم وەرزەی ساڵ، لەو ناوچەیەدا، وەرزی ڕاوەکەو بو. شەوێکیان لە باری نوست بوین. هەرسەکان خەبەریان کردینەوە وتیان دەنگە دەنگێکی زۆر لە پشتی ئاوایەوە دێ. هەموومان هەستاین گوێمان هەڵخست، ڕاست بو غەلبەغەلبێکی زۆر ئەهات. وامان لێک دایەوە کە پیادەی جەیش هێرشی بو کردبین و، بیانەوێ پشتی دێ مان لی بگرن. چوینە شاخەکە و دامەزراین. کە دنیا ڕوناک بوەوە سەیرمان کرد تاقمێکی زۆری خەلکی ناوچەکەن چون بو ڕاوەکەو.

هەر لەم ماوەیەدا جەیش لە سورکێو بە هالیکوپتەر «ئینزال» ی کرد بو، بە دوای ئێمەدا گەڕا بو، توشی چەند ڕاوکەرێک بو بو لە شاخەکەدا لە حەشارگەدا بون، هەمویان گرت بون.

کەو یەکێکە لە مەلە جوانە دەنگخۆشەکانی چیاکانی کوردستان. لە بەهاردا هێلانە ئەکات و ۱۵ تا ۲۰ هێلکەی تیا ئەکات و لە سەری کڕ ئەکەوێ تا هەلیان ئەهێنێ. بە بێچکەکانی ئەڵێن: «بارەکەو».

کەو کە هێشتا بارە ئەیگرن و لە پێش دا لە ناو کولەکە و لەپادا بە خێوی ئەکەن، کوللە و گەرای مێرولەی ئەدەنی. کە گەورە بو لە ناو قەفەزدا ڕای ئەگرن، ماش و تالیشک و کوللەی ئەدەنی و، ڕای ئەهێنن بو خوێندن یان بو باری شەرەکەو، یان بو ڕاوەکەو.

لە کۆنەوە ڕاوەکەو یەکێکە لە سەرگەرمی دانیشتوانی چیاکان. زۆر شێوە و ڕێگای جۆراوجۆریان داهێناوە بو ڕاوکردنی لەوانە:

- کەوبوار

لە بەهاران دا پۆلە کەو بە کۆمەڵ لە ناوچە گەرمەکانەوە بەرەو بەرزایی شاخەکان

کوچ ئەکەن. ریگاکانیان دیارە. راوکەرەکان لە سەر ریگایان دا لە ناو حەشاردا دائەنیشن و، بە کومەل راویان ئەکەن.

- رەشە راو

لە هەمو وەرزەکانی سال دا راوکەر لە حەشاردا دا ئەنیشی و، کەو بو خویندن و راکیشانی کەوی تر لە گەل خوی ئەبات. هەندی جار دیوجامە هەلئەواسی و، هەندی جار کەولی سەرە رێوی ئەکاتە سەری خوی. کەوی لی کو ئەبیتەوە و ئەکەویتە رلو کردنیان.

- راوە سەرکانی

لە پایزدا ناو کەم ئەبیتەوە. لە هەندی جیگا کانی و لە هەندی جیگا تەنیا ماقور ئەمینیتەوە. راوکەر حەشار لە جیگایەک دا دروست ئەکا بە سەر کانیەکەدا بروانی و، چاوەروانی هاتنی کەو ئەکا.

- راوە نیرەکەو

لە بەهار دا ماکەو لە سەر هیلکە کر ئەکەوی ژمارەی نیرەکەو زور ئەبی. راوکەر ماکەویک لە قەفەزدا ئەبا و لە نزیک حەشارگاکەی خریەوە دای ئەنی. ماکەوەکە ئەخوینی و، نیرەکەوەکان لە ماکەوەکە کو ئەبنەوە. راوکەر ئەکەویتە راویان.

- راوە ماکەو

لە بەهار دا لە کاتی هیلکە کردن دا کە ماکەو و نیرەکەو جوت ئەگرن، راوکەر نیرەکەو ئەبات لە حەشارگا دا دا ئەنیشی. نیرەکەوەکە ئەقاسپینی. نیرەکەوەکانی ناوچەکە دەنگەکەی بە بیگانە ئەزانن دین بو شەر لە گەلی، ماکەوەکانیش دین بو جوت گرتن. راوکەر تیپان ئەکەوی.

- راو بە تەپکە

راوکەر شوینی هاتوچوی کەو ئەزانی. لە سەر ریگاکەیان دا چەند چالیک هەلئەکەنی و، سەری بە تەختە یان بە دار و پوش ئەگری. کەو کە بە سەری دا رویشت تی ی ئەکەوی.

- راو بە داو

بە سەدان داو بە سنگ بە ئەرزەکەدا ئەچەقینی و، کەوی دەنگ خوشی بە دیارەوە دائەنی بو ئەوەی کەوی ناوچەکەی لی کو ببیتەوە. خوی لە ناو حەشاردا چاوەریی ئەکا. کەوەکان بە تووەییەوە بە دەوری قەفەزەکەدا ئەسورینەوە و قاچیان ئەبی بە داوەکەوە.

راوکەر زور جار شەویش ئەمینیتەوە بو دریژە پی دانی. زورجار راوکەر یەکیکی کە لە گەل خوی دا ئەبا یارمەتی بدا بو هەلگرتنی کەلوپەلی راو وەکو تفەنگ و قەفەز و

خواردن پێ ی ئەڵێن: «مەخورە».

هەرگیز حەزم لە هیچ جۆرە راوێ نەبوە و کەسیشم هان نەداوە راو بکا. زۆر جار لە گەران و سورانەوەدا بە ناو شاخ و دەشت و دەردا تووشی مەل و دەعبای کێوی بوم، نە خۆم تەقەم لێ کردون و، نە هیشتومە کەس تەقەیان لێ بکا. راو بەو جۆرەی لە کوردستان دا ئەکرێ ئەبێ بە هۆی لە ناو چونی یەکجاری دەعبا و مەلی کێوی.

نەریتێکی خراپ لە شۆرشی ئەیلولەوە داکەوتوە بوە بە باو. هەمو چەک بە دەستێ ئەتوانێ بە ئارەزوی خۆی بێ هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەک راو بکا، یان ئەگەر لە رێگاوبان دەعبا و مەلی کێوی بینێ بۆ سەلماندنی دەستراستیی خۆی تەقەیان لێ بکا و، بیانکوژێ و، بە جێ یان بهێلێ. لە ئەنجامی ئەم راوە بێ «دەستوبەرەڵیە»دا، زۆر مەلی کێویی ناپاب بە تەواوی لە ناو چون یان خەریکە لە ناو ئەچن، لەوانە: داڵ.

داڵ، چەندین ناو و چەندین جۆری هەیە: دالاش، لاشەخۆر، کەرخۆر، کورتان بە کۆڵ، سیسارک، سەرگەر... ئەمانە بە پۆل ئەگەرێن و، لە هەرجێیەک کەلاکی توپیو یا مردار هەبێ بە بۆن ئەیدۆزنەوە و لێ ی کۆ ئەبنەوە و ئەیخۆن. داڵ لەو مەلانەیە کە زۆر بە کەڵکە بۆ راگرتنی پاک و خاوێنی سروشت لە پیسیی کەلاکی بۆگەن.

*

چەند رۆژێ لە ناوچەکەدا ماینەوە، بە زۆری لە قوڕخەکان دا کاتمان بە سەر ئەبرد، چاوەروانی گەیشتنی کاک خالید و شێخ حسێن و کاک تاهیر بوین، بۆ ئەوەی هەمومان پێکەوە بەرەو تورکیان بە رێ بکەوین بۆ لای مەکتەبی سیاسی. لە شایەدبین بوین کە گەیشتن.

بەدەم رێگاوە، لەم ناوچەیەدا دوجار تووشی تەڵە بوین: جاری یەکەم، کە بە روناکی رێچکەمان بەست بۆ بە لای زنجیرەیەک رەبیەدا تێ پەرین لە نزیک شیوەکەڵ. دور بە دور دایان گرتینەوە. جاری دوەم، کە لە شایەدبینەوە ئەمانویست بچین بۆ ناوەزێ. ئەمەیان رێکەوت یارمەتی داین ئەگینا زیانی زۆرمان لێ ئەکەوت. کە گەیشتینە سەر شاخ، هەوا خۆش و، دیمەنی ناوچەکە زۆر جوان بو. گیا تازە سەری دەرئەهێنا. لە بەر هەتاوەکە، لە خۆشی ئەو هەوا خۆش و دیمەنە جوانە لە سەر شاخەکە ماینەوە و، دانیشتین. ترمەز لەبەرمانەوە بۆسەیەکی بەهێزیان بۆ دانابوین چاوەروانی ئەوە ئەکەن بە نشێوەکەدا شۆر ببینەوە بەرەو ناوەزێ. نشێویکی کوێر و روت و درێژ بو. بەڵام ئێمە دواکەوتین. بۆسەکە نائومێد بو لەوەی ئێمە دابەزین، لەوە زیاتر دانیان بە خۆیان دا نەگرت لە پڕ دایانێنە بەر دەسرێژی گوللە. ئێمە لە سەر ناوەرۆی شاخەکە دانیشت بوین. ئەگەرچی زۆری گوللەکان

کەوتە ناومان، بەڵام کەس بەرنەکەوت و نەپێکرا. چونکە دیری ئەدیوی ئاوەڕۆژەکە. بوسەکە تێتر ئاشکرا بو ئیمەش دەستەیەک پێشمەرگەمان نارده سەریان هەڵیان کەنن و راویان نان.

عەلی چوارتایی چەند جاری چو بو بو تورکان، هەر ئەو ڕیگاکەی بو دیاری کردبن. ئەحمەد فەتحوڵلا لیپرسراوی ناوچەی ماوەتی یەکێتی بو، ئەومان راسپارد تەگبیری پەرینەوەمان بو بکا. بو پەرینەوە لە چەمی کەڵوی، لە لای گرگاشەوە گوریسمان رایەل ئەکرد، سەریکیمان لە بەری عیراق و سەرەکەی تریان لە بەری ئیران ئەبەستەوە. زەلام و بارمان پی ئەپەڕاندەوە. کە ئیشەکەمان تەواو ئەبو گوریسەکانمان ئەپێچایەوە و ئەمان شاردەوە.

ڕوژیکی خوش بو. هەوا لە بار بو بو فڕینی هالیکوپتەر. ٤ گوریسمان بو بەستبن. هیزەکەمان بەرەوژوری ۲۰۰ کەس بو. د. خالید و مەفرەزەکەی لە پێشەوە پەرینەوە بو ئەوەی لە بەرزاییەکانی بەری ئیران دابەزری بو پاراستنی پەرینەوەی هیزەکە. منیش لەم بەر سەرپەرشتی پەرینەوەی هیزەکەم ئەکرد. بو ئەوەی پشێوی دروست نەبی مەفرەزە بە مەفرەزە بە ریم ئەکردن. بە سەلامەتی هەمومان پەرینەوە.

بو یەکەم جار محەمەدی مەلا عەلی بیتوی م لە سەر ئەم ئاوە بینی و ناسی. راسپاردەی هەندی لە تیکوشەرە کوردەکانی ئیرانی پی بو.

•

زێ ی پچوک

لەم سەفەرەدا ئەمە دوەمین جار بو لە ئاوی «زێ» بپەرینەوە. لە ماوەی سەفەرەکەش دا لە چەندین ڕوبار و چەم و جوگامان دا بو. کوردستان یەکێکە لە مەلبەندە دەولەمەندەکانی ئاو. وەکو چون نەوت بو بە مایەی بەدبەختی بو کورد، بێگومان لە پاشەڕوژدا ئەم نیعمەتە گەورەیەی کە خوا بە کوردی بەخشیوە، ئەمیش ئەبی بە غەزەبیکی خراپتر لە غەزەبی نەوت. لیرەدا بە پێویستی ئەزانم هەندی زانیاری دەربارەی «زێ ی پچوک» بنوسمەوە لە باسیکی کاک شورش حاجی وەرم گرتوە.

زێ ی بچوک یەکێکە لە لقە سەرەکی و گەورەکانی ڕوباری دیجلە. لە کوردستانی ئیران هەڵئەقوڵی و، لە ۳۵ کم ی خواروی شاری شەرگات ئەرژیتە دیجلەوە.

سەرچاوەکانی زێ ی بچوک لە ناوچەی لاجان و، لە نزیک شاری خانە «پیرانشەهر» ی کوردستانی ئیران هەڵئەقولین. هەر لە سەرچاوەوە چەندین لق و چەمی ئەبەستەوە سەر، هەندیکیان لە چیای قەندیل هەڵئەقولین و، بەرەو خوار ئەروا تا ئەگاتە

ڕۆژهەڵاتی شاری «سەردەشت». لەویش چەند لقێکی تری ئەچێتەوە سەر گەورەترینیان چەمی بانەیە کە لە چیاکانی ناوچەی سنە هەڵئەقوڵێ و لە گوندی ماشان تێکەڵ بە زێ ئەبێت. لەوەوە ئیتر زێ ی بچوک تا ماوەی ٢٣ کم ئەبێ بە سنور لە نێوان عێراق و ئێران دا، تا ئەڕژێتە خاکی کوردستانی عێراقەوە.

لە سەرچاوەوە تا ڕۆژهەڵاتی سەردەشت زێ بە ناوچەیەکی نیمچە تەخت و گردۆڵکاوی دا ئەڕوا، لە ناوچەی ئالان بە دۆڵێکی قووڵ و پڕ لە دارستان دا ئەڕوا. ڕۆژئاواکەی بریتییە لە زنجیرەیەک چیا بەرزاییان لە نێوان ١٨٠٠ تا ٢١٠٠ م، لە هەندێ شوێن ئەگاتە ٣٠٠٠ مەتر. کە زێ ی بچوک دێتە ناو خاکی عێراق بە گوندەکانی گرگاشە، چومە، ئاوکورتێ، قورنتینە دا تێ ئەپەڕێ. لە نێوان گوندی قورنتینە و بەر گورد «چەمی قەلاچوالان» ی تێکەڵ ئەبێت. ئینجا بەرەو خوار ئەبێتەوە تا ئەگاتە دەشتی قەلادزێ و لەوێ پانایییەکەی زیاد ئەکا، لە هەندێ شوێن ئەگاتە نزیکەی ١٠٠٠ م. لە ١٢ کیلۆمەتری خوارووی شاری قەلادزێ کۆمەڵە گردێکی گێچی ئەبڕێ. لە ویشەوە بە سنوولان و تەنیشت سەنگەسەردا ئەڕوا تا ئەگاتە دەربەند کە شوێنی بڕینی چیای «کێوەڕەش» و «ئاسوس» ە.

لە نێوان قەلادزێ و دەربەند چوار لقی تری تێکەڵ ئەبێتەوە، سەرچاوەکانیان بەفری چیای قەندیلە. بریتین لە چومی ژاراوە، چومی قەلادزێ، چومی بانێ، چومی گارڵین.

لە دەربەند تێ ئەپەڕێ و شاری ڕانیە بە جێ ئەهێڵێ، دەشتی بیتوێن و میرزا ڕوستەم ئەبڕێ تا ئەگاتە «تەنگی دوکان». لەم تەنگە دا «سەدی دوکان» دروست کراوە. بەرزاییەکەی ٤٥٩ م لە ئاستی دەریاوە. لە نێوان ڕانیە و تەنگی دوکان دا ڕووبارەکانی «قائمقام» و «قەشان» و «هیزوپ» ی تێ ئەڕژێ. لە سەدەکەوە هەردوو زنجیرە چیای «کوسرەت» و «هەیبەت سولتان» ئەبڕێ و لە دواوڵن پێچ ئەکاتەوە بەرەو خوارووی ڕۆژئاوا و بە گوندەکانی کلیسە، بوگد، قزلو، مەلا زیاد دا تێ ئەپەڕێ تا ئەگاتە شاری تەق تەق.

لە نێوان سەدەکە و تەق تەق چەندین ووشکە شیو و ڕووباری بچوک و گەورەی تێکەڵ ئەبێ، گرنگەکانیان ئەمانەن: چەمی شیوی قەیسیان لە ئاستی گوندی ئەلیاسە سور، ڕووباری شیوە سوری کانی هەنجیر لە نێوان کانی هەنجیر و گەلناغاج، شیوە سور لە قەلاتکەی نێوان گوندی گومەشین و قزلو. ئینجا لە تەقتەقەوە بەرەو ڕۆژئاوا ئەڕوا و لە نێوان گوندی کانی لەلە و ئومەر گومبەت ڕووباری کوێەی تێکەڵ ئەبێت کە لە چیای باواجی هەڵئەقوڵێ. وە لە ئاستی گوندی سارتک بەستی شەرگەی ئەچێتەوە سەر، کە ئەمیش لە چیای باواجیەوە هەڵئەقوڵێ و لە زستان و بەهارا ئاوەکەی زۆرە و لە ئاستی گوندی

«چومەزەردەلە» روباری شاقازی ئەچێتەوە سەر. بەرزایی لەم ناوچەیە لە ئاستی دەریاوە ۳۰۰ م ئەبێ. ئینجا بەرەو خوار ئەچێتەوە تا ئەگاتە شاری پردێ «ئالتون کوپری» کە بەرزاییەکەی ۲۵۵ م.

لە نێوان «کلیسە» و «پردێ» دا، هەردووبەری کەناری زێ بە هۆی قوڕ و لیتەی چەند ساڵەی لافاوەوە زەوی زۆر بە پیت دروست بوە، پێ ی ئەڵێن: «حاوییە» و «دەرن» بۆ کشتوکاڵ سودی لێ وەرئەگرن.

لە ناو زێ دا لە چەند جێگایەک پەلەیەک وشکایی لە شێوەی جەزیرەیەکی بچوک دا دروست بوە پێ ی ئەڵێن: «دوورگە». یەکێکیان کەوتوتە ناو شاری پردێ و پێ ی ئەڵێن: «گەرەکی دوورگە».

لە نێوان پردێ و شوێنی یەکگرتنەوەی لە گەڵ دیجلە دا زێ ی بچوک لە هەمو شوێنەکانی تر پانترە. هەر لەم شوێنە هەردو زنجیرەی «زورگەزراو» و «قەرەچوغ» ئەبڕێ. لەسەرو ئەوبەری زێ لە زورگەزراو مەیدانێکی گەورەی نەوت هەیە، حکومەتی عێراق سەدان بیری تێ دا هەڵکەندوە و نەوتیان لێ دەرئەهێنێ.

لێڵی زێ ی بچوک زۆر لە لێڵی ئاوی دیجلە زیاترە، بۆ نمونە: لە سنوری عێراق و ئێرانەوە بۆ تەق تەق ۱:۳۰۰ و لە نێوان تەق تەق و پردێ ۱:۱۱۱۱

درێژی زێ ی بچوک نزیکەی ٤٠٠ کیلومەترە. رووبەری ئاوەڕۆکەی ۱۱٦۹۰ کم۲ یە. زۆرترین ئاو کە بە زێ ی بچوک دا هاتبێ لە رۆژی ۲۵/٤/٥٤ بوە گەیشتوتە ۳٦٦٠ م۳/ سانیە. و کەمترینیشی ۲۵م۳/ سانیەیە، معدلەکەی ۲۰۲م۳/ سانیەیە.

زێ ی بچوک بە گوێرەی ئەو شوێنانەی پیا ئەڕوا ناوی ناوچەیی لێ نراوە: لە ناوچەی سەردەشت «چەمی کەلوێ» و، لە ناوچەی ئاڵان «چەمی ئاڵان» و، لای هەرزنە و تەشکان «چەمی هەرزنە» و، لە ناوچەی قەڵادزێ «زێ ی خاس» و «زێ ی سنەولان» و، لە ناوچەی کۆیە و قەڵاسیوکە «زێ ی دوکان» و «زێ ی کۆیە» و، لە ناوچەی شێخ بزێنی و دەشتی هەولێر «زێ».

لە کۆنەوە بە «کەلەک» بە ناو ئاوی زێ دا کەلوپەل بە تایبەتی دار و خەڵوزیان لە دوکان و تەقتەقەوە بۆ دوبز و پردێ گواستوەتەوە.

ئاوی زێ لە قولاییی دایە. زۆر نزمترە لە ئاستی زەویوزاری تەنیشتی. لە بەر ئەوە جوگای لێ هەڵنابەستری تا بۆ کشتوکاڵ یان خواردنەوە بە کار بهێنری بەڵام گۆڕینی ئاوەڕۆکەی لە هەندێ شوێن دا ئەتوانێ ببێ بە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ ئاوداتی زەوی پان و بەرین بۆ نمونە:

– ئەگەر لە هیزۆپەوە بەو گەلی و دەربەندانەی چیای سەفین و باواجی دا ئاوەکەی
بەری بۆ ڕۆژئاوای شاری کۆیە، تۆپۆگرافیای ناوچەکە یارمەتیدەر نیە بۆ ئاودێری هەردو
بەری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای دەشتی کۆیە و سالیی و ملکیە و شیخ بزێنی خوارو.
– ئەگەر لە دامێنی سەددی دوکانەوە ئاوەڕوی زێیەکە بە ناوچەی قەشقەولی و
زنجیرە چیای «بێتزمرد» وە ئاوەکە بگۆردرێ بەری بۆ بەرزاییەکانی بازیان و قەلاسیوکە ئەوا
هەمو دەشتەکانی قەلاسیوکە و شوان و هەمەوەند و چەماری زۆر بە چاکی ئاودێری ئەکا کە
ڕوبەرێکی زۆر گەورەیە و تەبیعەتی ئاو و خاکەکەی زۆر گونجاوە بۆ هەمو جۆرە
بەرهەمێکی کشتوکالی.

لە سەر ئاوی زێ دو بەنداو دروست کراوە یەکێکیان، «بەنداوی دوکان» و، ئەوی
تریان «بەنداوی کونەکوتر» ، لە دوبز. بەنداوی کونەکوتر بچوکترە لە هی دوکان بۆ
ئاودانی ناوچەی حەویجەیە.

*

شەوەکەی لە ئاوایەکی بچوکی تەبران مایەنەوە و شەوەکی بەری کەوتین بەرەو
«کورێناو». ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتین. هێشتا بلاو نەبویونەوە بۆ نان خواردن،
ژاندارمەی گەیشتە سەرمان. کردیان بە قڕە و هەڕەشە کە دەسبەجێ ئێی لە ناوچەکەی
ئەوان دور بکەوینەوە. هەرچی لە گەلیان خەریک بوین ئەیان هیشت بۆ پشودان بمێنینەوە.
مۆختاری کورێناو خەبەری لی دابوین.

بۆ ئێوەڕوی ڕۆژی دوایی گەیشتینە «بنوخلیلف». بە گەرمی پێشوازییان لی
کردین و، بۆ فراوین بە ماڵەکان دا بلاو بوینەوە. لەوە بیستمان شەرێکی قورس لە
«دەشتبەو» ڕوی داوە. چەندین پێشمەرگە کوژراون و، هەندێکیان گیراون. کاک خالید
کەوتە مەراقەوە وتی: «ئەوە مەترەزەکەی مەنە توشی شەڕ بون». هەرچەندە زۆر ماندو بوین
بەلام کاک خالید پەروشی زانینی هەوالی شەڕەکە و دەرباز بوەکان بو. بە پەلە کەوتینەوە
ڕی بەرەو «ئەرکان».

*

## نۆکان: سەرەتای کارەسات

*

نۆکـان گـوندە دێ بو. لە ئەرزی ئێـران دا بو. چـەند مـاڵـێکی کـەمـی تێ دا بو. دو سێ خانو کە پاییزی رابوردو قم دروستیان کردبو، ئێمە لە هاتنمان دا پێمان چوڵ کرد بون، مەکتەبی سیاسی یەکێتی تێ چو بو. مامجەلال و عەلی عەسکەری و رەسـوڵ مـامـەند و ئازاد هەورامی لەو خانوانەدا بون. خانوی تەنگ و تاریک و بچوک بون. بە گـەیشـتنی ئێمە زور خوشحاڵ بون. پێشـمەرگەکانمان نارد، «شێنی» و «بیدەلان»، و خومان لە لای ئەوان ماینەوە.

*

شەری دەشتێو

سەعدی عەزیز و، سەید کاکە، ئەوانیش وەکو ئێمە بەرێگاوە بون بەرەو نوکان بو بەشداری لە کوبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی یەکێتی دا. لە گوندی «دەشتێو» لە پشدەر توشی شەر بون. لەم شەرەدا سەعدی و ۱۲ پێشمەرگە کوژران و، ٤ لە پێشمەرگەکان بە دیل گیران. دوایی ئەوانیشیان ئیعدام کرد. سەید کاکە و جەوهەری برای کاک خالید و زرار وەرتی و چەند پێشمەرگەیەک لە شەرەکە دەرباز بوبون و گەیشت بونە نوکان.

مەکتەبی سیاسی بە بونەی شەهید بونی سەعدی عزیز و هاوڕێکانییەوە بەیانێکی دەرکرد بو.

کـاتی خـوی من هەواڵی شـەرەکـەم بەمجـورە دارشـتوە و، لـە یەکـەمـین ژمـارەی «هەواڵنامە» دا بڵاو کراوەتەوە:

٨ ی مـارتی ٧٨ دەمـەوبەیانی لە کـاتێک دا کـە هـێزێکی پ م بە رێگاوە بون بەرەو ناوچەی پشدەر لە گوندی دەشتێو (قەڵادزە) لە سەر زێ کەوتە بوسەیەکی گەورەی دوژمنەوە. شەر لە بەیانییەوە تا ئێوارەی خایاند. بە قەد ژمارەی پێشمەرگەکان هاڵیکوپتەر بەشدار بو لە شەرەدا. پێشمەرگەکان بەربەری قارەمانێتییەوە وەستان و لاپەرەیەکی تریان لە مێژوی شورشەکانی گەلەکەمان دا بە خوێنی خویان نوسی و زیانی گەورەیان لە دوژمن دا:

. ۱٦ سەرباز و ئەفسەر زیاتر کوژران

. ٢٥ سەرباز و ئەفسەر زیاتر بریندار کران

چەندین هالیکۆپتەر پێکرا لەوانە ٣ یان کەوتنە خوارەوە
چەندین ناڵیلە و زیلی سوپایی شکێنرا
زیانی ئێمــــە: ئەندامی ســەرکــردایەتی پ س ک، ئەندامی ک س - ی ن ک، فەرماندەی هەرێمی دەشتی هەولێر سەعدی عەزیز. ئەندامی پێشکەوتوی کەلک، رابەری سیاسی هەرێمی دەشتی هەولێر فاروق صدیق. پ م فەرخ قادر (هەولێر). پ م فەریق هەمزە (هەولێر). پ م شاهین عیزەدین (هەولێر). پ م طاهیر حەمەد (هەولێر). پ م جەبار ئیسماعیل (هەولێر). پ م عوسمان باوە (هەولێر). پ م عەزیز باپیر (هەولێر). پ م سامی عوبێد (هەولێر). پ م صەباح جەمیل (هەولێر). پ م ئەحمەد محەمەد ئەمین (هەولێر). پ م ئەحمەد محەمەد (هەولێر). شەهید بون.

*

هەروەها ئەم پێشــمەرگانە بە دیل گیــران: جەعفــەر ئەسـوەد (کـویە)، حســین عەبدورەحمان (کویە)، جەواد کەریم (کویە)، کەمال واحید (کویە).
رۆژی ٧٨/٦/٢١ لە زیندانی موسل لە سێدارەیان دان.
ئیسماعیل تایە نعیمی، سەرکردەی ئەوسای فەیلەقی یەک، لە (ل ٢٢١ تا ٢٢٥) ی کتێبەکەی دا: «تجربتی فی القیادە» باسی شەری دەشتیوی وەکو یەکێ لە شەرە سەرکەوتووەکانی ئەو سەردەمەی خۆی بە درێژی گێراوەتەوە.
ئەوەی لە سەرەوە نوسراوە راستیی روداوەکە بو. بۆ بەراوردی جۆری گێــرانەوەی ئێـمە و گێـرانەوەی سەرانی جەیش و، نیشـاندانی زلی قــوارەی لەشکرکێـشییەکە و هاشوهوشی ناراستی نعیمی، لێرەدا دەقاودەق باسەکەی نعیمی ئەنوسمەوە:
بساط ناجح فی منطقة (قلعتدزة)
٤١٠. فی ربیع عام ١٩٧٨ خطط الفیلق لحرکة بساط فی منطقة (قلعتدزة) علی ان یکون مرکز البساط قریة (دیشتیوی) وهی قریة تقع علی وادی اخضر قریبة من الزاب الاسفل وجنوب (قلعتدزة) علی أن تشترك فیها قوات من الفرقة الثانیة والفرقة التی فی منطقة (السلیمانیة) وقد حددت الاهداف علی أن یتم مسك المصدات مع الضیاء الاول بالطائرات السمتیة ثم بعد ذلك تبدأ عملیة التمشیط للبحث عن العصاة المحصورین تحت البساط.
وفی ساعة مبکرة تحرکت من (کرکوك) برافقنی قائد الفرقة فی قاطع (الموصل) العمید الرکن حازم برهاوی وتوجهنا الی (السلیمانیة) حیث استصحبت محافظ السلیمانیة السید ارشد الزیباری .من السلیمانیة تحرکت الی (دوکان) التی کانت قاعدة انطلاق قطعات

الفرقة فى منطقة السليمانية وعند النزول فى (دوكان) سألنا عن قائد الفرقة فاخبرونا انه يستطلع بطائرة الويت وسألنا ضابط الركن فى المقر الجوال الذى تم تأسيسه فى (دوكان) للقيادة العملية فاخبرنا انهم لم يستطيعوا مسك المصدات حيث اضطرت عناصر من القوة للعودة الى (دوكان) وبعضها نزل فى (قلمدزة) نظرا لاصابة طائرتهم وقد بلغ عدد الطائرات المصابة ثمانية طائرات ولذلك لم يتم مسك المصدات المطلوبة وفق الخطة. لقد طلبت حضور قائد الفرقة الى (دوكان) ولكنه تأخر وكان الوقت يقارب الساعة ١٠٠٠ فطلبت احضار القوة وحبوطها فى المصدات بنقلها بوجبات بالطائرات المتوفرة وفعلا أمكن إنزال القوة ومسك المصدات ولم تصب اى طائرة بأذى اذ ان الفرقة الثانية نقلت واجباتها بسرعة ومسكت المصدات وهيأت لواء قوات خاصة للقيام بالتمشيط وبعد ان امكن تنفيذ الخطة بحضورنا فى قاطع (دوكان) ولعدم حضور قائد الفرقة غادرت (دوكان) وذهبت الى (قلمدزة) وشاهدت الطائرات المصابة فظهر ان اكثر الاصابات لاتؤثر على الطيران ولذلك طلبت طيرانها عدا اثنين منها كانت اصابتها تؤثر على الطيران وتحتاج الى تصليحات قد تستغرق يوما كاملا ولذلك امرت بعودة الطائرات والقوة الى (دوكان) لاستخدامها لتعزيز المصدات التى امكن مسكها بدون مقاومة بالقوة المتوفرة فى (دوكان) ولكن التاخير الذى سببه عدم تنفيذ مسك المصدات فى مواعيدها حسب الخطة ساعد على هروب بعض العصاة قبل اكمال الطوق حولهم.

٤٠٢. عند وصولى الى (قلمدزة) سألت عن قائد الفرقة الثانية وهو العميد الركن لطفى الدباغ حيث تم نقل قائدها السابق اللواء الركن سعدالدين عزيز بعد الانتصارات الباهرة التى حققتها فرقته الى منصب معاون رئيس اركان الجيش للتدريب ونقل بدله العميد الركن لطفى الدباغ وهو ضابط كفوء حيث عملنا معا معلمين فى كلية الاركان معا وكنت معلم القدم وهو معلم محى لدورة الاركان (٣١) كما كان آمر فوج مشاة فى (كويسنجق) عندما كنت قائدا للفرقة الثانية سنة ١٩٦٩ وتمكنا من فتح الطريق الى (كويسنجق) (راجع الفصل الثالث). لقد ذهبت الى مقر الفرقة الجوال فى منطقة مشرفة على قرية (دشتهوى) فوجدت هناك قائد الفرقة وآمر لواء القوات الخاصة العقيد الركن صباح صبرى ولواءه مفتوح للقيام بالهجوم على سلسلة التلول المشرفة على القرية وكان فى قمة هذه السلسلة موقع يبدو انه ملائم لنزول الطائرات السمتية يظهر ان العدو قد شخص هذا المكان ووضع قوة لمسكه كما توزع على السلسلة بعد اكمال الطوق حوله وعدم امكان التملص الا بعض الاعداد التى كان يقودها (سيد كاكه) والتى استطاعت التملص لتأخر مسك المصدات من قبل الفرقة فى قاطع السليمانية. وعند شرح الموقف من قبل قائد الفرقة وآمر اللواء عرفت انهم ينوون مهاجمة السلسلة بلواء القوات الخاصة لمسك قمة السلسلة ثم بعد ذلك الاندفاع الى القرية وتفتيشها.

لقد لاحظت ان هنالك قمة كائنة شمال القرية، يستطيع العدو الانسحاب اليها من القرية فطلبت ارسال قوة بالطائرات السمتية لمسكها والسيطرة على الوديان التي تؤدي الى الشمال والشرق من القرية فتم ذلك بسرعة بينما كان العصاة مشغولين بالقوات الخاصة التي تتقدم باتجاه السلسلة امكن اجراء عملية الانزال بدون مقاومة وبذلك استطعنا ان نطوق القرية بصورة كاملة بحيث لايمكن ان يفلت العصاة من هذا الطوق الا اثناء الليل، ولذلك طلبت السرعة في حسم المعركة نهارا قبل حلول الظلام وقد تكلمت مع القوات الخاصة قبل حركتهم للهجوم فازداد اندفاعهم كما انني اعرف آمر لوائهم وهو من الضباط الشجعان المندفعين ولذلك كنت مطمئنا بانهم سيحتلون اهدافهم بسرعة. كما تكلمت مع طياري السمتيات المقاتلة وطلبت منهم مساندة القوات الخاصة بضرب الحافة القريبة للسلسلة والاستمرار بالاسناد لحين وصول القوات الخاصة على ان يتم التنسيق بين اسناد الطائرات والاسناد المدفعي الذي تم وضع خطته من قبل آمر مدفعية الفرقة بالتعاون مع امر لواء القوات الخاصة. اندفع الفوج الاول بسرعة واستطاع ان يمسك ربيئة قديمة في بداية السلسلة بعد ان تركها العصاة ولكن القوات الخاصة كعادتهم لم يعسكروا المنطقة بل انحدروا الى السفح الاخر معقبين العصاة وتركوا الربيئة، فقام العصاة بهجوم مقابل استطاعوا على اثره ان يطاردوا السرية التي وصلت الى الربيئة واستشهد امرها و جرح ضابط اخر. ولم تتراجع السرية الى مسافة بعيدة بل بقيت في طنف لايبعد عن الربيئة اكثر من مائتي متر وامكن تحويل نيران المدفعية والسمتيات على الربيئة التي مسكها العصاة وارسلت سرية جديدة لتعزيز السرية الاولى فاندفعت السريتان لاحتلال الربيئة. وفي الساعة ١٤٣٠ هبطت طائرة سمتية مقاتلة حيث اصيبت بشظية من قنبلة (آر بي جي ٧) وتحتاج الى تصليحات بسيطة ولكن طياريها لم يصب باذى فتحول الطيار الى طائرة اخرى واستأنف المعركة ان هذا الطيار لا اتذكر اسمه ولكنني اكبرت فيه روح التضحية والاندفاع وقد طلبنا تكريمه لشجاعته لقد كنت اراقب المعركة ومعي محافظ السليمانية ارشد الزيباري وهو ضابط شجاع ومقاتل جرئ والعميد الركن حازم البرهاوي وقائد الفرقة الثانية. هبطت طائرة الويت ونزل منها قائد الفرقة في منطقة السليمانية وسألته اين كنت كل هذه الفترة الطويلة وقد سألته عن موقف فرقته فقال جيد مع العلم انه لم ينفذ ما مطلوب من الفرقة الا بعد ان وصلنا (دوكان) وطلبنا التنفيذ. وكان القائد في الاستطلاع وكان الاعتذار لعدم التنفيذ بسبب وجود مقاومة.

٣ . ٤. كانت المعركة تسير بشكل جيد والقوات الخاصة تندفع لاعادة احتلال الربيئة التي يمكن اعتبارها مفتاح الموضع. اقترح قائد الفرقة في قاطع السليمانية ان اسمح له باستخدام سرية مغاوير من فرقته لانزالها في قمة السلسلة بالطائرات السمتية فقلت له ان

العدو بمسك القمة بقوة وقد ضربوا احدى السمتيات المقاتلة بالقاذفات ولذلك فان الانزال لايمكن تنفيذه مع العلم ان العصاة محصورين ولذا فانهم يدافعون عن رقابهم ولذلك لم اوافق على هذا المقترح كما ان الفرقة الثانية استطاعت ان تحتل الربيئة في بداية السلسلة واندفعت القوات الخاصة على ظهر السلسلة باتجاه القمة كما ان الناحية الادبية لا تجيز تدخل قائد في قاطع قائد اخر الا بعد ان يثبت عجزه وعدم مقدرته على ادارة المعركة في قاطعه ولذلك رفضت هذا المقترح.

لقد كان لهذا الرفض اثره البالغ على قائد الفرقة في قاطع السليمانية حيث ذهب الى المسؤولين ونقل صورة المعركة بشكل مغاير للحقيقة وقد علمت بذلك من السيد ارشد الزيباري محافظ السليمانية عند مواجهته لاحد المسؤولين حيث اخبره بالمعركة التي شاهدها بنفسه لكنه وجد صورة غير حقيقية لدى المسؤول عن المعركة. ان هذا العمل ان دل على شئ فانما يدل على مدى الطموح غير المشروع الذي كان لدى قائد الفرقة في قاطع السليمانية فلا يهمه قلب الحقائق والاضرار بالاخرين من اجل الوصول، ولم نكن نعلم ان وراء هذا الطموح والتكالب على المنصب مخطط تآمري لضرب قياداتنا وحزبنا المقدام حزب البعث العربي الاشتراكي ولكن الله كان بالمرصاد فتم كشف المؤامرة ونال المتآمرين جزاءهم.

٤٠٤. لم تمر فترة طويلة على القوات الخاصة التي اندفعت باتجاه القمة وعند اقترابهم منها هرب العصاة منها فلحقت بهم السمتيات المقاتلة وقتلت اعدادا كبيرة منهم ونحن نشاهد هذا المنظر فقال السيد ارشد الزيباري محافظ السليمانية لقد قاتلت العصاة لفترة طويلة ولكنني لم اشاهد في حياتي مثل هذا المنظر فالعصاة ينحدرون من القمة باتجاه القرية ويعقبهم رجال القوات الخاصة وكانت مطاردة مشهودة فتم احتلال القرية واسر مايزيد على ٣٥ من العصاة اما الاعداد الاخرى فتم قتلهم وبقيت جثثهم في المنطقة. كان بحوزتنا مصوري تلفزيون لتصوير هذه المعركة ولكن لم يكن معتادا تصوير المعارك تلفزيونيا في ذلك الوقت.

لقد كانت معركة (ديشتوى) معركة ناجحة وحاسمة وامكن مسك وقتل كافة العصاة اللذين كانوا في المنطقة ولم يستطيع ان يفلت منها سوى (سيد كاكه) مع عدد من حمايته، وقد هرب عندما تاخرت الفرقة في قاطع (السليمانية) من مسك المصدات حسب الخطة...

*

لە ناو كومەلەدا گیروگرفتی راستەقینەمان هەبو:

– كومەلە هەندێ لە سەركردەكانی لە زیندان دا بون. لە كومیتەی هەریمەكانیش؛ ئارام كوژرا بو، سالار لە دەرەوەی ولات بو. ئازاد هەورامی و مەلا بەختیار لە ناو پیشمەرگەدا بون. سەركردایەتی پیشو و، كومیتەی هەریمەكان لە كونفرەنس یا

کۆبوونەوەیەکی فراوان دا هەڵ نەبژێردرا بوون. هەردووکیان خۆیان شەرعییەتی ئەندامییان بە خۆیان دا بوو.

- کۆمەڵە کۆمیتەی سەرکردایەتی یان مەکتەبی سیاسی یان ناوەندێکی ئەوتۆ سەرپەرشتی هەموو ڕێکخستن بکا. ئۆرگان و بڵاوکراوەی نەبوو. کاک ئارام یەک هەوڵی دابوو ئۆرگانی بۆ کۆمەڵە دابمەزرێنێ. یەک ژمارەشی لێ دەر کرد بوو. ئیتر هیچی بە دوادا نەهات بوو.

- کادرەکانی هەموو گەنجی تازە پێگەیشتوو بوون. سەرمایەی ڕۆشنبیریی گشتی و مارکسی و، ئەزموونی سیاسی و پێشمەرگەییان کەم بوو.

- بە هۆی سەختی هەلومەرجی ئەو کاتەوە پەیوەندی لە نێوان کادرەکان و ڕێکخراوەکان و بەرپرسەکان دا کز بوو. هەر کەسە و هەر ڕێکخراوە سەربەخۆ بە گوێرەی «ئیجتیهاد» ی خۆی کاری ئەکرد.

- مەلا بەختیار و سالار «طموح» یان لە توانا و لێوەشاوەیی خۆیان زۆر زیاتر بوو. هەریەکەیان لە لای خۆیەوە هەوڵی ئەدا جێگەی ئارام بگرێتەوە. مەلا بەختیار بە هەڵمداوان چوو بوو قەرەداغ هەندێ لە کادرەکانی کۆمەڵەی کۆ کردەوە، وای ئەزانی هەرچی لە قەرەداغ جێگیر بێ ئەبێ بە سکرتێری کۆمەڵە. بەر هێرشێکی جەیش کەوتن، ئەمین پەرلا (ئەمینی حاجی شێخ عەلی) کوژرا و خۆیان بە قەلاکەت دەرباز بوون. سالاریش لە سورداوە هەندێ نامەی «هەڵمەت پەڵەت» ی بۆ «کۆمیتەی هەڵمەت» نوسی بوو.

گرنگترین کاری ئەم کۆبوونەوەیە ئەوە بوو؛

یەک ناوەندی جێگای باوەڕ دروست بکا سەرپەرشتی هەموو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و، پێشمەرگە و فەرماندەکانی بکا. یەکیتی بیر و هەڵوێست و کاریان تێ دا دروست بکا.

*

بۆ ئەم کۆبوونەوەیە هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵە کە لە ڕیزی پێشمەرگەدا بوون، وەکو کادری ڕێکخستن، ڕابەری سیاسی، فەرماندەی مەفرەزە و کەرت بانگ کرا بوون. داوام لە ڕێکخراوە نهێنییەکانیش کرد بوو ڕاپۆرتی درێژ بنوسن. خۆم کۆمەڵێ پرسیارم بۆ نوسی بوون وەڵامی بدەنەوە.

زۆری ئەوانەی داوام کرد بوو بێن بۆ کۆبوونەوە هات بوون، تەنها ئەوانە نەهات بوون کە ئاگادار نەکرا بوون، یان نەیان توانی بوو شوێنەکانی خۆیان بە جێ بهێڵن. ڕێکخستنی شارەکان، بە تایبەتی کۆمیتەی هەڵمەت، ڕاپۆرتی تێرو تەسەلیان نوسی بوو. بۆ من ئەمە تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو، باوەڕی ئەم هاوڕێ یانە ئەدۆزینەم و، جێگەی باوەڕی ئەوان بم.

کۆبوونەوەکانم لە سەرەتاوە کرد بە «سیمینار» بۆ: «لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی ناوخۆیی، ناوچەیی، جیهانیی» و «چۆنیەتی گەشە پێ دانی سیاسی، ڕێکخراوەیی، پێشمەرگەیی کۆمەڵە و، بە هێز کردنی یەکێتیی نیشتمانی».

لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە ئەمە یەکەمین کۆبوونەوەی ئەندامەکانی بوو. پێشتر بە هۆی پەیڕەوی ڕەوشوێنەکانی کاری ژێرزەمینییەوە نەیتوانی بوو کۆبوونەوەی وەها ڕێک بخا. خیبرەتێکی گەورەمان هەڵ دا بوو، زۆری بەشدارانی کۆبوونەوەکە شەو لەوێ نەمانەوە. ناسیاوی و برایەتییان بەهێزتر ئەبوو، شەویان بە قسەی خۆش و «شەرە شیعر» و «شەرە سەربن» تا درەنگ بە سەر ئەبرد. لە مێژ بوو «سەلتەنەتی» وەهایان بە خۆیانەوە نەدی بوو: شەو بە بێ حەراسەت و کەمین و بە بێ ترس بنوون و، بەیانی بە ئارەزووی خۆیان هەڵ بستن!

بەشدارانی کۆبوونەوەکە بەوپەڕی ئازادییەوە بیروڕاکانی خۆیان دەربارەی هەموو باسەکان دەربڕی و، هاوبەشییان لە گفتوگۆکان دا ئەکرد. مامجەلال چەند «محاضرە»یەکی بۆ دان و، کاک عەلی و کاک خالید بوو بە خێرهاتن سەردانیان کردن.

هەندێ بڕیاری ڕێکخراوەیی و سیاسی گرنگ درا. لەوانە:

- دروستکردنی ناوەندێک بۆ کۆمەڵە، کە هەموو ڕێکخستنەکان و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە فەرمان و ئامۆژگاری لەو وەربگرن. «ئۆرگان» و بڵاوکراوەی پێویست دەربکا.

- مانەوەی هەموو ئەوانەی ئەندامی سەرکردایەتی بوون و، بە هۆی خەباتی سیاسییەوە گیرا بوون، لە سەرکردایەتی دا.

- دامەزراندنی سەرکردایەتی تایبەی بۆ ڕێکخستنی شارەکان.

- بەهێزکردنی تەبایی و دۆستایەتی لە گەڵ بزووتنەوە و، بەهێزکردنی ڕیزەکانی یەکێتی.

کۆبوونەوەکان، کە چەند ڕۆژێکیان خایاند، بە سەرکەوتوویی تەواو بوون. ئەوانەی ئەبوو لە سەفەری یادینان دا بەشدار بن مانەوە و، ئەوانەی تر گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان.

*

کشانەوەی ڕەسوڵ مامەند لە مەکتەبی سیاسی

لە ناو سەرکردایەتی بزووتنەوەدا کێشەی قوڵ هەبوو، ئەم کێشانە کاریان لە چالاکی و کارەکانی یەکێتی پش کرد بوو. هەندێ لە سەرکردەکانی بزووتنەوە کە لە شار بوون، ئەیانویست بزووتنەوە لە یەکێتی جیا بکەنەوە، لە گەڵ هەندێ لە بیروبۆچوونە بنەڕەتییەکانی یەکێتی نەبوون.

دروشمی سەرەکی یەکێتی: «ڕوخاندنی ڕژێمی فاشی عێراق» بو. ئەوان ئەم دروشمەیان پەسەند نەدەکرد. لایان وابو، جێبەجێ کردنی ئەم دروشمە لە توانای کورد بە دەرە، بەڵکو هەندێکیان لایان وابو حیزبی بەعس هاوپەیمانی ستراتیجیی کوردە و، جوڵانەوەی کورد ئەبێ دەس لەو دروشمە هەڵبگرێ و، لە ڕێگای گفتوگو لە گەڵ بەعس هەوڵی چاککردنی داوودەزگای ئوتونومی بدات. لە گەڵ دەس پێ کردنەوەی خەباتی چەکداردا بەیانێکیان بە عەرەبی لە لوبنان و ئەورووپا بەم مەعنایە بلاو کردەوە. وەکو ئەیان وت: صلاح بەدرەدین، کە دوستی بەعسی عێراق بو، بوی بلاو کرد بوەوە.

لە ناکوکی نێوان ئێمە و یەکێتی دا پێ یان وابو ئەمە زیندوکردنەوەی ناکوکی مەلایی و جەلالییە. ئەوان پێویستە نەبن بە بەشێ لەم ناکوکییە، بەڵکو پێویستە «خەتی سێهەم» دروست بکەن.

لە کاروبارەکانی ناو یەکێتی دا مامجەلالیان تاوانبار ئەکرد بە «تاکڕەوی» و، بە داشکاندن بە لای کومەڵەدا.

لە ناو سەرکردەکانی بزوتنەوەدا لە شاخ ڕەسوڵ مامەند کەوت بوە ژێر تەئسیری ئەم بیر و ڕایانەوە و، دیفاعی لێ ئەکرد. هەندێ لە بیر و بوچونەکانیان جورێ لە ڕاستییان تێ دا بو، بەڵام شێوەی کار و پروپاگاندەکانیان نادروست و زیانبەخش بو. ڕەسوڵ بە درێژایی زستان کێشە و کێبڕکێیی لە گەڵ مامجەلال دروست کرد بو. تەنیایی لە ناو مەکتەبی سیاسی دا نەیهێشت بو. زوری کارەکان تەگەرەیان تێ کەوت بو.

سەرکردایەتی بزوتنەوە خەریکان کوبونەوە. ڕەسوڵ لە مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی کشایەوە. لە یاتی ئەو تایەریان بو ئەندامەتی مەکتەبی سیاسی و، حاجی حاجی برایم یان بو ئەندامەتی کومیتەی سەرکردایەتی دانا. ڕەسوڵ «تفرغ» ی کرد بو کاری بزوتنەوە.

*

دەفتەری سەروەری

بە درێژایی ساڵی ٧٧ بەعس بەوپەڕی دڕندایەتییەوە تێکوشەرانی گەلەکەمانی لە سێدارە ئەدا. گیراوەکان خویان لیستەکانیان بو ئەناردین و، ڕێکخستنی شارەکانیش هەواڵ و دەنگوباسەکانیان ئەنارد. زوری ئەم ئاگادارییانەم لە گەڵ ئەو ئاگادارییانە، کە خوم لە سەر شەهیدانی پێشمەرگە کوم کرد بونەوە، لە یەک دا و، لە نامیلکەیەک دا ئامادەم کرد بە ناوی: «دەفتەری سەروەری» یەوە.

گیراوەکانی یەکێتی، بە تایبەتی ئەندامەکانی کومەڵە، لە زیندان دا نەریتێکی

ئازایەتییان داهێنا: تەریقی «نامە نووسین لە ژووری خنکاندنەوە» کە تا ئەوسا باو نەبوو.

ئەفسەرە کوردەکان: محەممەد قودسی، عیززەت عەزیز، خەیروڵڵا عەبدولکەریم و مستەفا خۆشناو، پێش هەڵواسینیان بە چەند سەعاتێ نامەیەکی گرنگیان بۆ میللەتی کورد نووسیوە. نامەکە وەکو سەروەرییەکی نەتەوەیی زۆر جار بڵاو کراوەتەوە و، بوو بە سەرمەشق بۆ تێکۆشەرانی ڕێگای کوردایەتی.

دوای ئەوان کەسێکی کە نامەی لەو بابەتەی نەنووسی بوو، یا ئیمە پێمان نەگەیشت بوو. هاوڕێیانی کۆمەڵە سەرەدڵیان شکان و، بە نامەی شۆڕشگێڕانە لە ژووری ئیعدامەوە، سەرکردەکانیان، هاوڕێکانیان، خزم و کەسوکاریان هان ئەدا بۆ درێژەدان بە خەبات تا سەرکەوتن.

زۆری ئەو نامانە لە لای من کۆبوونەوە. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە بۆیان ئەناردم. نامەکان ئەوەندە بەرز و بە سۆز بوون، هەستیان ئەبزواند و کاریان لە ناخی دەروون ئەکرد. من هەر کە وەڕس ئەبووم، هەندێ لەم نامانەم ئەخوێندەوە، سەرلەنوێ تین و تاوم تێ ئەگەڕایەوە.

نامەکان هەندێکیان بۆ مام جەلال و، هەندێکیان بۆ من و هاوڕێ و دۆست و، هەندێکیان بۆ کەسوکاریان نووسی بوو. هەر ئەو زەمانە هەندێ بەشم لەم نامانە لە «دەفتەری سەروەری» و «هەواڵنامە» و «کۆمەڵە» دا بڵاو کردەوە. دوابەدوا هەمووم دا بە دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی زۆریان لە کتێبێک دا بڵاو کردەوە لە ژێر ناوی: «چەند نامەیەک لە زیندانی فاشیستەکانەوە». نازانم ئەسڵی نامەکانیان چی لێ کرد.

لە دەفتەری سەروەری دا، پێشەکییەک و، چەند برگەیەکی هەندێ لەو نامانە و، لیستی ناوی هەموو ئەوانەی لە چالاکی پێشمەرگایەتی دا و، لە زیندانەکانی عێراق دا تا ئەو کاتە کوژرا بوون؛ نووسی بوو.

پێشەکیی دەفتەرەکەم بەم بەیتەی «مەحوی» دەس پێ کرد بوو:

بە پێی مەرگەوە فەرسەخ بە فەرسەخ ڕۆیین مەردان

ئەوی پاکی لە مردن بێ دیارە پەلخ و نامەردە!

مەحوی خۆی «ئەهلی تەصەووف» بوە. وەکو هەموو صوفییە ڕاستەقینەکان بەو جۆرە لە مردن و ژیانی ڕوانیوە. هاوڕێیانی کۆمەڵەش، ئەو زەمانە، صوفی ڕاستەقینە بوون: عاشقی نەتەوە و نیشتمانەکەیان بوون. «کوردی» لەم بارەیەوە ئەڵێ:

ئەسڵی مەقصەد هەر یەکێکە بۆ پەرستارانی عەشق

یەک سیالە حەق شوناسی: کەعبە یا بتخانە بێ!

تایپیکی «برازەر» و رونیۆیەکی دەستی مان پەیدا کرد بو، ئەم نامیلکەیە و هەندیکی تر لە بلاوکراوەکانی یەکیتی کە لە دەرەوە دەرچو بون، پی چاپ کرد و، تا ماوەیەکی دریژ ئەم تایپ و رونیۆیە تەنیا هوی بلاوکردنەوەی بیروباوەر و دەنگوباسەکانی یەکیتی و کومەلە بو.

*

راگویزانی ئاوایی‌یەکانی سنور

بەعس بریاری دابو لە سەرەتای مانگی حوزەیرانەوە دەس بکا بە راگویزانی هەمو ئاواییەکانی سنور بە قولایی ۲۰ کیلومەتر. یەکی لەو مەسەلانەی لە کوبونەوەکانی کومیتەی سەرکردایەتی دا ئەبو باسی بکری، ئەم مەسەلەیە بو. رەئی هەمووان ئەوە بو بەرەنگاری راگویزان بکری و، ریوشوینی سازدانی دانیشتوانی ناوچەکانی سنور دابنری بو بەرەنگاری هیرشەکانی عیراق و، بەرەنگاریی راگویزان. زوری خەلک ئامادە بون بو بەرەنگاری. بەلام چەکیان نەبو. بو ئەوەی پلانەکە جیبەجی بکری ئەبو چەکیان بو پەیدا بکری. تەنیا سەرچاوەی چەک لەو کاتەدا سوریا بو. ئەبو ریگایەک بو سوریا بکریتەوە. یەکی لە هوکانی سەفەری برادوست، کە بو بە «کارەساتی هەکاری» ئەمە بو.

دەربارەی راگویزان، بو هاندانی خەلک، ئەوسا باسیکم ئامادە کرد بو، لە ژمارەی دوەمی سالی ۱۹۷۸ ی «هەوالنامە» دا بلاوم کردوتەوە. لیرەدا وەکو خوی ئەینوسمەوە:

*

رەگەزپەرستەکانی عیراق ئاوەدانی و پیشکەوتن دینە کوردستانەوە

- ۱ -

دەولەتە ئیمپریالیستیە گەورەکانی ئەوروپا هەر لە کوتایی قەرنی نوزدەهەم و سەرەتای قەرنی بیستەمەوە مرخیان لە زەوی‌وزارەکانی عوسمانیەکان خوش کرد بو و، کەوتبونە دانانی پلان و نەخشە بو داگیرکردن و دابەشکردنی قەلەمرەوی فراوانی عوسمانیەکان بە سەر خویان دا.

پاش جەنگی جیهانیی یەکەم ئەو دەولەتە ئیمپریالیستیانەی شەرەکەیان بردەوە، بە ئاماڵجی خویان گەیشتن و، بە پی ی قازانج و دەسکەوتی ستراتیجی، سیاسی، ئابوری - پەترولیی خویان، بی ئەوەی گوی بدەنە ویست و ئارەزوی دانیشتوانی ناوچەکە و، بی ئەوەی گوی بدەنە هیچ ئیعتیباریکی نەتەوەیی، کومەلایەتی، دینیی و جوگرافی.. ناوچەکانی روژهەلاتی ناوەراستیان دابەش کرد و، بەمجورە نیشتمانی عەرەب و نیشتمانی کوردیش لەتوپەت و وڵەم وڵەم کران و، چەندین دەولەتوکەی بی هیز و دەسەلات و گری

دراوی ئیمپریالیزمیان تێ دا دروست کرا.

کوردستانیش وەکو نیشتمانی عەرەب لەتوپەت کرا، بەلام ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستانی داگیرکەری کوردستان، هەر بەوە دابین نەبون نەتەوەی کورد پارچە پارچە بکەن، بگرە لە ناو کوردیش دا خێل و هۆز و تیرە و بنەماڵە و هەندێ جار خێزانەکانی ئەو ناوچانەیان بە سەر ئەم دیو و ئەو دیوی سنورەکان دا دابەش کرد.

خێلە کوردەکانی سنورەکان بەم جۆرە پارچە پارچە بون و کەوتنە دیوە جیا جیاکانەوە هەر پارچەیەکیان کەوتە ناو سنوری سیاسی دەولەتێکەوە، بۆ وێنە:

عێراق - ئێران

زەنگنە، ئەرکەوازی، باجەلان، رۆژبەیانی، تاوگوزی، جاف، ئێناخی، لەهونی، بارام بەگی، میراودەلی، مەنگور، مامەش، پیران، بلباس، هەرکی، سورچی.

عێراق - تورکیا

هەرکی، سورچی، گەردی، دوسکی، ئەرتوشی، هەویری، سندی، سلوپی.

عێراق - سوریا

میران، موسا رەشی، هەسەنی، کیچان، هارونی، چیلکان، گابارە (خواروی شەنگار و سەروی حسەکە)، شەرقی (دنا، کیکا، ملی).

بەلام هەروەکو لەتوپەت کردنی نیشتمانی عەرەبەکان و دروستکردنی چەندین دەولەتی جیا جیا نەیتوانی یەکیتی عەرەب هەڵ بوەشێنێتەوە، پارچە پارچە کردنی خاکی کوردستان و دابەشکردنی نەتەوەی کوردیش بە سەر چەندین دەولەتی جیا جیادا، کیشانی سنوری سیاسی و هەوڵ و تەقەلای رژێمە کۆنەپەرستەکان، تەنانەت ئیجرائاتی جەنگی و پولیسی یش نەیتوانیوە یەکیتی نەتەوەی کورد هەڵوەشێنێ.

یەکێک لەو رێگایانەی زور لە کۆنەوە داگیرکەرانی کوردستان پەنایان بردوتە بەر بۆ لە ناو بردنی کورد؛ راگوێزانی هۆز و خێڵ و تیرە کوردەکان و دورخستنەوەیان بوە لە کوردستان.

مێژونوسەکان لە سەدەکانی ناوەراستەوە باسی راگوێزانی زورملێ ی کوردمان بۆ ئەگێرنەوە، باسی زولموزوری پاشا و ئەمیر و سولتانە زوردارە خوێنمژەکان و هەوڵ و تەقەلاکانیانمان بۆ ئەگێرنەوە لە مەر بە زور راگوێزان و دەربەدەر کردنی کورد لە خاکی کوردستان، باسی بەرگری قارەمانانە و شورشی خوێناوی و راپەرینی کوردمان بۆ ئەگێرنەوە.. تەنانەت قارەمانانی ئەمری وەکو سەلاحەدینی ئەیوبی و کەریمخانی زەندیش هەر لە ناو ئەو خێلە بە زور دورخراوە و دەربەدەر کراوانەدا هەڵکەوتون.

لەم چەرخەش دا، مێژووی نوێ ی تورکیا نموونەیەکی تری هەوڵی زۆرکەوتووانە و نابووبەرانەی رەگەزپەرستە فاشیستەکانی تورکیامان پیشان ئەدات لە بارەی بە زۆر راگوێزانی گەلی کورد لە کوردستان.

بەڵام تاکو ئێستا لەعنەت و نەفرەتی مێژوو بۆ ئەو ئەمیر و سوڵتان و کاربەدەستە خوێنڕێژ و زۆردارانە ئەچێت و لە لاپەڕە پڕ شەرمەزارییەکان دا ناویان دێت و گەلی کوردیش سەرەڕای زۆر لێ کران و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی، سەرەڕای کوشتن و بڕین، سەرەڕای دەربەدەر کردن و راگوێزان، سەرەڕای برسی کردن و تاڵان و دواخستن، سەرەڕای هەوڵ دان بۆ تواندنەوە و تەفرووتونا کردن و لە ناو بردنی وەکو یەک نەتەوە، هەروەکو کێوە سەرکەشەکانی کوردستان بە سەربەرزی، بە کوردی ماونەوە.

- ٢ -

رەگەزپەرستەکانی عێراق، سەرەڕای هەمو ئەو درۆ و دەلەسانەی لە بارەی چارەسەر کردنی کێشەوگرفتی نەتەوەیی کورد و دانانی سەرزارەکی بە هەندێ لە مافەکانی کوردا، لاپەڕەیەکی یەکجار رەش و فاشیستی و درندانەیان هەیە لە رەفتاریان دا بەرامبەر گەلی کورد و مێژووی میللەتەکەمان دا، بە بێ گومان کردەوەکانی ئەمانە لە پاڵ کردەوەکانی رەگەزپەرستە سپیەکانی ئەفریقا و سەهیونیەکانی فەلەستین دا ئەگیرێتەوە.

رەگەزپەرستەکانی عێراق کە ساڵی ١٩٦٣ بۆ یەکەم جار کاروباریان گرتە دەست، دەستیان کرد بە راگوێزانی کورد لە ناوچە نەوتاوییەکان، بە تایبەتی کەرکوک، بە سەدان گوندیان لە دەوروبەری کەرکوک و چەندین گەڕەکیان لە ناو شاری کەرکوک دا لە گەڵ خاک دا یەکسان کرد، جاری دووەمیش ساڵی ١٩٦٨ کە هاتنەوە سەر حوکم هەر زوو دەستیان کرد بە دەربەدەر کردنی کورد، فەیلیەکان و راگوێزانی کورد لە خانەقین، شەنگار، کەرکوک، تەلەعفەر، زەمار..و، بەمجۆرە بە سەدان گوندیان چۆڵ کرد و، بە هەزاران خێزانیان لە خاکی باووباپیرانیان دەرکرد.

ئاشبەتاڵەکەی ١٩٧٥ هەلێکی باشی دەس ئەم فاشیستیانە خست بۆ جێبەجێ کردنی بە پەلەی پلانە رەگەزپەرستانەکەیان لە مەر گۆڕینی روخساری نەتەوەیی خاکی کوردستان بە دەرکردنی کورد لە ناوچە تێکەڵاوەکانی کوردستان و، بە راگوێزانی دەیان هەزار خێزانی کورد لە ناوچە پەترۆلی و ستراتیجی و سنوورییەکانی کوردستان.

بەمجۆرە کەوتنە راگوێزان و دەربەدەر کردنی کورد لە کەرکوک، خانەقین، شەنگار، تەلەعفەر، عەین زالە.. و، هێنانی خێڵ و هۆز و سوچەخۆر و جەرلیار و

کریکاری عەرەب بۆ ئەم ناوچانە، هەروەها کەوتنە راگویزانی ناوچە سنوورییەکانی کوردستان و، هەمو سنووری سوریا - عیراق و، بەشی هەرە زۆری سنووری تورکیا - عیراق و، بەشێکی گەورەی سنووری ئیران - عیراقیان، لە سالانی ۱۹۷۵ تا ۱۹۷۷ دا بە قولایی ۲۰ کم چۆل کرد و، ئەمسالیش کەوتنە راگویزانی ناوچەکانی میرگەسور، دەشتی بەرازگر، دولی خوا کورک، دولی لولان، سیدەکان، گرتک و رووست، پشدەر، مەنگورایەتی.. و، تا ئیستا پلانیان بە دەستەوەیە ئالان، سیوەیل، شلیر، هەورامان.. رابگویزن.

تاکو ئیستا صەددام حسین دو جار بە رەسمی دانی ناوە بە راگویزانی دانیشتوانی کوردستان دا:

جاری یەکەم، دوای ئاشبەتالەکەی سالی ۱۹۷۵ لە وتاریک دا بە ناوی «سەنگەریک یا دو سەنگەر» وە بلاوی کردوەتەوە. لەو وتارەدا باسی پیویستیی چۆل کردنی ناوچەکانی سنووری کوردستان ئەکا بە قولایی ۱۰ - ۲۰ کم، سەبارەت بە ئەمن و ئاسایشی عیراق، گوایە بۆ ئەوەی «پشتێنەی ئەمنی» لە دەوری عیراق دروست بکریت.

جاری دوەم، لەو کۆنگرەیەدا کە بە بۆنەی ئاهەنگەکانی تەمۆزەوە لە ۱۹۷۸/۷/۱۸ دا لە گەڵ رۆژنامەنوس و پەیامنیرانی بیگانەدا گرتی. صەددام لەم کۆنگرەیەدا وتی:

«وفی بعض الاحیان تسمعون حدیثا عن تهجیر الاکراد.. فماهو تهجیر الاکراد فی حقیقته...؟ سوف تشاهدونهم عندما تذهبون الی هناك.. لکن الذی ارید ان اقوله لکم الان، الشریط الحدودی بین العراق وترکیا وبین العراق وایران.. تقرر ان یجری ترحیل القری التی هی عبارة لیست عن قری وانما فی اغلبها من بیوت معزولة عن ای نمط من انماط مستلزمات التقدم والحضارة.. وعن قدرة الدولة فی ایصال ای نمط من انماط الخدمات الاجتماعیة والاقتصادیة لهم. تقرر بالنسبة لکل الذین یسکنون الشریط الحدودی والذی بعمق بین ۱۰ - ۲۰ کم للاراضی الحدودیة الواقعة بین العراق.. یعنی من اراضی العراق المجاورة لترکیا ولایران یرحلون بالعمق فی قری نموذجیة تتوفر فیها کل المستلزمات والخدمات الاساسیة التی تفتقر لها حتی الان قری واسعة فی ضواحی بغداد.. وفی مدن اخری من العراق.. هذا هو معنی الترحیل.. لکن یکتبون ترحیل.. رحلو الاکراد..»

لەم قسانەی صەددام ئەم شتانە تی ئەگەین:

۱. ناوچەکانی سنووری عیراق لە گەڵ ئیران و تورکیا بە قولایی ۱۰ - ۲۰ کم رائەگویزن.

۲. ئەم جارە هۆی راگویزانی نەدایە پاڵ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و دروستکردنی

«پشتێنەی ئەمنی» لە سەرانسەری سنورەکانی کوردستانی عیراق - ئێران، کوردستانی عیراق - تورکیا، کوردستانی عیراق - سوریا، بەڵکو گەرایەوە بۆ دواکەوتن و پێش خستنی کوردستان کە گوایە ئەم ناوچانە خانوی لە یەک دابڕاو و دور لە یەکی ناوچەیەکی شاخاوی سەختی ئەوتۆ دان، کە دەولەت ناتوانی خزمەتی کومەلایەتی و ئابوری پێگەیەنێتی، جا بۆ ئەوەی پێشکەوتن و شارستانیەتیان پێگەیەنرێتی، دەولەت «گوندی نمونەیی» ان بۆ دروست ئەکات، کە هەمو نیشانەکانی پێشکەوتن و ئاوەدانی.. بە جورێکی ئەوتو تی دایە، کە تەنانەت لە گوندەکانی نزیک بەغدا و شارەکانی تریش دا نیە.

٣. صەددام جاری یەکەم کە مەسەلەی راگویزانی کوردی لە «سەنگەرێک یا دو سەنگەر» دا لە باری سەرلەی جەنگیی و ستراتیجیەوە لێک ئەدایەوە، ئەمجارە خستویەتیە چوارچێوەیەکی ترەوە کە لە قسەی ئەو ئەوروپاییە داگیرکەرە ئیمپریالیستیانە ئەچی کە کاتی خۆی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمەریکای لاتینیان داگیر و تالان کرد بە ناوی ئەوەوە کە گوایە: کابرای سپی پەیامی پێشکەوتن و ئاوەدانی ئەهات بۆ گەلانی دواکەوتوا

رەگەزپەرستەکانی عیراق ناوچەکانی سنور راندەگویزن نەک لە بەر ئەوەی ئەیانەویت کورد پێش بخەن و، کوردستان ئاوەدان بکەنەوە و، شارستانیەتی و ژیانی خوش و پێشکەوتوی تی دا ئامادە بکەن، بەڵکو ئەیانەویت یەکیتی نەتەوەی کورد تیک بدەن و، کوردی عیراق لە پارچەکانی تری کوردستان داببرن، چونکە هەمو ئەو هەوڵ و تەقەلا ئابوری و سیاسی و کومەلایەتی و فەرهەنگی و عەسکەری یانەی کاربەدەستانی عیراق و دەولەتەکانی دراوسی داویانە بو لە یەک پچراندنی کورد، تا ئیستا سەرنەکەوتوە و، بەم شیوەیە ئەیانەویت بوشاییەکی زەمینی لە بەینی کوردستانی عیراق و پارچەکانی کوردستان لە ئیران و تورکیا و سوریا دروست بکەن و، ئەو بۆشاییەیش بە سەربازگە و سەنگەر و ئامیکاری جەنگیی پر بکەنەوە کە وەکو شورەیەک وابی لە نیوان کوردی عیراق و کوردی پارچەکانی تری کوردستان دا.

ئەو ناوچانەی راگویزراون لە سنورەکان لە گەڵ ئەو ناوچانەی کە بە دەستەوەیە رابگویزرین بە لایەنی کەمەوە تەقدیر ئەکریت بە ٢٥ هەزار کیلومەتری چوارگوشە، کە دو ئەوەندەی قەلەمرەوی لوبنان زیاترە.

- ٣ -

راگویزانی کورد لە سەرزەمینی باوباپیرانی جگە لەوەی کە سیاسەتیکی رەگەزپەرستانەی دژی مروڤایەتیە، هەنگاویکیشە بو پەرت و بلاوکردنەوە و تراندنەوەی ئەو کوردانەی راندەگویزرین، چونکە ئەم خیزانە کوردانەی دور ئەخرینەوە بی بەش ئەکرین لە

پیشەی هەمیشەیی خۆیان کە ژیانیانی لە سەر بوە؛ کشتوکاڵ و پەروەردە کردنی ئاژەڵ. ئەمە وایان لێ ئەکات کە ئیتر نەتوانن خۆیان بە خێو بکەن و، چاویان لە دەستی کاربەدەستانی بەغدا بێت، بە تایبەتی لە بەر ئەوەی کە لە کار و پیشەکەی پیشویان دوور خراونەتەوە بێ ئەوەی لە «ئوردوگا زۆرەملێیەکان» یش دا هیچ کار و پیشەیەکی تریان بۆ تەئمین کرابێ.

کاربەدەستانی بەغدا پلانێکی رەگەزپەرستانەیان داناوە بۆ ئەوەی ئەمانە بکەنە کرێکار لە خواروی عێراق و، لەم بارەیەوە پێشتر بلاویان کردوەتەوە گوا زیاتر لە ٤٠ هەزار کرێکاریان پێویستە بۆ کارگاکانی ناوەراست و خواروی عێراق. بە پێی لێکدانەوەی رەگەزپەرستەکان ناچاریی خۆ بەخێو کردن و پێویستیی گوزەران، وا لەم خەلکە بێ بەشە راگویزراوەی کە لە زەویەکانی خۆیان هەلکەنراون، ئەکات، کوچ بکەن بەرەو بازاری کار و نان پەیدا کردن. ئەمەش بێگومان زەرەر لە ئابوری عێراق ئەدات، چونکە ئەمانە شارەزاییان لە کاروباری کرێکاری دا نیە، بەلام رژێمی فاشیستی عێراق ئەمەی لە لا گرنگ نیە، بەلکو تەنیا مەبەستی تواندنەوەی کوردە لە ناو عەرەبی ناوەراست و خواروی عێراق دا.

رژێمی بەغدا سەدان ملیون دیناری بودجەی عێراقی سەرف کردوە لە دروستکردنی خانو و بەرەی «ئوردوگا زۆرەملێیەکان» دا و، لە بژاردن و دانی پارەی تەختیەندا بە خێزانە راگویزراوەکان و کاروباری تر، ئەم پارەیە سەرف ئەکری لە ویران کردنی بەشێکی ولات و دەربەدەر کردنی دانیشتوەکانی دا.

راگویزان زەرەرێکی گەورەی داوە لە کەرتی کشتوکاڵ و سامانی ئاژەڵ چونکە ئەو ناوچانەی راگویزراون و بە دەستەوەیە رابگویزرێن لە ٢٥ تا ٣٠ هەزار کیلومەتری چوارگۆشە ئەگرێتەوە کە ئەکاتە سێ یەکی سەرزەمینی کوردستان. جا ولات لە بەرهەمی کشتوکاڵ و بەروبومی ئاژەلی ئەم ناوچە گەورەیە بێ بەش ئەبێت و، ئەمەش گرانی و ناریکی ئابوری لە ناوچەکانی کوردستان دا دروست ئەکا. جگە لەوەش ئەو خەلکە زۆرەی ئەچنە نزیک شارەکان ئەبن بەبار بە سەر ئەو ناوچانەوە، نەک ژیانی خۆیان پێ مسوگەر ناکرێ، ژیانی خەلکی شارەکانیش ئەخەنە تەنگوچەلەمەیەکی تەواوەوە.

بە هۆی راگویزانەوە بێکاری زیاتر ئەبێ، ئەمەش گیروگرفتی قولتر بۆ ئابوری عیراق بە گشتی و، بۆ ئابوری کوردستان بە تایبەتی، دروست ئەکا.

بە پیچەوانەی ئەو پروپاگاندەیەوە کە رژێمی بەغدا ئەیکات، راگویزان زەرەر لە خزمەتی گشتی (تەندروستی، خوێندن..) ئەدات، چونکە هەندێ لەو دێهاتانەی ویران

کراون نەخۆشخانە، قوتابخانە و مزگەوتیان تێ دا بوە سوتێنراون. ئەو ئوردوگایانەیش کە بۆیان گوێزراونەتەوە قوتابخانە و نەخۆشخانە و مزگەوت و (داوودەزگای خزمەتی گشتی) یان تێ دا ئامادە نەکراوە، ئەمە جگە لەوەی کە کارەبایان تێ دا نیە و پرۆژەی ئاوی خواردنەوەش لەو شوێنانەدا ئامادە نەکراوە.

ئەگەرچی ئوردوگا زۆرەملێیەکان ناو نراون گوندی هاوچەرخ و نمونەیی، بەڵام لە راستی دا کامپی گرتن (معسكرات الاعتقال) ن، چونکە هێزی سوپای بە دەورەوە دامەزرێنراوە و پاسیان ئەکات.

سەرەرای هەمو ئەم لایەنە خراپانە، راگوێزان لە روی سیاسیەوە بریتیە لە لادانێکی زیاتر بە لای ئیمپریالیزم و، دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی ئێران و تورکیادا، ئەمە زەرەر لە سەربەخۆیی وڵات ئەدا، چونکە ئەو شوێنانەی چوڵ ئەکرێن یەکجار فراوانن، ماوە ئەبێت دەوڵەتانی ئێران و تورکیا (تسلل) بکەنە ناوی و، بۆ مەبەستی خۆیان بە کاری بهێنن. لە راستی دا وازهێنانی رژێمی بەغدا لەم ناوچە فراوانەی خاکی وڵات خیانەتێکی نیشتمانی و نەتەوەییە، بە نیازی جیبەجێ کردنی سیاسەتی زەمینی سوتاو (الارض المحروقة) بۆ سوتاندنی تەڕ و وشک لە دێهاتەکان دا، بۆ لە ناو بردنی مەڕ و ماڵات و ئاوەدانی و رەز و باخ و، هەمو سەرمایەیەکی تر گوایە بۆ ئەوەی تەنگ بە ژیان و گوزەرانی پێشمەرگە هەڵبچنێت و لە برسان دا بیکوژێت، کە بێگومان ئەمەش بۆ رژێمی بەغدا ناچێتە سەر، چونکە میللەت پشتیوانی شۆرشە و، گەلی ژیانی پێشمەرگە تەئمین ئەکات.

ئەم سیاسەتەی رەگەزپەرستەکانی عیراق دژی گەلی کورد و خاکی کوردستان گرتویانە، دژی هەمو ئەو یاسا و پەیمان و رێککەوتنە جیهانی و مرۆڤایەتیانەیە کە عیراق سەبارەت بە ئەندامەتی لە (کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکان) دا مۆری کردوە.

- ٤ -

رەگەزپەرستەکانی عیراق کە دەست ئەکەن بە راگوێزانی ناوچەیەک بەم جۆرە ئیهانەیت ئاوەدانی و پێشکەوتنی تێ دا بڵاو بکەنەوە.

- سوپا بە هالیکۆپتەر و ئوتومبێل و تانک و زرێپۆش و پیادە هێرش دێنێتە سەر ناوچەکە و، دەوری ئەو شوێنانە ئەگرێ کە بڕیاری راگوێزانیان دراوە.

- پاش داگیر کردنی ناوچەکە، دانیشتوانی گوندەکە ئەگیرێن و بە خۆیان و هەندێک کەلوپەل و ئاژەڵ و کاوگزتالەوە راپێچ ئەکرێن و ئەپەستێنرێنە ناو چەند زیلێکی سوپاییەوە.

- بە زیل ئەگوێزرێنەوە بۆ یەکێک لەو ئوردوگا زۆرەملێ یانەی پێشتر ئامادە

گرلوە بۆ نیشتەجێ کردنیان.

- لە کاتی گواستنەوەدا هەندێک پیر، ساوا، نەخۆش.. ئەمرن. بۆ نموونە لە کاتی ڕاگوێزانی دانیشتوانی گوندی بلوزی (قەلادزە) بۆ ئۆردوگای تومسوران ١١ منداڵ و ژنێک مردن.

- ئەوانەی ڕاتەگوێزرێن زۆر بە زەحمەت هەندێک لە کەلوپەلی پێویستیان بۆ دەرباز ئەکرێت و، ئەوانی تر هەموی بە جێ ئەمێنێت و سوپا ئاگری تێ بەر ئەدات.

- لە ناوچەی ڕاگوێزراودا:

خانوبەرە، مزگەوت، قوتابخانە.. بە تەقەمەنی ئەتەقێنرێ و کاول ئەکرێن و ئەسوتێنرێن.

باخ و ڕەز وێران ئەکرێ، ئاگر بەر ئەدرێتە پەرژینەکانی و، تەلانەکانی ئەروخێنرێ و، تیزاب ئەکرێ بە سەر داری بەری دا.

جۆگا و بناران و کانیەکان بە دینەمیت ئەتەقێنرێن و کوێر ئەکرێنەوە.

هەنگەلان ئاگری تێ بەر ئەدرێت و پورە هەنگ ئەشالوزکێنرێن.

ماوە نادرێت بە جوتیارەکان بەرهەمەکانی ئەو وەرزەیشیان هەڵگرن، بەڵکو شەنایی و خەلە و خەرمانیان.. ئەوی فریا بکەون ئەسوتێنرێ و، ئەوی تریان پێ بە جێ ئەهێڵرێت.

بە نرخێکی هەرزان ئاژەڵ و گاگەلەکان لە جوتیارەکان ئەستێنرێ.

- ٥ -

ئەم هەنگاوە ڕەگەزپەرستیەی کاربەدەستانی عیراق دەرهەق بە میللەتی کورد بۆتە هۆی:

١. ڕاگوێزانی دەیان هەزار خێزانی جوتیاری کورد لە سەرزەمینی باووباپیری و پەککەستن و لە کار خستنی هەزاران دەستی کار.

٢. بەرەڵلا کردنی هەزاران دۆنم زەوی باشی بەراو و دێمی کشتوکاڵ.

٣. وشک بون و لە ناوچونی هەزاران دۆنم ڕەز و باخی میوە و بەرەڵلا کردنی دەیان هەزار دۆنم لەوەڕگا.

٤. تەفروتونا بون و بە تالان چونی هەزاران مێگەلی گەورە و گاگەلی گەورە.

٥. لە ناوچونی دەیان هەزار پورە هەنگ.

٦. وێران بونی سەدان گوندی ئاوەدان و هەزاران خانوبەرە، مزگەوت، قوتابخانە.. (تەواو)

دوەمین کۆبونەوەی

کومیتەی سەرکردایەتی یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان

خولی دوەمی کوبونەوەکانی ک س - ی ن ک چەندین مەسەلەی گرنگی سیاسی، پیشمەرگەیی، ئیعلامی، ریکخراوەیی، دارایی لە بەردەم دا بو کە ئەبو لی یان بدوی و باسیان بکات و بریاریان لە سەر بدات.

کومیتەی سەرکردایەتی پیک هینرایەوە لە:

نوینەرانی بزوتنەوە: عەلی عەسکەری، تاهیری عەلی والی، خالید سەعید،، سەید کاکە، حاجی حاجی براییم، عومەر مستەفا (لە دەرەوە بو)

نوینەرانی کومەلە: ئازاد هەورامی، مەلا بەختیار، عومەر عەبدوللا، تالیب روستەم، من و، سالار (لە دەرەوە بو).

نوینەرانی خەتی گشتی: شیخ حسین و، دەستەی دامەزرینەر (کە لە دەرەوە بون).

مامجەلال هەلبژیردرایەوە بە سکرتیری گشتی و، مەکتەبی سیاسی لە ۲ نوینەری بزوتنەوە: عەلی عەسکەری و تاهیری عەلی والی و، ۲ نوینەری کومەلە: سالار و ئازاد، پیک هینرایەوە.

سالار لەو کاتەدا هیشتا لە دەرەوە بو من پیشنیارم کرد لە مەکتەبی سیاسی دابنریتەوە. لە روژانی کوبونەوەکەدا تالیب، بە بیانوی ئەوەی ریزی نەگیراوە و پرسی پی نەکراوە، ئیستیقالەی لە نوینەرایەتی کومەلە و لە کومەلە کرد. لام وایە هوی راستەقینە ئەوە بو نەکرا بو بە ئەندامی سەرکردایەتی کومەلە، چونکە خوی لەوانی تر بە شایستەتر ئەزانی.

سەرلەنوی فەرماندەی هەریم و پاریزەدەرەکانیان و، لیپرسراوی لقەکان، دیاری کران. تالیب روستەم، فەرماندەی هەریمی ٦ ی پشدەر بو، لە هەمان کاردا هیلرایەوە.

پیکهینانی ناوەند و، دەرکردنی نورگان و، سەرپەرشتی ریکخستنەکانی کومەلە، بەواتەیەکی تر زوری کارەکانی کومەلە کەوت بوە ئەستوی من. من نیتر نەمئەتوانی فەرماندەی هەریم بم، خویشم نەمئەویست بچمە مەکتەبی سیاسیەوە، ئەمویست جی بو هاوریکانی ترم چول بکەم.

*

لە ناو ئەو مەسەلە گرنگانەدا کە باس کران:

یەکیکیان، هەلبژاردنی شوینیک بو بارەگاکانی سەرکردایەتیمان تی دا دابنری.

ئەوی تریان، مەسەلەی راگویزانی دیهاتەکانی سنور بو.

بارەگای مەکتەبی سیاسی لەو کاتەدا لە «نۆکان» بوو، بەڵام «نۆکان» نزیکی ئێران بوو. کاتی خۆی ئەم ئاوایان کرد بووەوە. مەکتەبی سیاسی بە ناچاری لەبەر سەرمای زستان و لەبەر بێ جێگایی چو بوە ناوییەوە. ئێران هەڕەشەی کرد بو ئەگەر چۆڵی نەکەن هێز بنێرێتە سەریان بە زۆر دەریان بکا.

ڕاگوێزانی ئاوایییەکانی سنور بە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر پاشەڕۆژی گەلی کورد دانەنرا، لەبەر ئەوە بڕیار درا بە هەمو توانایەکەوە بەرەنگاری بکرێ و، دانیشتوانی ناوچەکانی سنور ساز بدرێن و، ڕێک بخرێن بۆ شەڕی بەرەڵستی ڕاگوێزان.

*

گرنگی ناوچەی ٣ سنور

ک س - ی ن ک لە کۆبونەوەکانی دا، بە گشتی بڕیاری دا کە بارەگا و بنکەکانی دەزگا سەرکردەییەکانی شۆڕش بباتەوە شوێنەکانی ساڵی پێشو لە ناوچەی برادۆست، کە ئەکەوێتە ناوچەی ٣ سنوری عێراق - ئێران - تورکیاوە، لەبەر زۆر ئیعتیباری ئەمنییەتی، سیاسی، جەنگی، تاکتیکی...

ناوچەی ٣ سنور ئەو کاتە گرنگییەکی گەورە و تایبەتی هەبو لە چاو شوێنەکانی تری کوردستانی عێراق دا چونکە:

٣ دەوڵەتی عێراق، ئێران و تورکیا و، ٣ پارچەی جیاجیای کوردستانی پێکەوە گرێ ئەدا و ناوچەکانی بادینانی عێراق و سۆرانی عێراقی بە یەکەوە ئەبەست، هەروەکو توانای هێنانی ئازوقە و کەلوپەلی پێویست لە ٣ دەوڵەتی جیاوازەوە هەبو. ئابلوقەدانی ئابوری دژوار بو، سەرەڕای ئەوەی کە ناوچەکەش شاخاوی و سەخت و عاسی بو دوژمن نەیئەتوانی لە هەمو لایەکەوە ئابلوقەی سیاسی بدات و بە ئاسانی بیگاتێ و بۆی بچێتە ناوییەوە.

جگە لە مانە هەمووی، لەبەر ئەوەی کە بەهار و هاوین و پاییزی ١٩٧٧ بارەگای سەرکردایەتی ی ن ک و هێزێکی گەورەی پێشمەرگە لەوێ بو، وە زستانەکەی لەبەر نەتوانینی تەئمین کردنی پارەی ئازوقەی هێز و بارەگاکان کشا بونەوە ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی، ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردە و کادرە پێشمەرگەیی و سیاسی و پێشمەرگەکانی شارەزاییەکی باشیان لە هەر ٣ دیوی ناوچەکە و ناسیاوی و ئاشنایەتییان لە گەڵ خەڵکی هەر ٣ دیوەکەی سنور هەبو.

*

دانانی پلانی گواستنەوە و ئامانجەکانی

ک س - ی ن ک بە گشتی بڕیاری دا کە بارەگای سەرکردایەتی بهاتەوە ناوچەی برادوست لە سەر سنور بۆ ئەوەی:

١. بارەگای دەزگا سەرکردەییەکان لە شوێنێکی ئەمین دا جێگیر بێ و بپەرژێتە سەر جێبەجێ کردنی ئەرک و فرمانەکان.

٢. پێش ١٩٧٨/٦/١، واتە پێش کاتی جێبەجێ کردنی بڕیاری حکومەتی عیراق لە سەر ڕاگوێزانی دیهاتەکانی سنور، ڕێگەی پەیوەندی لە گەڵ دنیای دەرەوە و، ڕێگەی هێنانی تفاقی جەنگی و، یارمەتی و پێویستییەکانی شۆرش بکاتەوە.

٤. پاککردنەوەی ناوچەکە لە چەکدارەکانی قم ئەگەر بونە ڕێگری پلانەکانی یەکیتی.

٥. داوای یەک لە سەر یەکی دوستەکانی یەکیتی لە تورکیا بە تایبەتی دە دە گا دە بۆ نزیک بونەوەی هیزەکانی یەکیتی لە سنورەکانی تورکیا.

*

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجانە ک س - ی ن ک بڕیاری دا:

١. زانیاری تەواو لە سەر ناوچەکە کۆ بکاتەوە، بە تایبەتی ئەو ئالوگۆڕانەی بە سەر هیزەکانی دوژمنان دا لە ناوچەکەدا هاتون.

٢. هیزێکی ئەوتۆ ساز بدات بۆ ئەوەی بەرەو شوێنی دیاریکراو بە ڕێ بکەوێ و بەشی جێبەجێ کردنی پلانەکەی یەکیتی بکات.

٣. شوێنی جێگیر بونی هیزەکەی یەکیتی کە لە دوا قۆناغ دا، واتە لە ناوچەی برادوست دا، قایم بکات.

تەرازوی هیزەکانی ناوچەکە

سەرکردایەتی یەکیتی کەوتە کۆکردنەوەی زانیاری و دەنگوباسی پێویست لە چەندین سەرچاوەی سەرەکی و لاوەکی جیا جیاوە لەوانە:

١. دە دە گا دا.

٢. ئەوانەی لە لای قم موە ڕایان ئەکرد و ئەهاتنە ڕیزی یەکیتیەوە.

٣. ئەو کادر و دوستانەی یەکیتی لە ناوچەکانی قم دا هەبون.

٤. ئەو پیشمەرگانەی یەکیتی کە لە لای قم گیرا بون.

ئەو زانیاریانەی لەم سەرچاوانەوە هاتن لە سەر هیزە چەکدارەکانی قم: ژمارەیان، جوری چەکەکانیان، لیپرسراوەکانیان، بارەگاکانیان، ورەی جەنگاوەرانەیان، توانا و ئیمکاناتی سیاسییان، پشتیوانییان لە ناو عشیرەتەکانی سەر سنور دا.. لە یەک دران،

هەروەها ئەو زانیارییانەی لە سەر هێزەکانی عێراق و ئێران و تورکیا کۆکراونەوە هەڵسەنگێندران، ئەنجامەکانی بەم چەشنە بو:

- هێزە چەکدارەکانی حکومەتی عێراق:

سەربازگە و ئوقتە و رەبیەکانی جەیش، لە ناوچەکانی چومان، برادوست، میرگەسور، گورێنیکی ئەوتۆیان بە سەردا نەهات بو و، هەر لە شوێنەکانی سالی پێشو بون.

- هێزە چەکدارەکانی حکومەتی تورک:

قەرەقوڵەکانی سەر سنور، داتیمی و موەقەتەکان، لە ناوچەکانی گەوەر، شەمزینان، چەلی، ئەوانەی زستانە لە شوێنەکانی خۆیان بون و ئەوانەی هاوینە هێشتا نەهات بونەوە.

- هێزە چەکدارەکانی حکومەتی ئێران:

پاسگا و پایەگا و پادگانەکان، لە ناوچەکانی سەردەشت، خانە، شنو، لە شوێنەکانی خۆیان دا بون و، ئالوگۆرێکی گرنگیان بە سەردا نەهات بو.

- هێزە چەکدارەکانی قم:

بارەگاکانیان: گوستە، چەمەتو، هەرکی، شەتونس، بێلاو.

لێپرسراوەکانیان: سامی سنجاری، ئەورەحمان بەداوی، ئازاد محمود خەفاف، وریا رەئوف سەعاتچی، ئازاد بەرواری، غازی زیباری، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیق، کەمال کەرکوکی، ملازم سەردار ئەبوبەکر، ملازم عومەر عوسمان، عەریف یاسین، مستەفا نێروەیی، ئیهاد، یونس رۆژبەیانی، حەمید حسین، عەبدوللا سالح، هاشم رەمەزان، مەلا ئەمین بەرزانی.

ژمارەی هێزی ئەسلیهیان: ۲۵۰ - ۳۰۰ چەکدار.

هێزە چەکدارەکانی قم لە چەندین بارەگا و بنکەی دور و لە یەک دابراو دا لە هێڵێکی درێژی سنوری تورکیا - عێراق دا پەرت و بڵاو بون، هیچ بارەگایەکیان لە ۳۰ - ۵۰ کەس زورتری تی دا نەبو.

هێزە چەکدارەکانی قم لە رووی چونایەتی سیاسی و سوپاییەوە پێکەوە نەگونجاو و ناریکوپێک بون، هەندێکیان خوێندەواری شاری بون لە ئەورووپاوە گەڕابونەوە، وەکو: سامی، ئازاد خەفاف، وریا.. و، هەندێکیان پیاوی بنەماڵەی بارزانی بون و، لە ئێرانەوە نێردرابونەوە، وەکو: عەریف یاسین، حەمید ئەفەندی، یونس.. و، هەندێکیان خەڵکی دێهاتەکانی سنور و، هەندێکی تریان خەڵکی ناو تورکیا بون.

دە دە کا دە وای ئیدیعا ئەکرد کە قم لە ناو چەند سەرۆک عەشیرەتێکی

کونەپەرست دا لە چەلی و ئولودەرە نفوز و دەسەلاتی هەیە و، دە دە کا دە خوی لە ناو هوز و خیلەکانی شەمزینان و سەرانسەری هەکاری دا نفوز و دەسەلاتی هەیە و، لە کاتی گەیشتنی هیزی پیشمەرگەی یەکیتی دا ئەوان هاوکاری سیاسی و جەنگیی یەکیتی ئەکەن.

*

دارشتنی پلانی دوایی و دیاری کردنی هیزەکان

لە ئەنجامی بەراورد و تاووتوی کردنی ئەو زانیاریانەدا ک س - ی ن ک بریاری دا هیزیکی تیکەلاوی چەکدار و بی چەک لە پیشمەرگەی زوریەی هەریمەکانی کوردستانی عیراق ساز بدا و بە ری ی بکات:

١. بەشیکی هیزەکە بو پاراستنی بنکەکانی مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری لە براەوست بیننەوە.

٢. بەشیکی تری دوای پر چەک کردنی بە چەکی زیادەوە بگەرینەوە ناوچەکانی خویان.

٣. مەفرەزەکانی بادینان لە گەل هیزیکی پشتیوانی و یارمەتیدەر دا بچنەوە بادینان.

بەمجورە یەکیتی هیزیکی گەورەی ساز دا، کە نزیکەی ... ١ پیشمەرگە ئەبو لە چەکدار و بی چەک، لە خەلکی ناوچەکانی سەرانسەری کوردستانی عیراق هەر لە خانەقینەوە تا زاخو، لە گەل زورایەتی ئەندامانی ک س و ژمارەیەکی زور لە فەرماندەی هەریم و کەرت و مەفرەزەکان و کادرە سیاسیەکان، کە بکەونە ری.

بریار درا ئەو هیزە گەورەیە ببیتە ٣ بەش، هەر بەشیکیان چەند لیپرسراویکی لە گەل بیت، پیشمەرگەکانی هەندیکی چەکدار و هەندیکی بی چەک و، خوی ئازاد بیت لە هەلبژاردنی ئەو ریگایەدا کە ئەیگریتە بەر بەو مەرجەی لە کات و شوینی دیاری کراودا ئامادە بیت. خوی وەکو هیزیکی سەربەخو بەرپرسی دوزینەوەی ریگا و شارەزا و تەئمین کردنی ئازوقە و زەخیرە و ولاخ.. بیت.

بەشی یەکەمی هیزەکە:

. ٣٢ پیشمەرگە زیاتر بو لەوانە ١٥. چەکدار و ئەوی تریان بی چەک بون.

ئەو لیپرسراوانەی لە گەل هیزەکە بون: خالید سەعید (ئەندامی م ع - ی ن ک)، حسین بابەشیخ (ف. هـ. بادینان)، مەحمود عەبدولرەحمان (ف. هـ. ٣ شارباژیر)، رەئوف مستەفا (ف. هـ. پینجوین). حامیدی حاجی غالی (یاریدەدەری ف. هـ. ١ ی هەورامان

و شارەزوور).

ئەم هێـــزە ئەبوایە لە ٧٨/٤/١٩ دا لە ناوچەی قـــەلادزەوە بکەوێتـــە ڕێ و، لە سەرەتای مایس دا لە ناوچەی برادۆست بێ.

بەشی دوەمی هێزەکە:

نزیکەی ..٥ پێشمەرگە ئەبو لەوانەی نزیکەی ١٥٠ کەسیان بێ چەک بون.

ئەو لێپرسراوانەی ئەبو لە گەڵ هێزەکـە بن: عەلی عەسکەری (فـەرماندەی هێزی پێشمەرگە)، تاهیری عەلی والی (ئەندامی م س و مع - ی ن ک)، سەید کاکە (ف. هـ. ٨ ی هەولێـــر)، تالیب ڕوســـتـــەم (ف. هـ. ٦ ی قـــەلادزە)، شـــێـخ جـــەوادی بێـــدەری (یاریدەدەری ف. هـ. چەمی ڕیزان).

ئەم هێـزە ئەبوایە لە ٧٨/٤/٢١ دا، واتە دو ڕۆژ دوای جـولانی بەشی یەکـەم لە ناوچەی قـەلادزەوە بکەوێتـە ڕێ و، لە سـەرەتای مـانگی مـایس دا لە گـەڵ بەشی یەکـەمی هێزەکە لە برادۆست یەک بگرێتەوە.

بەشی سێیەمی هێزەکە:

نزیکەی ١٥٠ کـەس بو کـە زۆربەیان چەکـدار بون و، ئەبوایە سکرتێـری گشـتی یەکێـتی و، ئەندامـانی تری م س و، نوێنەراتی کـومـەڵـەی ئامـادە کـردنی - پ د ک و، پاسوکی لە گەڵ بێ.

ئەبوایە ئەم هێزە لە ٧٨/٤/٢٧ دا بکەوتایەتە ڕێ و لە قەندیل چاوەڕوانی هەواڵی یەکگرتنەوەی بەشی یەکـەم و دوەمی هێـزەکـە برادۆسـتی بکردایە و، ئینجـا ئەویش بە ڕێ بکەوتایە بەرەو برادۆست.

جگە لەم هێـزانەی بەری ئەکران بەرەو برادۆست، لە سنوری هەر هەرێـمێـک دا چەند سـەفەرەیە یاخـود کـەرت و، فـەرمـاندەی هەرێمـەکـە یاخـود یاریدەدەرەکـەی گل ئەدرایەوە بو ئەوەی ناوچەکـە لەو مـاوەیەدا چوڵ نەبێت و بوشـاییـەکی پێشـمـەرگەیی و سـیـاسی دروست نەبێ.

ئەم هێزانە چەکەکانیان بریتی بو لە: کلاشینکوف، برنەو، هەندێ ڕەشاشی برنەو و، چەند دانەیەک ئارپیجی.

*

دیسانەوە مەسەلەی ق م

ئەم هێزانە و لێپرسراوەکانیان لە ڕوی سیاسی و پێشمەرگەییەوە زۆر ڕێک و تەبا نەبون، جگە لەو ناکۆکییانەی لە ناو باڵە جیاوازەکانی ناو یەکێتی دا هەبو، هەندێ ناکۆکی

تووندوتیژ لە ناو سەرکردایەتی بزووتنەوەدا هەبوو، بە تایبەتی لە سەر مەسەلەی بە عەراقی کردنی شۆڕش، هەڵگرتن یا داگرتنی دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمی عێراق، پاک کردنەوەی کوردستان لە پاشماوەی چەکدارەکانی قم.

مەسەلەی پاک کردنەوەی کوردستان لە چەکدارەکانی قم، وە یاخود «هەنە» کردن لە گەلیان و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی «شێوەیەکی بە هێمنی پێکەوە ژیان» دیسانەوە هاتەوە کایە و، هەندێ لە سەرکردەکانی بزووتنەوە کەوتنەوە لێدانەوەی ئەو بالۆرەیە، کە بێ گومان لەو کاتە گرنگەدا دوودڵی و ڕاڕایی لە ناو هێزەکەدا دروست ئەکرد و گیانی جەنگاوەرانە و دەس وەشاندنی لە پێشمەرگەکان دا ئەمراند. ئەو قسە و باسانەی لە کۆبوونەوەکان دا ئەکرا زۆر جار لە ناو پێشمەرگەکانیش دا دەنگی ئەدایەوە.

یەکدڵی لە هەڵوێستی سیاسی هێزەکەدا لە ڕووی دیاری کردنی دۆست و دوژمنەوە و، یەکدەستی لە هەڵوێستی سوپایی هێزەکەدا لە ڕووی لێدانی بێ چەندوچوونی دوژمنانەوە، کە شتێکی پێویست بوو، دیسانەوە خرایەوە سەر مێزی لێدوان و گفتوگۆ و باسکردنەوە. دوودڵی و ڕاڕایی لە لێدانی قم دا جارێکی تر لە دڵی هەندێک دا شین بووەوە. تەنانەت لە ناو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دا هەبوو ڕەئی وابوو کە بۆ ئەوەی یەکێتی بتوانی بێ گیرمە و کێشە ڕێگەی هێنانی چەک بکاتەوە و، ماوەی خەڵک چەکدار کردنی هەبێ، لە گەڵ قم ڕێک بکەوێ و، نیسبەتێکی ئەو چەکانەی ئەیهێنی لە باتی «گومرگ» و «باج» بیدات بەوان.

پاشماوەی ئەندامانی ک س - ی ن ک دیسانەوە چەند جاری کۆبوونەوە، بۆ دیاریکردنی هەڵوێستێکی نوێ لە قم، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئیدریس یەکدو کەسی «ساواکیی» ڕاسپاردە بوو، لەوانە کابرایەک بە ناوی مینە کوریە، بە ناو بۆ گفتوگۆی ڕێککەوتن و، لە ڕاستی دا بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباس و بۆ خاو کردنەوە و پیلانگێڕان.

*

نامەنووسین بۆ دەسەڵاتدارەکانیان

بەر لە بەریەککەوتنی هیچ کام لەو ٣ پشانەی هێزەکان، لە ئەنجامی ئەو کۆبوونەوانەدا ک س بڕیاری دا کە ئەم هەڵوێستە بەرامبەر قم بگرێ بۆ ئەوەی سەرکردایەتی هێزەکە پەیڕەوی بکات:

١. هێزەکانی یەکێتی لە هەموو حاڵەتێک دا بچیتە ناوچەی برادۆست.

٢. ئەگەر قم بە بێ شەڕ بارەگاکانی ساڵی پێشووی یەکێتی یان لە گۆستە چۆڵ کرد، وا بە دوویان نەکەون و وازیان لێ بهێنن.

٣. ئەگەر چەکدارەکانی قم هاتنە سەر ڕێگەی هێزەکانی یەکێتی، وا بە توندی لێیان بدرێ.

دوای دانی ئەم بڕیارانە، دیسانەوە، چەند کۆبوونەوەیەکی تر کرا. ئەمجارەیان بڕیار درا وەکو نیشانەی نیازپاکی و، بە نیازی خۆلادان لە شەڕی قم و، خاو کردنەوەی گرژی نێوان یەکێتی و ئەوان، دەستپێشخەرییەکی نوێ بکرێ: لە بەر ئەوەی لەو کاتەدا مەلا مستەفا و مەسعودی کوڕی لە ئەمریکا بوون، چەند نامەیەک بۆ هەندێ لە گەورەکانی بنەماڵەی بارزانی و، کەسانی نزیکیان بنووسرێ. لەوانە: مامجەلال و عەلی عەسکەری سەرۆ نامەیان بۆ شێخ محەممەد خالید بارزانی و، عەلی عەسکەری نامەی بۆ ئیدریس بارزانی و، خالید سەعید نامەی بۆ دایکی مەسعود و، تاهیری عەلی والی نامەی بۆ ڕەشید سندی و چەند کەسێکی کە نووسی. ناوەڕۆکی ئەم نامانە بریتی بوو لەوەی کەوا:

– کوردستان لە مەترسی ڕاگوێزان و بە عەرەب کردن دایە و، کورد لە مەترسی لە ناو چوون و تەفروتونا کردن دایە، بۆیە ئێمەی کورد هەمووی یەک بگرێ بۆ بە گژدا چوونی دوژمنی سەرەکی کە حکومەتی عێراقە.

– ئەو هێزەی بەرەو برادۆست ئەگەڕێتەوە ڕێ بۆ ئەوەیە کە هەرچی زوتر ڕێگای هێنانی چەک بکاتەوە و، فریای دانیشتوانی ناوچەکانی سنوور بکەوێ پێش ٧٨/٦/١ کە کاتی دەس پێ کردنی ڕاگوێزانیانە.

– ئەو هێزە نیازی پەلاماردانی قم ی نیە، بەڵکو بۆ ئەو ناماڵجە پیرۆزە ئێچێ و، ئەوانیش نفوزی خۆیان لە لای مەلا مستەفا و کوڕەکانی و پیاوەکانی بەکار بهێنن بۆ ئەوەی نەهێنە ڕێگری هێزی پێشمەرگە لە بادینان و سنووری تورکیا و، شەڕ بە هێزەکانی یەکێتی نەفرۆشن.

ئەم نامانە بە ڕاسپێردراوەکانی ئیدریس دا نێردران بۆ تاران و کەرەج و، گەیشتە دەس خاوەنەکانی.

کۆبوونەوەی یەک لە دوای یەک و، گۆڕینی پەیتا پەیتای بڕیارەکان و، نووسین و ناردنی ئەم نامانە، ڕادەی دوودڵیی سەرکردایەتی یەکێتی دەرئەخا لە مەسەلەی لێدانی قم دا، دوودڵیی و ڕارایی لە بڕیاردانی جەنگیی دا، بە تایبەتی لە کاتی ناسک دا، دەردێکی کوشندەیە و، دوژمن ئەتوانی بە چاکترین شێوە کەلکی لێ وەربگرێ. لە کاتێک دا سەرکردەکانی قم کە هەموو چەکدار و دۆست و لایەنگرەکانی خۆیان بە گیانی دوژمنایەتییەکی سەخت و بێ ئەندازەی یەکێتی پەروەردە کرد بوو، بۆ ئەوەی کە بێ سێ و دوو لە ڕووی دا ڕابوەستن و بە گژی دا بچن و ئەگەر بتوانن، یەکێتی وەکو هێزێکی دوژمن بە

خۆیان، له ڕەگوڕیشه دەربهیان، کەچی گومان و دوودلی و ڕاڕایی خرا بوه ناو هێزەکانی یەکیتیەوه کە: ئاخۆ ئەو شەرە بکری باشه یا نەکری؟ ئەو شەرە براکوژیه یان براکوژی نیه؟ ئەم له یەکیتی نادەن ئیتر بۆچی یەکیتی لەوان بدات؟

*

بەرێکەوتنی هێزەکان بەرەو ناوچەی ۳ سنور

هێزەکان خۆیان ئامادە کرد بۆ ئەوەی بەرەو ئامانجی دیاریکراو بکەونه ڕێ. لە بەر گەرمیی هێزەکە و زۆر باس کردن و زۆر مانەوە، مەسەلەی پاراستنی نهێنیی بەرێکەوتن و ڕێگەکەی و ئیتیجاهی و دوائامانجی، هەروەها مەسەلەی ئامانجی بەرێکردنی، لە لای هەمو دوژمنەکانی یەکیتی: چ حکومەتەکانی عیراق، ئێران، تورکیا و، چ ئەم دیار و ئاشکرا بو.

بەشی یەکەمی هێزەکە، لە کاتی دیاریکراوی خۆی دا واته لە ۷۸/٤/۱۹ لە «گورەشێر» ەوە بە دیوی ئێران دا سنوراو سنور کەوتە ڕێ، ناوچەی سەردەشت و بەشێکی خانه (پیرانشەهر) یان بڕی بو و لە نزیک حاجی هومەرانەوە ئاودیوی عیراق بوبونەوە و، لە ئالانه - گوندەژور - گرتک و ڕوست - هیردن - بیرکمه وە گەیشت بونەوە برادوست.

لە بەر ئەوەی هێشتا هێزەکانی دوژمن بە تەواوی بە خۆ نەکەوتبون، ئەم هێزە توشی شەر و بەرسیتی و سەرما نەبو، گیروگرفت و نارەحەتی زوریان نەهاتە ڕێگا. تەنها لە «بیرکمە» توشی شەرێک بون پێشمەرگەیەکیان کوژرا. بەلام هێزەکانی دوژمنی هوشیار کردەوە کە هەرچی زوتر بکەونە خۆ ئامادە کردن بۆ ڕێگە گرتن و لێدانی هێزەکانی تری یەکیتی.

*

پیلانی حکومەتی ئێران و تێکچونی پلانی ڕویشتن

بەشی دومی هێزەکە بە هیوای ئەوەی سود لە چاوپۆشینی حکومەتی ئێران لە هاتوچوی کەمی پێشمەرگە وەربگری، خۆی دواخست و، بە تەمای ئەوە بو کە بە ئوتومبیل بە ناو ئێران دا لە جادەی سەردەشت - پیرانشەهر - شنۆ وە بڕوات لە نزیک کیلەشین دابەزی و، لەوێوە ئاودیوی عیراق بێ و بچیتە ناوچەی برادوست.

سەرکردایەتی هێزەکە چەند کەسێکی نارد بۆ دیوی ئێران بۆ ئامادە کردن و بە کری گرتنی ئوتومبیلی گواستنەوەی هێزەکە. ئەم هێزە لە باتی ئەوەی وەکو چاوەڕێ ی نەکرد ئوتومبیلی پێ بگات، زانیاری پێویست لە سەر ژمارە و لێپرسراو و، چەکەکانی و ئیتیجاهی ڕویشتنی، گەیشتەوە ساواک و ئەرتەشی ئێران. پاش ئەوەی نائومێد بو لە «بە ئوتومبیل ڕویشتن» کەوتە خۆ ئامادە کردن بۆ ئەوەی بە پێ بکەوێتە ڕێگا و چەند

کەسێکی تری ناردە دەوری تاران بۆ کڕین و ئامادە کردنی نان و خواردەمەنی و دانانی لە سەر ڕێگای تێپەڕ بوونی هێزەکەدا.

سەرکردایەتی بەشی دوەمی هێزەکە، بەمە هەلمەیەکی یەکجار گەورەی کرد بەوەی کە خۆی دواخست و لە کاتی دیاریکراودا نەکەوتە ڕێگا و، لەوەش گەورەتر کە بە تەمای ئۆتۆمۆبیلی تارانی و بە ئاگاداری تاران خۆی دواخست و نەخشەکەی بە تەواوی بۆ تاران دەرکەوت و، ئەو (جەدوەلە زەمەنی) یەی کە بۆ جولان و بەڕێکەوتن و پەکگرتنەوەی هێزەکان دانرا بو، تێک چو. تارانیش لە پاتی ئەوەی ڕێگەی تێپەڕینمان بدا بە ئۆتۆمۆبیل، لەو ماوەیەدا بە ناوی (موناوەرە) ی جەنگییەوە هێزێکی یەکجار زوری ساز دا و، بە درێژایی سنوری تاران - عێراق هەمو شوێنە گرنگ و جادە و ڕێگاوبان و تەنانەت قاچاخە ڕێگاکانیشی داگیر کرد. هەر زور زو کەوتە خوی هەمو ئەوانەیشی پان گرت بو یاخود کری بو، کە چو بون بۆ تاران، بۆ ئامادە کردنی نان و خواردەمەنی بۆ هێزەکە.

جگە لەمانە، هێزێکی گەورەی تری حکومەتی تاران لە شاخەکانی دەوروپشتی نزکان، تورژلە، گۆرەشێر.. دامەزرا و، هەرەشەی لە هێزەکانی یەکێتی کرد، کە هێشتا لەو ناوچەیە دا بون، کە ئەگەر لە ماوەی چەند سەعاتێک دا ناوچەکە چۆل نەکەن، هێزی زەمینی و ئاسمانی لێیان ئەدات.

*

بەڕێکەوتنی هێزەکان پێکەوە

بەشی دوەمی هێزەکە کە لە کاتی دیاریکراوی خۆی دواکەوت بو، لە گەڵ بەشی سێیەمی هێزەکە، کە ئەویش بە هۆی دواکەوتنی بەشی دوەمەوە کاتی جولانی خۆی دواخست بو، بە ناچاری هەمویان پێکەوە کەوتنە ڕێ بەرەو قەندیل. من لە گەڵ ئەو ڕەتلە دانرا بوم کە لە گەڵ مامجەلال بون، بەلام لە ناو ئەو ڕەتلەدا هیچ ئەرکێکی دیاریکراوم نەبو.

لە گوزەرشێر تێ پەڕی بوین لە ناو هەندێ داروددەوەن دا ڕاوەستا بوین، مەفرەزەیەک ئەگەڕایەوە بۆ خواری. مامجەلال ویستی نامە و هەندێ بلاوکراوەیان پێ دا بنێری. سەلاح چاوشین فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە بو کە بەرپرسی پاراستنی مامجەلال بو.

مامجەلال سەلاحی بانگ کرد، وتی: «بلاوکراوەکان بهێنە!»

سەلاح وتی: «مامە نەمان هێناوە»

مامجەلال وتی: «بوچی نەتان هێناوە؟»

سەلاح وتی: «ولاخەکان ئەو هەمو بارەیان پێ هەڵ نەئەگیرا»

مامەجەلال سەیری ولاخەکانی کرد لە بەتانی و لیباد و نایلۆن بار کرا بون، بە تورەییەوە ڕوی کردە سەلاح وتی: «ئێمە مەکتەبی سیاسیین، یا مەکتەبی لیبادین؟ ئەو هەمو لیبادەیان هەلگرتوە نەیانتەتوانی کارتۆنێ بلاو کراوەیش هەڵ بگرن؟».

سەلاح گەڕایەوە چو بلاوکراوەکانی هێنا.

هەمو هێزەکە بە لای گورشەردا چوینە دولە کوکێ. ئەو شوێنانەی بەڕیان لێ ترا بوەوە گیا سەری دەرهێنا بو، تازە ڕیواس پێ گەیشت بو. دولە کوکێ لە بەر داپراوی و بەفری زور ئاوەدانی تێ دا نەبو. چەند ساڵە پێشمەرگەیەکی لێ بو. شەوێ لە دولە کوکێ ماینەوە. پێش ئەوەی بە جێ ی بهێلین بە پێشمەرگەکانم وت: «لیرە بە دواوە ئیتر ژن و منال و مەڵ نایبانا». لایان وابو گاڵتەیان لە گەڵ ئەکەم. لەویوە هەلکشاین بو «دەراوی گویزێ» بەرەو قەندیل.

*

ئەوی سەرنجی ڕیبوار ڕائەکیشێ، لە زمانی کوردی دا هەندی ئەندامی لەشی مرۆڤ و هەندی شوێنی شاخ، هاوناوی یەکترین. پێ ئەچێ کورد لەشی شاخی بە لەشی خۆی شوبهاند بێ، وەکو:

سەر، تەپلە سەر: ١. بەرزترین شوێنی لەش. ٢. بەرزترین شوێنی شاخ.

لوتکە (لە «لوت» ەوە وەرگیراوە): ١. دیارترین ئەندامی سەر. ٢. دیارترین و بەرزترین بەشی سەرەوەی شاخ.

مل: ١. ئەو بەشەی سەری مرۆڤ ئەبەستێ بە لەشەوە. ٢. ملە، وەکو ملە کەوە لە ڕیگی پێنجوین و، ملەی مرواری لە شاخی سورێن.

گەردن: هەمان واتای «مل» ی هەیە. گەردنە: ملە.

گەرو: ١. قورگ، ئەورگ. ٢. شوێنێکی تەنگەبەر لە نێوان دو شاخ دا، وەکو «گەرو» ی بیشە، «گەرو» ی عومەر ئاغا.

گەلی: گەرو. وەکو گەلی ی عەلی بەگ، گەلی ی بیجان لە کوڕەک، گەلی ی بەدران و سەرگەلی و زارگەلی لە دولی شەهیدان.

گەڵو: گەرو، گەلی. وەکو سەرگەڵو، بەرگەڵو لە دۆلی جافەتی.

«گەلی» و «گەڵو» و «گەرو»: هەرسیکیان یەک مەعنایان هەیە و لە ڕیشەی «گەرووک» ی پەهلەوین و، لە فارسی دا بوتە «گلو».

شان: ١. لە دوا جومگەی باڵەوە تا مل. ٢. تەنیشت یا لای ڕاست و چەپی شاخ.

سنگ: ١. بەشی پێشەوەی لەش لە نێوان مل و سک دا. ٢. ڕووی پێشەوەی شاخ.

پاسک: ١. باڵ، لە پەلەپەی دەستەوە تا جومگەی شان. ٢. بەرزاییەکی لە شاخەوە درێژ ئەبێتەوە.

*

**گوچانەکەی کاک عەلی**

لە گەڵ جوڵانی هێزەکانی یەکێتی دا، هێزی ئاسمانیی ئێران کەوتە فڕین بە سەر ئاسمانی ناوچەکەدا و، بە سەر هێزەکانی یەکێتی دا. جگە لەمەش هێزی زەمینیی هەموو ڕێگاکانی داگیر کرد بۆ ئەوەی ڕێگەی تێپەڕینی هێزەکانی یەکێتی بگرێت. بەفر ڕێگاکانی گرت بوو، لە هەندێ جێگا وڵاخی لێ دەرنەئەچوو، یەکێ لە کاروانەکانی هێزەکەمان لە بەر گیرانی ڕێگاکەی، ناچار بوو بچێتە ناو ئەرزی ئێرانەوە، هێزەکانی ئێران دایانە بەر تۆپ و، ناچاریان کرد کە بگەڕێتەوە دیوی عێراق.

جموجوڵی زۆر و خێرای جەنگیی ئێران، بەرامبەر هێزەکەمان، سەرلەبەری هەموو کەسێکی ڕاتەکێشا و، هەموو ئەترسان ئێران پیلانێکی دوژمنانەی لە ژێر سەردا بێ. هێشتا لە «دەرواری گوێزێ» بووین مامجەلال، بۆ هەڵسەنگاندنی سەر لە نوێ ی هەلومەرجی تازە، داوای لە: عەلی عەسکەری، تاهیری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوڵلا و من کرد.. دابنیشین، د. مەحموود و قادر جەباریش ئامادە بوون.

مامجەلال وتی: «پێ ئەچێ هەلومەرجەکە گۆڕا بێ، جموجوڵی دوژمنانەی ئێران زۆر زیادی کردووە. ڕۆیشتن بەم قەرەباڵغییە بە ناو ئەرزی ئێران دا کارێکی خەتەرە. لە بەر ئەوە پێشنیار ئەکەم هەموومان بگەڕێینەوە «دۆڵە کۆکێ» و، بە پێ ی ئەو فاکتەرە نوێ یانەی هاتوونەتە ناو مەسەلەکەوە، سەر لەنوێ بیر لە هەموو نەخشەکە بکەینەوە و حساب و نەخشە و ڕێگە و شوێنی نوێ دابنێین».

کاک عەلی وتی: «ئێمە هێزێکی ترمان ناردووە ناوچەی برادۆست، چاوەڕوانی گەیشتنی ئێمە ئەکەن، من فەرماندەی پێشمەرگەم بەڵێنم پێ داون لەوێ یەک بگرینەوە لە بەر ئەوە من هەر ئەڕۆم».

مامجەلال وتی: «مەبەستم لەوە ئەڕۆیشتن نییە، بەڵکو گۆڕینی جۆری ڕۆیشتنەکەیە».

لەم بارەیەوە هەندێ مشتومڕ کرا. کاک عەلی سوور بوو لە سەر هەڵوێستەکەی و، وتی: «ئەمە چۆن ئەبێ هەر دو تۆپ تەقێ ئێمە نەخشە و پلانەکانی خۆمان بگۆڕین..؟».

کاک عەلی لە کاتی رویشتن دا گزچانی بە دەستەوە ئەگرت، لە کاتی قسەکانی دا گزچانەکەی بە توورەییەوە کیشا بە بەردیک دا گزچانەکەی شکا.

*

لە یەک جیا بوونەوە

بە ناو بەفری کویستانەکانی قەندیل دا رویشتین. گرێ و چالی شاخەکان لوس بوبون. هەتا چاو بڕی ئەکرد سپی ئەچوەوە. ریچکەی درێژی پیشمەرگەکان و کاروانی ولاخەکانیان، لە ناو بەفری قەندیل دا دیمەنیکی سەیری هەبو. لە دوورەوە بە ئاسانی بە دی ئەکرا. فرۆکەی ئیرانی بەردەوام بە سەرمانەوە ئەفرین.

بە لای «کەوپەر» دا تی پەڕین بۆ «دۆڵە تێ». دولە تێ هەندێ کەورگ و چەند داریکی لی بو. لەوێ لامان دا بۆ پشودان. چەند جاری سەر لە نوێ کۆ بوینەوە. لە بەر مەترسی ریگاوبان وا ریک کەوتین، هیزەکەمان بکەینەوە دوبەش:

بەشیکیان، لە گەڵ کاک عەلی بروا بۆ برادوست، لە گەڵ ئەو هیزە یەک بگرێتەوە کە بە سەرکردایەتی خالید سەعید رویشت بون.

بەشەکەی تریان، لە گەڵ مامجەلال بمێنیتەوە، تا هەواڵی گەیشتن و یەکگرتنەوەی بەشی یەکەم و بەشی دوەمی هیزەکان ئەگات، ئەوسا ئێمەیش بەرەو لای ئەوان بە ری بکەوین و، هەموویان لەوێ یەک بگرنەوە.

بەشی هەرە زوری پیشمەرگە چەکدار و چالاک و لاوەکان جیا کرانەوە و، لە گەڵ تاهیری عەلی والی، عومەری حاجی عەبدوللا، سەعید کاکە، تالیب روستەم، ئازاد هەورامی، قادری مامەند ئاغا، ئەنوەری مەجید سولتان، فرئاد عومەر.. دانران، تا لە گەڵ عەلی عەسکەری برون.

هەمو پیر و، نەخوش و پەککەوتو و، گومان لیکراو و، زوری بی چەکەکانیش جیا کرانەوە و بەرەو روی ئیمە: مامجەلال و من، کرانەوە، تا بە شینەیی بیان نیرینەوە بۆ دواوە و، بلاوەیان پی بکەین، بۆ ئەوەی ئەبن بە بار بە سەرمانەوە. ئەو تا هەمومان جاریکی تر یەک ئەگرینەوە کاروباری مەکتەبی سیاسی بەش رابپەرینین.

لە کومیتەی ئامادەکردن: د. مەحمود عەلی عوسمان و قادر جەباری و، لە پاسوک: جەلالی حاجی حسین، لە گەڵ ئیمە مانەوە.

مامجەلال و عەلی عەسکەری و د. مەحمود، قسەیان بۆ هیزەکە کرد و، بە درێژی و بە وردی ئەرکەکانی سەفەرەکەیان و مەترسیەکانی ریگایان بۆ روون کردنەوە.

ئەوان بەرەو شوینی دیاریکراو رویشتن و ئیمە لە دولە تێ ماینەوە.

## هەکاری: شانۆی کارەسات

*

سەرەتای مانگی مایس، بەشی دوەمی هێزەکە، لە وەدولە ن،ێ وە بە لای خانەدا بەرەو کێلەشین لە پشتی شنز کەوتە ڕێ.

هێزەکە کە زۆری ڕێگاکەی تا نزیک ٣ سنور بە دیوی ئێران دا ڕۆیشت بو، جگە لەوەی تووشی ماندووبونێکی زۆر، برسێتی، سەرما و سەهۆڵبەندان بون. هێزەکانی حکومەتی ئێران لە چەند جێگا بۆردومانی کردن و چەند پێشمەرگەی کوشت و بریندار کرد و، ڕێگاوبانەکانی بە ڕوەی لی تەنی بون بو ئەوەی بە سەرما و برسێتی تەفروتونایان بکات، کە ئەگەر نەختێک خواردنی چەند شوانێک نەبوایە لە پشتی شنز کە لە خەوەتیک دا زەخیرەیان کرد بو، پێشمەرگەکان بە ڕێکەوت تووشی بوبون، بەشێکی زۆری هێزەکەیان لە برسان لە ناو بەفردا ڕەق ئەبونەوە.

تا هێزەکە هەسوی گەیشتەوە دیوی عێراق، لە پەناوی هێنانی نان و خۆراک دا لە دەورووپشتی گوندەکانی ئێران چەندین کەس کەوتنە بۆسەی ئێرانیەکانەوە و گیران و، چەندین کەس خۆیان دا بە دەستەوە و، چەندین کەس ڕەق بونەوە و، ئەوی تری بە هەزار فەلاکەت و ناخۆشی بە نیوەگیان گەیشتەوە دیوی عێراق.

بەلام هەر گەیشتنە دیوی عێراق و پێشمەرگەیەکی بەزیو بە دزیەوە رایکرد و تەسلیم بوەوە، هێزەکانی حکومەتی عێراق کە پێشتر خۆیان ئامادە کرد بو، دەسبەجێ لە «خرێنە» پەلاماری بەشی دوەمی هێزەکەیان دا کە هێشتا پشویان نەدا بو و، ماندوێتی ڕێگایان دەرنەچو بو. هێزەکانی عێراق، بە تایبەتی بە هالیکۆپتەر، هەرشیان هێنایە سەر هێزەکە و، چەندین کەسیان کوشت و بریندار کرد.

هەرچەندە ئەم هێزە هەندێ نان و خواردنیان پەیدا کرد، بەلام هێشتا نە ماندوێتی ڕێگایان دەرچو بو، نە گەرم بوبونەوە و، نە حەوا بونەوە.. بەم وەزعەوە سەرلەنوێ ناچار بون بکشێنەوە دولی خراکورک. لەویش دیسان هێزەکانی عێراق بە هالیکۆپتەر دایەزی و پەلاماری دان، ئەوی هێشت وچان بدەن و خۆیان ڕێک بخەنەوە. چەند پێشمەرگەیەک کوژران و چەند پێشمەرگەیەک گیران. لەرشەوە، دیسان لە ژێر گوشاری جەنیشی عێراق دا، ناچار بون بکشێنەوە دیوی تورکیا.

بەشی یەکەمی هێزەکە بە سەرکردایەتی خالید سەعید، کە پێشتر گەیشت بوە

هەمان ناوچە و مەشووری هەندی ئازووقە و خواردەمەنی خوارد بو. لە گەڵ بەشی دوەمی هێزەکە بە سەرکردایەتی عەلی عەسکەری، ڕۆژی ۷۸/۵/۱۳ یەکیان گرتەوە و، لە سەر سنووری تورکیا - عێراق - ئێران کەوتنەوە ڕێکخستنەوەی هێزەکان و پشوودان و خۆ کۆکردنەوە.

*

ئەو مەینەتی و ناخۆشی و زەرەر و زیانە زۆرەی تووشی هێزەکە بو، هەمووی نرخی ئەو هەڵە کوشندانەیە کە وەکو پێویست حسابیان بۆ نەکرا بو. بەڕێکەوتنی هێزەکانی یەکیتی بەرەو ناوچەی ۳ سنوور بەو شێوەیەی کە باس کرا، گەلێک هەڵەی سیاسی، پێشمەرگەیی، جوگرافی.. تی دا کرا، کە ئەمانە هەندێکیانە:

۱. گوی نەدانە پیلانی هاوبەشی دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە دژی یەکیتی:

حکومەتەکانی ئێران، عێراق، تورکیا.. گەلی کورد و مەسەلە ڕەواکەی بە دوژمنی دێرینە و هاوبەشی خۆیان ئەزانن، بۆیە سەرەڕای هەموو ناکۆکییە قووڵەکانی ناوخۆیان هەمیشە لە کاتی پێویست دا هاوکاری یەکیان کردوە و، یەکیان گرتوە بۆ شکاندنی جوڵانەوە شۆڕشگێڕییەکانی گەلی کوردستان.

شای ئێران و صەددام حسێن لە ۱۹۷۵ دا لە جەزائیر ڕێککەوتنێکیان ئیمزا کرد بۆ هاوکاری کردن دەربارەی پاراستنی ئاسایش و ئارامیی هەردوو دیوی سنووری عێراق و ئێران.

حکومەتەکانی عێراق و تورکیاش لە ساڵی ۱۹۷۷ دا ڕێککەوتنێکی تری لەو بابەتەیان مۆر کرد بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامیی هەردوو سنووری عێراق و تورکیا.

حکومەتی ئێران زیاد لە ......٤٥ هێزی چەکداری هەبو.

حکومەتی تورکیا زیاد لە .......٥ هێزی چەکداری هەبو.

حکومەتی عێراقیش زیاد لە .......٢ هێزی چەکداری هەبو.

شۆڕش لە کوردستانی عێراق دا، بەو ڕێبازە سیاسی و پێشمەرگەییە پێشکەوتنخوازانەیەوە لە قوناغی ئەوسای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا کە سەرانسەری ناوچەکە لە ژێر زەبروزەنگی حکومەتە کۆنەپەرست و فاشیستییەکانی ناوچەکە هێمنییەکی ڕووکەشیان تی دا بڵاو کرد بوەوە، شۆڕشی کوردستانی عێراق بوبوە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر ئەم دەوڵەتانە، شتێکی ئاسایی بو کە لە کاتی پێویست دا قوڵ بکەن بە قوڵی یەکتری دا و، پیلانی هاوبەش دابنێن بۆ لە ناو بردنی.

لە کاتی بەڕێکەوتنی هێزەکانی یەکیتی دا، هاوکاری ئەم ۳ دەوڵەتە، بە شێوەیەکی

ڕوون و ئاشکرا، دیار بوو.

حکومەتی عێراق چەندین ئەفسەری سوپایی و پسپۆڕی جاسوسی نارد بوو، تاران و تورکیا بۆ یەکخستنی زانیارییەکان و دانانی پلانی هاوبەش. هەروەکو حکومەتی عێراق زۆربەی ناوچەکانی سنووری ڕاگوێزا بوو، ڕەوەندەکانیشی قەدەغە کرد بوو لەوەی کە بە مەڕ و ماڵاتەوە بچنە کوێستانەکان بۆ ئەوەی پێشمەرگە سوودی لێ وەرنەگرێ. هەروەها حکومەتی ئێرانیش ڕەوەندەکانی قەدەغە کرد لە هاتنە کوێستان، تەنانەت ئەوانەشیان کە هات بوون، بە زۆر گێڕانیەوە دواوە.

ئەرتەشی ئێران بە ناوی سووتاندووەوە هەموو ڕێگاوبانەکانی گرت بوو، تووشی هەرکەس بووایە ئەیگرت، هەروەها هەموو ئەوانەی کە پێشتر ئەیردرا بوونە شارەکانی؛ سەردەشت، خانە بۆ ئامادە کردنی خواردن یا گرتبوونی وە یاخود کرێبوونی و، دەستی بە سەر کەلوپەلەکان دا گرت بوو. جگە لە مانەش بە فڕۆکە بەردەوام چاودێری هێزەکانی یەکێتی ئەکرد و، هەندێ جار بە هالیکۆپتەر ئاگربارانی ئەکردن.

هێزەکانی ئێران لە دیوی ئێران کەوتنە لێدانی هێزەکانی یەکێتی و، هەر کە چوونەوە دیوی عێراق لەویش هێزە چەکدارەکانی عێراق کەوتنە پەلاماردانی و، کە چوو دیوی تورکیاش، عەشیرەتەکانی ناوچەکە کەوتنە خۆ ئامادە کردن و، سیخوڕ و دەزگا جاسوسییەکان کەوتنە پەیجۆریان.

سەرکردایەتی یەکێتی هێزی دوژمنەکانی بە کەم گرت، یاخود بە چاکی هەستی بەم مەترسییە نەکرد. چاوپۆشینی حکومەتی ئێران لە هاتوچۆی پێشمەرگە بە ناوچەکانی سنووردا، کە لە ڕاستی دا بۆ شاردنەوەی دالدە دان و یارمەتیدانی هێزە چەکدارەکانی قم بوو و، چاوپۆشینی حکومەتی تورک لە دانیشتنی هێزەکانی قم لە ناوچەکانی سنووردا، دەستخەرۆی کرد و بە گورگان خواردوی دا، وای زانی ئەم چاوپۆشینە هێزەکانی یەکێتی یش ئەگرێتەوە، کەچی لە ئەنجام دا بوو بە هۆیەکی کاریگەری ئەو شکستە گەورەیە.

٢. یاش ڕێک نەخستنی هێزەکە و، یاش نەناردنی بۆ شوێنی دیاریکراو.

هەرچەندە هێزەکە کرا بوو بە ٣ بەش و، دوایی بوو بە ٢ بەش، بەڵام هەربەشێکی لە چاو ڕێ ڕۆیشتنێکی وەها و، بە ڕێگایەکی وەها دووری پڕ مەترسی دا، بۆ جەنگی پارتیزانی، لە هەلومەرجێکی وەکو ئەو کات و شوێنەی کوردستان دا، هەڵەیەکی گەورەیە.

هێزەکە لە بەر گەورەیی خۆی و، درێژی ڕێگاکە و باریکی و سەختی، ببوو ڕیچکەیەکی زۆر دوور و درێژ کە بە هۆی لە ڕیز دەرچوونی یەکێکەوە بۆ پشوودان و وچانگرتن، بۆ ئاو خواردنەوە یا خۆ توند کردنەوە.. هەموو ڕیزەکە تێک ئەچوو و، زنجیرەکە

ئەوچرا و ئەبوە هۆی دواکەوتن و لە یەک دابران و لە یەک ون بون.

لە بەر گەورەیی و درێژی ڕیچکەکە و، ئەبونی هۆی پەیوەندی، وەکو هۆکی تۆکی، نەئەتوانرا بە چاکی سەرپەرشتی بکری. هەرچەندە هێزەکە کرا بوە چەند «ڕەتل» و، هەر ڕەتلە لێپرسراوی خۆی هەبو، بەلام دیسانەوە چونکە هەمو پێکەوە و، بە یەک ڕێگای بارێک دا ئەڕۆیشتن و بە یەک خێرایی نەئەڕۆیشتن، بە چاکی سەیتەرەیان بە سەردا نەئەکرا.

تەئمین کردنی ئازوقە و خواردەمەنی و پێویستیەکانی تری هێزێکی وا گەورە، بە تایبەتی لەو شوێنە چۆلانەدا کە ئەوان پێی دا تێ ئەپەڕین، کارێکی یەکجار دژوار و زەحمەت بو.

هێزەکە لە بەر زوری ژمارەی خۆی، نەیئەتوانی خۆی لە دوژمن بزر بکا و خۆی بشارێتەوە، شوێنەونی بکا و شوێنەوارەکانی پاش خۆی بسڕێتەوە.

جولانی هێزەکە بەو گەورەییە بە پێ، بەو ڕێگا دوورودرێژە بارێک و شاخاویەدا کە ئاوەدانی تێ دا نیە و، هێشتا بەفر گرت بوی کارێکی زور خراپ بو. جولاندنی هێزی وا زل کە لاسایی کردنەوەی جولاندنی هێزی (جەیشی نیزامی) یە لە کاتێک دا کە جەیشی نیزامی ماشین و فروکەی هەیە بۆ گواستنەوە و تەئمین کردنی پێویستیەکانی خواردن و خۆ گەرم کردنەوە و ماندو نەبون، پەیوەندی کردن و توانای زۆ دەرباز بون و زۆ پەلاماردان و زۆ کشانەوەی هەیە، بۆ لەشکرێکی پارتیزانی کە بێ بەشە لەو ئیمکانیاتە هەلەیەکی ئەوەندە گەورەیە، لە حوکمی خۆکوشتن دایە.

هێزەکەی یەکیتی ئەبوایە بە تاقمی کەم کەمی ۱۰۰ - ۱۵۰ کەسی بڕۆیشتایە، نەک هەموی بە کومەل پێکەوە.

ئەبوایە ئەو تاقمانەش ڕێگای جیا جیایان بگرتایە نەک هەمویان یەک ڕێگایان بگرتایە بەر.

ئەبوایە لە کات و شوێنی جیاوازەوە بەری بکەوتنایە و، لە کات و شوێنی دیاریکراودا یەکیان بگرتایە.

ئەبوایە هەر تاقمە چەندین سەرچاوەی تەئمین کردنی ئازوقە و پێویستیەکانی تری لە پێشەوە، لە چەند شوێنی جیا جیاوە تەئمین بکردایە.

ئەبوایە هەر تاقمە هەولی دوزینەوەی ڕێگە و شوێنی حەوانەوەی جیاواز و ڕابەر و چاوساغی جیاوازی بدایە.

۳. گوێ نەدانە مەناخ و تەپوگرافی ناوچەکە.

ئەو كاتەی هێزەكە بە ڕێ كەوت هێشتا سەرەتای بەهار بوو، ئەو ناوچانەی كە ئەبوو ببڕی هەموی كوێستانی سەخت و چوڵ بوون. شاخی هەزار بە هەزاری ڕووت و دۆڵی قوڵ، دوور لە ئاوەدانی، زۆر جار تا سەرەتای هاوین بەفر ئەیگری و، ماوەی هاتوچۆ كردن نادا.

زۆر جار سوپا نیزامییە گەورەكان هەر بە هۆی حساب نەكردنی ورد و تەواوی «عامیلی مەناخ»، یاخود «عامیلی تۆپۆگرافی» شكستی زۆر گەورەیان بە سەردا هاتوە، تەنانەت سوپای عیراقی لە چەندین پەلاماری پایز و زستان دا هەر لە بەر بەفر و سەرما و گێژەلوكە شكاوە، یاخود لە بەر سەختی و نالەباری ناوچەكە و تێكەڵ بوونی لە گەڵ نالەباری باری هەوا، شكستی گەورە و زیانی زلی گیانی، لێ كەوتوە.

كاتی بەڕێكەوتنی هێزەكانی یەكێتی لە چاو مەناخی ناوچە شاخاویە سەختەكانی كوێستانەكانی كوردستان دا زوور زوو بوو، بۆیە جگە لەوەی بەفری شاخەكان هێشتا نەتوابوەوە و، ڕێگاكانی بەر نەدابوو، پێشمەرگە ڕەشایی نەئەدۆزیەوە تا بحەوێتەوە یا تێی دا دابنیشێ، چ جای شوێنی نوستن، جگە لەوەش هەندێ جار ئەبووەوە بەفر و زریان. ڕێگایەكی وەها ئەگەر چەند سەعاتی بێ، یاخود ماوەی چەند ڕۆژێ بێ، ڕەنگە كارێكی ئەوتۆ نەكاتە سەر پێشمەرگە، بەڵام ماوەی چەند حەفتەیەك كە درێژەی كێشا، بێ كەلوپەلی خۆ گەرم كردنەوە و، بێ سوتەمەنی و خواردەمەنی و، بێ شوێنی حەوانە، وا سەرەڕای ئەوەی توانای جەنگاوەرانەی پێشمەرگە ناهێڵی، بەڵكو پرژەی لێ ئەبڕی و قڕی تێ ئەخات، هەروەكو بە سەر ئەم هێزە هات.

*

هەڵەی كوشندە:

گۆڕینی بنەڕەتیی بڕیاری جێگیربوون لە ۳ سنور

بەشی یەكەم و دووەمی هێزەكانی یەكێتی كەوا لە ناوچەی برادوست یەكیان گرت بوەوە و، بۆ پشوودان و خۆڕێكخستنەوە پەڕی بوونە دیوی توركیا و ۷ ڕۆژ لە وێ بە ئاسودەیی مابونەوە، لە باتی ئەوەی خەریكی خۆسازدان بن بۆ جێبەجێ كردنی بڕیارەكانی كومیتەی سەركردایەتی، لە سەرو هەمویانەوە: دامەزراندنی بنكە و بارەگای سەركردایەتی لە شوێنەكانی پار و، هەواڵ ناردن بۆ هاتنی بەشی سێیەمی هێزەكە و، ئەندامانی تری م س، سەركردایەتی هێزەكە بە بیانوی ئەوەی كە ئەوان زۆربەی ئەندامانی سەركردایەتی یان لە گەڵە و، بە پێ ی هەلومەرجی نوێ، ئەتوانن بڕیاری نوێ بدەن، بە تایبەتی دوای ئەوەی ڕاسپەردراوێكی ئیدریس بارزانی ئەگاتە لایان و، پێیان ڕائەگەیەنێ كە: پیاوەكانی ئیدریس لە ناو چەكدارەكانی قم دا نایەنە سەر ڕێگای هێزەكانی یەكێتی، ئەگەر ئەوان

ئەچنە سەریان، سەرکردایەتی هێزەکە بڕیار ئەدا: لە باتی مانەوە لە ناوچەی برادۆست و، دانانەوەی بارەگا لە دۆڵی گۆستە، بۆ ئەوەی تووشی شەڕ نەبێ لە گەڵ قم، بڕیار ئەدات کە بچێتە ناو قوڵایی تورکیاوە، بۆ ئەوەی نزیک بکەونەوە لە شوێنی وەرگرتنی چەک و چەکدارکردنی بێ چەکەکانی هێزەکەیان.

لە نامەیەک دا کە ڕۆژی ٧٨/٥/١٦ دا عەلی عەسکەری، خالید سەعید، تایەری عەلی والی نووسیویانە، دوای ئەوەی باسی ئەو مەینەتی و دژواریی و شەڕانە ئەکەن کە لە ڕێگا تووشیان بوە، لە بەشێکی نامەکەیان دا، ئەڵێن:

«ئێمە بۆ چەکەکانمان و ڕاپەڕاندنی خەڵکی ناوچەکە بەرەو بادینان ئەچین و، جاری بڕیارمان داوە بێ چەکەکان پڕ چەک بکەین و خۆمان ساز بدەین. نامەمان ناردوە بۆ برایانی پارتی (مەبەستی دە دە کا دە بوە) و سوریا (مەبەستی بنکەی یەکێتی بوە لە سوریا) کە بە پەلە جێگا و شوێنی چەکەکانمان بۆ بنێرن و یەکێکی پارتی خۆی بێت و چاومان پێ یان بکەوێ بۆ تەنسیق کردنی ئیشوکارمان و، هەروەها دکتۆر کەمالی خۆشمان بێت بۆ هەمان مەبەست»

لە کۆتاییەکەی دا ئەڵێن:

«بە تێکڕایی وەزعی ناوچەکە و ئێمە زۆر زۆر باشە دڵتان نارەحەت نەبێ و گوێ مەدەنە پڕوپاگاندەی دوژمن. ئومێدمان وایە بە سەرکەوتووانە هەموو کارەکانی خۆمان ئەنجام ئەدەین و ئاگادارێشتان ئەکەینەوە. تکایە ئێوەش زۆر زۆر پەیوەندیمان پێوە بکەن بە هۆی کاک نوعمان و برایانی ترەوە»

بەمجۆرە سەرکردایەتی هێزەکە، پشت ئەستوور بە بەڵێنەکانی دە دە کا دە و، پشت ئەستوور بە بەڵێنەکانی ئیدریس، خۆی لە شەڕی قم لا ئەدا لەو ناوچەیەدا، کە زەمینەترین نوقتەیان بو، یا ڕاستتر خۆی لە شەڕی قم ئەدزێتەوە و لە ناوچەکە دوور ئەکەوێتەوە بەرەو قوڵایی تورکیا، بێ ئەوەی شارەزاییان هەبێ لە ناوچەکەدا و، ئاشناییان هەبێ لە گەڵ خەڵکی ناوچەکەدا، لە پێش خۆیانەوە بنکەیان هەبێ پێشڕەوی بۆ بکەن، یا لە پشتی خۆیانەوە بنکەیان هەبێ بۆی بکشێنەوە، بێ ئەوەی بنکەیەکی جەماوەریی سیاسییان لە ناو کوردەکانی تورکیادا هەبێ، بێ ئەوەی حساب بۆ خۆکۆکردنەوە و پەلاماردانی قم، یاخود بۆ «تدخل» ی هێزە چەکدارەکانی تورک و، پەلاماری میت یا خۆسازدانی عەشیرەتەکانی تورکیا بکەن.

قم هەڵیکی ئاشکرا و دیاری لە نێوان خۆی و یەکێتی دا کێشا بو و، هێزەکانی یەکێتی بە دوژمنێکی سەرسەخت دانا بو و، لە ناوبردنیانی کرد بوە ئەرکی یەکەمی

سەرشانی خۆی.

*

### قولایی تورکیا: کەوتنە ناو تەپکە

هەڕیکەوتنی هێزەکەی یەکێتی بەرەو قولایی تورکیا، پشت ئەستور بە بەڵێنەکانی «د. دە. کا. دە.» بە ناوی هێنانی چەکەوە، بێ ئەوەی بنکەیەکی پشتەکی یان بنکەیەکی پێشەوەیان هەبێ، بێ ئەوەی بزانن بۆ کوێ ئەڕۆن و، بەرەو کوێ ئەڕۆن و، بۆ لای کێ ئەچن، بێ ئەوەی لەوێ بنکەی سیاسی و جەماوەرییان هەبێ.. لە کاتێک دا کە ئەم بەشی هەرە زۆری عەشیرەت و خەڵکی دێهاتەکانی تورکیایان لە یەکێتی پڕ کرد بوو، کە گوایە:

- هێزەکانی یەکێتی ئەچنە دیوی تورکیا بۆ تۆڵە کردنەوەی ئەوانەی ساڵانی پێشو لێیان کوژراوە.

- گوایە هێزەکانی یەکێتی دێهاتەکانی تورکیا تالان ئەکەن و ئەسوتێنن، پیاوەکانیان ئەکوژن و، ئافرەتەکانیان بە دیل ئەگرن.

- هاتون بۆ بڵاوکردنەوەی بێ دینی و کافری و بەڕەڵایی و کۆمۆنیزم و.

- بە فیتی صەددام و بەعس ئەیانەوێ شۆڕشەکەی بارزانی تێک بدەن!

بەم درۆ و دەلەسانە ئەم خەڵکی ناهۆشیار و دواکەوتوی ناوچەکانی شەمزینان، گەوەر، چەلی، ئولودەرە.. یان هان دابو لە یەکێتی و، سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەکەش کە ژمارەیەکی زۆریان لە حیزبی «عەدالەت» و «سەلامەتی میللی» دا بون و، بە پێ ی ئامۆژگاری و فەرمانی «میت» ئەجولانەوە، کەوتنە خۆ و، هێزەکانی خۆیان کۆ کردەوە و ساز دا و پڕچەک کرد و، هەمو شوێنە گرنگ و ستراتیجیەکانیان گرت و، لە سەر ڕێگا و پرد و گەلی و دەربەند و بواری چەم و ڕوبارەکان، لە ناوچەیەکی یەکجار فراوان و بەرین دا، دامەزران، بۆ ڕێگە گرتن و لە ناوبردنی هێزەکەی یەکێتی.

جەنگی پارتیزانی بە تەنیا پشت ئەستور نیە بە بیروباوەڕ و، زاتی شۆڕشگێرانەی پێشمەرگەکان و، بە گیانی خۆبەختکردن و لە خۆبوران، یاخود بە لێوەشاوەیی و ئازایەتییان، بەڵکو بە شارەزایی پێشمەرگەکانیش لە هەوراز و نشێو و کون و قوژبنی ناوچەکەدا و، بە پەیوەندی باش و دۆستانەی پێشمەرگەکان لە گەڵ خەڵکی ناوچەکە. کۆمەڵانی خەڵک قەڵای لە شکان نەهاتوی پێشمەرگەن، زانیاری و دەنگوباسی بۆ کۆ ئەکەنەوە، ڕێگەی پیشان ئەدەن، خواردن و پێویستیەکانی تەئمین ئەکەن، ئەی شارنەوە، بریندار و نەخۆشەکانی تیمار ئەکەن و ئەیحەوێننەوە، پەیوەندی بۆ دروست ئەکەن لە گەڵ هێزەکانی تری دا، لە کاتی پێویستی دا چەکی بۆ هەڵئەگرن و بەرگری چەکدارانەی لێ

نەكەن. كاتێ كە خەڵكی ناوچەكە كەوتنە دوژمنایەتی پێشمەرگەكان و پێشمەرگەكان بێ بەش بون لە پشتیوانی و یارمەتی ئەوان، بە تایبەتی كە ئەشارەزا بون، وەكو ئەو ماسییەیان لێ دێ كە لە ئاو دەربهێنرێ و ئەكەوێتە وشكایییەوە و ئەخنكێ.

هێزەكەی یەكیتی بێ بەش بو لە یارمەتی و پشتیوانی خەڵكی ناوچەكە. ئەو زانیارییانەی كە دە دە كا دە دایری بە سەركردایەتی هێزەكە ناراست بون و، دە دە كا دە بێ خۆی هیچ هێز و نفوزێكی كاریگەری لە ناو عەشیرەتەكانی ناوچەكەدا نەبو و، نەیتوانی یاخود نەیویست هیچ جورە هاوكارییەكی كەم یا زور لە گەڵ هێزەكەدا بكات، بەڵكو بە پێچەوانەوە هەندێ جار بە پێشكەش كردنی زانیاری و حسابی ناراست، سەری لە هێزەكە ئەشێواند و چەواشەی ئەكرد.

سەرەڕای ئەمانە هەموی، سەركردایەتی هێزەكە خۆیشی چەندین هەڵەی جەنگیی گەورەی كرد، لە پێش هەمویانەوە بە جێ هێشتنی ناوچەی برادوست و، دور كەوتنەوەی لە خەڵكی كوردستانی عێراق و، ملنانی بەرەو ناو قوڵایی توركیا، واتە بەرەو ناو ئەو تەڵەكە گەورەیەی بو نرا بوە.

سەركردایەتی هێزەكە، هەروەكو لە باری ستراتیجییەوە توشی هەڵەیەكی كوشندە ببو، هەروەها لە باری تاكتیكی یشەوە وەكو پێویست هێزەكەی خۆی رێك ئەخست و دائەمەزراند.

سەركردایەتی هێزەكە لە باتی ئەوەی هێزەكانی بەش بەش بكات بە سەر چەند ناوچەی فراوان دا و، لە مەیدانێكی بەربڵاودا دایان بمەزرێنێ و بیان جولێنێ، هێزەكانی خۆی هەموی بە كومەڵ و پێكەوە بە یەك رێگادا و لە یەك كات دا و بو یەك شوێن خستە رێ، وە هەر لە یەك ناوچەش دا، یا راستتر، لە یەك دوڵ دا مۆڵی دان. ئەمە هەلی دەس دوژمن خست كە بە چاكی «تەركیمز» ی بكاتە سەر. دەنگوباسەكانی بە وردی كۆ بكاتەوە و بزانێ، هەمو هێزەكانی خۆی لە سەر كۆ بكاتەوە و، «بالادەستییەكی ژمارەیی» بە دی بهێنێ و، دەوری هێزەكانی یەكیتی لە مەیدانێكی تەسك و سەخت دا بگرێ و، بیخزێنێتە كونێكی تەنگەبەری شەر و بەرگری و دەرباز بونەوە. لە كاتێك دا كە ئەگەر سەركردایەتی هێزەكە، هێزەكانی خۆی بەش بەش بكردایە و، لە چەند شوێنی جیاواز و دور لە یەكتری دا دای بمەزراندایە، مەیدانی شەر فراوان و بەرین ئەبو، بەو پێ بە دوژمنیش ئەبوایە لە چەند لایەكەوە پەلاماری بدایە هێزەكانی خۆی پەرت و بڵاو بكردایەتەوە بە ناوچەیەكی فراوان دا و، لە چەند قوڵەوە خەریك بوایە.

سەركردایەتی هێزەكە شوێنێكی دیاریكراوی هەڵنەبژارد بو، كە لە كاتی شەردا،

ڕووی تێ بکا، یا تەنانەت لە کاتی ڕۆیشتن دا بوی بچی، بەڵکو هەروا لە خۆیەوە ڕێ ی کەوت بوە ئەوی و، لە ناوچەی چولەمێرگ دا ئەخولایەوە، بێ ئامانجێکی دیاریکراو ملی ڕێ ی گرت بو. هەر لە بەر ئەوە لە کاتی لێکەوتەمان و کشانەوە و لە یەک دابڕان دا نە پێشمەرگەکان و نە فەرماندەکانیان ئەیان ئەزانی ڕو لە کوێ بکەن و بۆ کوێ بچن، بەڵکو هەر ئەوەندەیان پێ وت بون کە پێویستە نەگەڕێنەوە بۆ دواوە بەڵکو بەرەو پێشەوە بڕون، واتە بەرەو زیاتر قوڵایی تورکیا. سەرکردایەتی هێزەکە، بەوەی کە چوە ناو تورکیاوە، ئیتر بە یەکجاری و بە تەواوی خۆی دابڕی لە هێزەکانی تری یەکێتی، کە کەوت بونە ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکوکەوە.

ئەم هێــزە بە کـــۆمـــەڵ پێکەوە بەرەو ناو قــوڵایی تورکـیــا ڕێچکەی بەست بو، هەفتەیەک زیاتر بە ناوچەیەکی سەخت و شاخاوی کوردستانی تورکیا دا، بە بێ وچان گـرتن و پشـودان، ڕۆیشتن تا گـەیشـتنە ناوچەی «ژێرکی» کـە یەکـێکە لە هۆزەکـانی عەشیرەتی گەورەی «هەرتوشی». لە نزیک گوندی پچوکی «بازی» لە دۆڵێک دا بارگە و بنەی خست. سەرکردایەتی هێزەکە کە بە قسە و بەڵێنەکانی ئیدریس فریوی خوارد بو، کە گوایە چەکدارەکانی ئەم ناوچە سەریان، لە بەر ئەوە پشتیان لێ کرد بوەوە، بە بێ ئەوەی ئەخشەیەکی ورد دابنێن بۆ خۆپاراستن و بەرگری، بێ خەم کەوتنە پشودان و حەسانەوە.

دوژمنانی هێزەکەی یەکێتی لەم ماوەیەدا بە ناوی کڕین و فرۆشتنەوە چەندین کەسیان ناردە ناویان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویست لە سەریان، هەر لەو ماوەیەدا یەکێک لە مەفرەزەکانی هێزەکە، کە دەستەی پاراستنی تایبەتی عەلی والی بون، بە دزییەوە رایان کرد و چونە ناو ئەم موە، زانیاری پێویستیان لە سەر هێزەکە و سەرکردە و لێپرسراوەکانی و، ژمارەی چەکدار و بێ چەکەکانی و، باری گشتی هێزەکەیان دا بە ئەم. ئەمەش خۆی لە خۆی دا، لە لایەکەوە خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بە ئەم کرد و، لە لایەکی ترەوە زەرەرێکی زلی هەم لە باری مەعنەوی و هەم لە باری دەرچونی نهێنیەکانی هێزەکانییەوە گەیاند بە یەکێتی.

لەم ماوەیەدا هێزەکانی یەکێتی بە هۆی خزرەتاندن و ڕێ ڕۆیشتنی دووردرێژ و ئەشارەزایی و پشوئەدان و سەرما و برسێتی و نائەمینیەوە، بە تەواوی ماندو و بێزار و وەڕس بوبون.. لە کاتێک دا ئەم سودێکی زۆری لەو ماوەیە وەرگرت بو بۆ کۆکردنەوە و ڕێکخستن و سازدانی هێزە چەکدارەکانی خۆی و عەشیرەتەکانی ناوچەکە و، دانانی پلانی پەلاماردانی هێزەکانی یەکێتی.

*

### شەڕی بازێ

لە ئێوارەی ٧٦/٦/١ دا هەندێ لە پێشمەرگەکان جموجوڵی چەند چەکدارێکیان بە شاخ و لوتکەی چیاکانی دەوروپشتیانەوە بە دی کرد و، سەرکردایەتی هێزەکەیان ئاگادار کرد. سەرکردایەتی هێزەکەش دەستبەجێ کەوتە خۆی و، هێزەکانی سەر خستە هەردوو بەری دۆڵەکە و، بە شاخەکەدا بەرەوژوور هەڵگەڕان و دامەزران. تەقە دەستی پێ کرد. بەڵام دیسانەوە هێزەکە بە جۆرێکی وا دامەزرا و دابەش بو کە خۆی دابڕی لە سەرچاوەی ئاو و ڕێگای گەیشتنی خواردن.

ئێوارەی ڕۆژی ٦/١ و شەوەکەی و ڕۆژی دواییتر شەڕ درێژەی کێشا، برسێتی و تینوێتی و سەرما و درێژە کێشانی چەند ڕۆژەی شەڕ، تەنگی بە هێزەکە هەڵچنی بو. هەرچەندە بە گشتی ڕەوتی شەڕەکە بە قازانجی هێزەکانی یەکێتی بو و، لەو شەڕانەدا هێزەکانی قم نەیان توانی بو باڵادەستی بە دەس بهێنن و، لە ڕۆژی یەکەمی شەڕەکەدا تەنیا فەرماندەی کەرت، شەهیدان گێچەنەیی و، ڕۆژی دوەم فەرماندەی کەرت، حەمەمینی خەلیفە قادر و، فەرماندەی مەفرەزە، خدری کامەلای باڵەیی و ٢ پێشمەرگەی تر کوژران و، چەندێکیش بریندار بون. هێزەکانی قم و عەشیرەتەکان زیاتریان لێ کوژرا و، یەکێ لە فەرماندە ناسراوەکانیان بە ناوی مەلامینی بارزانی کوژرا و، سەنگەرەکەی گیراو، ١٢ کەسیان لێ بە دیل گیرا.

ژمارەیەکی زۆر کەم چەکداری قم لەم شەڕەدا بەشدار بون، هێزی سەرەکی شەڕەکە بریتی بو لە چەکدارەکانی عەشیرەتەکانی: پنیانش بە سەرۆکایەتی ماجیدی ئەحمەد بەگی چەلی، نورەماری بە سەرۆکایەتی فاضل شوکری ئاغا، پیروزی بە سەرۆکایەتی کورانی مەلا مەحمود، دۆسکی بە سەرۆکایەتی حاجی صالح ئاغا.. و چەند وردە عەشیرەتێکی کەی کوردستانی تورکیا.

بۆ خۆ دەرباز کردن لە برسێتی و تینوێتی و، سەبارەت بە پێویستی جێگۆڕکێ ی هێزەکە و، بۆ ئەوەی نەتوانن هێزی زۆرتریان لە سەر کۆ بکەنەوە و ئەوقی ئابڵوقەکە سەختتر و تەنگتر بکەن و، لە ترسی ئەوەی نەوەکو هێزی تورک بەشداری شەڕ بن، سەرکردایەتی هێزەکە بڕیاری کشانەوەی دا.

لەو کاتەدا سەرانسەری ناوچەکانی شەمزینان، یوکسەکوا، چەلورجە، بەیتوشەباب، نورەمار، ئولودەرە کە چەندین بنکەی ئوردوی تورک و چەندین قەرەقوڵی جەندرمەی لێ بو و، بەسەدان کیلومەتر درێژایی و پانایی بو، بو بە مەیدانی ئەراتین و هاتوچوی ئازادی چەکدار و لێپرسراوەکانی قم و شوێنی کۆبونەوە و لەشکرکێشی عەشیرەتە کوردەکانی

هەکاری. تەنانەت لێپرسراو و پێشمەرگەکانی یەکێتی کە لەلایەن عەشیرەتەکانی تورکیاوە ئەگیران هەمویان تەسلیمی ئێمە ئەکران، بێگومان، ئەمەش هەمووی لە ئەنجامی «هاودەردی نەتەوەیی» ئەم عەشیرەتانە نەبو لەگەڵ ئێمە. بارەگاکانی ئێمە، شوێنی ئێستگەی رادیو و دەزگای چاپ، شوێنی زیندانی دیلەکانی شەڕەکە هەمو لەسەر ئەرزی تورکیا بو، هاتوچوی لێپرسراوەکانی ئێمە بۆ ئێران و سوریا و ئەوروپاش هەر بە ناو تورکیادا بو.

چاوپۆشی تورک لە جموجوڵی چەکداری ئێمە و، هاوکاری عەشیرەتە کوردەکانی تورکیا لە گەڵی، پێشینەی هەبو. لە مانگی تشرینی یەکەمی ٧٧ یش دا لەکاتێک دا کاروانێکی یەکێتی بە کوێستانێکی هەکاری دا تێ ئەپەڕی، ئێمە بە هاوکاری چەکدارەکانی عەشیرەتی «باوی» بوسەیەکیان بۆ دانان، ١٢ کەسیان لە پارێزەرانی کاروانەکە کوشت و ١٤ کەسیان لێ گرتن، دەستیان گرت بەسەر چەکەکان دا بۆ خۆیان، لاشەی کوژراوەکانیان لە مەیدانی شەڕەکەدا بەجێ هێشت. داوودەزگاکانی تورک لاشەی کوژراوەکانیان کۆ کردەوە. ئەگەرچی ڕۆژنامەکانی تورکیا هەواڵی ئەم پێکدادانەیان بڵاوکردەوە کە لە قوڵایی تورکیادا قەومابو، بەڵام کاربەدەستانی تورک گوێ ی خۆیان لێ خەواند.

*

کشانەوە و، لەتوپەت بون

کشانەوە لە هەلومەرجێکی سەختی وەهادا، بە هێزێکی ماندو و برسی و تینو و کەم ئومێد و کەم وورە و، نەشارەزای دور لە بنکەکانی خۆی و، بۆ شوێنێکی نەزانراو و تاقی نەکراوە، کارێکی یەکجار دژوار و زەحمەت و ئالۆزە.

«کشانەوەی ڕێکوپێک» بۆ ئەوەی جیا بکرێتەوە لە «هەڵاتنی ناڕێکوپێک»، پێویستی بە ڕێکخستنێکی ورد و وورەیەکی بەرز و باوەڕێکی بەهێز و دیسپلینێکی پۆلایین و شارەزاییەکی باش و، سەرکردایەتیەکی زیر و لێوەشاوە هەیە.

سەرکردایەتی هێزەکە بڕیاری کشانەوەی دا و، بۆ ئەو مەبەستە کەوتە خۆ ئامادە کردن و خۆسازدان، هێزەکانی ڕێک خستەوە و، دابەشی کردن بە سەر چەند «ڕەتل»ێک دا، کە هەندێکیان لە پێشەوە بڕون و، ئەوانی تر بە دوایان دا، هەروەها هێزێکیشی تەرخان کرد بۆ پاراستنی پشتەوەی هێزەکان لە پەلاماری دوژمن و، داپۆشینی کشانەوەکە. «ئیتیجاه»ی کشانەوەکەشی دیاری کرد، بەڵام چونکە شارەزای ناوچەکە نەبون، هەروا بە شاخەکانی دەوروپشتی خۆیان دا نیشانەیان کرد و، ئاگاداری فەرماندەی ڕەتلەکانی کرد.

لێرەدا، سەرکردایەتی هێزەکە، هەڵەیەکی تری کرد لە دیاریکردنی «ئیتیجاه»ی کشانەوەکەدا کە چارەنوسی هەمو هێزەکەی بڕیار دا و، لە ناوی برد، بەوەی لە باتی ئەوەی

بڕیاری کشانەوە بدات بۆ دواوە بەرەو عێراق، بەرەو ئەو ناوچانەی لێ ی شارەزان و ناسین و ناسیاویان هەیە، دیسان بڕیاری بەرەو پێشەوە چون، واتە بەرەو قولایی زیاتری تورکیایان دا، بە تەمای ئەوەی لە سنوری سوریا نزیک بکەونەوە، بێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکیان لەو ناوچەیەدا هەبێ، یاخود پێشتر تاقییان کردبێتەوە.

لە تاریکایی شەوی ٢-٧٨/٦/٣ دا ڕەتلەکان دەستیان کرد بە جولان بە نیازی کشانەوە. بەلام هەر کە هێزەکان گەیشتنە سەر ئەو چەمەی ئەبو لێ ی بپەڕنەوە، لە بەر لێنوبەتی بەشی هەرە زۆری پێشمەرگەکان کەوتنە تێکدانی ڕیزەکەیان بۆ ئاو خواردنەوە. بەو جورە ڕیزی پێشمەرگەکان و ڕیزی ڕەتلەکان تێک چو، هەندی لە تاقمەکان پێش کەوتن و هەندێکیان لە بەر تاریکی و نەشارەزایی و پەرێستی بێ دەنگ بون، لە یەکتری گوم بون. لە کاتێک دا هەندێ لە ڕەتلەکانی پێشەوە تێپەڕی بون، بۆسەیەکی بچوکی قم لەو نزیکانە بە جموجولی هێزەکەی زانی و، چەند تەقەیەکی کەمی کرد.

ئەم چەند تەقەیە بو بە هۆی تێکچونی تەواوەتی شیرازەی ڕێکخستنی ڕەتلەکان. پێشمەرگەکان پەرش و بلاو بونەوە لەو ناوچەیەدا، تاریکایی شەو و نەشارەزایی و ماندویەتی و پەک کەوتن، هێزەکانی لەتوپەت کرد و، سەرکردایەتی هێزەکە نەیتوانی سەیتەرەی بە سەر دا بکاتەوە. بەمجورە هێزەکە کە بە درێژایی ئەو ڕێگا دورودرێژە هەمو پێکەوە بون و، لە یەکتری دانەبرا بون، لەم کاتەدا کە پێکەوە بون و پێکەوە ڕویشتن لە هەمو کاتێکی کە پێویستتر بو و، ئەبوایە لە یەکتری دانەبڕێن، کەچی پارچە پارچە بون و، هەر پارچەیەکی کەوتە لایەکەوە.

کە دنیا روناک بوەوە هێزەکە بە تاریکوپیکی بوبوە ٣ بەش:

بەشی یەکەمیان، ئەوانەی بە «ئیتجاە» ی دیاریکراوی کشانەوەکەدا ڕویشت بون و، لە شوێنی تەقەکان دەرباز بوبون.

بەشی دوەمیان، ئەوانەی بە «ئیتیجاە» ی پێچەوانەی «ئیتیجاە» ی دیاریکراوی کشانەوەکەدا، بەرەو لای سنوری عێراق دەرباز بوبون.

بەشی سێیەمیان، ئەو هێزە بو، بۆ پاراستنی پشتەوەی ڕەتلەکان و داپۆشینی کشانەوەکە مابوەوە، لە گەل ئەو کەس و تاقمانەی لە دەورووبەری شەرگەی ڕۆژانی پێشوتر و سەرچەم و نزیک گوندەکە بە جێ مابون و، بە پچر پچری بێ ئەوەی هیچیان ئاگای لەوی تریان بێ پەرەوازە بوبون.

بەشی یەکەم، خوی ڕێک خستەوە و دامەزرا، بە هیوای گەیشتنی پاشماوەی هێزەکە.

بەشی دووەم، ترسەمی هەندێ لە فەرماندەی رەتڵەکانی پێشتر تەگبیریان کردوە کە بەرەو نزیکترین نوقتەی عیراق بگەرێنەوە و، تەسلیم ببنەوە بە عیراق، بۆیە ڕێگەیان لە رەتڵەکانیان گۆڕی بوو.

بەشی سێیەم، هەر ئەو ڕۆژە دانە دانە و بە کۆمەڵ، لە لایەن قەو و عەشیرەتەکانی ناوچەکەوە، گیران و چەک کران.

لە ناو ئەوانەدا کە گیرا بوون: عەلی عەسکەری، تاهیری عەلی والی، سەید کاکە، قادری مامەند ئاغا و، دەیان فەرماندەی کەرت و مەفرەزەیان تێ دا بوو. بە دیل گیرانی فەرماندەی هێزەکە، خۆی لە خۆی دا گورزێکی کوشندە بوو لە هێزەکە کەوت و، یەکێ بوو لەو هۆیانەی دوژمنی هارتر کرد بۆ پەلاماردان و ڕاونانی پاشماوەی هێزەکە.

لە ناو ئەوانەش دا، کە بەرەو عیراق چوو بوونەوە و تەسلیم بوونەوە: تالیب ڕۆستەم، شێخ جەوادی بیدەری، عەولا سوور، کوێخا قادری زەوەی، حەمەدی بایز، بەکر پیروت.. یان تێ دا بوو. بە هەمویان ١٧٦ کەس بوون و ١١٧ چەکیان پێ بوو.

*

خڕبوونەوەی پاشماوەی هێزەکە

ئەو هێزەی بە پچڕپچڕی لە شەڕی بازێ دەرباز بوبوو، ڕۆژی دواییتر پاش ئەوەی یەکی گرتەوە، هەر لە هەمان ناوچەدا مابوەوە، بە هیوای گەیشتنی پاشماوەی هێزەکە. بە هەمویان ١٧٠ کەسی چەکدار و بێ چەک بوون، لەوانە: خالید سەعید، حسێن بابە شێخ، عومەری حاجی عەبدوللا، ئازاد هەورامی، ڕەئوف مستەفا، مەحمود عەبدولڕەحمان، حامیدی حاجی غالی، عەلی ئەحمەد شیعە. لە پاش چاوەڕوانییەکی نائومێدانە کەوتە ڕێ بەرەو گوندی «کەعن» لە نزیک شاری «جولەمێرگ»، ناوەندی ویلایەتی «هەکاری».

ئەم هێزە، نەیئەزانی پاشماوەی هێزەکەیان چی لێ بە سەر هاتوە. لە ڕاستی دا ئەو دە کا دووریکی خراپی هەبوو لە چەواشە کردنی سەرکردایەتی ئەم هێزە و، سەر لێ تێکدانی مەکتەبی سیاسی دا، چونکە لە باتی ئەوەی زانیاری ڕاست دەربارەی لە ناو چوونی پاشماوەی هێزەکە بە خالید سەعید و هاوڕێکانی بلێ و، دەنگوباسی ڕاست بۆ ئەیمەش بنێری، وای ئاگادار هەردولایان کرد کە: عەلی عەسکەری و زیاتر لە ٢٠٠ پێشمەرگە چونەتە دیوی عیراق و، لە نزیک «نیروە» بنکەیان داناوە.

لە نامەیەک دا کە ڕۆژی ١٠/٦/٧٨ لە ناوچەی ژێرکەیەوە، خالید سەعید، حسێن بابە شێخ، عومەر عەبدوللا نوسیویانە، دوای باس کردنی شەڕی بازێ و، کشانەوەیان نوسیویانە، ئەڵێن:

«.. شەو کە لە چیا هاتینە خواری نزیک گوندی بازێ تووشی کەمینێکی جاشەکان بوین و تەقەیان لی کردین، وەکو بومان باس کردن ئیمە نەشارەزا بوین لەو شەوەوە بوین بە دو قوەتەوە و لە یەکتری بر بوین. ئەمرو برادەرانی پ ش م (میمستی دە دە کا دە یە) ئاگاداریان کردین بە نوسراو، گەوا کاک عەلی عەسکەری نوسراوی بۆ ئەوان نوسیوە کە بە خوی قوەتەکەی لە گەلی دایە، بەرەو ئەتریش لە ناوچەی عەمادیە چون و. حالیان زور باشە»

لە بەشێکی تری نامەکەیان دا نوسیویانە:

«ئیمە هەر لە سەر ئیشوکارەکانی خومان بەردەوام ئەبین دوای ئەوەی کە وەجبەی چەکەکانمان دەس کەوت بەرەو بادینان ئەڕوین کە لەو ناوچانەدا وەکو ئاگادار کراوین چەکداری خومانی لێ یە: بەیتوشەباب و ئورلودەرە»

لە پاش ئەم شکستە سەختەی بە سەر هیزەکانی یەکیتی دا هات، ئەگەر تا ئەو کاتە هەندی لە عەشیرەتەکانی کوردستانی تورکیا دودڵ بون لە بەشدار بون لەو شەرەدا، کە لە بەینی یەکیتی و قم دا بو. وە خویان مات کرد بو سەیری ئەنجامی شەرەکەیان ئەکرد، لە دوای ئەوە ئیتر دەمیان چیشکە بر بو، هەمویان کەوتنە خۆ بۆ راونانی پاشماوەی هیزەکە بەو پەری دڕی و دڕندایەتیەوە، هیچ نەبی بۆ تالان کردن و روت کردنەوەیان لە چەک و پارە و سەعات، هەندی جار لە پیلاو و جلوبەرگ.

هیزەکە چەند روژیک لە کەمی مایەوە بۆ ئەوەی خوی ریک بخاتەوە و ریوشوینی رویشتنی دابنیت و پەیوەندی لە گەڵ دوستەکانی نوی بکاتەوە.

لەم ماوەیەدا هەروەکو هیزەکەی یەکیتی حەسایەوە و پشوی دا و خوی ریک خستەوە، لە هەمان کات دا هەمو عەشیرەتەکانی ناوچەکەش خویان ساز دابو و، سەرانسەری ناوچەکەیان گرت بو. تەنانەت هەوالنیرەکانی تورک لەو وتار و هەوالانەدا کە بەم بونەیەوە لەو روژانەدا ئەیان نوسی، هەروەکو دانیان پیدا ئەنا کەوا ئەم هیزە بە نەخشەیەکی زیرەکانە دەرباز بوە، بەلام لە هەمان کات دا بە دلنیاییەوە ئەیانوت ئەم هیزە هەلی دەرباز بونی نیە، چونکە ئەیانزانی میت و دوژمنەکانی چ تەپکەیەکیان بو لە ناوبردنی ریک خستوە.

میت و عەشیرەتەکانی ناوچەکە و قم، زوریان هینا بو خەلکی کەمی و ناوچەکە، کە ئەوانیش تیرەیەک بون لە هوزی ژیرکی، هیزەکەی یەکیتی لەوی دەربکەن، ئەوانیش، بو ئەوەی تووشی شەر و پەلامار نەبن داوایان لە هیزەکەی یەکیتی کرد ناوچەکەیان بە جی بهیلی.

ڕۆژی ٧٨/٦/٩ د. کەمال خۆشناو و سالار گەیشتنە شاری وان و، لە گەڵ چەند کەسی لە سەرکردەکانی دە دە کا دە کۆبوونەوە بۆ باسی وەزعی هێزەکە و، داتانی ڕێوشوێنی دەربازکردنیان.

کەماڵ و سالار داوایان لە سەرانی دە دە کا کرد بۆ: ڕێوشوێنی گەڕاندنەوەی هێزەکە بۆ ناوچەی شەمزینان - برادۆست دابین بکەن و، ئەلیمن ئەوە باشترین و گەورەترین یارمەتی یەکێتیە.

بەڵام سەرانی دە دە کا دە پێ لە سەر ئەوە داتەگرن کە:

ڕێگاکانی شەمزینان بەرەو برادۆست هەمویان گیراون و، لەوێوە ساوەی دەرباز بونیان نیە.

خۆیان زۆریان بیر کردۆتەوە لە چۆنیەتی دەرباز کردنی هێزەکە، هیچ ڕێگایەکی تر نیە جگە لەوەی خۆیان تەگبیریان کردوە:

- پەیوەندییان لە گەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەکە کردوە و، بەڵێنیان لێ وەرگرتون شەر بە هێزەکانی یەکێتی نەفرۆشن و ڕێگەیان لێ نەگرن.

- ڕێگەیان بۆ ناوچەی تولودەرە - زاخۆ بۆ ناو عەشیرەتی گزیی، کە دوستی ئەوانن تەئمین کردوە و، خۆیان تاقییان کردۆتەوە کە سەلامەتە.

- چەند کەسێکی «گزیی» یان پەیدا کردوە کە بۆ ڕێبەری و ڕێ پیشاندان لە گەڵ هێزەکە بن، تا ئەیان گەیێنە ناوچەکە.

سالار لە گەڵ چەند کەسێکی دە دە کا دە ئەچی بۆ ناوچەی تولودەرە بۆ ئامادە کردنی مەطرەزەی گزییەکان بۆ پێشپەرەوە پۆلی هێزەکە و، د. کەمالیش لە گەڵ چەند کەسێکی کەیان ئەچی بۆ سەردانی هێزەکەو نزیک گوندی کەهی. شەوی ٧٨/٦/١٦ ئەگەنە لایان، هەندی چەک و فیشەک و پارە بڵاوکراوەکانیان بۆ ئەبەن.

لێپرسراوەکەی دە دە کا دە بە دڵنیاییەوە ئاگاداری خالید سەعید و هاوڕێکانی ئەکا کە تا ئەگەنە ناوچەی عەشیرەتی گزیی توشی شەر و نارەحەتی نابن، بە تایبەتی چونکە قسەیان لە گەڵ هەمو عەشیرەتەکانی ناوچەکە و، گوندەکانی سەر ڕێگا کردوە و، بەڵێنیان لێ وەرگرتون کە دەس نەخەنە ڕێگایان، جگە لەمەش چەند دەلیلێکی گزییان لە گەڵە و هێزێکی گزیی چاوەڕێیان ئەکات و، «عەشیرەت شەری عەشیرەت ناکات!».

هەروەها دڵنیای کرد بون لەوەی کە عەلی عەسکەری و هێزێکی تر بە سەلامەتی گەیشتونەتە کوردستانی عیراق و، لە سەر سنور بارەگایان داناوە.

د. کەمال و لێپرسراوەکەی دە دە کا دە هێزەکە بە جێ ئەهێڵن و، هێزەکەش

ئەکەوێتە خۆی کە ڕۆژی دوایی بەرەو ناوچەی گزیی بە ڕێ بکەوێ.
پەیامنێرێکی تورک لە کۆمێنتارێک دا کە بۆ ژمارەی ١٧-٧٨/٦/٢٣ ی گۆڤاری «الوطن العربی» سەر بە عێراقی ناردبو، نوسیویتی:
«کاربەدەستانی تورک هەڵوێستی تەماشاکەری ورپایان گرتوە لە ناکۆکی خوێناوی نێوان تائیفە کوردیەکان دا لە ناوچەی هەکاری....
ئەگەر کاربەدەستانی تورک هیچ پێژارەیەک دەرنابڕن لەوەی ڕو ئەدا، لەبەر ئەوەیە چونکە مەیدانی پێکدادانەکانی ناوچە کوردیەکان ئابلوقەدراوە بەرپوشینی سوپایی تورکی بە جورێک کە ناهێلی ڕەنگدانەوەی سیاسی لە ناو سنوری تورکیا یا دەرەوەی دا هەبێ ..
دوا ڕاپورتی گەیشتوتە ئەنقەرە واتەگەیەنی لەوە ناچی تائیفەکەی خالید سەعید بەخت یاری بێ و، لەوە ناچی بتوانی لە سنور بپەڕێتەوە بۆ ئەوەی خۆی بدا بە دەست عێراقەوە تاکو لە ناو نەچێ...
سەیرکەو ئیحتیاتی خوت وەربگرە! ئەمە ئەو سەرەتا کردەوەییەیە کاربەدەستانی تورک گرتویانە بەرامبەر ناکۆکی ناوخۆی کوردی بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی کوردی دا بیهێلنەوە، بە شێوەیەک کە ڕێگەی نەدا ببێتە هۆی هیچ ئیجراائاتێک بۆ پەیوەندیەکانی دەرەوەی تورکیا، هەروەکو ناشهێلی ڕەنگدانەوەی سیاسی ناو دەوڵەتانی هەبێ لە ناوچەکانی کەمایەتی کوردا لە تورکیا»

*

لە ناو چونی یەکجاری

ئەم هێزە، دوای ئەوەی حەسایەوە و، هەندێ چەک و تەقەمەنی و خۆراک و بارەی پێ گەیشت، ئەیتوانی لە تەوقی ئابلوقەدان ڕزگاری ببێ و بگەڕێتەوە ناوچەی ٣ سنور، بۆ ئەم مەبەستە ئەیتوانی کەلک لە ئوتومبیل و تراکتور وەربگری بۆ ئەوەی بە زویی لە ناوچەی دوژمن دەربچێ، بەڵام بە پێ ی ئەگبیرەکەی ده ده کیا ده کەوتنە ڕێ و، مەلا محمودی گزیی و، چەند کەسێکی کە، کەوتنە پێشیان.
هێزەکە هەر کە بە ڕێ کەوت، کەوتە ناو چەند عەشیرەتی تەیار و کۆزکەوە، چەند ڕوژ بۆ خۆیان ئامادە کرد بۆ بۆ لێدانی. هێزەکە ئەگەرچی هەوڵی زوری دا لە گەڵ عەشیرەتەکان توشی شەڕ و پێکادان نەبێ و، بۆ ئەو مەبەستە چەند جاری ڕێگەی گوری و، ڕێگەی زور سەخت و دژواری گرت و، چەند جاری «قاسید» ی ناردە لایان و، ٨ کەسی لە مام خوران بە بارمتە گرت، بەڵام هەر سودی نەبو، چونکە عەشیرەتەکان لە هەمو لایەکەوە بۆ لە ناوبردنی بە خۆ کەوت بون و، بڕیان دامەزرا بون.

شەوەکی ڕۆژی ۷۸/٦/۱۹ لە کاتێک دا بە دەربەندێک دا تێ ئەپەڕین، کەوتنە بۆسەیەکی گەورەی سەدان چەکداری عەشیرەتەکانی: ژیرکی، مام خوران، زیوکیان، کۆچەر، سیمیرتی و، گیتە.. کە شیخمەوس کەرطان دای نابو. لەم شەڕەدا کە چەند سەعاتێکی خایاند، دەیان پێشمەرگەی دلێر و ئازا شەهید بون و، چەند پێشمەرگەیەکیش بە بریندار بە جی مان لەوانە: رەوطی مستەفا بەگ و، دەیان فەرماندەی پێشمەرگە بە دیلی کەوتنە دەس چەکدارەکانی ژیرکی، لەوانە: خالید سەعید، حسین بابە شیخ، عومەر عەبدوللا، ئازاد هەورامی، مەحمود عەبدولرحمان، عەلی شیمە، حامیدی حاجی عالی، فوئاد عومەر... پاش چەند ڕۆژێ، تەسلیمی قم یان کردن.

بەمجورە دوایەشی هیزەکە لە ناو چو.

لە مانگی مایس دا «ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورک» بو لیکۆلینەوەی دو مەسەلە کۆبونەوە: یەکێکیان، مەسەلەی کورد. ئەوی تریان، مەسەلەی زۆربونی کوژران لە تورکیا لە ئەنجامی پیکادانی سیاسی دا.

لە سەرەتای مانگی حوزەیران دا وەفدێکی عیراقی بە ناوی گفتوگوی بازرگانیەوە دەربارەی فەرزی نەوت سەردانی ئەنقەرەی کرد.

هەر لە مانگی حوزەیران دا، وەکو ژمارەی ڕۆژانی ۲٤-۷۸/٦/۳۰ حەفتەنامەی پاریسی «الوطن العربي» نوسی بوی: جەنەراڵ کنعان ئەفرین، سەروکی هەیئەتی ئەرکان، لە گەڵ فەرماندەی هیزی زەمینی و، فەرماندەی جەندرمە و، چەند گەورە ئەفسەری میت، سەردانی کەرتەکانی فەیلەقی ۳ ی ئوردوی کرد لە کوردستان و، هەر لەو ماوەیەدا سەروکی وەزیرانیش، بولەند ئەجەوید، سەردانی هەکاری کرد. لە سەردەمی دامەزراندنی جمهوریەتی تورکیاوە، ئەمە یەکەمین جار بو، سەروکی وەزیران سەردانی ئەم ناوچەیە بکات و، لە وتاریک دا داوای لە دەولەتانی دراوسی کرد: کە هاوکاری بکەن بو گەشە پی دانی ناوچەکە و، چەسپاندنی ئاسایش.

لە ۲۰ حوزەیران دا، واتە ئەو ڕۆژەی دوایین پیکادان قەوما، وەزیری کاروباری ناوخوی تورکیا عیرفان ئوزایدنیلی رایگەیاند کە هیزەکانی تورک لاشەی ۱۲ کەسی دوزیوەتەوە کەلە شەری ۱ی حوزەیران دا کوژراون. هەروەها وتی: «هیزەکانی عیراق لە هیرشەکانیان دا دژی کورد، لەجاریک زیاتر لە سنور تی پەڕیون» و، بەلێنی دا لە پاشەروژدا «سنوری تورکیا بە چاکی بپاریزن و نەهیلن پشیوی لە دەرەوەی سنوری ئەوانەوە بیتە ناو تورکیاوە».

لەم کەین و بەینەدا ئەگەر تورکیا بەرەسمی و راستەوخوش بارمەتی قم ی نەدابی

دژی یەکێتی، ئەوا چاوپۆشی ئەنقەستی لێ کردبو کە ناوچە سنوریەکانی تورکیا بکاتە مەیدانی بەرێوەبردنی چالاکی عەسکەری و سیاسی و ئیعلامی خۆی، ئەگینا تورک ئەیتوانی کونترۆلی ناوچەکە بکا و ئەهیلی قم کەلک لە قەلەمڕەوی ئەوان وەربگری و، عەشیرەتە کوردەکانی تورکیا بەشداری شەڕ بکەن بە قازانجی قم.

چەند ڕۆژنامەنوسێکی تورک چون بو بینینی گیراوەکانی یەکێتی و، گفتوگۆیان لە گەڵ کردن. مامجەلالیش نامەیەکی بۆ ئەجەوید نارد، دەربارەی گیرانی سەرکردەکانی یەکێتی لە ناو خاکی تورکیادا، «ڕێگای ئازادی» هاوتای کرمانجی «ئوزگوریرلک یولو» نامەکەی بلاو کردەوە. ئەجەوید، نامەکەی پشت گوێ خست.

چاوپۆشی ئەنقەرە، بەتایبەتی دەزگاکانی میت و جەندرمە و ئوردو، لەچالاکی قم ئەگەڕێتەوە بو چەند هویەک:

١. تەجرەبەی پێشوی پارتی عێراق لە ڕەفتاری دا لەگەڵ بزوتنەوەی کوردی تورکیا، دەری خستبو کە زیانی بو حکومەتی تورکیا نیە، چونکە پارتی مەسەلەی خۆی بەسەرەکی دائەنێ و کە ڕەفتاری لەگەڵ بزوتنەوەی پارچەکانی تر ئەکرد بو خزمەتی خۆی و بەهێزکردنی هەلویستی خوی بو، نەک بو هاندان و یارمەتیدانیان دژی حکومەتی مەرکەزی خۆیان. بە پێچەوانەی یەکێتی کە هەلویستێکی توندڕەوی هەبو لە مەسەلەی کوردی پارچەکانی تری کوردستان، زیاتر لەوەی ناوچەیی بێ، بوچونی «پان کوردیستی» هەبو.

٢. لەو کاتەدا تورک لەگەڵ عێراق لەسەر مەسەلەی قەرزی نەوت توشی کێشە ببو، تورک لە تەنگوچەلەمەیەکی ئابوری دژواردا بو، قەرزێکی زوری ولاتانی تری لەسەر کەلەکە ببو، کێشەی زوری هی کڕینی نەوت بو، لەوە ۳۳۰ ملیون دولاری عێراقی لەسەر کەلەکە ببو، ئەیتوانی بو بە دراو بیداتەوە وەکو عێراق ئەیویست، بەلکو ئەیویست نرخەکەی بە کەلوپەلی تورکی بدا لەسەر ئەوە ٦ مانگ بو عێراق ڕوێشتنی نەوتی لە لولەی تورکیەوە ڕاگرت بو، تورکیش قازانجی لەوەدا ئەبو هەمو جولانەوەکە بەتەواوی لە ناو بچی و ڕێگە بو عێراق تەخت بێ، بەلکو ئەیویست کەلک لە گێچەلی کوردی وەربگری دژی عێراق بو ئەو سەودایەی بە دەستیەوە بو.

٣. حکومەتی ئەجەوید لە هەلبژاردن دا لە ناوچە کوردنشینەکان دا زورایەتی دەنگی خەلکی بەدەست هێنابو سەبارەت بەو نەرمیەی لە کوردستان پەیرەوی ئەکرد، نەیئەویست لە ئەنجامی بەکارهێنانی توندوتیژی دا، ئەو بنکە جەماوەریە گرنگە لەدەست بدا، چاوپۆشی لە باکیلی بزوتنەوەکە ئەکرد.

4. هەر لە سەرەتای دامەزراندنی قم وە بە پەیرەوی لە سیاسەتی پێشووی پارتی بەرامبەر تورکیا، توانی بۆیان پەیوەندی لەگەڵ دەزگای میت و هەندێ لەکاربەدەستانی سنور دروست بکەن.

لەبەر ئەم هۆیانە تورکیا لە ڕووداوەکانی هەکاری دا یارمەتی قم دا دژی یەکێتی.

*

سامی سنجاری، کە ئەوسا، سکرتێری قم بو، بە بۆنەی ئیشکانی یەکێتیەوە، بە ناوی قم ەوە بەیانێکی نوسی لە ژێر سەرناوی: «حملە الالف جحش» و، لە ئەوروپاش ئەم بەیانەیان بە ئینگلیزی بلاو کردەوە.

*

## قەندیل: هەستانەوە

*

«دۆڵە نێ» ناوچەیەکی بەفراوی و چۆڵ و دور بو لە ئاوەدانیەوە. خەرمان هەندی رایەخ و بەتانی مان لە گەڵ خەرمان هەلگرت بو، ئەبو مشوری پەیدا کردنی خواردن بخوین. تەنیا چاوساغ و شارەزامان: قادر خەبات، بو. قادر هەتا بلی ی بە هەمت و دلسوز و لە بەردەم ماندوبون و ناخوشی دا خوراگر بو.

هەمو روژی فروکەی جەنگیی ئیرانی بە ئاسمانی ناوچەکەدا ئەسورانەوە. ئەبو بە روژ خومان حەشار بدەین و، ئاگر و دوکەڵ نەکەینەوە. چەند جاری هالیکوپتەری ئیرانی هاتە سەرمان تەقەی لی ئەکردین و، جاریکیان چەند ولاخیکی کوشتین. زوری پێشمەرگەکان ورەیان بەر دابو، لایان وابو لە ناو ئەچین، ناو بە ناو لی یان هەڵ ئەهات، هەندیکیان ئەچون تەسلیمی ئیران ئەبون و، هەندیکیان ئەگەرانەوە بو دواوە.

*

دۆڵە نێ و مراد شیرۆ

«دولە نێ» هەندی بیرەوەری کونی لە لا وروژاندم. ٥ساڵ پێشتر مراد شیرو و هەندی لە هاوریکانی لیرەدا کوژرا بون. مووراد یەکی بو لە فەرماندەی پێشمەرگەکانی بزوتنەوە چەکداریەکەی سالی ١٩٦٧ - ١٩٦٨ ی کوردستانی ئیران. بەم بونەیەوە بە پیویستی ئەزانم یادی لە روداوەکانی ئەو سەردەمە بکەمەوە، بە تایبەتی لەو کاتەدا ئیمە: ئەوانەی گوڤاری «رزگاری» مان دەرئەکرد، لە پیش هەمو لایەک و، گوڤار و روژنامەیەکی تردا بە هاودەردیەکی قولەوە هەواڵەکانی جولانەوەکە و، وینەی قارەمانەکانیمان بلاو کردەوە.

دوای شورشی ١٤ تەموز ریکخراوەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران کەوتنە بەر هیرشی «ساواک» چەند کەسی لە سەرکردە و ئەندام و لایەنگرەکانیان گیران و، چەند سەد کەسی لە سەرکردە و ئەندامەکانیشیان پەنایان بو کوردستانی عیراق هینا. ئەوسا کوماری عیراق بە قەلای ئازادیخوازان دائەنرا و، مەلا مستەفای بارزانی وەکو قارەمانی نەتەوەیی کورد تەماشای ئەکرا.

هەر لە سەرەتاوە زوری ئەم ئەندامانەی دیموکرات خویان لە بارزانی نزیک خستەوە و، بە چاوی پیشەوای هەمو کورد سەیریان ئەکرد و، زورتر لەو نزیک بون تا

سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق.

کە شۆڕشی ئەیلول دەستی پێ کرد هەندێ لە ماتەش چونە ریزی شۆڕشەکەوە. جولانەوەکە لە ناوچەکانی سلیمانی و هەولێر دا لە سەرەتادا توشی نیشتنەوە و کشانەوە بو. ئەمان ئەوەیان بە هەل زانی بەو داوودەزگای چاپەی هەیان بو کەوتنە بلاوکردنەوەی شتی بە ناوی «دیسان بارزانی» یەوە. لەم بلاوکراوەیەدا سەعایشیان لە بارزانی ئەکرد و، ترانج و تانەیان لە ریکخراوەکانی پارتی ئەدا. تۆوی ناکۆکی و دوبەرەکییان ئەوەشاند.

تیهران جوری لە پەیوەندی لە گەل مەکتەبی سیاسی دروست کرد بو، هێشتا پەیوەندی لە گەل بارزانی دانەمەزراند بو، بارزانی بو ئەوەی تیهران لە مەکتەبی سیاسی توڕە بکا و، ناچاریان بکا پەیوەندییەکە بگوێزنەوە بو لای خوی، هەندێ لە ماتەی نارده ناوچە سنورییەکانی نزیک مەکتەبی سیاسی تەقە لە پاسگاکانی تیهران بکەن.

سالی ١٩٦٤ لە کاتی لەت بونی پارتی دا بێ دودلی پشتیوانییان لە بارزانی کرد دژی مەکتەبی سیاسی، هەندێ لە بیانەکانی بە ناوی بارزانییەوە دەرئەچو ئەمان بویان ئەنوسی، تەنانەت لە سەنگەسەر هەندێکیان بون بە زیندانەوانی گیراوەکانی لایەنگری مەکتەبی سیاسی.

دوای لەت بونی پارتی و، سەرکەوتنی بارزانی، تیهران پەیوەندی لە گەل بارزانی بەهێز کرد، تا ئەحات بەهێزتریش ئەبو. بارزانی ئیتر نەیئەتوانی هاوسەنگی لە تیهران پەیوەندی لە گەل ساواک و پەیوەندی لە گەل دیموکرات دا رابگری، ئەبو لە نیوان شا و دیموکرات دا یەکێکیان هەلبژێری. سەرەنجام شای هەلبژارد و، کەوتە تەنگ پێ هەلچنین و راونانی کادر و پێشمەرگەکانی دیموکرات. لەو کاتەدا دیموکرات لە ژێر کارتێکردنی حیزبی تودەی ئیران و حیزبی شیوعی عیراق و، لەت بونی پارتی بو دو ریکخراوی جیاوازی «مەلایی» و «جەلالی»، توشی تەنگەچەلەمەیەکی سیاسی و ریکخراوەیی قول بوبون و، لە ناو خویان دا بوبون بە چەند بەشێکەوە:

بەشێکیان لە ئەورووپای روژهەلات جێگیر بوبون وەکو بەشێ لە حیزبی تودە یان وەکو خویان ئەیانوت: «حیزبی مادەر» کاریان ئەکرد.

بەشێکی تریشیان لە کوردستانی عیراق بون ئەمانیش بوبون بە ٣ پارچەوە:

- پارچەیەکیان لە گەل بارزانی بون.
- پارچەیەکیان لە گەل مامجەلال بون.
- پارچەیەکیشیان خویان هاویشت بوە پەنای حیزبی شیوعی.

ئەوانەی لە گەل مەلا مستەفاش بون، بو بون بە دو دەستەوە:

«دەستەیەکیان عەبدوللای ئیسحاقی «ئەحمەد توفیق» ڕێبەری ئەکردن، هەر بە دڵسۆزی ما بوونەوە بۆ بارزانی، بەڵام بارزانی لە سنووری ئێران دووری خستنەوە بۆ بادینان. لە هەلومەرجێکی نادیاردا سەریان تێ دا چوو.

«دەستەکەی تریان سولەیمانی موعینی «فایەق ئەمین» ڕێبەری ئەکردن، «کومیتەی ئینقیلابی» یان پێک هێنا بوو. ئیسماعیلی شەریف زادە، عەبدوللای موعینی، مەلا ئاوارە لە سەرکردە ناسراوەکانیان بوون. لە ژێر گوشاری بارزانی دا ئەمانە بڕیاریان دا بگەڕێنەوە بۆ کوردستانی ئێران و، بە چەکداری لە دێهاتەکان دا بکەونە گەڕان و، خەباتی سیاسی و چەکدار.

سەرکردە و پێشمەرگەکانی کومیتەی ئینقیلابی گەڕانەوە بۆ کوردستانی ئێران و، بە ناوچەکانی بانە، سەردەشت، خانە دا بڵاو بوونەوە و، خەریک بوو جێگیر بێن. ئەمە مەترسییەکی گەورەی بۆ سەر ئێران دروست کرد. جوڵانەوەکە خەریک بوو لە دنیادا دەنگی ئەدایەوە و، هەندێ لە ڕێکخراوە چەپەکانی ئێران لە ئەورووپا خۆیان ئامادە کرد بوو بێن بەشداری تێ دا بکەن.

ئێران بە هاوکاری بارزانی کەوتە ڕاونانی جوڵانەوەکە. عەبدولوەهاب ئەتروشی، ئەوسا لە ئەویلە بوو، پۆلی پێشمەرگەی دیموکراتی بە گیراوی تەسلیمی ساواک کرد. هێزەکانی بارزانی یارمەتی هێزەکانی ئێرانیان ئەدا بۆ دۆزینەوەیان. لە ماوەیەکی کورت دا هەمو سەرکردەکانیان: ئیسماعیلی شەریف زادە، عەبدوللای موعینی، مەلا ئاوارە، میراد شیریز... یەک لە دوای یەک کوژران و، سولەیمانی موعینی کە ڕێبەری جوڵانەوەکە بوو، لە کاتی گەڕانەوەی دا بۆ کوردستانی ئێران لە شارباژێر کەوتە بۆسەی «صدیق ئەمین» ەوە کە لێپرسراوی لقی ٤ ی پارتی بوو، ئەم و هاوڕێ یەکی بە ناوی خەلیل شەوباش گیران و، ڕەوانەی لای بارزانی کران. هەردووکیان کوشتن و تەرمی سولەیمانیان تەسلیمی ساواک کرد. ساواک بۆ شکاندنی چاوی کورد تەرمەکەی بە کوردستان دا گێڕا.

جوڵانەوەکەی ١٩٦٧ - ١٩٦٨ کە ١١ مانگی خایاند بە کوژرانی سەرکردەکانی کوتایی هات.

*

هەواڵنامە

هێشتا لە نوکان بووین، دەفتەر و ڕۆژمێرەکانم کۆ کرد بووە ئەمویست هەواڵەکانی شۆڕش ڕێک بخەم. پێشتر «بەلاغێکی عەسکەری» دەر کرا بوو، بەڵام زۆر لە ڕووداوەکانی نەگرت بووەوە. سەر لە نوێ هەمو ڕووداوەکانم بە سەر کردەوە بە گوێرەی ڕۆژ و

مانگ و ساڵ ریزم کردن و، دامرشتنەوە. داوام لە مامجەلال کرد ئەویش پیشەکی بو بنوسی. هیمەتی کرد لەو هەلومەرجە سەختەدا پیشەکی دریژی بو نوسی.

تایپەکەمان لە گەڵ خومان برد بو، بەلام رونیو و ستینسل و کاغەز و مەرەکەب مان لە لای حەمە سەعید لە «دولە کوکی» بە جی هیشت بو. ناردمان ستینسل مان بو هات. لە بن کەورگەکانی دولێنی دا کەوتینە تایپ کردنی.

کوریک هات بو بو پیشمەرگایەتی ناوی مەلا رەحیم بو. گورمانی لە سەر بو. لە بەر ئەوە دەس بە سەر دامان نابو. کوریکی زیرەک و دەسرەنگین و قسە زان بو. خوی هاویشت بوە پەنای د. مەحمود. جارویار خواردنی بو دروست ئەکردن. مەلا رەحیم تایپستیکی باش بو. یەکەمین ژمارەی: «هەوالنامەی خەباتی شورشگیرانەی گەلی کوردستانی عیراق لە ماوەی دو ساڵ دا» لە سەر ستینسل بەم پیاوە گورمان لی کراوەم تایپ کرد و، ناردمەوە بو حەمەسەعید ئەویش بە رونیو چاپی کرد و، بو هەریم و لقەکان و، ریکخستنەکانی شار و، بو ئەورویامان نارد. لە ئەوروپا سەرلەنوی چاپیان کردەوە.

یەکەم «هەوالنامە» ٥٤ لاپەرەی فولسکاب بو. ٢٤ لاپەرەی پیشەکییەکی تیوری و سیاسی... بو. مامجەلال نوسی بوی، ئەوی تریشی هەوالی جوربەجوری دو ساڵی سەختی جولانەوەکە بو، من ئامادەم کرد بو.

چەند وتاریکی تریشم نوسی بە ناوی کومەلەوە بە هەمان ریوشوین چاپمان کرد.

*

بو خوپاراستن چەند جاری جیگورکی مان کرد بەلام هەر لە هەمان ناوچەدا مابینەوە، چونکە بەرزاییەکانی قەندیل هیشتا رشاییان تی دا پەیدا نەبوبو، بوی بگوزینەوە. بەفر و سەرما و برسیتی پەریشانی کرد بوین. وردە وردە کوارگ و گیای کیوی پەیدا ئەبو. کوارگی قەندیل سپی و تامی خوش و تیایەتی بە قەد قاپیکی خواردن ئەبی. هەندی ئاردیشمان پەیدا کرد. بە زوری ئەمان کرد بە ناوساجی. چەند جاری ئەو پیشمەرگانەی رایان ئەکرد لە گەڵ خویان ناوساجییەکەشیان ئەبرد، ئیمەیان نانەراو ئەکرد.

*

سورانەوەی هالیکوپتەری ئیرانی شپرزەیان کرد بوین. بریارمان دا بگوزینەوە بو «دولی بالەییان» لە دیوی عیراقی قەندیل. کەلوپەلەکانمان پیچایەوە هەندیکی خومان هەلمان ئەگرت و، هەندیکی مان لە ولاخ بار کرد. پیش خومان ولاخەکانمان بە ری کرد و، لە هەر مەفرەزەیەک پیشمەرگەیەکمان لە گەڵ نارد. لە مەفرەزەکەی من «فەرید ئەسەسەرد» مان لە گەڵ ناردن.

فەرید چەند حەفتەیەک بوو هات بوو بۆ پێشمەرگایەتی. پاش هاتنی بە چەند ڕۆژێ لە «مالومە»ی جالەتی بەر هێرشێکی جەیش و دابەزینی هالیکۆپتەر کەوت بوو، بە قەلاکەت دەرباز بوبوو. دوای ئەویش تووشی ئەم سەفەرە سەختە بوبوو. تازە تفەنگێکی برنەومان دابویە.

کاروانەکە بە ڕێ کەوت بوو. ئێمە بە ناو بەفرێکی ئەستوور دا هەڵگەڕێن. زۆر زۆر ولاخەکان لە بەفر دا چەقلی بوون. فەرید گەیشت بوو، تێنی لە پاتی ئەقیمزە برنەوەکەی بۆ لێخوڕینی ولاخەکە بە کارهێنا بوو. داری تفەنگەکە بوو بوو بە دوو کەرتەوە. ڕاستیەکەشی من بە هەڵەدا چوو بووم، ئەرکێکی نالەبارم پێ سپارد بوو: فەرید ئەهلی قەڵەم بوو، نەک ئەهلی تفەنگ. فەرید گەنجێکی ڕۆشنبیر و نووسەرێکی باش و پێشمەرگەیەکی خۆراگر بوو.

ئێمەش بە قەندیل دا هەڵگەڕاین بۆ لای «شێخ شەرۆ». هێشتا کەلاکی هالیکۆپتەرێکی لێ مابوو کە ساڵی ڕابوردوو لە شەڕێکی قورس دا بەردرابووەوە. چاوەڕێمان کرد تا دنیا تاریکی کرد. بە قەندیل دا شۆڕ بووینەوە و، بە لای «پشتئاشان» دا ڕۆیشتین، دیسانەوە بە «سیلم» دا هەڵگەڕاینەوە و، ئینجا شۆڕ بووینەوە بۆ «خەلاپ» لە دۆڵی بالەیان. دەمەوبەیانی گەیشتینێ.

چەند بزن و گیسک مان پەیدا کرد بوو لە گەڵ خۆمان هێنا بوومان. لەو کاتەدا بوو ئێمە بە نرخترین سەرمایە بوو. بە پێشمەرگەیەکمان سپارد بوو ئاگای لێ بێ. بزنگەلەکەمان دیار نەبوو. بزنەوانەکە بە شەو لە ماندوویەتی دا فەرامۆشی کرد بوون. بزنەکان چووبوونە ناو بەفر و سەهۆلبەندانێکەوە لە شوێنێکی کوێر و سەخت دا. بزنەکان عاسی بوبوون، ئەمیش نەیوێرا بۆ دوایان بکەوێ بیان هێنێتەوە. قادر خەیات و سامان گەرمیانی گەڕانەوە دواوە بۆ هێنانەوەیان. قادر خەیات شاخەوانێکی شارەزا و کردە بوو. بۆ ئەوەی ئەخزێ و ئەخلیسکێ بە پێی پەتی بە شەختەی کوێری شاخەکەدا هەڵگەڕا بۆ بزنەکانی هێنابوەوە.

*

جاری یەکەم من لە شوباتی ٧١ دا ئەم ناوچەیەم دی بوو. ئەو کاتە من خۆم لە داوودەزگا ئەمنیەکانی بەعس شارد بووەوە، چونکە بە پیلانێک کە تاقمی بارزانی لە سلێمانی بۆ تاوانبار کردنی من ڕێکیان خست بوو، «محکمە الثورە» حوکمیان دا بووم. دوای یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکەی پارتی، لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد، مامجەلال، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری، منیش چووم بۆ بارەگای بارزانی لە «قەسری». چەند مانگێ لەوێ ما بوومەوە زۆربەی شاخەکانی ناوچەکە و، ئاوایەکانی گەڕا بووم.

دۆڵی باڵەیان ناوچەیەکی شاخاویی عاسی بوو، کەوت بووە بناری قەندیلەوە. ئەرزیان بۆ کشتوکاڵ کەم بوو، بەڵام لەوەڕگای گەورەیان هەبوو. کانی و ئاوی زۆر و ئاووهەوای خۆش و دیمەنی جوان بوو. گوێزی باش و هەنگوینی ناوایان هەبوو. بەشێک بوو لە ناوچەی باڵەکایەتی، کە چومان ناوەندی بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوو.

لە ساڵانی شۆڕشی ئەیلول دا مەلا مستەفا کرد بووی بە بنکەی ژیان و کارەکانی خۆی. خانوو و بەرەی بۆ ژیانی خۆی و خێزانەکەی لە «دیلمان» و، بارەگای کاری لە «قەسری» دروست کرد بوو. زۆریان ئازاری دانیشتوانی ناوچەکە دا بوو، لە بەر ئەوە حەزیان لە چارەی بنەماڵەی بارزانی و، بارزانییان نەدەکرد.

زۆری پیاوەکانی دۆڵی باڵەیان لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بوون. هۆشی سیاسییان پێشکەوتوو و شارەزاییان لە پێشمەرگایەتی دا زۆر بوو. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشی حوزەیران دا دۆڵی باڵەیان بوو بوو بە یەکێ لە بنکە سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەییەکانی یەکێتی. لە ۲۳ ی تشرینی دووەم و ۱۷ ی کانوونی یەکەمی ۷٦ دا و، لە کۆتایی مارتی ۷۷ دا جەیش چەند لەشکرکێشییەکی گەورەی بۆ سەر دۆڵی باڵەیان کرد بوو. لەم شەڕانەدا جەیش زەرەری گیانیی قورسیان لێ کەوت بوو. دانیشتوانی ناوچەکە لە ئابی ۷۷ ەوە ڕاگوێزرا بوون، لە ئۆردوگای «قەسری» دا کۆ کرا بوونەوە.

ئێمە ژمارەمان کەم بوو، بەرگەی هێرشی جەیش مان نەدەگرت. ئەبوو خۆمان حەشار بدەین و، نەهێڵین کەس جێگە و ڕێگە و ژمارەمان بزانێ. لە قەسری «مەعسکر» یەکی گەورەی لێ بوو، هەروەها ڕێکخستنی زۆری یەکێتی لێ بوو.

کە گەیشتینە «خیلاپ»، هەر مەفرەزەیەک پێویستییەکانی خۆی، لە پێڵاو و جلوبەرگ و جگەرە و خواردنی قوتوو، کرد بە لیستەیەک. لیستەکەمان بۆ کۆمیتەی قەسری نارد بیکڕن و بۆمان بنێرنەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو، کۆمیتەی قەسری و لێپرسراوەکەیان، بە خواردن و کەلوپەلێکی زۆرەوە هاتن. پێمان سەیر بوو چۆنییان زانیوە. تورمز ئەو پێشمەرگەیەی لیستەکانی کرد بوو، لە سەری نووسی بوو: لیستی پێویستییەکانی مەفرەزەکەی مامجەلال.. و کاک فلان و کاک فیسار. ناوی هەموومانی نووسی بوو. کاغەزەکە کە گەیشت بووە دەستیان زانی بوویان ئێمە لە ناوچەکەیان داین، بۆ ڕێز لێ نان بە چاکیان زانی بوو خۆیان بێن بۆ سەردانمان.

بە درێژی ئەو ماوەیەی لە دۆڵی باڵەیان بووین «کۆمیتەی قەسری» بەو پەڕی

تواناپانەوە خزمەتیان کردبین، یەکەمین چادر ئەوان بۆیان پەیدا کردبین.

*

ئەمانویست لە خیلاپەوە بگوێزینەوە بۆ «زمنگەلیین» یا «سەرشیخان». لە گەڵ قادر خەبات و دوسی پێشمەرگەی تر چوین بۆ «استطلاع» ی ناوچەکە. لە ریگا زورمان کوارگ کو کردەوە. دو جامانەمان پر کرد لە گەرانەوەدا لە گەڵ خومان بیبەینەوە بۆ برادەران.

لە دورەوە ترۆسکەیەکی ئاگرمان بە دی کرد. ئەمانویست خومانی لی ئاشکرا بکەین. بۆ ئەوەی ئەمان بیان و هەستمان پی نەکەن دزەمان کرد بۆ نزیکیان. سەیرمان کرد تاقمی پێشمەرگەی بالەیین. کاتی خوی لە گەڵ پایز ئاغا تەسلیم بوبونەوە. بەلام دیسان هات بونەوە دەرەوە. لە بەر بەفر و سەرما داپرا بون لە هیزەکانی تر. فەرماندەکەیان ئەحمەد مەولود بو. لەو ساوە لە گەڵ ئەحمەد بوین بە دو دوستی گیانی بە گیانی لە هەمو گەران و سوران و شەرەکان دا لە من جیا نەئەبوەوە، تا شەهید بو.

ئەم سەفەرەیە بو ئیمە گەڵەبینەیەکی بە نرخ بو. پیاوی ئازا و گورجوگوڵ بون. خەلکی ناوچەکەش بون. دوای جیا بونەوەمان لە هیزە سەرەکییەکەی یەکیتی، ئەمان یەکەم تاقم بون دەستمانی پی گەیشت بو.

*

دلی پیس

کە گەیشتینە «زمنگەلیین»، داروەرەختمان بینی. واممان زانی دەرگای رەحمەتمان لی کراوەتەوە. پردیکی بچوکی لی بو. لە نزیک پردەکەدا لە بن شاخیکی هەزار بە هەزارا جیمان راخست. لە میژ بو گەرمان نەبوبوەوە. لە خوشی دا کەوتینە کوکردنەوەی چیلکە و دار. ئاگریکی زور گەورەمان کردەوە. ساورمان لی نا. هەوێرمان شیلا. بە دیار ئاگرەکەوە بە چیچکانەوە دانیشت بوم. دنیا زور تاریک بو، گری ئاگرەکەش چاوی بە شەوارە خست بون. منیش و پێشمەرگەکانیش هەستمان کرد لە شاخەکەی پشتەوەمان خرتە خرت دی و، هەندی جار بەرد خلور ئەبیتەوە. بەلام هیچمان نەئەدی. ناوچەکە چوڵ بو لە ترسی جەیش کەس نەئەئەویرا روی تی بکات. «مەعسکر» یکی گەورە لە قەسری بو. ئیرەش لە قەسری دور نەبو. وڵمان رەنگە وریچ یان دەعبایەکی کیوی بی.

زوری پی نەچو تارمایی زەلامیک دەرکەوت. ئاغرەتیکی گەنج بو کە لیمان نزیک بوەوە سەلامی لی کردین و، هاتە ناومانەوە. بە خیرهاتنمان کرد. ساورو و نان و چا مان پیشکەش کرد هیچیانی نەخوارد. وتی: «پرسیم نیە». جاری ئەمەویست بکەومە

لیکۆڵینەوە و پرســـیــار و وەڵام. لیم پرسی: «ئەزانی نان بکەی؟» وتی: «بەڵێ ئەزانم».
وتم: «تاقــەتت هەیە هەندێ نانمان بۆ بکەی دەمــێکە نانی باش مــان نەخــواردووە؟» وتی:
«خۆتان هەویرەکە بشێلن، من نانەکەتان بۆ ئەکەم».

پاش ئەوەی هێمن بووەوە لیم پرسی: «خۆت بە تەنیای یا پیاویشت لە گەڵە؟»

وتی: «خۆم بە تەنیام»

وتم: «رەدوو کەوتوی؟»

وتی: «نەخێر رەدوو نەکەوتوم»

وتم: «ئەگەر رەدوش کەوت بی و پیاویشت لە گەڵ بی، مەترسە بۆ ئێمە شتێک
نیە، بەڵام ئەگەر پیاوت لە گەڵە پێمان بڵێ بۆ ئەوەی بانگی بکەین»

وتی: «پیــاوم لە گــەڵ نیــە. من خۆم مــێرد و منداڵم هەیە و بە مــێردەکـەی خۆم
رازیم»

وتم: «چی ئەکەی بە تەنیا لەم شاخە»

وتی: «مێردەکەم دڵی لیم پیسە. هەر چەن لە گەڵ پیاوێک چاکوچۆنی بکەم لیم
تورە ئەبێ یان لیم ئەدا. پیــری ئێــوارە لە گــەڵ دراوسـی پەکــمــان قســەم ئەکرد. بە ســەرا
هاتەوە. لیم تورە بۆ خـەریک بو لیم بدا. منیش هەڵاتم. ســاڵەکــەمــان نزیکە لە رەبیــەی
عەسکەرەوە. لە رەبیــەکە تێ پەڕی بوم. شــەوی بە ســەرا هات ئەوێرام بگەڕێمەوە بۆ مــاڵ.
بەرەو کەونە گوندەکەی خومان چوم. ئەوە ٣ رۆژە لەو ناوەم ئەمشــەو کــە ئاگرەکــەی ئێوەم
دیت. لیتان نزیک بومەوە زانیم پێشمەرگەن هاتمە لاتان».

وتم: «ئەم ماوەیە چیت خواردوە؟».

وتی: «کوارگ و ریواس و گژوگیای کێوی».

وتم: «ئەتەوی لە میردەکەت جیا ببیتەوە؟»

وتی: «من مێردەکەی خۆمم خوش ئەوی ئامەوی لی ی جیا ببەوە»

ئاغــرەتەکــە خــەڵکی گــوندێکی راگــوێزراوی دۆڵی باڵەیــان بو لە نزیک زەنگەڵین.
هەندێ لە پێشــمەرگــەکانی باڵەیــانی بە ناو ئەناسی. ئەو شــەوە لای ئێــمــە مایەوە. بەیانی
ناردم بە دوی ئەحمەد مەولودا. ئەحمەد ژنەکە و مێردەکەی ئەناسی. بردیە بنکەکەی خۆیان.
ژنەکە خێری بو دانەوە نانی بو ئەکردن و چێشتی بو لی ئەنان. کە ئێمە ناوچەکەمان چۆڵ
کرد ئینجا ناردیان بە دوی مێردەکەی دا تاشتــیــان کــردنەوە و. گەڕانەوە مالی خۆیان لە
قەسری.

*

رۆژێکیان لە «سەرشیخان» پاڵم بە گابەردێکەوە دابو سەیری شاخەکەی بەرامبەرمانم ئەکرد لە دوورەوە ریزێک زەلامم بینی ریچکەیان بەست بو بەرەو سەرشیخان ئەهاتن. ناوچەکە چوڵ بو هاتوچوی بە سەرەوە نەبو. چومە سەر رێگەکەیان. پاشتر لێیان ورد بومەوە هەمویان بی چەک بون و جلی کوردییان لە بەردا بو. گەیشتنە لای من سەلامیان کرد. منیان نەئەناسی. لێم پرسین: «بە دوای چی دا ئەگەرێن لەم شاخە چوڵە؟»

وتیان: «بە دوای ئێوەدا ئەگەرێین»

وتم: «بو ئەزانن ئێمە کێین بە دوامان دا ئەگەرێن؟»

وتیان: «ئێوە پێشمەرگە نین؟»

وتم: «بەڵی ئێمە پێشمەرگەین. فەرمون چیتان ئەوێ؟»

وتیان: «ئەمانەوێ ئێمەش بین بە پێشمەرگە!»

وتم: «ئێمە خومان تاقەتمان لە پێشمەرگایەتی چوە خەریکین وازی لی ئەهێنین»

وتیان: «ئێوە تاقەتتان چوە ئێمە دەس پی ئەکەین!»

وتم: «چەکمان نیە بتاندەینی»

وتیان: «خومان پارەمان لە گەڵ خومان هێناوە ئەیکرین»

وتم: «نانمان نیە بتاندەینی»

وتیان: «خومان خەلکی ناوچەکەین نان پەیدا ئەکەین!»

خەلکی گوندە راگوێزراوەکانی بناری قەندیل بون تازە پارەی «تەعویض» ی دیهاتەکانیان وەرگرت بو. کە پارەکەیان وەرگرت بو بەکەسەر هات بون بو پێشمەرگایەتی. بە خەبەر هاتنیکی گەرمم کردن. لە گەڵ خوم بردمن بو بنکەکەمان. مامجەلال و ئەوان چاوەروان بون بزانن ئەمانە چین و بوچی هاتون. چوم حیکایەتەکەم بو گێرانەوە. وتم: «ئەم میللەتە بویە نامری. ئێمە لە خومان بێزار بوین ئەوان تازە ئەیانەوێ دەس پی بکەن».

*

نوا

لە ناو پوستەی رێکخستنی شاردا نامەیەکی بەختیاری برامم پی گەیشت لە گەڵ چەردەیەکی باش پارە. لە نامەکەدا هەوالی خوشیانی بو نوسی بوم. خوا کچێکی پی بەخشی بون، داوای لی کرد بوم، من ناوی بنێم. وەلامم دایەوە و ناوم نا «نوا» و. لە بەر ئەوەی ئەم وشەیە نائاشنا بو بەوان، مەعناکەشم بو نوسی: «نوا» بو باران وەکو «سێبەر» و «سایە» بو هەتاو، «نوا» بەو شوێنەیان ئەوت کە بو خوپاراستن لە باران و بەفر ئەچونە ژێری.

بۆ یەکەمین جار وشەی «نوا» م لەم سەفەرەدا بیست بوو. هەروەها چەند وشەیەکی تر وەکو:

لێ ئەنیشتن: هەندێ جێگای شاخەکە کووڕ و لووس و خز بوو، بە بەفرەکەدا بە پێ مەترسی گلان و خزان و بەربوونەوەی هەبوو. پارچەیەک لباد، یا نایلۆن، یا قەمسەڵەکەی لە سەر بەفرەکە دائەخست. هەردوو لنگی درێژ و جووت ئەکرد و، دەستی ئەخستە ژێر سمتیەوە، هەردوو پێ ی بە جووتکراوی کەمێ لە ئەرز بەرز ئەکردەوە، بە خێرایی بەرەو خوار ئەخلیسکا و، نشێوێکی درێژی بە ماوەیەکی کەم بە سەلامەتی ئەبڕی.

لێنەشت: لافاوی باران و بەفراو.

سوول: تاڵگەی ئاو.

ڕنوو: هەرەسی بەفر.

جمگە: داروخانی شاخ و، جمینی ئەرز.

کەستەک و، سند: تۆزی بەفر کە لە بەرزایی شاخەوە خل ئەبێتەوە بەرەو خوار تا دێ زلتر ئەبێ. یان وەکو بە ئینگلیزی پێ ی ئەڵێن: «سنۆ بۆڵ» و، وەکو زاراوی سیاسی بۆ زلبوونی بەردەوامی گیروگرفت بە کاری ئەهێنان.

چەقەڵ: شوێنی بەردەلان لە ناو شاخ دا. کەچی لە ناوچەی سلێمانی دا ناوی دەعبایەکە لە خێزانی ڕێوی، لەم ناوچەیەدا بەو دەعبایە ئەڵێن: «تورگ».

گزر: تەختایی سەر شاخ. کەچی لە ناوچەی سلێمانی بە شوێنی ناشتنی مردوی ئەڵێن.

*

کەلاوەی خانووی ئاواییە ڕووخێنراوەکان و، کەلەک و پاردەی زۆر لە باخەکان ما بوون. باخەکانی سێودار و مێوە بە زۆری لە بێ ئاوی دا وشک بوبوون. هەندێ خەرمان، کە ساڵی پار لە کاتی ڕاگوێزان دا فریای هەڵگرتنی نەکەوت بوون، لە شوێنی خۆیان دا دامرکا بوونەوە. لە هەندێ جێ پیاز و پەتاتەی پار ڕوا بوونەوە.

پێشمەرگەکان لە بێکاریی دا کەوتنە گەڕان بە ناو کەلاوەی خانوو و کەلەکی بەردەکان دا. تەور، پاچ، خاکەناز، ساج، سەتڵ و، زۆر شتی تری لەم بابەتەیان دۆزییەوە. ئەمانە هەمو کەرەستەی بە کەڵک بوون بۆ ئێمە. لە ناو کەلەکی بەردەکان دا چەندین تفەنگ و چەندین هەزار فیشەکی شاردراوەیان دۆزییەوە. باش هەڵگیرا بوون. لە دوایی دا خاوەنەکانیان پەیدا بوون و بۆمان بژاردن.

*

ئەو ماوەیەی لە دولی بالیسیان بوین خەریک بو ئەبوژاینەوە: لە خواردەمەنی دا هەرچی مان بویستایە لە «قەسری» وە بویان ئەهێنان. لە سوتەمەنی دا بو خو گەرمکردنەوە و نان کردن و چێشت لێنان کەموکوری مان نەبو. هەندی چادرمان پەیدا کرد بو. هێزەکەش مان خەریک بو زیادی ئەکرد.

بەهانیەکیان لە بن بەردێک دا دانیشت بوین گوی مان لە هەواڵەکانی «بی بی سی» گرت بو. باسی هەڵگیرسانی شەرێکی قورسی کرد لە ناو خاکی تورکیادا لە نێوان هێزەکانی یەکێتی و ئەم دا. بە وردی دریژەی هەواڵەکەم لە بیر نەماوە، بەلام ئەوەم لە بیر ماوە کە زەرەری گەورە لە هێزەکانی یەکێتی کەوت بو.

هەمومان تاساین. ئەوە هێزی سەرەکیی یەکێتی و شۆرشەکە و، زوری سەرکردەکانی جولانەوەکەشی لە گەڵ بو.

*

سەراسی و شەوبێداری

پەندێکی پێشینان ئەڵێ: «دراوسی لە دراوسی، ئەگری سەراسی».

سەراسی: جورێکە لە ژانە سەر توشی لایەکی سەری مروڤ ئەبی، ئازارێکی ئەوەندە سەخت و بە تینی هەیە، ئەو چاوەی کەوتوتە ئەولایە لە تاو توندی ئێشەکە قرمیسک ئەرێژی. لە زمانی پزیشکی دا پی ی ئەڵێن: «میگرەین». پەندەکە هیچ بنچینەیەکی زانستی نیە، چونکە سەراسی «ساری» نیە و، کەس لە کەسەوە توشی نابی، بەلام ئەبی مەبەستی پەندەکە ئەوەبی کە دراوسی لە دراوسیوە توشی گیروگرفت و گیچەڵ و دەردەسەر ئەبی.

لە کوردەواری دا، هوی ئەم نەخوشیە ئەهێننەوە بو ئەوەی «سەری» ئەو کەسە «کەوتوە»، چارەسەریشی بەوە ئەکەن «سەری ئەگرنەوە».

«سەر کەوتن» وەکو هوی نەخوشیەکە و، «سەر گرتنەوە» وەکو چارەسەری لە کونەوە باو بوە بەم جورە:

نەخوشەکە دائەنێن و، پەتێک لە دەوری سەری لە ئاستی لاجانگەکانی دا ئەگێرن و ئەندازەی هەردولای سەری ئەگرن و، پاشان هەردولای پەتەکە بەراورد ئەکەن ئەگەر لایەکی لە لایەکی درێژتر بی ئەوە بە نیشانەی کەوتنی سەری کابرای نەخوش دائەنێن و، سەر لەنوی پەتەکە لە دەوری سەری ئەجەرێنن و، بە کلکی تەشیەک یان دارێکی باریک زیاتر بای ئەدەن و ئەیچەرێنن تا بە تەواوی توند ئەبی، بە مەش گوایە سەری کابرا ئەگرنەوە. ئینجا بە جاجم یا بەرماڵێکی تاریک سەری دائەپوشن تا ژانەکەی لە کوڵ ئەبێتەوە.

من له میژ بو جارویار میگرەینم توش ئەبو. له فیینندا چەند جاری چویومە لای پزیشکی پسپور بەلام چارەی بنەرەتیی نەبو، هەندی «حەب» ی کەمکردنەوەی ئازاریان بو ئەنوسیم. ئەو ماوەیەی له لەندەن بوم، سەرباری هەمو گیروگرفتەکانی تر، سەرئیشەکەم زور زیادی کرد بو. هەندی جار له کاتی نوسان دا ئەمگرت و، له تاو ئازاری سەرم خەبەرم ئەبوەوە. هەندی جار زیاتر له دو سەعاتی ئەخایاند. ئەوەندە ناخوش بو له گەڵ کابرای فارس دا ئەمەوت: «ای مرگ بیا زندگی مارا کوشت»، واته: «ئەی مەرگ وەرە ژیان کوشتمی».

جگه لەمە بە گشتی هەمومان تەندروست و لەش ساغ بوین، بە دەگمەن یەکیکمان نەخوش ئەکەوت.

یەکیکی تر له گیروگرفتەکانم بە سەر بردنی شەو بو. هەر له منالیمەوە نەمئەتوانی شەوان زو بنوم. لەو شوینانەی لی ی ژیا بوم هەمیشە کارەبای لی بو، شەو تا درەنگ دائەنیشتم، ئەمتوانی سەیری تەلەفزیون بکەم، گوی له رادیو بگرم، بخوینمەوە و، بنوسم. بەلام ئەو ماوەیەی له براەوست بوین چراسان دانەئەگیرسان. ئەبو له ئیوارەوە خومان بو نوستن ئامادە بکەین و، بەیانی زو هەلبستین. هەرچەندە منیش وەکو هەمو ئەوانی تر بەیانیان زو هەلئەستام بەلام بە شەو تا درەنگ خەوم لی نەئەکەوت. له سەر جیگاکەم گینگلم ئەخوارد، سەیری ئەستیرەکانی ئاسمانم ئەکرد، جگەرەم ئەکیشا، تا بە تەواوی شەکەت ئەبوم. گیانی منیش ئەبو بە هاودەرد و هاوئاوازی گیانی ئەو گورانییە فولکلورییەی وتویەتی:

دیسان شەو هات بو حالی من

بو دلەی پر له خەیالی من

عالەم سوتا له نالەی من...

بەلام بو خوشبەختی ئەم شەونەخونییەی من «نەخوشیی» نەبو بەلکو «خو» بو.

که گەرامەوە ناوچەی سلیمانی ئەم گیروگرفتەم نەما. شەوانیان له ئاوەدانی دا بە سەر ئەبرد تا درەنگ له بەر لوکس یان چرا دائەنیشتین. بەلام که چوینەوە لەندەن حەفتەکانی یەکەم توشی هەمان گیروگرفت بومەوە. پی ئەچی پیش منیش زور کەس لەم دەردەیان چەشت بی. «کوردی» و «سالم»، که له نیوەی یەکەمی سەدەی نوزدەهەم دا ژیاون، دیارە ئەوانیش هەمان گیروگرفتیان هەبوە. چەندین شیعری ناسک و بە سوزیان له سەر شەو و شەوبیداری داناوە. شەو له شیعری کوردی دا ئەتوانی لیکولینەوەیەکی تایبەتی له سەر بکری. «کوردی» له سەرەتای یەکیکیان دا ئەلی:

شەوی یەلدا، وە یا دەیجوورە ئەمشەو
کە دیدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەمشەو

شەوی یەلدا درێژترین شەوی ساڵ و، شەوی دەیجوور تاریکترین شەوە. بۆ من هەموو شەوی «شەوی یەلدا» و «شەوی دەیجوور» بوو، نەمئەزانی چۆنی بە سەر بەرم.

لە دوای بالەبیان ناردمان هەندێک فانوس و نەوت و مۆم یان بۆ هێنایین. بۆ من ئەمە خۆشییەکی گەورە بوو. حەسانەوەیەکی زۆری ئەدا بە مێشک و گیانم. شەوان تا درەنگ لە بەر رووناکییەکی کزی فانوس یا مۆم «نالی» گوتەنی: کە «وەک ئاگری بێ شەوقی دزان» بوو دائەنیشتین و من کارەکانی خۆم: خوێندنەوە و نووسینی نامە و، وتار، کتێبم ئەنجام ئەدا.

پێشمەرگەکان ئەیان ئەهێشت تنۆکێک لە تراوەی مۆمەکە بە خەسار بچێ. پاشماوەکەیان کۆ ئەکردەوە و پلیتەیان تێ ئەخست و ئەیان کردەوە بە مۆم. ئەم ئیجمەئە بەردەوام بوو تا بۆ پێشەوە ئەچوین رووناکییەکەمان گەشتر ئەبوو.

*

لە ناو پۆستەی دەرەوەی ولات دا نامەیەکی فەرنادی مەلا مەحموودم پێ گەیشت. پاش دەربڕینی هاودەردی و هەندێ بیروڕای خۆی دەربارەی هەلومەرجی ئەو کاتە، لە نامەکەی دا بۆی نووسی بووم کەوا تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە چاک بوونەوەی نییە و، ئەوپەڕی دووساڵی تر ئەژی، لە بەر ئەوە حەز ئەکا پاشماوەی ژیانی لە کوردستان و لە ناو هاوڕێکانی دا بە سەر بەرێ و، لە ولات بمرێ.

ئەم هەواڵەم زۆر پێ ناخۆش بوو. فەرناد هاوڕێ ی سەردەمی خوێندنی سانەوی و کاری سیاسی و ساڵانی ژیانی فیەنتنام بوو. ساڵانی ۱۹٦۳ - ۱۹٦٤ پێکەوە لە سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووین، هاوڕێ یەکی خۆشەویست و دڵسۆزم بوو. لە لایەکەوە پێم ناخۆش بوو تووشی ئەو نەخۆشییە بووە و، لە لایەکی ترەوە پێم ناخۆش بوو چونکە نەمانئەتوانی خواستەکەی بە جێ بهێنین. هەلومەرجی ژیانی پێشمەرگایەتی سەخت بوو، جێگا و رێگایەکی دیار و، دکتۆر و دەرمانمان ئەبوو. چارەنووسی خۆشمان دیار ئەبوو.

ساڵی ۷۹ کە جارێکی تر سەردانی ڤیەتنام کردەوە فەرنادم بینییەوە. نەخۆشیی بە تەواوی کاری تێ کرد بوو بەڵام خۆی پیاوێکی بە زات بوو، ترسی نزیکبوونەوەی مردنی پێوە نەئەبینرا. دوای ئەوە زۆری نەخایاند، هێشتا لە هەرەتی لاوی دا بوو، کۆچی کرد.

*

لە گەڵ تەرانەوەی بەفری قەندیل دا ئیمەش بەرەوژوور هەڵ ئەکشایین. خەریک بوو

رشایی لە بەرزاییەکان دا دەر نەکەوت. دولی بالیسیان مان بە جی هێشت و چوینە هەواری «شێخ ئایش». لە بەر بەفر ئەمانتوانی بپینەوە سەر لەنوی بەرەو «دولە نی» داکشاینەوە و بارمان خست. تەنیا یەک خێوەتمان هەبو مامجەلالی تێ دا بو. من ژێر بەردێکم بۆ خۆم چاک کرد بو بە نایلون بەرم گرت بو. پێشمەرگەکانیش هەر یەکەی لە بن بەردێک دا جێگایان بۆ خۆیان چاک کرد بو.

*

دوکەڵ و جاسوس

بە رۆژ ئێمە هەمومان خۆمان لە بن گابەردا حەشار بدەین و، هیچ کەس ئاگر نەکاتەوە. لە قەندیل هەر گوێی تەقەی لێ بو بۆ سوتاندن. ئەویش دوکەڵێکی زۆری لێ بەرز ئەبووەوە. هالیکوپتەری ئێرانی چاودێری ئاسمانی ناوچەکەیان ئەکرد لە هەر شوێنێک دوکەڵ بەرز بوایەتەوە ئەچونە سەری. هەر لەو ماوەیەدا چەند پێشمەرگەیەکی ئاگوێزتی خۆیان لە ئێمە دزی بوەوە چوبونە شوێنێکی دور ئاگریان کرد بوەوە و چایان لێ نا بو. هالیکوپتەر گەیشت بوە سەریان و هەموریانی گرت بو لە گەڵ خۆیان برد بویانن. دوای روخانی شا گەڕانەوە.

نیوەڕۆیەکیان لە گەڵ مامجەلال لە ناو چەقەڵە بەردێک دا بە بەربەرزاییەکەوە دانیشت بوین. دیمان لە خوار خۆمانەوە دوکەڵ بەرز ئەبێتەوە. مامجەلال تورە بو چو بۆ لای دوکەڵەکە. لوتیەک گۆشتی ماسییان لە سەر گەرم ئەکردەوە. مامجەلال چو بە گژیان دا و وتی: «ئێوە جاسوسن. دوژمن ناردوتی بۆ ئەوەی شوێنەکەمان ئاشکرا بکەن!». هەردوکمان چەک کردن و دەس بە سەر داماں نان. پێشمەرگەکان، یەکیکیان عەلی کوێلەیی بو، خەڵکی دولی بالیسی بون تازە هات بون بۆ پێشمەرگایەتی. پاش نەختێ چەکەکانمان دانەوە.

*

پێش ئەوەی بە رێ بکەوین لە تورکان چەند پێشمەرگەیەکیان بەرەو رو کردینەوە کە لە دەستەی مامجەلال و من بن. ئەمانە هەندێکیان لە شار هاوڕێ ی کومەڵە بو بون، لە بەر ئەوە جێگای بڕوای ئێمە بون. سەختیی ژیان و نالەباریی چارەنوس ئەمانەشی روخاند بو. مامجەلال لە صەلاح تورە بوبو لە دەستەکەی خۆی دوری خست بوەوە. دوای ئەو سامان گەرمیانی کرد بو بە سەردەستەی پێشمەرگەکانی. لەویش تورە بوبو لای برد بو کورێکی لە جێگا دانا بو ناوی لە خۆی نا بو فەتاح. فەتاح هاوڕێ ی کومەڵە بو، لەو پێشمەرگانە بو کە لە بەر ئەمینی گواستبویانەوە لای مامجەلال.

هەموویان شەلا بو نان و ناوساجی بکەن. فەتاح ئەرکەکەی گرتە ئەستوی خوی کە بە شەو لە گەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تردا بەریز حەراسەت بگرن و، نانەکەش بکەن. تومەز لە گەڵ دو کەسی تر لە پێشمەرگەکان؛ فاخر و رەفیعە، ئەوانیش هاوڕێ ی کومەلە بون، ریک کەوت بو بە ریز لە سەعات پانزە و دوانزە و یەکی نیوەشەودا حەرەس بن و، لەو ماوەیەدا فرسەت بهێنن رابکەن بو ئیران.

نیوەشەو مامجەلال هەستا بو لە خەوەتەکەی هات بوە دەرەوە حەرەسی بانگ کرد بو کەس وەلامی نەدا بوەوە. لە دەنگی مامجەلال هەموومان هەستاین. مامجەلال لە ساماتی پرسی: «کوا حەرەس؟» سامان وتی: «وەنگە رایان کرد بی» مامجەلال چو بە گوێی دا وتی: «دیارە تو ئاگات لی بەتی ئەگینا چون ئەوانی رایان کردوە؟». هەر ٣ پێشمەرگەی راکردو سەرو نامەیان بە جی هێشت بو، نوسی بویان لە داخی ئەوە بونی ئیمە هەلاتون و، خویان بە خائین نازانن و، ریگەی خیانەت ناگرن.

لە گەل خویان ٣ تفەنگ و، زوری نان و ناوساجییەکانی ئیمەشیان برد بو. تەسلیمی ئیران بون و بون بە پەنابەر لەوی.

بو روژی دوایی مەفرەزەیەک لە پێشمەرگەکانی سلیمانی لە گەل شەمال (شیخ محەممەدی شیخ محمودی باخ) گەیشتن. ئازاد محەممەد غەریب، دلشاد توفیق، مەلا عەلی (حسین مەولود).. گەیشتنی ئەمان لەو هەلومەرجە نالەبارەدا تولەی راکردنی ئەوانی کردەوە. گەلێی خاوەن بیروباوەر و بە زات بون. لەو ساوە نیتر لە گەل من بون بە هاوری ی گیانی بە گیانی. شەمال و دلشاد و حسین هەریەکەیان لە مەیدانێکی تیکوشان دا کوژران.

*

ناتومێد بوین لەوەی هەوالی کاک عەلی و هیزەکەمان بو بیت و، ئیمەش بچین بو برادوست. نیتر بەردەوام شوێنەکانی خومان ئەگوری و، لە هەوارێکەوە ئەمان گواستەوە بو هەوارێکی تر. ئیران ئەوساڵە ریگای بە رەوەندەکان نەدا میگەلەکانیان بو لەوەرخوری بهێنن بو قەندیل. بە هالیکوپتەریش ئەگەران لە هەر جیگایەک دا رەشمالێکیان بە دی بکردایە، ئەنیشتنەوە و ئەمیان گیرابەوە دواوە. بەلام ئیمە نیتر ژیانی خومان و، ریگای پەیوەندی مان لە گەڵ ریکخستن و پێشمەرگەکانی خومان لە ناوچەکانی تری کوردستانی عیراق و، لە گەل چەند کەسێکی باش لە سەردەشت و خانە و شنو لە دیوی ئیران ریکخست بو.

خەلیل جەلال و هاوار جەلال لە نزیک قەلاتوکان بنکەیەکی نهینیان دانا بو، هەم ئازوقەیان بو ئەکرین و بویان ئەناردین، هەم پەیوەندیان لە گەل ریکخستنەکانی شاردا بو

دابین کرد بوین. کاک ئیبراهیمی براگەورەیان تەگبیری کرد بو.

*

لە ڕەشایی ناو یەکێ لە هەوارە بەرزەکانی قەندیل چەند خێوەتێکی هەژارانەمان هەڵ دابو. چوار دەورمان هێشتا بەفر بو. یەکێ لەو کوردانەی شەمزینان کە ساڵی پار بوبو بە ئاشنامان و، زۆری یارمەتی دابوین، پەیدا بو. نامەی عەبدولحافظی هێنا بو. حافظ لە نامەکەی دا هەواڵی لە ناوچونی هێزەکەمان و، گیرانی سەرکردەکانی بۆ نوسی بوین. ئەمە وەکو ئەوە وابو هەورە تریشقە لێمان بدا. تا ئەو کاتە هەواڵەکەی بی بی سی مان بیست بو، لە ڕۆژنامەکانی تەهرانیش دا هەندێ وردە دەنگوباسی شەڕ و شۆڕی تەهران هێزەکانی یەکێتی و قم مان دی بو. بەڵام دڵمان بڕوایی نەئەدا بڕوا بکەین هێزەکەمان لە ناو چوە، هێشتا هیوایەک مان هەر هەبو، تا ئەم نامەیەی حافظ مان پێ گەیشت و، هەواڵەکانی یەکلایی کردەوە.

هێزەکەمان و، کادر و سەرکردەکانی، گەورەترین سەرمایەی ئێمە بون، بە ڕەنجی دو ساڵی سەختی پڕ لە ماندوبون کۆمان کرد بونەوە و ڕێکمان خست بون، ئومێدی گەورەی گەلەکەمان بون، ئەو بەڵێ ی هەروا بە ئاسانی ڕەنجەڕۆ بوبین!

پێشتر زۆرم بیر لێ کرد بوەوە ئەگەر لەم ڕوداوەدا هێزەکانمان لە دەس دا چی بکەین؟ ئێمەش واز بهێنین و، بچینەوە بۆ دەرەوەی وڵات، یان درێژە بە ئەرکی نیشتمانی و نەتەوەیی خۆمان بدەین و، سەر لەنوێ دەس پێ بکەینەوە؟ بە تەنها چوم بۆ لای مامجەلال. هەندێ قسەی گشتی مان کرد، ئینجا وتم: «مامجەلال دڵنیای لەوەی من تۆم خۆش ئەوێ؟»

وتی: «بەڵێ دڵنیام!»

وتم: «من ئەوەندە تۆ بە پێویست ئەزانم بۆ گەلەکەمان، ئەگەر گوللەیەک بێت بۆ تۆ من خۆمی ئەدەمە بەر بۆ ئەوەی بەر تۆ نەکەوێ!»

وتی: «دڵنیام وایە»

وتم: «مادەم دڵنیای لە دڵسۆزی و خۆشەویستی من، ئەمەوێ هەندێ قسەت بە سەربەستی لە گەڵ بکەم»

وتی: «فەرموو!»

وتم: «ئەو هێزەی هەمان بو لە ناوچو، شتێکی ئەوتۆمان نەماوە، مەعلوم نیە ئێمەش ئەمێنین یا تیا ئەچین، تا ئێستا سەرکردەکانی کورد لە شکان دا هەڵاتون، با ئەمجارە ئێمە نەریتێکی تازە بۆ نەوەکانی داهاتو دابهێنین و ڕانەکەین ئەگەر پێویستی

کرد لە دوای خۆمان چەند گۆڕی لە کوردستان بە جێ بهێڵین. خەڵک بڵێن ئەمانە ڕایان نەکرد مانەوە تا کوژران! دڵنیام ئەگەر خۆمان ڕابکەین هەڵە ئەسپێنەوە»

مامجەلال قسەکانی پێ خۆش بوو. وا ڕێک کەوتین بە هەموو توانامانەوە لە جاران زیاتر خۆمان ماندوو بکەین بۆ هەڵسانەوەی باری گلاوی شۆڕشەکە و، ڕێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە. لە گەڵ د. مەحمود و جەلال قسەمان کرد. ئەوانیش بەڵێنی هاوکاریان پێ داین.

*

هاتنەوەی جەمالی عەلی باپیر

تەنیا ئاڵسی لە شەڕەکانی تورکیا دەرباز بوون و گەڕانەوە ٨ کەس بوون لەوانە جەمالی عەلی باپیر، حەسەنی حاجی مەحمود، تاهیری حاجی عەزیز... ئەمان چووبوونەوە ناو کوردستانی عێراق و، لە بادینانەوە گیرا بوونەوە. بە درێژی ڕووداوەکانیان بۆ گێڕاینەوە. هەر لەو ماوەیەدا گۆڤاری «الوطن العربي» کە لە پاریس دەرئەچوو، سەر بە عێراق بوو، وتارێکی درێژی لە سەر ڕووداوەکان نوسی بوو، باسی خۆبەدەستەوەدانی تالیب ڕوستەم و، هێزەکەی ئەوی کرد بوو. بە زمانی ئەویشەوە هەندێ قسەی نوسی بوو.

*

هەڵاڵ درندە

لەو هێرشەدا کە جەیش و هێزی ئاسمانی عێراق بۆ سەر هێزەکەی یەکێتی کرد بوو لە برادۆست، گوڕانیوز عەبەی مەلا کوژرا بوو. ئەنوەری سەعید والی بە سەختی بریندار بوو. بە برینداری گوێزرابوونەوە ماڵە جوتیارێکی برادۆست لەوێ حەشاریان دابوو تا برینەکانی کەمێ سارێژ بوو بوو. بە هۆی دوستەکانمانەوە لە شنۆ هاتەوە بۆ قەندیل. هێشتا بە تەواوی چاک نەبووبوو. ئەم بنەماڵەیە لە کارەساتی هەکاری دا زیانی زۆریان لێ کەوت. کاک تاهیر و ڕوستەم گیران و، ڕەوف بەگ کوژرا و، ئەنوەر بریندار بوو.

ئەنوەر لە سەردەمی هەرزەکاریەوە تێکەڵاوی کوردایەتی بوو بوو. لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بوو. ئەمجارەش لە گەڵ دەس پێ کردنەوەی شۆڕش دا سەرلەنوێ هات بووە ڕیزی پێشمەرگایەتی. پیاوێکی کەمدوو و هێمن و هێمن بوو. لە سەرەتای شەستەکان دا کە لە پارتی دا ناوی نهێنییان بۆ دانا بوو، ناویان نا بوو «هەڵاڵ بڕندە». بەو هۆیەوە هاوڕێکانی بۆ ئەوەی تووڕەی بکەن گۆڕی بوویان بۆ «هەڵاڵ درندە»، ڕاستییەکەی نەک درندە نەبوو، بەڵکو پێشمەرگەیەکی دڵناسک و باش و دڵسۆز بوو، دواییتر لە بۆسەیەک دا کە جاشەکانی زەرایەن بۆیان دانا شەهید بوو.

*

ئەم گیراوەکانی هەکاری کرد بو بە چەند تاقمێکەوە:

– عەلی عەسکەری، خالید سەعید، شێخ حسێن لەو کاتەوە کە گیرا بون لەوانی تر جیا کرا بونەوە، کەس ئەی دی بون و، کەس ئەی ئەزانی لە کوێن.

– ئازاد هەورامی، شێخ عەلی (مەحمود عەبدوررەحمان)، عەلی شەمە، حامیدی حاجی غالی، لە کادرەکانی کۆمەڵە، پێکەوە لە شوێنێک دا گیرا بون.

– تایەری عەلی والی، سەید کاکە، قادری مامەند ئاغای میراودەلی، عومەری حاجی عەبدوللا، دەس بە سەر لە نزیک خۆیانیان دانا بون.

ئەم زور خەریک بو بو لە گەڵ پێشمەرگەکانی یەکێتی بچنە ریزی ئەم موە. جگە لە چەند کەسێکی کەم ئەوانی تر ئامادە نەبون هیچ جورە هاوکارییەکیان لە گەڵ بکەن. ژمارەیەکی زوریان لە پێشمەرگەکان، بە تایبەتی تازەکانیان، ناچار کرد بو تەسلیمی عیراق بینەوە. هەندێکی تریشیان لە وی گل دابوەوە. پاش ماوەیەک یەکە یەکە و دو دو تێزنیان ئەدان برون، بە زوری ئەهاتنەوە بو لای ئێمە.

عوسمانی قادر منەوەر و ئەبەز گەیشتنەوە. هەواڵەکانی ئەوی یان بە درێژی بو باس کردین. دوای ماوەیەک سەلامی مەلا عەبدوللا شیان تێزن دابو. سەلام لە سەرەتاوە پاسوک بو، ئەیویست سەفەر بکا بو ئەورووپا.

هەوڵێکی زورمان دا هەواڵی چارەنوسی کاک عەلی و هاوڕێکانی بزانین. زور کەسایەتی ناوچەکەمان راسپارد، لەوانە شەمسەدین موختاری گوندی هەرکی کە لە مەیدانی روداوەکانەوە نزیک بو. هیچ ئەنجامێکمان دەس نەکەوت.

کوڕێکی کەرکوکی ناوی «کامیل» بو، ئەویش لە گیراوەکان بو تێزنیان دا بو. گەیشتەوە لامان. ئەویش هەواڵ و دەنگوباسەکانی گیراوەکان، ئەوەندەی ئاگای لی بو، بوی گێرایەوە. هەواڵی کاک عەلی و هاوڕێکانی مان لی پرسی. وتی: «ئەوانیان هەر لە سەرەتاوە لە ئێمە جیا کردەوە. شوێنەکەیان دیار نیە. بەڵام لام وایە نەماون». وتمان: «چون ئەزانی؟». وتی: «پێڵاوەکانی کاک خالیدم لە پی ی یەکی لە حەرەسەکان دا بینیەوە». کاک خالید کە لە سوریاوە گەرابوەوە، جوتی پێڵاوی باشی شاخەوانی لە گەڵ خوی هێنا بو، بو ئەم سەفەرە لە پی ی کرد بو. ئەمە تێبینییەکی ورد بو. کامیل لە کاتی خوی دا «مەعاون شرطە» بو بو.

ئەم تێبینییە ئێمەشی خستە پەژارەوە. ترسێکی زورمان هەبو لە چارەنوسی هاوڕێکانمان.

*

پاش ماوەیەک دەرکەوت دوای گیرانیان بە چەند رۆژێ سەرانی ئەم: سامی سنجاری، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیق، ئازاد بەرواری، نورەحمان بیداوی، غازی زیباری، ئازادی مەحمود خطاف، وریای رەوف سەعاتچی... لە کۆبوونەوەیەکی خویان دا بریاری «نیعدام» هەر سێکیان: عەلی عەسکەری، خالید سەعید، حسین بابەشیخ یان ئیمزا کرد بو، دوای ئەوەی مەلا مستەفا لە واشنتونەوە فەرمانی پێ دابون بە گەورەترین چەک بیانکوژن.

هەر سێکیان کرد بون بە نیشانەی ئاریپیجی حەوت.

کوشتنی ئەم ٣ سەرکردەیەی یەکیتی بە فەرمانی بارزانی و، لە لایەن ئەم موە دوژمنایەتی نیوان یەکیتی و پارتی قولتر کرد. کوشتنەکەیان دوای گرتنیان و، لە ناوچونی هێزەکانی یەکیتی، زۆر ناڕەوا بو. کوشتنیان بی چاوەڕوانی و لەپەرسینەوە، پێچەوانەی قانون و ویژدان و، پێچەوانەی نەریتی سیاسی و کومەلایەتی باوی کوردەواری بو.

ئەم ئەنجامەی ئەو کارەساتەی بە سەر یەکیتی هات بو، یەکجا بە سەرەتای دەس پێ کردنی قوناغی دوستایەتی و برایەتی لە گەڵ یەکیتی. بەلام ویستی بیکا بە سەرەتای لە ناوبردنی یەکجاری یەکیتی چ وەکو ریکخراوێکی پیشمەرگەیی و، چ وەکو ریکخراوێکی سیاسی.

*

کاک عەلی کوری شیخ عەبدوللا و برازای شیخ عەبدولکەریمی شەدەلە، شیخی تەریقەتی حەقە، سالی ١٩٣٧ لە گوندی عەسکەر لە دایک بو بو. باوکی یەکێ بو لە لایەنگرەکانی شیخ مەحمود لە شورشەکانی دا بو بە دەسهێنانی مافی نەتەوەیی کورد.

ئەو کاتەی قوتابی ساناوی بو لە کەرکوک لە سەردەمی پاشایەتی دا چوە ناو یەکیتی قوتابیانی کوردستان و، ئینجا بو بە ئەندامی پارتی. لە هەردو ریکخراوی قوتابیان و لاوان دا بو بە ئەندامی «لیژنەی بالا». دوای شورشی ١٤ ی تەموز بو بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی کەرکوک و، لە یەکەمین کونگرەی ئاشکرای پارتی دا سالی ١٩٦٠ هەلبژیردرا بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی و، لە پاش ئەوەی دریژە بە خویندنی زانستگا بدا بو بە کادری پیشەیی پارتی.

ئەو کاتەی بارزان کەوتە بەر هێرشی خیلە نەیارەکانی دەوروپشتی، پارتی کاک عەلی نارد بو بو بادینان، بو سازدانی ریکخراوەکانی پارتی و کوکردنەوەی چەکدارەکانیان

بو بەشداری لە پاراستنی بارزان و بارزانییەکان. ئەرکەکەی بە جوری ئەنجام دا جیگەی ریزیکی تایبەتی شیخ ئەحمەد و مەلا مستەفا بو.

عەلی عەسکەری لە بادینان مابوە و لە گەڵ عەلی حەمدی و ئەحمەد عەبدوللا، هەردوکیان ئەندامی کومیتەی ناوەندی بون دوایی‌تر بارزانی هەر یەکەی بە جوری کوشتن، کاروباری ئەوی یان بەریوە ئەبرد و لە گەڵ دەس پی کردنی شورشی ئەیلول دا عەلی وەکو لیپرسراویکی پیشمەرگە لە بادینان مابوە. بە هوی ئەو بروسکەیەوە کە شیخەکانی بارزان بو قاسمیان نارد و، بە هوی ئەو قسانەوە کە شیخ ئەحمەدی بارزانی بە دەنگی خوی لە رادیوی بەغداوە کردی و، داوای لە خەلک کرد: «ئالوز یالوز نەکەن» و «بگەرینەوە ناو عەیل و عەیالی خویان» و، بەشداری لە شورشەکەدا نەکەن، توشی کیشەیەکی گەورە بو زوری ئەوانەی لە گەڵی بون بە جی یان هیشت و بە هیزیکی پچوکەوە مابوە.

لەو تیشکانەدا مەلا مستەفا نوینەری خوی نارد بو بو تورکیا و سوریا داوای پەنادانی سیاسی لی کرد بون. عەلی و هاوریکانی هەولیکی زوریان لە گەڵ دا لەو بریارە پەشیمانی بکەنەوە. داوایان لە مەکتەبی سیاسی کرد چالاکی پیشمەرگە لە ناوچەکانی تری کوردستان دا زیاد بکەن و، پارە و یارمەتی بو بنیرن بو ئەوەی بینیینەوە. هەردو حکومەت داواکەی بارزانییان رەت کردەوە. جولانەوەکەش بەرە بەرە هەلسایەوە. عەلی بە دریژایی ۱۹٦۱ تا ۱۹٦۲ لە گەڵ بارزانی مابوە و، یەکی بو لە نزیکەکانی، یارمەتی ئەدا بو ریکخستنی هیزەکان و، سەرکردایەتی چەندین شەری کرد لە بادینان بو تیکشکاندنی هیرشی جاشەکان.

بارزانی ئەیویست نفوز و هەیبەتی پارتی وەکو حیزب بشکینی. ئەمەش لە گەڵ بیری عەلی نەئەگونجا لە سەر ئەوە بارزانی بە جی هیشت و گەرایەوە ناوچەی سلیمانی کرا بە فەرماندەی «هیزی خەبات» کە بەشی زوری لیوای سلیمانی ئەگرتەوە. تا لەت بونی پارتی لە ۱۹٦٤ دا ئەم فەرماندەی ئەو هیزە بو، بە یەکی لە سەرکەوتوترین و ئازاترین فەرماندەکانی پیشمەرگە ناسرا بو.

لە لەت بونی پارتی دا لە گەڵ مەکتەبی سیاسی مابوە. لە گەڵیان چو بو ئیران و، لە گەڵ ئەوان گەرایەوە. بارزانی لە دولەرەقە دەس بەسەر دای نان. هەر لە گەڵ ئەوان هەلات و، سەر لەنوی پارتی و پیشمەرگەیان ریک خستەوە. سالی ۱۹۷۰ دەوریکی کاریگەری گیرا بو ئاشتبونەوەی بالی مەکتەبی سیاسی لە گەڵ بارزانی و، دەوریکی کاریگەری گیرا لە کونگرەکەدا بو هەلوەشاندنەوەی ئەم حیزبە، کە مەرجی یەکەمی بارزانی بو بو ئاشتبونەوە. لەو ساوە ئیتر لە چومان دانیشت. کە ۷٤ شەر هەلگیرسایەوە و،

هێرشی جەیش بۆ سەر ناوچەکانی نزیک بارەگای بارزانی دەستی پێ کرد. بارزانی عەلی عەسکەری هەڵبژاردە بۆ سەرکردایەتی ئەو هێزەی ناوچەی سەرکردایەتی ئەپاراست. ئەمجارەش ئەرکەکانی خۆی بە چاکی بە جێ هێنا و تا ڕۆژی ئاشبەتاڵ ناوچەکەی پاراست.

دوای ئاشبەتاڵ چوە تەهران بەڵام کە لە بارزانی نائومێد بو لە گەڵ هەندێ لە هاوڕێکانی قسەیان کرد بە یەک کە بگەڕێنەوە کوردستانی عێراق و، ڕێکخستنێکی تازە دروست بکەن. گەڕانەوە و «بزوتنەوە» یان دامەزراند، بەڵام عێراق دوری خستەوە بۆ خوارەوی عێراق و، لە ڕوناهی کردی بە سەرۆکی شارەوانی. مامجەلال لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی دا پەیوەندی لە گەڵ دامەزراند. لە گەڵ دەس پێ کردنەوەدا ئەمیش لە ڕوناهیەوە هەڵات بۆ چیاکانی کوردستان. هاتنی کاک عەلی و عومەر مستەفا و خالید سەعید و هاوڕێکانیان تەوژمێکی گەورەی بە جولانەوەکە دا.

لە یەکەمین کۆبونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی دا بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی و، فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەڵبژێردرا.

ناسیاوی من لە گەڵ کاک عەلی ئەگەڕایەوە بۆ ٦٣. ئەو کاتە ئەو فەرماندەی هێزی خەبات و من خوێندکاری زانستگای بەغداد بوم دوای دەس پێ کردنەوەی شەڕ لە کوردستان دا (حوزەیرانی ٦٣) تازە لە بەغداوە هەڵات بوم و گەیشت بوم بە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ئەشکەوتەکەی ماڵومە.

ناسیاوییەکمان سالانی ٦٤ - ٧٠ بەهێزتر بو. هەرچەندە ماوەیەک ناکۆکی کەوتە بەینمانەوە بەڵام زور زو ئاشت بوینەوە و، دوستایەتی مان دوای ٧٠ لە بەغداد و دوایەتر کە چوین بۆ بارەگای بارزانی بەهێزتر و قوڵتر بو.

کاک عەلی پیاوێکی دڵپاک، قسە خۆش، نوکتەباز، ئەدەب دوست، ئازا و چاو نەترس بو، ڕێزی هاوڕێکانی ئەگرت و وەفادار و بەر چاو فراوان بو. کوژرانی بەو جۆرە و لەو تەمەنەدا زیانێکی گەورە بو لە یەکێتی و لە کورد.

*

خالید سەعید

کاک خالید کوڕی حاجی سەعید لە کۆیە سالی ١٩٣٤ لە دایک بوبو. بە هەرزەکاری تێکەڵاوی کاری سیاسی بو بو. هەر زو بو بە ئەندامی پارتی و، دوای شۆڕشی ١٤ ی تەموزی ٥٨ ئەندامی لیژنەی ناوچەی کۆیە بو. لە مانگی ئەیلولی ٦١ دا کە چەکداری عەشیرەتەکانی کورد ڕێگاوبانەکانیان گرت، کاک خالیدیش لە گەڵیان چەکی هەڵگرت و، دوای بڵاوە لێ کردنی ئەوان، ئەم خۆی و چەند پێشمەرگەیەک مانەوە تا

جولانەوەکە خوی ریک خستەوە.

لە پیشمەرگایەتی دا بە ئازایەتی و لیوەشاوەیی و توانای بەدەنی ناسرا بو. لە ناو پیشمەرگەدا خوشەویست و بەریز بو. هەر لە بەر ئەم سیفەتانە بو بە سەر لق و، بو بە فەرماندەی بەتالیون و، فەرماندەی قوەتی گەروک. سەرکردایەتی دەیان شەری گەورەی کرد بو.

لە سەر داوای بارزانی لە ناو شاری کویەدا بوسەیەکی بو حەویزی مام یەحیا دانا، خوی و تاقمی لە چەکدارەکانی کوشت. حەویز سەروکی جاشەکانی کویە و، ناحەزی بارزانی بو. دوای ئاشبەتالْ ئەم زو گەرایەوە عیراق. بو ئەوەی لە کوردستان دوری بخەنەوە بە موچەخور لە «نەخوشخانەی شەمّاعیە» لە بەغدا دایان مەزراند.

کە یەکیتی دامەزرا پەیوەندی دامەزراند و، چەند ریکخراویکی گرنگی لە ناو کونە پیشمەرگەکانی ئەیلول دا دامەزراند، کە لە هەلگیرسانەوەی شورشەکەدا دەوری کاریگەریان هەبو. کاک خالید لە پەیوەندییەکی بەردەوام دا بو لە گەلْ مامجەلالْ و دەستەی دامەزرینەر و، زور بە گەرمی داوای دەس پی کردنەوەی خەباتی چەکداری ئەکرد و، لای وا بو هەرچی زوتر دەس پی بکریتەوە باشترە، چونکە کات بە قازانجی دوژمن تی ئەپەری و، نائومیدی خەلک زورتر ئەبی.

کە دەستەی دامەزرینەر داوایان لی کرد بچیتە شاخ، بی دودلی یەکسەر خوی و هاوریکانی ئامادە کرد. هەر ئەمیش داوای لە کاک عەلی و لە کاک عومەر مستەفا کرد، بینە ناو یەکیتییەوە و، لە گەلی بچنە شاخ بو دەس پی کردنەوەی شورش و، ئەوانیش داوایان لی کرد بەرامبەر بە بەشداری کردنی ئەوان لە یەکیتی دا و، لە شورشەکەدا، کاک خالید بچیتە سەرکردایەتی «بزوتنەوە» وە.

ئەوانە بە کومەلْ چونە شاخ و، لە گەلْ خویان کومەلیک کادر و پیشمەرگەی ناسراوی شورشی ئەیلولیان بردە شاخ و، لە ناو خەلک دا دەنگیکی گەورەی دایەوە.

بو یەکخستنی هەولی پیشمەرگایەتی لە ناوچەکانی بابان و سوران و، دوزینەوەی ئیبراهیم عەزو و هاوریکانی، گەشتیکی دریژی بو بادینان کرد، بەلام کەسی نەدوزیەوە، چونکە ئەم ئیبراهیم و هاوریکانی کوشت بون.

بەهاری ۷۷ هاتە هەلگورد و دەشتی بەرازگر و برادوست بو ئەوەی لە گەلْ ئیمە لە سوریا پەیوەندی دابمەزرینی و، هەر لەوی مایەوە تا پەیوەندی مان دامەزراند. من لە کوتایی مانگی نیسانی ۷۷ گەیشتمە برادوست و، مانگی نیسان یەکتری مان بینی و، لە برادوست بنکەمان دانا و، هەلْالاتی دەرەوە دەستیان کرد بە گەرانەوە.

ناسیاوی کاک خالید و من ئەگەڕایەوە بۆ سالی ١٩٦٤ ئەو کاتەی تازە خەریک بو پارتی لەت ئەبو. دوای ئەوە لە بونەی جیاجیادا چەندین جار یەکتری مان دی بو تا من چوم بو ڤیەننا.

دوای گەڕانەوەم لە گەڵ کاک خالید بوین بو بە دو هاوڕێ ی زور نزیک. ناخی دەرونی خومانمان بو یەکتری هەلئەڕشت و، بیرمان لە چارەسەر کردنی کیشە و گیروگرفتەکان ئەکردەوە و. لە زور شت دا هاوبیر و هاوڕەش بوین.

عاشقی گەڵ و نیشتمانەکەی بو. نمونەی پێشمەرگەی خوراگر و پشو درێژ بو، توانایەکی بێ وینەی بەرگە گرتنی ناخوشیی و ماندوبەتی و ریگا رویشتن و بە شاخ دا هەلگەرانی هەبو. لە مردن نەئەترسا و گوێ ی نەئەدایە دوژمنایەتی و سەختی.

*

شیخ حسین کوری بابەشیخ سالی ١٩٤١ لە شیخان لە دایک بو بو. هەر لەوێ چو بوە بەر خویندن و لە سەردەمی لاویتییەوە تیکەلاوی کاری سیاسی بوبو، چو بوە ریزی یەکیتی قوتابیانی کوردستان و، دوایيتر پارتیەوە. سانەوی تەواو کرد بو. بو بو بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی شیخان و، لە کاتی هەلگیرسانی شورشی ئەیلول دا گیرا تا ٦٤ لە زیندان دا مابوەوە. دوای بەربونی چوە ریزی پیشمەرگەوە. ماوەیەک لیپرسراوی لیژنەی ناوچەی شیخان و، ماوەیەک فەرماندەی بەتالیون و، ماوەیەک ئەندامی لقی دهوک بو.

دوای ئاشبەتال بە پێی لە تیرانەوە بە ناو تورکیادا خوی گەیاندە سوریا و لە قامیشلی جیگیر بو. یەکێ بو لە کادرە هەرە چالاک و ژیرەکانی یەکیتی لە جەزیرە. مانگی مایسی ٧٧ سەرکردایەتی پێشمەرگە بادینییەکانی کرد بو گەرانەوە لە جەزیرەوە بو کوردستانی عیراق. لە یەکەمین کوبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی دا هەلبژیردرا بە ئەندامی سەرکردایەتی و فەرماندەی هەریمی بادینان.

لە گەڵ کاک خالید پیکەوە هاتن بو ناوچەی سلیمانی و پیکەوە لە ناوچەکەدا گیراین و پیکەوە چوینەوە بو توکان.

پیویست ناکا دوبارە لە سەر خو و رەوشتی جوامیرانەی ئەم پیاوە بنوسم چونکە پیشتر باسم کردوە.

*

کەوتینە کار، کاری بێ ماندوبونی روژ و شەو.

من ژمارەی دوەمی «هەوالنامە» م ئامادە کرد و، سەروتارەکەیم تەرخان کرد بو ئەم کارەساتە. ناردمان حەمە سەعید و هاوری جەبار و چەند کەسیکی تر هاتن بو ئەوەی

کاروباری چاپ و بڵاوکردنەوە ڕێک بخەین.

مامجەلال نامەی بۆ هەڤالاتی دەرەوە و، «تجمع» و، سەرۆک ئەسەد و، سەرۆک قەذذافی... نووسی و، شەمال نامەکانی برد و، لە ڕێگای ئەو دۆستانەوە لە ناو کوردەکانی تیهران دا پەیدامان کرد بۆ بە نهێنی بە ناو تیهران دا چو بۆ تورکیا و لەوێوە بۆ سووریا.

لە گەڵ مامجەلال سەدان نامەمان نووسی بۆ ڕێکخراوەکانی یەکێتی، فەرماندەکانی پێشمەرگە و، کەسایەتی و پیاوماقوڵەکانی کورد، سەرانی ئێل و ڕیش سپی و پیاو ماقوڵاتی ناوچەکان، ڕووداوەکانی هەڵکارێمان بۆ ڕوون کردنەوە، داوامان لێ کرد بوون: هەر کەسە بە گوێرەی توانای خۆی بەشداری بکا لە ژیاندنەوەی شۆرشەکەدا. بە پارە، بە چەک، بە چەکهەڵگرتن و پێشمەرگایەتی، بە قسەی باش و ڕێکخستن.

کارەکەمان لە ماوەیەکی کورت دا ئەنجامی زۆر گەورەی بە دەستەوە دا. خەڵک بە دەنگمانەوە هاتن بە سەدان کەس بە چەکی خۆیانەوە لە سەرانسەری کوردستان دا بوون بە پێشمەرگە. هێزێکی تایبەتی مان بۆ مەکتەبی سیاسی دروست کرد، ناومان نا «هەرێمی پارێزگاری» لە ماوەی چەند حەفتەیەک دا ۱٤ کەرت مان پێک هێنا و، ژمارەیان لە ۷۰۰ پێشمەرگە تێ پەڕی. زۆری هەرێمەکانی تریش مان بوژاندەوە.

هێزەکانمان لە گەشە کردن دا بوون و، تا ئەهات ژمارەیان زۆرتر ئەبو. زۆریان نەخوێندەوار و خەڵکی لادێ بوون. بۆ ئەوەی چۆنایەتی سیاسییان باش بکەین پێویستی مان بە ژمارەیەک کادری سیاسی خوێندەوار هەبو دایان بنێین بە ڕابەری سیاسییان. داوام لە سەرکردایەتی ڕێکخستنەکانی ناوخۆ کرد: هەندێ کەس مان بۆ بنێرن بە کەڵکی ئەم کارە بێن. پاش ماوەیەک چەند کەسێکیان بۆ ناردین لەوانە: دانا ئەحمەد مەجید، کۆکۆ عەسکەری، پشکۆ ناکام، جەلال شێخ توفیق، نوری محەممەد عەلی... هەموویان ئەندامی کۆمەڵە و، گەنجی تازە پێگەیشتو و، شاری بوون، وایان چاوەڕێ کرد بو ژیان لە سەرکردایەتی یەکێتی خۆشتر بێ لەوەی کە دیتیان، هەندێکیان تووشی «خیبە امل» بوون، بۆ ئەوەی چاویان بکرێتەوە ماوەیەک لای خۆمان گلمان دانەوە.

*

سیستەمی ئایدیۆلۆجی

ڕۆژێکیان یەکێ لە پێشمەرگەکان لێ ی پرسیم: «سیستەمی ئایدیۆلۆجی چیە؟». پرسیارەکەیم بە لاوە سەیر بو وتم: «لە چی دا ئەمەت خوێندوتەوە؟». وتی: «نەمخوێندوتەوە». وتم: «ئەی لە کوێ بیستوتە؟»

وتی: «دکتۆر حسێن و حەمەسەعید ئەم بەیانیە لە سەر پاککردنی سەرۆیی

ئیکچوون. دکتور حسێن زۆر تووڕە بوو بە حەمەسەعیدی وت: «برۆ تۆ سیستەمی ئایدیۆلۆجیت تێک چووە!».

دکتور حسێن کادری «سازمانی ئینقیلابی حیزبی توودە» بوو. لە گەڵ مامجەلال هات بوو بۆ کوردستان و هەر لە گەڵ ئێمە مابووەوە. سەری لە بڕینپێچی دەرئەچوو لە بەر ئەوە پێمان ئەوت دکتور. کوڕێکی خۆراگر و خاوەن باوەڕ بوو. زۆری خزمەتی پێشمەرگە ئەکرد. دوای ڕوخانی شا ئینجا گەڕایەوە بۆ تەهران.

*

شێخ محەمەدی کاریزە جوابی بۆ ناردبوین کە ئەیەوێ مامجەلال ببینێ. هات بوو بۆ قەلاتۆکان لەوێ چاوەڕوانی ئەکرد. مامجەلال هەندێ لە کوێخاکانی مەنگوڕی لە گەڵ خۆی برد. منیش لە گەڵی چووم. حەسەنی برایم شوان ڕەشماڵێکی لە هەوارێکی پشتی «قەلاتۆکان» هەڵ دابوو. جێگای گفتوگۆکەمان لەوێ دانا بوو.

لە گەڵ شێخ محەمود دانیشتین. پاش چاکوچۆنی و هەواڵ پرسین. مامجەلال لە شێخ محەمودی پرسی: «فەرموو قسەکانت بکە!»

شێخ محەمود وتی: «من حکومەت ناردومی لێتان بپرسم: ئێوە چیتان ئەوێ؟»

مامجەلال وتی: «هیچی تریان پێ نەوتی؟»

وتی: «نەخێر. هەر ئەوەندەیان وتوە لێتان بپرسم: چیتان ئەوێ؟»

مامجەلال وتی: «بچۆرەوە پێیان بڵێ: هیچیان ناوێ ئەوانە جەماعەتێکی شێتن داویانەتە شاخ»

شێخ محەمود چەندێ لە سەری ڕۆیشت، مامجەلال لەوە زیاتر وەڵامی نەدایەوە. وتی: «قابیلە ئەوانە نەزانن ئێمە چی مان ئەوێ؟»

ئەم خولەی گفتوگۆ بەوەندە تەواو بوو. شێخ محەمودیان نەنارد بوو بۆ گفتوگۆ، لەو کاتەدا ئێمە توشی شکستێکی گەورە ببووین، بەعس ئامادە نەبوو هیچ دەسکەوتێکی سیاسی مان پێشکەش بکا. زۆری هێزەکانمان لە هەکاری لە دەس دابوو، ئەیانویست تاقی مان بکەنەوە دوای ئەو ڕووداوە ئاخۆ چۆن بیر ئەکەینەوە و، تا چ ئەندازەیەک کاری لە هەڵوێستی ئێمە کردوە.

*

هەندێ لەوانەی بۆ پارێزگاری ئێمە و ڕاپەڕاندنی کارەکان لە گەڵ ئێمە بوون، گەنجی خوێندەوار و، ڕۆشنبیر و ئازا بوون. دوای گەیشتنی تاقمێکی تر لە کادرەکانی شار، لە ناو پێشمەرگەکانی هەرێمەکانی تریش دا چەند کەسێکی کەمان هەڵبژارد و، لە دەوروای گورگان

«دەورە» یەکسان بو پەروەردەکردنی سیاسی بو کردنەوە.

بەشدارانی دەورەکە هەمو بەیانییەک لە خیوەتیک دا کو ئەبونەوە و، زیاتر لە ۳ سەعات قسەیان بو ئەکرا. مامجەلال دەرسی فەلسەفەی مارکسیزم و جەنگی پارتیزانی، د. مەحمود میژوی پارتی دیموکراتی کوردستان لە دامەزراندنیەوە تا ئاشبەتال و، منیش میژوی کورد و ئابوری کوردستان و، هەندی بابەتی پەیوەستم لە سەر ریکخستن پی ئەوتن.

قوتابیەکان زیرەک و گوێرایەڵ و ژیر بون. زوری بابەتەکانیان لە لای خویان ئەنوسییەوە و کەلکی زوریان لی وەرئەگرت. پاشان زوریان کاروباری پیشمەرگەیی و ریکخراوەییان پی سپیردرا.

*

صەددام بە بونەی ئاهەنگەکانی ۱۷ - ۳۰ تەموزەوە کوریکی روژنامەوانی بەست. لە وەلامی پرسیاریک دا دەربارەی ئیمە، وتی: ئەوانە هیچ نین لە شاخەکان دا گیریان خواردوە، جاروبار تەقە لە پولیسیکی گیل ئەکەن. ئیمە ئەتوانین تا ۲۰ سالی تر لە گەل ئەو جورە روداوانە بژین.

*

هێزەکەمان تا ئەهات قەرەباڵغتر ئەبو. ئەوانەی تیی دا کوبوبونەوە هەمویان لە گەل یەک تەبا و ریک بون.

دو جار شەماڵ مان، لە ریگای دوستەکانی تیهرانەوە، نارد بو سوریا.

مەلا عەلی گەنجیکی خاوەن باوەری کەللە رەق و لاسار بو. هەتا بلی ی لەش سوک و ئیشکەر بو، بەلام لە شتی زور پچوک توڕە ئەبو، خیشی ئەکرد و، مانی ئەگرت لە خواردن. هەندی جار خوی خواردنەکەی دروست ئەکرد، لە وەختی دانان دا توڕەیان ئەکرد، ئەتزورا و لی ی نەئەخوارد، نان و چای ئەخوارد.

بە کاداری گەراپەوە ناوچەی سورداش. کەوتە داوی دوژمنەوە گیرا و، ئیعدام کرا. لە زیندان دا دەستەیەک شیعری داناوە و، لە سەر وەرەقی پاکەتی جگەرە نوسی بویەوە و، بوی ناردبین. لە چاو شیعری زیندان دا بی ئەونەبو. لە ریزی شیعرە بەرزەکانی کوردا دائەنری. بە شیعرەکانیەوە دیار بو، شیعرەکانی هیمن کاریان تی کرد بو. لە کاتی خوی دا هەمومان لە دیوانیک دا چاپ کرد.

ئەم تاقمە پیشمەرگەیە، سەرەرای ئەوەی هەمو ئەرکەکانی پیشمەرگایەتییان بە جی ئەهینا و، ئیشوکاری روژانەی بارەگەکەیان رائەپەراند، کاروباری چاپی هەمو بلاو

کرلوەکانی یەکێتی و کۆمەڵەشیان نەکرد.

ئازاد و حەمە سەعید و جەبار و شێرکۆ و هیمن هەتا زەمانێکی درێژ لە گەڵمان مانەوە.

*

مامۆستا جەعفەر

فاضیل کەریم ئەحمەد، کادر بوو لە بەری قەرەداغ، لەوێ ناوی لە خۆی نا بوو: «مامۆستا جەعفەر»، من پێشتر ئاشناییم لە گەڵی نەبوو. بۆ کۆبوونەوەی کادرەکانی کۆمەڵە لە نۆکان نامەیەکی درێژی بە عەرەبی بۆ من نووسی بوو. نامەکەی هەندێکی لێکۆڵینەوە بوو لە سەر هەلومەرجی گشتی کوردستان و، هەندێکی بیرەوەریچوون بوو لە سەر کەموکورییەکانی کۆمەڵە و، هەندێکی پێشنیار بوو بۆ چاککردنی. وەکو هەنگم لە دارا دوزی بیستەوە دڵم خۆش بوو، لە ناو کادرەکان دا کەسێکی وام دۆزیبوەتەوە ژیرانە بیر بکاتەوە و، نووسەرێکی باش بێ. هەر ئەو کاتە لە کۆبوونەوەکان دا پێشنیارم کرد فاضیل لە ناوەندی دابنێین بۆ کاروباری نووسین.

هەندێ لەو برادەرانەی ئەیانناسی هاتنە لام وتیان: «پیاوی چاک بە، ئەمە مەعنەوەرە پێشەوە، ئەم کابرایە بە کەڵکی ئەو ئیشە نایەت». زۆریان لە سەر وت. ئەو شتانەی ئەوان لە سەر ئەم باسیان ئەکرد بایی ئەوە نەبوو من ژیوان بکاتەوە لە ناودیر کردنی. لام وابوو بەخیلی پێ ئەبەن کەڵکێکی تازە پێگەیشتوو بە زوویی پێش بکەوێ. هەرچۆنێ بوو زۆری هاوڕێکانم لە کۆبوونەوەکەدا رازی کرد و، خۆیشم نامەم بۆ نووسی بگاتە لای ئێمە بۆ ئەوەی ئەرکی نوێ ی پێ بسپێرین.

لە قەندیل بوین گەیشتە لامان. پیاوێکی بێدەنگ و مەرن بوو. لە چاو زۆر لە کادرەکانی تردا رۆشنبیرتر بوو، هەندێ وتاری لە رۆژنامە کوردییەکانی بەغدادا بڵاو کرد بوەوە.

بە مامجەلالم ناساند و، وەکو نوێنەری کۆمەڵە لای مەکتەبی سیاسی دامان نا. مەسئولییەت لەو زەمانەدا لە قەندیل هیچ دەبدەبەیەکی نەبوو، پیاو خۆی پێوە هەڵ بکێشێ یا بایی بێ. بەڵام دیارە ناوەکە خۆی زل بوو: ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە و ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی. بە هەنگاوی مامجەلال وحەڵقی عەشکەری و هەموومانی گرت بووەوە. پێشتر شتی وای بە خۆیەوە نەدی بوو، چاوەڕوانی شتی وەهاشی نەکرد بوو، لە بەر ئەوە هەر لە یەکەم رۆژەوە بە فیز و بایی بوونێکی زۆرەوە لە گەڵ پێشمەرگەکانی تر رەفتاری نەکرد. ئیوانی لە گەڵ هیچ کامیان خۆش نەبوو. پێشمەرگەکانی لە دەوری من

بون، هەموویان کادر بون و، هیچیان لەو پچوکتر نەبون، بەلکو هەندێکیان خۆیان لەو بە تێکۆشەرتر و گەورەتر دائەنا. تەنیا لە بەر پلەی لێپرسراوەتی لە کۆمەڵە و یەکێتی دا ڕێزیان ئەگرت.

مامۆستا جەعفەر خۆی لە قەرەی هیچ کارێکی بارەگەکە نەئەدا، وەکو میوان ئەجولایەوە، ڕۆژێکیان لە گەڵ صەلاح چاوشین دەمیان لە یەک گیرا بو. مامۆستا جەعفەر لە پاڵەوە هەرەشەی لە صەلاح کرد بو، وت بوی: «زۆر لە سەری بڕوی هەڵ ئەستم صەللیەیەک کلاشینکۆفت پیوە ئەنێم». صەلاح قسەخۆش و، گاڵتەچی بو، لە کاتی خۆی دا قسەی بو ئەهات، بە گاڵتە پێ کردنەوە وت بوی: «بە خوا سەیر ئەبی لەم شۆڕشەدا هێشتا تفەنگت نەکردوە، یەکەم تفەنگ لە منی بکەیت!»

لەم وەلامە قورشلی بوبو دابویە شاخ ویست بوی بڕوا بە سەد تکا و پارانەوە هێنامانەوە. هیچ سەرچیەکی سەرکردەی تی دا نەبو. زۆری پی ئەچو تی گەیشتم لە هەڵبژاردنەکەم دا زۆر بە هەڵە چوبوم، بەلام تازە نەئەکرا دەستی پیوە بنێم.

*

سالم، لە سەردەمی خۆی دا، ئەبی بە قەندیل دا تی پەڕی بی، چونکە لە شیعرێکی دا باسی هەوای فێنک و خۆشی ئەکا و، ئەلی:

شنەی نوردی بەهەشتی وەصلی یار گەر بی بە سەر من دا
لە لام قەندیل و لاجانە بە هاوین گەر لە مەسقەط بم

جارێکیان یەکی لە پێشمەرگەکان بە نارەزاییەوە پرسی، ئەری ئەو کابرایە کی بە وتویەتی:

بیرە کوردستان عەزیزم گەر تو سەیرانت ئەوی
بتهەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کویستانت ئەوی

تو بڵی ی خوی هات بی بو قەندیل؟ ئەگەر بی دیاپە ئەبوت: «بتهەمە قەندیل ئەگەر هەورازی جوانت ئەوی!»

ناخۆشی هەندی جار جوانی لە بەر چاو ئەخا. قەندیل بەو هەمو جوانی و پاکی و دەوڵەمەندییەوە لە بەر چاوی ئیمە، کە بە هەورازە بەفراوییە سەختە درێژەکانی دا هەڵئەگەراین، هیچ ڕەونەقێکی ئەما بو.

ئەمە یەکێکە لە شیعرە ئەنتەوبییە بە ناوبانگەکانی «ئەسیری» ی کەرکوکی لە سییەکان دا هەڵی بەستوە. ئەبی هات بی بەلام بیگومان نەک وەکو ئیمە بو پێشمەرگایەتی، بەلکو ئەبی بو سەیران و گەران هات بی.

لە بەر بەرزیی قەندیل داری لێ نارویّ. وەکو جوگرافیناسەکان ئەڵێن: لە بەرزایی ١٦٠٠ مەتردا لە ئاستی دەریاوە، سنووری روانی دار و درەخت تەواو ئەبێ. قەندیل بەرزوورى ٣ هەزار مەتر و لە هەندێ جێگادا بە تایبەتی لوتکەی «کەوگەز» نزیکەی ٤ هەزار مەتر بەرز بوو. بەلام هێشتا بلێ ی دەوڵەمەندە لە دەوەن و گژوگیا و، گوڵی جۆراوجۆر دا. لەوێ ئاشنای شلێر، چنور، مێلاقە، هەلالە، سوێسن، گوڵە رون، ئەسپون، گیابەند و خاو... بوم و، ریواس، مەندوک، کورادە، جاترە، گیلاخە، بیزان، هەلز و کەما..م ناسی.

هەروەها ژمارەیەکی زور جوروجانەوەری جوراوجوری وەکو پەپولە، پەروانە، جاڵجاڵوکە، کوللە، قالونچە، گوڵنەستیرە...ی لێ بوو. سەرەرای سارە و سەرما مار، دووپشک، پەسپەسوکە، مشک و کیچی هەبو.

گژوگیای قەندیل و جوروجانەوەرەکانی ئەتوانی چەندین لێکوڵینەوەی زانستییان لە سەر بکری و، ئەلبومی تایبەتییان بو ریک بخری. رەنگە چەند جور گوڵ و گیا و، جانەوەری تی دا بدوزریتەوە لە شوێنانی تر هاوتایان نەبێ. زورجار بە ئاواتم ئەخواست کە شارەزاییم هەبوایە لە زانستی بایولوجی دا، لە زولوجی یا بوتانیک دا بو ئەوەی کەلکم لەم هەلە وەربگرتایە.

لە بەهاردا کوارگی زورە. بەزوری لە سەرەنجی کەمای سالی پیشو دەرئەچی.

قەندیل ٣ گومی بچوکی لە سەرە: کرمە سوران، بیر خەلند، بیکوردبان. لەوەرگاکانی جێگای سەدان هەزار سەر ئاژەڵ ئەبیتەوە. لە کونەوە ئیلەکانی مەنگور، مامەش، ئاکو، بلباس، پیران، بالەک... کوێستانەکانیان لە ناو خویان دا دابەش کردوە. هەر ئیلە و، لە ناو هەر ئیلیش دا تیرە و هوز و بنەماڵەکانی هەواری تایبەتی خویان هەبوە، رانەکانیان تی دا لەوەراندوە.

بەرزاییەکانی قەندیل لە زستان دا مەل و ئاژەڵی لێ نازی. لە هاوین دا تاک و تەرا نێری و بزنەکێوی بو ئەچی و، کەودەری کە مەلیکە لە رەگەزی کەوە، بەلام گەورەترە، هەروەها هەلو هێلانەی لێ ئەکا. هەلو بە جوت لە ئاسمانی قەندیل دا ئەفرن. بو یەکەمین جار لە «ئەنگی سلێمانی» گویم لە چریکەی هەلو و، چاوم لە هەلمەت و دابەزینی بو بو راوی کەو. لەو کاتەدا پارەکەو گەورە ببوون. کەو بە پوڵ ئەیان قاسپاند. هەلو کە بە ئاسمانەوە ئەیچریکاند کەوەکان ورەیان بەر ئەدا و لە شوێنی خویان دا ئەوەستان، هەلوکە بە دەم فرینەوە دائەبەزی و پری بە یەکیکیان دا ئەکرد و ئەیفراند.

جیگەی داخە لە کوردستان هەلو و، هەمو ئەو مەلانەی لەم تیرەیەن وەکو: شەهین، چەرخە، بالەبان، دوبرا.. و، بچوکتر وەکو: باز، واشە، باشوکە، مشککرەو کوللارە.. زور

کەم بونەتەوە. هەندێکیان نەماون و هەندێکیان بە دەگمەن ئەبینرێن، لە کاتێک دا جاران زۆر بون.

*

پاش گیرانی کاک عەلی و کاک تاهیر، مەکتەبی سیاسی یەکێتی نوێنەری بزوتنەوەی تێ دا نەما بو. هیچ کەس لە ئەندامانی سەرکردایەتی بزوتنەوەش لە گەڵ ئێمە نەبو بەشداری کۆبونەوەکان و بڕیارەکان بکا. داوامان لە رەسول کرد کە یان خۆی یان نوێنەرێکی بزوتنەوە بنێری بۆ لامان. کاک رەسول دوجار هات. جارێک بۆ گفتوگۆ لە سەر ئەم مەسەلەیە و جارێک لە گەڵ هەمزاغای پشدەری.

بیروڕاکانی رەسول لە گەڵ هی ئێمە جیاواز بو، وەکو لە گەڵ بیروڕاکانی کاک عەلی و کاک خالید جیاواز بو، بە نەمانی ئەوان بالەکەی ئەمان ریگەیان بو تەخت بو وەکو ئەیانویست هەلویستی جیاواز لە هی یەکێتی وەربگرن. مەلا ناصیح لە شار ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە بو لەو ماوەیەدا ئەویش هاتە دەرەوە، بەلام مەلا ناصیح نەیئەتوانی تەرازوەکە راست بکاتەوە.

*

حاجی شێخە

لەو کاتەدا ئێمە هیچمان نەبو بیدەین بە پێشمەرگە: نە چەک، نە پارە، نە جلوبەرگ، نە «ئیمتیاز»، تەنیا شتی هەمان بو بیروباوەر و قسەی خۆش بو. زۆرجار لەمەش بێ بەشمان ئەکردن. یەکێ لە گەورەترین گیروگرفتەکانی من توڕەبونی مامجەلال بو. لە هەمو شت توڕە ئەبو ئەچو بە گژ پێشمەرگەکان دا و ئەیشکاندن، بە تایبەتی کە ماندو یا برسی ئەبو. هەندێ لەو پێشمەرگانەی رایان نەکرد یان نەتوران توڕەبونی ئەمیان نەکرد بە بیانو.

مامجەلال هەندێ نامەی نوسی بو داوی بە عوسمان پچکول بیبات. عوسمان تازە لە زیندانی قەڵ ئازاد کرا بو. سالی پار لەو بوسەیەدا کە بو حەسەن خرشناویان دانا ئەم گیرا بو. عوسمان لای حاجی شێخەی بنزێری پێشمەرگە بو. حاجی شێخە و مەفرەزەکەی بەشی بون لەو هێزەی ئەرکی پاراستنی مامجەلالیان لە ئەستو بو.

مامجەلال عوسمانی دی بو هێشتا نەرویشتوە بانگی کرد بو لێی پرسی بو بوچی نەرویشتوە نامەکان بیبات. وت بوی: «حاجی شێخە پێ ی وتم تازە ئەمرو درەنگە سبەینێ برو ا». لە سەر ئەوە مامجەلال توڕە بو بو عوسمانی چەک کرد بو و کەوت بوە جنێو پێ دان و لێدانی. حاجی شێخە لەمە دلگیر بو پێشمەرگەکانی لە بەرامبەرمان

دامەزراند. ئیمازی باش نەبو. بە پەلە لە خیوەتەکەمان دەرپەڕین. پێشمەرگەکانی ئیمەش بەرامبەر پێشمەرگەکانی حاجی شێخە دامەزران. من داپەڕیم بۆ لای مامجەلال. ڕەسوڵیش لەوێ بو ئەویش هاتە لای مامجەلال. مامجەلال لە بینینی دامەزرانی حاجی شێخە و پێشمەرگەکانی تورەتر بو پێی کرد بە کلاشینکۆفەکەی دا پەلاماریان بدا. هەلویستێکی ناسک و پڕ مەترسی بو. لەوانە بو ببێ بە تەقەی خوێنەو و یەکتری بکوژین، بە تایبەتی حاجی شێخە و ئەوان سەنگەریان لە مامجەلال گرت بو. هەرچۆنێ بو مامجەلالمان خاو کردەوە. عوسمانمان نارده جێگایەکی تر و حاجی شێخەمان هێمن کردەوە. حاجی شێخە خۆی کۆ کردەوە و دەمەو ئێوارە باری کرد و ڕۆیشت بۆ لایەکی تر.

مامجەلال کەمێ تورە نەبو، تورەبونەکەی ئەوەندە نائاسایی بو، دوای ئەوەی ئەهاتەوە سەر خۆی، ماتی دای ئەگرت و ئەخۆش ئەکەوت، هەندێ جار چەند ڕۆژێکی ئەخایاند. چەندێ لە گەڵی خەریک بوین ئەم خوە تەرک بکا، کەڵکی نەبو.

ئێوارەکەی بە مامجەلالم وت ئەگەر بە چاکی ئەزانی ئەچینە سەر حاجی شێخە و چەکی ئەکەین و بە گیراوی ئەیهێنینەوە. مامجەلال قەبولی نەکرد وتی چاکەی زۆری بە سەرمەوە هەیە بۆ کوێ ئەڕوا با بڕوا. حاجی شێخە بۆ ڕۆژی دوهەم لە قەندیل ئاوا بو پاش چەند ڕۆژێ تەسلیمی حکومەت بوەوە.

حاجی شێخە لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا لە گەڵ مامجەلال پێشمەرگە بوە و، لە شەڕی تەگەران دا بە بریندار بە دیل گیرا بو. لە سەرەتای شۆڕشی حوزەیران دا ئەم یەکێ بو لەوانەی لە ناوچەی حاجی ئومەران دەستەی چەکداریان دامەزراند و بەشدار بو لە دەس پێ کردنەوەی خەباتی چەکدار دا. ئەگەرچی تەسلیم بوەوە بەلام دەزگای ئیستیخبارات لی ی خۆش نەبو کوشتیان.

*

حاجی چاوشین

بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە قەندیل بوین هیچ جۆرەیەکی پەیوەندیمان نەبو لە گەڵ کادر و پێشمەرگەکان، تەنها ڕێگای پەیوەندی نامە و تەتەری پیادە بو.

ئەو کاتەی لە شارباژێڕ بوم کارێکم بە یەکێ لە فەرماندەی مەفرەزەکانی هەرێمەکەم سپارد ناوی حاجی چاوشین بو، بۆی نەکرا بو، من وامزانی کەمتەرخەمی کردوە، لە سەر ئەوە کە هات بۆ نوکان مەفرەزەکەیم هەلوەشاندەوە. بە دلشکاوی ڕۆیشت. ماوەیەک بزر بو وامزانی تەسلیم بوەتەوە.

حاجی چاوشین ناوی صدیق و ئەندامی کۆمەڵە بو. بە پیشە نانەوا بو. لە شۆڕشی

ئەیلول دا پێشمەرگایەتی کرد بو، سەرەتای ئەم شورشەش دیسان بویو بە پێشمەرگە. لە پێشمەرگایەتی دا ئازا و دلسوز بو. یەکێ بو لەوانەی لە ریگا رویشتن دا کەس پێ ی نەئەگەیشت.

لە پڕ حاجی چاوشین پەیدا بو ژمارەیەکی زور نامەی فەرمانده و کادرەکانی شاباژێر و هەورامان و قەرەداغی... هینا بو. ترمەز ئەو ماوەیەی بزر بویو ناوچەکان گەڕا بو. هەرچی نامەی هەبوە لی ی وەرگرت بون و هات بو بو سەرکردایەتی. حاجی پیاوێکی ئەمین و دەسپاک بو. داوای نا بە نامەبەری مەکتەبی سیاسی.

لە ماوەیەکی زور کورت دا بەریدی سەرکردایەتی ئەگەیاندە دوورترین شوینی پێویست و وەلامەکانی ئەهێنایەوە. پێشمەرگەکان لە بەر خێرایی هاتوچوی ناویان نا بو: «کوپتەری شورش». بە درێژایی چەند مانگ ئەم ئەرکە قورسەی بی پرتە و بولە ئەنجام ئەدا و، بە شوێنی پڕ لە مەترسی دا تی ئەپەری.

پاشان لە بەر ئەو دلسوزیە کرایە فەرماندەی کەرت لە هەریمی ٥ و، لەو پوستەیەدا کوژرا کە حەمەخانی حاجی دارا لە نزیک زەڕایەن بو فەیسەڵ تالەبانی (سیروان) و پولی لە پێشمەرگە و کادرەکانی ئەوی ی دانا.

*

حاجی نیرگز

هەندی لەوانەی هات بون بو پێشمەرگایەتی خەلکی گوندە راگوێزراوەکانی بناری قەندیل بون. یەکێ لەوانە ناوی حاجی کاک ئەحمەدی پشتناشان بو. خوی بە پڕاگەورەی پشتناشانییەکان دائەنا. پیاوێکی ساویلکە و خوش و نەخوێندەوار بو. مامجەلال پێ ی وت بو: تو نامیر هەریمی پارێزگاریت. مزرێکی بەکیتی دابویە. حاجی ئەحمەد ئەوەندە دلی پێ ی خوش بو نامەی بو هەرکەس و بو هەر مەبەستێک بنوسیایە، تەنانەت نامە تایبەتییەکانی خویشی کە بو هەوالپرسینی کەسوکاری ئەنارد مورێکی پیا ئەنا.

حاجی کاک ئەحمەد جلی سەیری لە بەر ئەکرد. هەمیشە شەروالەکەی لە رەنگێک و، مراخانییەکەی یان فانیلەکەی بە سەر مرادخانی دا لە بەری ئەکرد رەنگێکی تر بو. رەنگەکانیش زەق بو. روژێکیان فانیلەیەکی زەرد و شەروالێکی سەوزی لە پێ کرد بو. عەلی نامەخان کە بەو جورە دی بوی، وت بوی: «سەیری کەن بزانن لە نیرگز ناچی!». لەوەوە ئیتر ناویان نا بو «حاجی نیرگز».

*

کابرایەکی جوتیار خەلکی یەکێ لە گوندەکانی بناری قەندیل بو لە دیوی ئیران

هەمو حەفتەیەک بە نهێنی ئەهات بۆ لامان بارێک تەماتە و خەیار و کولەکە و تەرەی ئەهێنا بۆ مامجەلال.

ژمارەیەکی زۆر کەم مالە رەوەندیش بە دژی کاربەدەستانی ئێرانەوە لە پەنای پەسوێی قەندیل دا هەلیان دا بو. رۆژی جەژن پیاوەکانیان بە «ران»ێکی پچوکەوە لە بەرخ و گیسک بۆ جەژنە پیرۆزە هاتن بۆ سەردانمان.

جگە لە خۆشەویستی کورد هیچ پاڵ پێوەنەرێکی تر نەبو پاڵ بەم جوامێرانەوە بنێ ئەم «موجازەفە»یە پڕ مەترسیە بکەن و، چاوەڕوانی هیچ پاداشتێکیش نەبون. لەو کاتەدا کە ئێمە لە بازار و ئاوەدانی دابڕا بوین دیاریەکانیان نرخێکی مادی گەورەی هەبو، بەلام نرخە سیاسیە «مەعنەوی»یەکەی زۆر گەورەتر بو.

*

زلکردنی دوژمن

بابەتەکانی دوەمین ژمارەی «هەوالنامە»م ئامادە کرد بو، دام بە حەمەسەعید و نەوال بۆ چاپ کردنی. پێشم وت بون چەندی ئەتوانن پەلە بکەن لە تەواو کردنی. هەمو جار هاوڕێ جیهار بابەتەکەی ئەخوێندەوە و، حەمەسەعیدیش تایپی ئەکرد. خەریکی تایپ کردنی سەروتاری ژمارەکە بون. سەروتارەکە لە سەر روداوەکانی هەکاری بو.

مانشێتەکانی وتارەکە ئەم رستانە بو:

- کۆنەپەرستانی ئێران، تورکیا، عێراق و ئەم پیلان ئەگێڕن دژی شۆڕشی پیرۆزی گەلەکەمان.

- چەتە کوردکوژەکانی بارزانی دوا پەردە لە سەر دەوری خائینانەی خۆیان لا ئەدەن.

- کۆمەلانی خەلکی کوردستان سورن لە سەر درێژەدان بە خەباتی شۆڕشگێڕانە.

بەشی یەکەمی وتارەکەش ئەمە بو:

«جەنگ لە چەندین شەر و نەبەرد و پێکدادانی دژوار و براوە، لە چەندین پەلامار و کشانەوە، هێرش و راکردن، قازانج و زەرەر، سەرکەوتن و ژێرکەوتن.. پێک دێت.

هیچ جەنگێک، بە تایبەتی هیچ جەنگێکی درێژخایەن، هێشتا لە مێژودا روی نەداوە کە لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەر سەرکەوتن و پەلامار و هێرش و قازانج بوبێت و، هیچ شۆڕشێکیش نادۆزیتەوە کە هەر لە خەتێکی راست و دروست دا بێ پێچ و پەنا، بێ هەوراز و نشێو، بێ شکان و گلان و نوچدان، بێ زەرەر و زیان.. بەرەو ئامانج و سەرکەوتن رۆیشتبێت.

شۆڕش لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە چەندین هەوراز و نشێو، بە چەندین کۆسپ و کەندەلان دا ڕاتێبووریت، چەندین جار تووشی هەڵچوون و نیشتنەوە ئەبێت، چەندین ژێرکەوتن و سەرکەوتنی گەورە و بچووکی بە سەر دێت، ڕەوتی گۆڕان و گەشە کردنی شۆڕش بریتیە لە زنجیرەیەک نوچدان، هەڵسانەوە، هەڵخلیسکان و ڕاست بونەوە، دوراندن و بردنەوەی.. پێکەوە بەستراو.. تا دوا سەرکەوتن بە دەست ئەهێنی.

شۆڕشەکەی ئێمەش لەم یاسایە بە دەر نیە، تا ئەو کاتەی بە دوا ئامانج ئەگات، تووشی چەندین شکست و نسکۆ، گلان و نوچدان، شکان و زەبر، هەوراز و نشێو.. دێت و، تا دوا سەرکەوتن بە دەس ئەهێنی ئەبێ چەندین قۆناغ ببڕێت، کە هەر یەکێکیان زنجیرەیەک ژێرکەوتنی جوزئی و سەرکەوتنی جوزئی تێ دایە، جا ئەگەر هەندێک جار لە هەندێک شۆڕش دا یەک نەبەردی گەورە و کارێگەر چارەنوسی شۆڕشەکەی بڕیار دابێت وا بێ گومان لە شۆڕشی نوێ ی کوردستان دا، لە قۆناغی ئێستادا، یەک شەڕی گەورە چەند کارێگەر و بە ئازاریش بێ، ناتوانێ چارەنوسی شۆڕشەکە بڕیار بدا.

سەرکەوتن یا ژێرکەوتنی شۆڕشی ئەم جارەمان لە ماوەیەکی درێژدا، لە چەندین شەڕ و نەبەرد دا، لە چەندین ناوچەدا، لە چەندین مەیدانی جەنگیی، سیاسی، ئابوری.. بڕیاری لە سەر ئەدرێت.

دوژمن چەند بەهێز و توانا بێت، ئەتوانێت یەک نەبەرد یاخود چەند نەبەردێک بباتەوە، بەلام ناتوانێت جەنگەکە بە یەکجاری بباتەوە و، چارەنوسی شۆڕش بڕیار بدات و، هێزی شۆڕش بە یەکجاری لە ناو ببات، چونکە هێزی شۆڕش، کە هێزی جەماوەری گەلە، سەرچاوەیەکی لە بن و لە بڕانەوە نەهاتوی هەیە و، هێزی شۆڕش لە سەرانسەری وڵات دا وەکو تۆ و چێنراوە و، لە مەیدانی نەبەردێک دا کز ئەبوێتەوە و، لە ناو ناچێت.

لە مانگی نیسانی ١٩٧٨ دوە هێزێکی تێکەڵاو لە پێشمەرگەی هەمو هەرێمەکانی کوردستانی عێراق خۆی ساز دا بۆ بە ڕێ کەوتن بەرەو بادینان بە نیازی هێنانی چەک و تفاقی جەمکیی شۆڕش و، هەڵگیرساندنی بڵێسەی پیرۆزی شۆڕش لە ناوچەکانی بادینان.

هێزەکە بڕیە وا زو کەوتە ڕێ تاکو پێش دەس پێ کردنی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی عێراق بە ڕاگوێزانی دانیشتوانی ناوچەکانی سنور بتوانێت هەندێ چەک و تفاق بە دەس بهێنێت و، فریای چەکدار کردنی دانیشتوانی ناوچەکانی سنور بکەوێت پێش ڕاگوێزانیان، تا بتوانن بەرگری هێرشی دوژمن بکەن بۆ سەر نیشتمانەکەیان.

ئەم هێزەی کە بۆ بە جێهێنانی ئەم فرمانە نیشتمانیە پیرۆزە کۆ بوبوە و، کەوتە ڕێ، ڕوبەڕوی بەرەنگاری پیلانێکی ئیمپریالیستی گەورە بو، کە دەوڵەتەکانی تەهران و عێراق و

تورکیا و جاشە دەولەتەکانی بارزانی تێ دا بەشدار بوون و، لە ئەنجام دا ئەو هێزە تێکەڵاوەی کوردستانی عێراق ئەگەرچی بەرپەرچی قارەمانانەی و ئازایەتییەوە بەرگری لە بەرسینگی و سەرما و ماندوو بوون و پەلاماری درندانەی هێزەکانی تاران. عەشیرەتە کۆنەپەرست و دواکەوتووەکانی تورکیا و، جاشەکانی لەم کرد، بەلام لە زنجیرەیەک شەڕدا لە ١ - ١٩ ی حوزەیران دا لە تورکیا، دوای ئەوەی دەیان پێشمەرگەی قارەمان شەهید بوون و بریندار کران تووشی شکستێکی گەورە بوو.

ئێمە ئەمەرەیک مان لە خاکی حکومەتێکی بێگانە، لە دەرەوەی سنووری وڵاتەکەی خۆمان دا، سەبارەت بە هەڵە و هەڵەتی سیاسی و سوپایی خۆمان، سەبارەت بە چاک هەڵنەسەنگاندنی پیلانی دوژمنانی شۆڕشەکەمان نەک سەبارەت بە هێز و توانای دوژمنەکانمان دوراند، بەلام شۆڕشمان نەدوراند، ئێمە ئەمەرەیکمان لە ڕووی سپاییەوە دوراند، بەلام ئەمەرەیکی سیاسی گەورەترمان بردەوە»

لە بەشەکانی تری دا ئەو دژوارییانەی هێزەکە لە سەرەتاوە تا لە ناوچوونی تووشی بوبوو، بە تایبەتی پەلامارەکانی تاران و عێراق و تورکیا، باس کرا بوو.

لە کاتی تایپ کردنی وتارەکە دا تاڵیسی پێشمەرگە، لەوانەی تازە هات بوون بۆ پێشمەرگایەتی، بە میوانی ئەچن بۆ خێمەتەکەیان. پاش بەخێر هاتن و چاکوچۆنی حەمەسەعید داوا لە هاوڕێ جەبار ئەکا بەردەوام بێ لە سەر خوێندنەوە.

جەبار ئەڵێ: «جارێ ڕاوەستە میوانمان هەیە».

حەمەسەعید ئەڵێ: «بیخوێنەرەوە! شتێکی نهێنی تێ دا نیە با ئەمانیش گوێ یان لێ بێ».

چەندی حەمەسەعید لە گەڵی ئەڵێ بیخوێنیتەوە، کەڵکی نابێ. چاوەڕێ ئەکەین تا میوانەکان ئەڕۆن. حەمەسەعید لە جەبار ئەپرسێ کە بۆچی بۆی نەخوێندەوە؟

جەبار ئەڵێ: «کوڕە چیت بۆ بخوێنمەوە؟ ئەگەر گوێ یان لێ بوایە یەکێتی ئەو هەمو دوژمنەی هەیە و پیلانی لێ ئەگێڕن و، پارتی ئەو هەمو دوستەی هەیە و یارمەتی ئەدەن.. هەر ئەمشەو بە کۆمەڵ ئەڕۆیشتن تەسلیم ئەبونەوە».

تێبینییەکەی هاوڕێ جەبار ڕاست بوو. بۆ من بوو بە «دەرس». لە کاری سیاسی دا زلکردنی دوژمن کارێکی ڕاست نیە و خەڵکی سادە ئەترسێنی، ئەبوایە من ئەمەم ڕەچاو بکردایە. بەلام بۆ پەروەردە کردنی کادر و پێشمەرگەکان لە نووسینەکان و نامەکان دا هەوڵمان دا چەند سەرەتایەک بچەسپێنین لەوانە: سەرەتای پشت بە خۆ بەستن، سەرەتای خەباتی درێژ خایان، سەرەتای کۆکردنەوەی جوتایەتی باش..

*

نیوەڕۆیەکیان ٢ هالیکۆپتەری ئیرانی لە ناکاو هات و زۆر بە نزیکی بە سەرمان دا فڕین و چەند جاری هاتن و چوون سەیری بنکە و بارەگەکەیان کردین. هەر زوو هەموومان دامەزراین و خۆمان ئامادە کرد و کەوتینە چاودێری. فڕۆکەوانەکان ئیمە و ئیمە فڕۆکەوانەکانمان ئەبینی. هیچ جۆرە چەکێکی قورس یا ئاوڵەی مان نەبو بۆ شەڕی فڕۆکە. لەوەو پێش ئاگاداری پێشمەرگەکانمان کرد بو هەر کە گوێ یان لە دەنگی هالیکۆپتەر بو یەکسەر دابمەزرین و، چاودێری بکەن، ئەگەر تەقەی نەکرد وازی لی بهێنان و، ئەگەر تەقەی کرد یان ئیمازی دابەزاندنی هێزی هەبو بە هەمو توانانەوە بە تەقە دای بگرنەوە. هالیکۆپتەرەکان بی ئەوەی تەقەمان لی بکەن گەڕانەوە. ئیمەش بارو بنەمان پێچایەوە و گویزامانەوە بو هەوارێکی تر.

پێشمەرگەکان بە گشتی فێری ئاگرکردنەوە، چیشت لی نان، هەویر شێلان، نان کردن، هەلدان و خستن و پیچانەوەی خێوەت، بارکردنی ولاخ.. بو بون. ئەم کارانە بو بون بە بەشێک لە پێویستیەکانی ژیانی ڕوژانەی هەمومان.

*

مامۆستا عەزیز لە داوی بەعس دا

عەزیز محەمەد لە قەرەداخەوە هات بو دەوری گورگان. سەرکردایەتی ناوخو لە نامەکانیان دا چەند جاری گلەییان لی کرد بو لە سەر ئەوەی چەند جاری بی ئەوەی هیچ کارێکی پێویستی هەبوبی چو بوە ناوشار. مەترسییان هەبو بکەویتە داوی دوژمن و بیگیری. ئاگادارمان کرد کە نابی ئیتر هاتوچوی شار بکا. تەنانەت مامجەلال بە گاڵتەوە هەرەشەی لی کرد کە ئەگەر لە سلێمانی لە «پەنای مەلجەئ» دا بگیری هیچی لە سەر نانوسی.

مامۆستا عەزیز گەڕایەوە بو قەرەداخ. گوێ ی نەدایەوە ئامۆژگاری و هەرەشەکەی مامجەلال و، جارێکی تر خوی کرد بوەوە بە سلێمانی دا. ماوەیەکی درێژ لە ماڵی کابرایەکی گومان لی کراو دا، کە سەر بە ئیستیخبارات بو، مابوەوە. ئەمجارەیان گیرا و، ئازار و ئەشکەنجەیەکی زوریان دا و، حوکمی ئیعدام درا.

بەعسییەکان بە فێڵ بە عەزیزیان وت بو: «کابرایەک لای یەکێتی گیراوە، ئاگاداریان بکە ئەگەر ئەوان ئامادە بن ئەو کابرایە بەر بدەن، ئیمەش تو بەر ئەدەین». مامۆستا عەزیز کادرێکی بەنرخ و هەلکەوتو بو ئیمە ئامادە بوین چەند دیل مان لە لا هەبو هەمویان لە بەرامبەر ئازاد کردن یان ئیعدام نەکردنی دا بەرەڵڵا بکەین. بەلام

بەعسییەکان لە سەردەمی شەڕ دا، پێشمەرگە و ئەندامە گیراوەکانی ڕێکخراوە نهێنییەکانی یەکێتییان بە «دڵی جەنگ» و «گیراوی سیاسی» دانەنا و، هیچ کات ئامادە نەبوون بۆ گۆڕینەوەیان.

پێش ئێعدام کردنی بۆ ئەوەی بیروخێنن و بیهێننە قسە پێیان وت بوو: «هاوڕێکانت بەرامبەر تۆ بێ وەفا بوون. ئامادە نەبوون زەلامێک بۆ تۆ بەر بدەن. خۆت ڕزگار بکە و، چی ئەزانی بیڵێ!».

ئەم قسڵە نامەردانەیە کاری لە مامۆستا عەزیز نەکرد بوو. لەوەڵام دا وت بووی: «دیارە هاوڕێکانم لە من باشتری لێ ئەزانن بۆیە ئامادە نەبوون بمان گۆڕنەوە»

مامۆستا عەزیز دەورێکی گرنگی هەبوو لە خەباتی ژێرزەمینی ناو شار دا و، ماوەیەک لێپرسراوی ڕێکخستنی سلێمانی بوو. هەروەها لە ئامادە کردنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی سلێمانی دا. لە زیندان دا نموونەی تێکۆشەری خۆڕاگر و ئازا بوو. حەیف بوو بەو جۆرە کۆتایی بە ژیانی هات.

*

لە کوردستانی ئێران ڕێکخراوێکی سیاسی لێ نەبوو هاوکاری لە گەڵ بکەین. حیزبی دیموکرات بۆ ئەوەی دڵی حکومەتی عێراقی لێ نەڕەنجێ خۆی لە هەموو جۆرە هاوکارییەک لە گەڵ یەکێتی ئەبوارد. جگە لەوە هیچ ڕێکخستن و نفوزێکیشی لە ناو کوردستانی ئێران دا نەبوو تا ئێمە کەڵکێکی لێ وەر بگرین. ئێمە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی خۆمان پێویستی مان بە کەسانێک هەبوو لە ئێران و تورکیا یارمەتی مان بدەن. لە هەردوو پارچەوە خەڵک هاتوچۆیان ئەکردین و نامەیان بۆ ئەناردین. بە هاوردەوردیەوە لە گەڵ ئێمە پەیوەندییان ئەکرد.

هەوڵمان دا دوستەکانی خۆمان ڕێک بخەین. تۆڕی ڕێکخستن مان لە شنۆ، ورمێ، مەهاباد، خانە، سەردەشت، بانە، مەریوان، پاوە... دروست کرد. ئەمانە یارمەتییەکی زۆریان ئەداین بۆ کڕین و گواستنەوەی کەلوپەلی جۆراوجۆر هەر لە ئاردەوە تا سەر خەیمەت و پەتو و پێڵاو و کاغەز و مەرەکەبی ڕۆنیۆ، هەروەها بۆ تیماری هەندێ بریندار و، گواستنەوەی هەندێ لە کادرەکانمان. هەر لە ڕێگای ئەمانەوە دوجار شەماڵ چوو بۆ تورکیا و، لە تورکیاوە بۆ سوریا و، گەڕایەوە لامان لە قەندیل. هەر لە ڕێگای ئەمانیشەوە قادر جەباری نێردرا بۆ سوریا و گەڕایەوە. هەر لە ڕێگەی ئەمانەوە ئەنوەری سەعید والی هاتەوە و، کە ڕوستەم بە برینداری هاتە دەراوی گورگان برا بۆ ئێران بۆ تەداوی و، دوای تیمارکردن گەڕایەوە.

جگە لە مان، د. سەعید عەزیزی شەمزینی و صەلاحەدینی موهتەدی و چەند کەسێکی تر بەردەوام نامەیان لە گەڵ مامجەلال ئالوگۆر ئەکرد.

*

کۆمەڵە لە تیهران لە ناو خۆیان دا بڕیاریان دابو خانەی موهتەدی کە یەکێ لە کادرەکانی سەرکردایەتییان بو، تازە لە زیندان بە سەربەرزی دەرچو بو، بنێرن بۆ کوردستانی عیراق بۆ لای ئێمە. محەمەدی مەلا عەلی هێنا بوی بۆ ناوچەی ئالان بەرەو ڕوی ئەحمەد لەتیفوللا، جێگری فەرماندەی هەرێمی ٣ ی، کرد بوەوە بیگەیەنێتە لای ئێمە. لەو کاتەدا شوێنی ئێمە نادیار بو.

چەند ڕۆژی خانە لە گەڵ ئەحمەد بو، جەیش لە ٢١ ی حوزەیرانی ٧٨ دا هێرشی بۆ کردن بۆ سەر «کانی بیشو» لە نزیک گوندی «دری» لە ناوچەی ماوەت. لەم هێرشەدا ٦ کەس کوژران، یەکێکیان ئەحمەد و ئەوی تریان خانە بو.

خانە، وەکو هاوڕێکانی ئەیانوت گەنجێکی ڕوشنبیر و تێگەیشتو و ئازا بو. برای شەهیدان: سولەیمان و عەبدوللا و، کوری محەمەد ئەمینی موهتەدی بو.

دوای کوژرانی خانە دو کەسی تر لە هاوڕێکانی بڕیار ئەدەن بێن بۆ کوردستانی عیراق، ئەودەم ئێمە لە دەواری گورگان بوین لە قەندیل، هەردوکیان گەیشتن: د. جەعفەری شەفیعی خەڵکی بۆکان و، ساعیدی وەتەندوست (کاک برایم) خەڵکی سنە بون. ساعید لە گەڵ خۆی چەردەیەک پارەی بۆ هێنا بوین پاشەکەوتی کرد بو. د. جەعفەریش لەو کاتەدا بۆ ئێمە زۆر بە سود بو چونکە پزیشکمان نەبو. تەنیا یەک برینپێچمان هەبو، ئەویش هەر ئێرانی بو، ئەندامی «سازمانی ئینقیلابی» بو.

دو پیاوی ڕوشنبیر و تێگەیشتو و بە زات و ورە بەرز بون. حەزیان نەئەکرد کەس بزانی کە ئێرانین و ناویان چیە

*

ڕۆژێکیان لە بەردەمی چادرەکەی خۆمان دا دانیشت بوین، حەمە سەعید لە دورەوە دو کەسی بە دی کرد، یەکێکیان جلی کوردی و، ئەوی تریان پانتۆڵێکی جینز و کراسێکی زەردی لە بەر دا بو، پۆچی بەر دا بوەوە. وتی: «وابزانم ڕۆژنامەنوسە».

کە نزیک کەوتنەوە پانتۆڵ لە پێکە عومەری حاجی عەبدوللا بو. زۆرم پێ خۆش بو ئەویش بە سەلامەتی گەیشتنەوە لامان. کاک عومەر لە گەڵ کاروانەکەدا ڕۆیشت بو بچی بۆ سوریا و، لەوێوە بە یەکجاری بڕوا بۆ ئەوروپا. ئەم نامەیەکیان پێ دا نارد بو بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە. بە ناو تیهران دا لە مەهاباددەوە بە نهێنی لە گەڵ یەکێکی شارەزادا

گەرا بووەوە. کردم بە گاڵتە لە گەڵی، وتم: «سەفەری دەرەوت کرد. دو وڵاتی بێگانەت بە بێ پاسپۆرت و ڤیزا بینی - مەبەستم تورکیا و ئێران بو - ئیتر هەقی گلەییت نەماوە!»

کاک عومەر لای ئێمە گیر نەبو ئیزنی خواست بو سەردانی کەسوکاری بگەڕێتەوە نزیک سلێمانی.

سەرانی قەم، سامی سنجاری و هاوڕێکانی، چەند جارێ لە گەڵ ئازاد هەورامی و عومەر دانیشت بون. بەو ئیعتیبارەی هەردو ڕێکخراو: «قەم» و «کومەلە» مارکسین، باسی ڕێککەوتنی دوقۆڵی و هاوکاریان لە گەڵ کرد بون. بو دەربڕینی نیازی باشی خویان ئەم نامەیەیان نوسی بو و، دابویان بە عومەر بیهێنێ و، درێژەی قسەکانیشمان بو بگێڕێتەوە.

ئەم تاکتیکێکی زیرەکانەی هەلبژارد بو: ئەیویست یەکیەتی لە ناوەوە هەڵ بوەشێنێ. پەیوەندی لە گەڵ کومەلە و بزوتنەوە، بە جیا لە یەکیەتی یان وردتر بە جیا لە مامجەلال، دروست بکا. لەوێ، لە گەڵ ئازاد و عومەر لە سەرکردایەتی کومەلە دانیشت بون و، ئەم نامەیەیان بو کومەلە نوسی بو، هەر بەو جورە لە گەڵ کاک تاهیر و سەید کاکەش لە سەرکردایەتی بزوتنەوە دانیشت بون و، پەیوەندییان لە گەڵ رەسول مامەند کرد بو.

تاکتیکەکەی سامی بە سەر ئێمەدا لە کومەلە تێ نەپەڕی، ئیمە سور بوین لە سەر ئەوەی کە ئەگەر بیانەوێ ڕێک بکەون ئەبێ لە گەڵ یەکیەتی نیشتمانی ڕێک بکەون، ئەک لە گەڵ بالەکانی و، داوامان لێ کردن چارەنوسی هەڤاڵە بزوەکانمان ئاشکرا بکەن و، لە گەڵ ئەوان گفتوگوی ڕێککەوتن دابمەزرێنن.

بە ڕاوێژ لە گەڵ مامجەلال و د. مەحمود وەلامی نامەکەمان بو نوسیەوە. هەر ئەو کاتە نەسلی نامەکەی قەم و وێنەی وەلامەکەی خومانم بو ئاگاداری و هەلگرتن نارد بو هەڤالانی دەرەوە. ئەبێ لە لایان مابێ.

بەلام تاکتیکەکەی سامی کاری لە بزوتنەوە کرد و، پشێوییەکی زوری خستە ڕیزەکانیانەوە. ڕەسوڵ و هەندێ لە هاوڕێکانی شاری کە ماوەیەک بو نارازی بون لە یەکیەتی، ئەو کارەساتەی بە سەر یەکیەتی هات بو دایانا بە بەلگەی ڕاستیی بوچونەکانی خویان. بە تەنیا کەوتنە پەیوەندی و گورینەوەی نامە. ئەمەش پێچەوانەی ئەو ڕێککەوتنانە بو کە لە ناو خومان دا لە سەری پێک هات بوین. پەیوەندی لە نێوان هەر ۳ بالەکە دا: کومەلە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، لە سەر بنچینەی جورێ لە فیدرالیزم ڕێک خرا بو. لە ناو یەکیەتی دا هەر بالە سەرکردایەتی تایبەتی و، سەربەخویی ئایدیولوجی و، ڕێکخراوەیی خوی هەبو، بەلام لە کاروباری پێشمەرگەیی و، دارایی و، پەیوەندی سیاسی

دا لە گەڵ حیزب و دەوڵەتان ئەبو یەکگرتو بن. هیچ باڵێک بۆی نەبو لەشکری تایبەتی
خۆی دروست بکا و، سەرچاوەی دارایی سەربەخۆی هەبێ و، پەیوەندی تایبەتی لە گەڵ
حیزبی تر و دەوڵەتان دابمەزرێنێ.

لەو هەلومەرجە دژوارەدا کە تێ ی کەوت بوین، بزوتنەوە بە سەرکردایەتی ڕەسوڵ
لە باتی ئەوەی ببێ بە فاکتەرێکی کاریگەر بۆ هەڵسانەوەی شۆڕشەکە و بەهێزکردنی
یەکیتی و هێزی پێشمەرگە، بون بە هۆی دروستکردنی ناتەبایی و ئاژاوەیەکی سیاسی
ناوخۆ لە ناو ڕیزەکانی یەکیتی و پێشمەرگەدا، تا ئەمجار ڕەسوڵ بزوتنەوەی بەرەو دابڕین و
جیاکردنەوەی لە یەکیتی ئەبرد. ئەمانە لایان وابو بە جیا لە یەکیتی باشتر گەشە ئەکەن و
گەورە ئەبن.

*

«مفە» حەیاتەکەدا

هەمزە ئاغای مەراودەلی تا ئاشبەتاڵ لە زیندانی بارزانی دا بو. دوای بەربونی وەکو
پیاوێکی سەربەخۆ خەریکی ژیانی خۆی بو، بەڵام لە دلووەزگاکانی بەعس نزیک بو.
حکومەت ڕای سپارد بۆ مامجەلال ببینێ و گفتوگۆی لە گەڵ بکات. هەمزاغا ئاگای لە
ناکۆکییەکانی ناو یەکیتی ئەبو. ئەم هەواڵەی بۆ ڕەسوڵ نارد بو. ڕەسوڵ ویست بۆی خۆی
بە تەنها ببینێ. هەمزاغا وەڵامی دابوەوە کە ڕایان سپاردوە مامجەلال ببینێ. ئەگەر ئەو
نەیبینێ نابێت. ڕەسوڵ گفتوگۆی لە گەڵ بەعس هەمیشە بە «خیار» ی یەکەم دائەنا. پاش
سارەییەکی درێژ لە پەیوەندییەکانی دا لە گەڵ مامجەلال، بەم بۆنەیەوە نامەیەکی
گەرموگوڕی بۆ مامجەلال نوسی، داوای لێ ئەکرد «عرض» ەکەی حکومەت قبوڵ بکا و،
بۆ ئەو مەبەستە بچێ بۆ بارەگاکەی ئەوان.

ئێمە لامان وابو: هەمزاغاش هیچ «عرض» ێکی سیاسی پێ نیە و، قسەکانی
ئەمیش لەوانەی شێخ محمودی کاریزە زیاتر نیە. هەمزاغا لە کۆنەوە دۆستی مامجەلال بو.
تەنها بۆ بینینی خۆیشی بوایە حەزی ئەکرد لە گەڵی دابنیشێ. قسەی لە گەڵ بکا و،
هەواڵی مەراودەلییەکان و، دەنگوباسی دۆست و ناسیاو و حکومەتی لێ ببیستێ.
مامجەلال، «عرض» ەکەی قبوڵ کرد. لەو کاتەدا ئێمە سەرگەرمی ڕێکخستنەوەی
پێشمەرگە و ڕێکخراوەکان بوین، ئەو شوێنەی ڕەسوڵ دای نا بو بۆ یەکتر بینین زۆر دور
بو لە شوێنەکەی ئێمەوە، شوێنێکی نزیکتری دیاری کرد بۆ یەکتر بینین.

هەمزاغا هات. ڕەسوڵ جوابی بۆ مامجەلال نارد بچێ بۆ بینینی. مامجەلال جوابی
دابوەوە کە ئەگەر هەمزاغا بۆ گفتوگۆ هاتوە لە گەڵ من با بفەرموێ بۆ لامان، خۆ ئەگەر بۆ

لای ئێرەش هاتوە، پێویست ناکا من بیم خوتان قسەی لە گەڵ بکەن. د. مەحمودیش، لەو کاتەدا چو بو بو لای رەسول ئەیویست پشتیوانی لەو بکا و، مامجەلال رایکێشی بو ئەوی، هەندی بروبیانویان هێنابەوە گوایە هەمزاغا ناتوانی ئەو ریگا دریژە بپێوی. سەرئەنجام هەمزاغا هات بو لای مامجەلال. رەسول و د. مەحمودیش شوینی کەوت بون. وەکو چاوەری مان ئەکرد، هەمزاغا، جگە لە مرچامەلە، شتێکی سیاسی دیاری کراوی پی نەبو.

ئەو کاتە بە هوی نادیاریی چارەنوس و، ناخوشیی ژیانی روژانەمانەوە، هەندی لە کادرەکان شەیدای «مفاوضات» بوبون. زور جار کە قسەیان لە گەڵ مامجەلال ئەکرد، تکایان لی ئەکرد ئەگەر بو ماوەیەکی کورتیش بێت «مفاوضات» لە گەڵ حکومەت دروست بکا. د. مەحمودیش هەمان رشی هەبو، بەو بونەیەوە «مفاوضات» ی ناو نا بو «مفە حەیاتەکەدا».

*

«تفهیم» ەکەی د. مەحمود

د. مەحمود لە سوریا لە گەڵ قادر جەباری و شەمسەدین موفتی و عەدنان موفتی کومیتەی ئامادەکردنیان دامەزراند بە نیازی ریکخستنەوەی پارتی لە سەر بنچینەیەکی هاوچەرخ و نوێ. لەوی کەسیان لی کو نەبوەوە. ئەوانەی کاری سیاسییان ئەکرد بە زوری دابەش بوبون بە سەر یەکیتی و قم دا.

د. مەحمود لە گەڵ شەمسەدین و قادر جەباری، لە دوا مانگەکانی ٧٧ دا گەرایەوە کوردستان. لە گەڵ مامجەلال و مەکتەبی سیاسی مانەوە. ئەگەرچی کومیتەی ئامادەکردن لە یەکیتی دا نەبو، بەلام لە هەمو مەسەلەیەک دا پرسیان پی ئەکردن، بیروڕایان وەرئەگرتن و، بو زور کوبونەوە بانگ ئەکران، ئەوانیش وەکو ئەندامانی سەرکردایەتی یەکیتی رشیان ئەدا.

لە کوردستانیش چەندی هەولیان دا کەسیکی ئەوتو لە حیزبەکەیان کو نەبوەوە.

کە لە گەڵ کاک عەلی لە یەکتری جیا بونەوە، د. مەحمود و قادر لە گەڵ ئیمە مانەوە. ئەو ماوەیەی بە یەکەوە بوین هیچ شتیکمان لی نەشاردەوە. وەکو یەک دەستەی یەک حیزب کارمان ئەکرد. خویشی پیاویکی بە ورە و تیگەیشتو و شارەزا بو. گوێ ی نەئەدایە ناخوشیی و تەنگوچەلەمە. بیروراکانی خوی لە هەمو بونەیەک و لای هەموان بە سەربەستی دەرئەبری.

دوای کارەساتی هەکاری ئەویش ئەیویست کەلک لە هەلەکانی یەکیتی و لاواز

بوونی وەرگێڕی بۆ بەهێزکردنی حیزبەکەی خۆی. ڕاکێشانی دانە دانەی کادر و پێشمەرگە کارێکی ئاسان نەبوو. تەنگوچەڵەمەی سیاسی ناو یەکێتی نەزانی و، ئاگاداری ناکۆکییەکانی نێوان بزووتنەوە و یەکێتی و، هەڵوێستەکانی ڕەسووڵ بوو. زۆرجار لای ئێمە ڕەخنەی لێ ئەگرت، بگرە گاڵتەی پێ ئەهات، کەچی لای ئەوێش جۆرێکی تر قسەی ئەکرد. لە نامەکانیشی دا بۆ ئەم و ئەو جاروبار نۆقوڕچی لە یەکێتی ئەگرت.

ماوەیەک بۆ کەوت بوو سەر باسی ئەوەی کە یەکێتی هیچ «تقییم»ێکی نییە بۆ ڕابوردوو، بە تایبەتی بۆ ماوەی «جەلالی»، لە بەر ئەوە یەکێتی تاوانبار ئەکری بە درێژەکێشانی هەمان حیزبی «جەلالی». من ئەو زەمانە نەمئەزانی لەمە مەبەستی چییە. لام وابوو ئەیەوێ تەرازوو ڕاست بکاتەوە: نامیلکەیەکی نووسیبوو لە سەر هەڵسەنگاندنی شۆڕشی ئەیلوول و، دەوری بنەماڵەی بارزانی. ئێستا ئەیەوێ نامیلکەیەکیش بنووسێ لە سەر جەلالی.

من خۆم لام وایە هەمیشە پێداچوونەوەی ڕابوردوو، هەڵسەنگاندنی باشەتیی و بەلایەن، شتێکی باش و بە کەڵکە. تەنانەت بۆ مرۆڤیش پێویستە جاروبار، لە ناو دەروونی خۆی دا بە خۆی دا بچێتەوە، کارەکانی خۆی هەڵ بسەنگێنێ و چاک و خراپەکانی دیاری بکا. چ جای بۆ جوڵانەوەیەکی سیاسی کە سەدان هەزار کەس بەشدارییان تێ دا کرد بێ و، دەیان هەزار کەسی تێ دا کوژرا بێ.

هەرچەندە لەو لێدوانەماندا ڕەخنەی «تقییم» و هەڵسەنگاندنی ڕابوردوو نەبوو، بەڵام ئەوەندەی دووبارە کردەوە وتمان باشە مادەم خۆت خاوەنی بیرەکەی خۆت بینووسە. پێ ئەچوو پێشتر بیرە بنەڕەتییەکانی لە مێشکی خۆی دا ئامادە کرد بێ، لە ماوەیەکی کورت دا نامیلکەیەکی ئامادە کرد، لە ژێر ناوی: «تاوتوێکردنەوەی ڕابوردوو و خەباتی ئەمڕۆی گەلەکەمان» دا. باسە سەرەکییەکانی بریتی بوو لە:

پێشەکییەک لە ژێر ناونیشانی: با سوود لە تاوتوێکردنەوەکانی ڕابوردوومان وەربگرین بۆ یەکخستنی ڕیزەکانی گەلەکەمان و بەهێزکردن و سەرخستنی خەباتی ئەمڕۆ و ئایندەی.

باسەکانی بە گوێرەی ماوەکانی دابەش کرد بوو بە چەند قۆناغێ: ماوەی ١٩٥٨ - ١٩٦١. ماوەی ١٩٦١ - کۆتایی ساڵی ١٩٦٤: کەرت بوونی پارتی و شۆڕش. ماوەی ١٩٦٥ - ١٩٧٠. ماوەی پاش دەرچوونی بەیانی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ - ١٩٧٥ وە تێکچوونی شۆڕش. ماوەی پاش تێکچوونی شۆڕشی ئەیلوول.

هەڵسەنگاندنەکە پشت ئەستوور نەبوو بە هیچ بەڵگە و دۆکومێنت یا کتێب و نووسینێک. لەو کاتەدا ئارشیف یا کتێبخانەمان لە بەر دەس دا نەبوو. هەمووی لە سەر بنچینەی بیرەوەرییەکانی خۆی نووسی بوو.

لە هەڵسەنگاندنەکەی دا هەردولا: «مەلایی» و «جەلالی»، لە هەندێ قۆناغ دا لایەکیان زۆرتر و، لە هەندێ قۆناغ دا هەردوکیانی بە جوتە، بە توندی کوتا بو.

ئەگەرچی مامجەلال زۆر لە هەڵسەنگاندن و بوچون و ئەنجامگیرییەکانی پێی ڕاست نەبو، بەڵام هیچ «اعتراض»ێکی دەرنەبڕی. من لام وابو د. مەحمود پیاوێکی دڵسۆز و شارەزا و خاوەن تەجروبەیە ڕێگەی بدەین لە «مینبەر»ی یەکێتیەوە باوەڕەکانی خۆی ڕون بکاتەوە، بێ ئەوەی بچینەوە بە گوێی دا. بێ مشتومڕ موافەقەتمان لە سەر کرد و لە ئەیلولی ١٩٧٨ دا وەکو یەکێ «لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان» خۆمان چاپمان کرد و بڵاومان کردەوە.

زۆری نەخایاند دەرکەوت: مەبەستی لە کوتانی «مەلایی» و «جەلالی» تەنها هەڵسەنگاندنی «تاڵیکردنەوەی ڕابوردو» بۆ «یەکخستنی ڕیزەکانی گەلەکەمان» نەبو، بەڵکو بۆ دروستکردنی «خەتی سێهەم» بو. «خەت»ێک خۆی سەرکردایەتی بکا.

بەڵام د. مەحمود نەیئەتوانی ئەم دەورە ببینێ، لە بەر هۆیەکی سادە و ئاشکرا، ئەویش ئەوە بو: د. مەحمود خۆی لە ١٩٦٤ تا ١٩٧٥ توندڕەوترین ئیدیۆلۆگی «مەلایی» بو لە ناو پارتی و، لە ناو جوڵانەوەی کوردا.

*

داری بوق

یەکێ لە گیروگرفتەکانمان سوتەمەنی بو. قەندیل داری سوتاندنی لێ نیە. گوێنی و چەقاڵە و هەندێ دڕک و داڵی هەیە. دوکەڵی زۆر و ئاگری کەم و زو دائەمرکێتەوە. ئاگری هیچ کامیان پشکۆ ناکا. هەمو ڕۆژێ هەمومان ئەبو بەشێ لە وەختی خۆمان بۆ کۆکردنەوەی گوێنی و چەقاڵە و دڕک و داڵ تەرخان بکەین، هێشتا بەشی نان کردن و چا و چێشت لێ نانی نەئەکرد. ڕۆژێکیان یەکێ لە پێشمەرگەکان بە تەلیسێکی پڕەوە هاتەوە وتی: «کوڕینە! لای مەغمەرزەکانی تر باسی مەکەن شتێکی زۆر گرنگم دۆزیوەتەوە، گیروگرفتی سوتەمەنی چارەسەر ئەکا». وا بە خۆشی و شانازیەوە باسی ئەکرد ئەتوت بیرە نەوتی دۆزیوەتەوە. تەلیسەکەی هەڵڕشت هەموی کۆتەرەی پچوک پچوک بو. کۆتەرەکان لە درزی بەردا ڕوا بون، قەدی دارەکەی باریک و، باڵای چەند بستێک و، گەڵاکانی سەوز و ئەستور و گەورە بون، ناوی «داری بۆق» بو.

وشەی بۆق بۆ چەند شتی جیاواز بە کار ئەهێنرێ: ١. ناوە بۆ گیانلەبەرێکی وشکاوی. ٢. ناوە بۆ ئەو هەڵم و هالاوە گەرمەی لە نیوەڕۆی هاوین دا لە ناو کشتوکاڵ دا پەیدا ئەبێ. ٣. ناوە بۆ ئەم ڕوەکە. ٤. پاڵ، وەکو بۆقی پیوە نا، واتە پاڵی پیوە نا.

زۆری پێ نەچوو مەفرەزەکانی تریش داری بۆقیان دۆزیبوەوە و کەوتنە هەڵکەندن و سووتاندنی.

تا لە تەنگی سلێمانی بوون لە پەنای «داری بۆق» دا حەسانەوە.

*

یەکێ لە پێشمەرگەکانی دەستەکەی مامجەلال ناوی هاوڕێ مارف بوو. هاوڕێ مارف گەنجێکی تازە پێگەیشتوو و، ئەندامی کۆمەڵە و، برازای عەلی پچکۆل بوو. هەتا پلی ی مامجەلالی خۆش ئەویست و، بۆ کۆمەڵە دڵسۆز بوو. بە هەموو کەسێکی ئەوت «هاوڕێ». ڕۆژێکیان کوێخاکانی مەنگوڕ هات بوون بۆ لای مامجەلال. هاوڕێ مارف کە بەخێر هاتنی کرد بوون وت بووی: «هاوڕێ کوێخا فلان و هاوڕێ کوێخا فیسار... بەخێر بێن!». کوێخاکان لەم نازناوە تازەیە سەیریان هات بوو.

ڕۆژێکیان هاوڕێ مارف کتێبێکی لەو کتێبانەی «دار التقدم» لە مۆسکۆ بە عەرەبی لە سەر فەلسەفەی مارکسی دەری ئەکرد بە دەستەوە ئەبێ بۆ پێشمەرگەیەکی تری ئەخوێنێتەوە. چەند جارێک وشەی «المستغلە - بكسر الغين و المستغلە - بفتح الغين» دووبارە ئەبێتەوە. گوێگرەکە لێ ی ئەپرسێ: «ئەم بكسر الغين و بفتح الغينە یەعنی چی؟»

هاوڕێ مارف یەکسەر وت بووی: «یەعنی چینی کرێکار کوت و پێوەند کراوە!»

ساڵانی دوایی هاوڕێ مارف بە دیل گیرا و لە زیندانی موسڵ لە سێدارە درا. چەند نامەیەکی لە زیندانەوە نووسیوە نموونەی پێشمەرگەی ئازا و خۆراگر بوو.

*

هەڵگرتن - ڕەدوکەوتن

بەشێ لە چیای قەندیل کەوتۆتە سنووری مەنگوڕایەتییەوە. مەنگوڕ لە هەردوو دیوی سنووری ئێران و عێراق هەن و، لە کوردستانی عێراق لە پشدەر و بناری قەندیل دا ئەژین. تا ئێستا ڕێکخراوی خێڵەکییان ماوە. بنەماڵەی «کادرویشی» سەرۆکایەتی ئێلی مەنگوڕی ئەکرد و، تیرە سەرەکییەکانی بریتی بوو لە: خدر مامەسینی، باپ ڕەسوو، زوودی، ڕەزگەیی، چنارەیی، مەنگوڕە ڕووتە. هەر تیرە و تایەفەیەک «کوێخا» ی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ سەرپەرشتی کاروباری تیرەکە.

لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی و دەس پێ کردنەوەی شۆڕش دا ئێلی مەنگوڕ بە گشتی هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانەیان هەبوو. کوێخا محەممەدی مەلا شەریف، کوێخا عەلی قەلاوی، کوێخا قادری زوودی، کوێخا محەممەدەمینی ڕەزگەیی، کوێخا حەسەنی برایم

شوان، شیخه کوڵ.. بە کومەڵ بون بە پیشەمرگە و، لە روژانی سەختی کارەساتی هەکاری دا بە دەوری مەکتەبی سیاسی یەکێتیەوە مانەوە.

لە ناو مەنگوردا هەندی نەریتی دەربەندی «ژن هێنان و شو کردن» صابو لەواتە: «هەڵگرتن» و «رەدوکەوتن».

ئەمانیش وەکو زور لە ئیلەکانی تر لە ناو خویان دا ژن و ژنخوازییان ئەکرد «الزواج الداخلي: ئیندوگامی»، تەنانەت هەڵگرتن و رەدوکەوتنیش هەر لە ناو خویان دا و، بە زوری لە ناو هەمان گوند و هەمان بنەماڵە و هەمان بەرەباب دا ئەبو. زور کەم روی داوە ژن و ژنخوازی لە گەڵ تیرەیەکی تری مەنگور بکەن چ جای ئیلیکی تر. بە گشتی «ژن و میردایەتیبان» لە گەڵ ژن و پیاوی دەرەوەی بەرەباب، هوز، تیرە، ئیلەکەی خویان «الزواج الخارجي: ئیکسوگامی» بە پەسند نەئەزانی، مەگەر ئاغاکانیان بو مەبەستی دامەزراندنی هاوپەیمانیتی لە گەڵ ئیلەکانی تر ئەمەیان کرد بی.

هەرچەندە هیچ کوسپیکی کومەڵایەتی یان دینی لە بەردەمی پیاوی مەنگوردا نەبو بو پیکهوەنانی خیزانی «فرە هاوسەر: پولی گامی»، یان «دو هاوسەر: بی گامی»، کەچی خیزانەکانیان بە زوری «یەک هاوسەری: مونو گامی» بو.

کویخاکانی مەنگور بو ریکخستنی «مەسلەحەت»، هەندی یاسا و ریوشوینیان دانا بو ئەوەی کە لە نەریتی باوویاپیریانەوە بویان بە جی مابو. دلوایان لە ئیمەش کرد بویان بسەلمینین، بە تایبەتی دیاری کردنی پارەی ریککەوتنەکە.

کور لە ناو مەنگور دا بە زوری بە ریگەی «ژن بە ژن» ژن ئەهینی.

کە داوای کچی ئەکا ئەبی ئەمیش کچ (خوشک یان ئاموزا)ی هەبی بیدا بە یەکی لە کەسوکار (برا، باوک، ئاموزا) ی کچی خوازبینی کراو.

هەردو کچ لە یەک زەمان دا لە دو کورەکە مارە ئەکرین.

کچی دوهەم ئەبیتە «مارەبراو» بەڵام مەرج نیە لەو کاتەدا بگویزریتەوە، چونکە زور جار کچیکی منال لە باتی کچی خوازبینی کراو ئەدری بە لاکەی تر «گەورە بە کچکە». خو ئەگەر هیچ کچیکیان نەبو بەڵینی «بەنەتزو» یان پی ئەدەن، واتە کچیک کە لە پاشەروژدا لە دایک ئەبی، دوای لە دایکبونی ئەیدەنی. کچە منالەکە مارە ئەکری بەڵام لە بەر منالی جاری نایگویزنەوە تا گەورە ئەبی.

کچە مارەبراوەکە، کە گەورە بو، ئەگەر دلی بە کورەکەوە بو، ئەوسا ئەگویزریتەوە، ئەگەر بە کورە مارەکراوەکەی خوی رازی نەبو، بە نهینی لە گەڵ کوریکی تر ریک ئەکەوی پیکەوە برون. کچەکە رەدوی کورەکە ئەکەوی و، کورەکە کچەکە هەڵئەگری، بە جورە ئەرون

و ئەچن خۆیان ئەخەنە خانوی کوێخا یان پیاوماقوڵێکی دەسەڵاتداری تایەفەکەیان و لەوێ ئەمێننەوە.

هەندێ جار پیاوێکی دەسەڵاتدار کچ یا ژن هەڵئەگرێ، ئەگەرچی ئارەزوی ئافرەتەکەی لە سەر نەبێ بە جۆرێ لە زۆر و هەڕەشە بیبا، بەڵام ڕەدوکەوتن هەمیشە ئارەزوی ئافرەتەکەی لە سەرە.

خاوەن ماڵ بۆیان تێ ئەکەوێ لە گەڵ ماڵی کوڕی مارە لێ براو بۆ «مەسلەحەت».
مەسلەحەتیشیان لە ڕێگەی «ژن بە ژن» یان «گەورە بە گچکە» یان «پێنەنزو» ئەکرێ.

کوڕی یەکەم کە کاتی خۆی کچەکەیان لێ مارە کردوە، دەس هەڵ ئەگرێ لە کچە مارەبڕاوەکە و، «تەڵاق» ی ئەدا بەرامبەر بەوەی کچێکی تر بدەن بە خۆی یان بە کەسێکی نزیکی (کوڕ، برا، باوک، ئامۆزا). ئەوسا ئافرەتەکە لە دەزگیرانە تازەکەی مارە ئەکرێ.

- ڕەدوکەوتنی کچی مارەنەکراو ئاسانتر و «مەسلەحەت» ی هەرزانترە لە کچی مارەکراو.

- ڕەدوکەوتنی کچی مارەکراوی نەگوێزراوەیەوە ئاسانتر و مەسلەحەتی هەرزانترە لە هی گوێزراوە.

- ڕەدوکەوتنی ژنی گوێزراوەی بێ منداڵ ئاسانتر و مەسلەحەتی هەرزانترە لە ژنی گوێزراوەی خاوەن منداڵ.

- مەسلەحەتی ڕەدوکەوتنی ژنی خاوەن منداڵ لە هەمویان گرانترە، چونکە مێردی ژنە هەڵگیراوەکە چەند منداڵێکی بێ دایکی بە سەردا ئەکەوێ، بە ئاسانی ژنێکی تری دەس ناکەوێ شوی پێ بکات و منداڵەکانیشی بۆ بە خێو بکات.

ئەم نەریتە لە کۆنەوە لە هەندێ شوێنی کوردستان و، لە ناو هەندێ خێل و هۆز و تیرەدا باو بوەوە و، لە ناو پیاوەکانی چینەکانی خواری و ناوڕاستی دا شێوەی سەرەکی ژنهێنان بوە. وەکو ڕوداوێکی کۆمەڵایەتی ئاسایی سەیری ئەکرێ، بەڵکو هەندێ لەو کچانەی هەڵیان بۆ هەڵ نەکەوتوە ڕەدوبکەون یان هەڵ بگیرێن هاوڕێکانیان کە لێ یان تورە ئەبن پێ یان ئەڵێن: «ئەگەر خێرت پێوە بوایە یەکێ هەڵی ئەگرتی!» و، هەندێ ژن کە چەند جاری هەڵگیراون لە ناو هاوتاکانی خۆیان دا شانازی پێوە ئەکەن.

بەڵام هەڵگرتن و ڕەدوکەوتن لە هەندێ شوێنی تری کوردستان و، لە ناو هەندێ خێل و هۆز و تیرەدا بە «سەرشۆڕی کۆمەڵایەتی» گەورە دائەنرێ، تەنیا بە کوشتنی هەردوکیان (کچ و کوڕ یان ژن و پیاو) و، هەندێ جار منداڵەکانیشیان، ئەگەر منداڵیان لێ کەوت بێتەوە، ئەم سەرشۆڕییە پاک ئەکرێتەوە.

*

ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی گوندی «چەپوە» ی خۆشناوەتی کاروانچییەتییان ئەکرد. لەم کارەدا زۆر شارەزا و وریا و تەمزرو بوون. زۆریان کوردپەروەری دڵسۆز بوون. سەید کەریم و د. خدر مەعصوم لە خۆشناوەتی بوون، بەلام ماوەیەکی درێژ بو لی مان بزر بووبوون و، هیچ هەواڵیکمان نەئەزانین. بە هۆی یەکی لە کاروانچییەکانی چەپوەوە نامەیەکم بۆ سەید کەریم نوسی. ڕووداوەکانی هەکاری م بۆ نوسی و، داوام لی کرد بۆ کە بینە لامان لە قەندیل.

لە «تەنگی سلیمانی» یەوە خەریک بو بگوێزینەوە بۆ «دەراوی گوێزی» سەید کەریم و چەند پێشمەرگەیەک پەیدا بوون. یەکێکیان لە ڕێگا بەردێک لە قاچی دابو لە ڕۆیشتنی خست بو، لە هەندی جێگا بە کوڵی خۆیان و لە هەندی جێگا بە کوڵی وڵاغ هێنا بویان. من جگە لە سەید کەریم ئەوانی ترم نەئەناسی. بەلام هەندێکیان لەو جارەوە ئیتر بون بە هاوڕێ ی گیانی بە گیانیم هەتا کوژران، لەوانە عەلی نەبی و ڕیباز.

پەیدا بونی سەید کەریم بو من مژدەیەکی خۆش بو.

عەلی نەبی پێشمەرگە نەبو. بە نوێنەرایەتی ڕێکخراوی «کیوەرش» ی کۆمەڵە هات بو. پاش ئەوەی هەندی قسە و باسی پەیوەستمان کرد گەڕایەوە. وا ڕێک کەوتین خۆی و چەند کەسێکی تر چەک پەیدا بکەن و بین بێن بە پێشمەرگە. پاش گەڕانەوەی بە ماوەیەکی کەم بەڵێنەکەی خۆی بە جی هێنا.

لە هەمو ڕۆژە سەختەکانی ژیانی پێشمەرگایەتی م دا لە سەنگەرایەتی، باڵەکایەتی. ئاکۆیەتی، سوران، خۆشناوەتی بو هەر جێیەک ئەچووم، هەمیشە دو شەریهاوم لە گەڵ بو هەردوکیانم لە قەندیل ناسی: ئەحمەد مەولود و عەلی نەبی، بە خۆیان و پێشمەرگەکانیانەوە لە گەڵ خۆم ئەبون و، هەر کارێکی دژوار بهاتایەتە ڕێگمان بە یەکی لەم دوانەم ئەسپارد و، بە بی ترس لە مردن جێبەجێیان ئەکرد.

*

ڕەوینە

لە کاتی گواستنەوەدا لە ڕێگا توشی هەوارەکەی حەسەنی برایم شوان بوین. حەسەن لە گەڵ چەند کەسێکی تردا چو بون بو ڕاو چەند سەری بزنە کێوییان کوشت بو. ۳ سەریان دا بە ئیمە. لە گەڵ خۆمان بردمان بو هەواری تازە. لەوی چاکمان کرد.

بناری قەندیل لە هەردو دیوی لەوەڕواری زۆری هەبو. دوڵ و شیو و زەرد و ماهی زۆری تی دا بو، شوێنی ژیانی دەعبای کێویی بە تایبەتی ئیری و بزنەکێوی بو. چەند

راوکەرێکی شارەزای شاخەوانیی لە ناو خۆیان دا ڕێک ئەکەوتن. دەسراستەکان لە سەر ڕێگای حەیوانەکەدا خۆیان مەلاس ئەدا و، چەند کەسێکیش «چەلەپ»ی حەیوانەکانیان ڕاو ئەنا. حەیوانەکان ئەکەوتنە بۆسەی دەسراستەکانەوە و، ئەیان کوشتن. بەم جۆرە ڕاوەیان ئەوت: «ڕەوەنە».

چیاکانی کوردستان چەندین جۆر حەیوانی کێوی ناپاپی هەبوە. مەڕ، بزن، شۆر «فیلە کێوی»، ورچ «هەرس»، پلنگ، وشەک، ڕێوی، دەلەک، کەمتیار... بەلام ڕاوی بێ «دەبەسپەلین»، تۆ ری هەندێ دەعبای کێوی وەکو: مەڕە کێوی و شۆری براندوتەوە و، هەندێکی تریشی وەکو بزنە کێوی و ئاسک خستوتە مەترسی لە ناوچوونەوە.

*

ئەستێلی سادر

دەراوی گوێزی کەوت بوە نێوان زنجیرە چیاکانی «سادر» و «جاسوسان» ەوە. هاوینە هەوارێکی خۆش و، کانی و ئاوی سارد و سازگاری هەبو. هەندێ دار و چیلکەشی بۆ سوتاندن لێ دەس ئەکەوت.

کە بە دەراوی گوێزی دا شۆڕ ئەبیتەوە بەرەو خوار ئەچیتە دۆلە کوگی لەوێشەوە کە شۆڕ ئەبیتەوە ئاوی هەردو شاخی ئەمبەر و ئەوبەر «جاسوسان» و «سادر» لە یەکتری نزیک ئەبنەوە پێش ئەوەی بگاتە گوندی «سوێسنی»، ئەبێتە تەنگێکی زۆر تەسک. ئەم تەنگە شوێنێکی لە بارە بۆ دروستکردنی دیوارێکی بەرز، ئاوی کانی و جۆگاکانی دۆلەکە و، ئاوی باران و بەفراو لە ئەستێلێکی گەورەدا کۆ بکاتەوە. بە درێژایی ئەم دۆلە هیچ ئاوەدانییەکی تێ دا نیە و، ئەرزێکی ئەوتۆی تێ دا نیە لە هیچ وەرزێکی ساڵ دا بە کەلکی کشتوکاڵ بێ. هەموی لێژایی شاخ و بەردەلانە. ئاوەکەی ئەتوانری بە کار بهێنری بۆ ئاودانی دەشتی قەلادزێ و بەرهەمهێنانی کارەبای ئاوی.

*

نائارامی لە «جەزیرەی ئارام» دا

دامەزراوی دینیی شیعە لە کۆنەوە لە تیهران دا گرنگییەکی تایبەتی هەبوە. چەند جیاوازییەکی بنەرەتیی لە هی سوننە هەیە:

- دامەزراوەی دینیی شیعە ڕێکخراوێکی هەرەمییە، «آیت الله العظمی» یەک «موجتەهیدی ئەکبەر» «مەرجەعی تقلید»ی هەمو شیعەکانی جیهان، لە لوتکەی هەرەمەکەدایە، دوای ئەویش چەند «آیت الله العظمی» و، ئینجا چەند ئایەتوللایەک، پنکە فراوانەکەیشی هەزاران «حجە الاسلام» و «ثقە الاسلام» و، دەیان هەزار «طلابی علمی»

- دامەزراوی شیعە لە رووی داراییەوە سەربەخۆیە لە دەسەڵاتی دەوڵەت. هیچ مەلایەکی شیعە و هیچ خوێندنگا و «حوزەی عیلمیە» پشت بە موچە و یارمەتی دارایی حکومەت نابەستێ. ئەمەش سەربەخۆیی کار و ئیجتیهادی بۆ دابین کردوون. کاتێ خۆی ڕەزا شا هەوڵێکی زۆری داوە پەیبەستی بە حکومەتەوە سەرکەوتوو نەبوە.

- ئەوانەی گەیشتوون بە پایەی «ئایەتوڵڵا» جۆرێ لە «حەسانە»یان هەیە ئەیانپارێزێ لە لێپێچانەوەی قانونی و گرتن.

ساڵی ١٩٦٣ شا «ئینقیلابی سپید»ی ڕاگەیاند. ویستی هەندێ ئاڵوگۆڕی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیریی لە ژیانی خەڵک دا بکا بە ئیمازی ئەوەی بنکەیەکی کۆمەڵایەتی فراوان لە ناو گەلانی ئێران دا بۆ پشتیوانی لە خۆی دروست بکا.

دامەزراوی دینیی شیعە بە توندی دژی هەندێ لەم ریفۆرمانە ڕاوەستا. بۆ بە ڕووبەڕوو بوونەوەی خوێناوی لە نێوان ڕژێم و دامەزراوی شیعەدا. ئاخوندێک بە ناوی ڕوحوڵڵای خومەینی ڕێبەری ئەم جوڵانەوەیە بوو. ڕژێم جوڵانەوەکەی سەرکوت کرد. خومەینی کەوتە بەر تەنگ پێ هەڵ چنین و دەربەدەری ساواک، بەڵام دامەزراوی دینیی شیعە، بۆ ئەوەی خومەینی لە گرتنی ساواک بپارێزێ، نازناوی «ئایەتوڵڵا»ی پێ دا. بەم هۆیەوە شا نەیتوانی بیگرێ، دووری خستەوە بۆ شوێنە پیرۆزەکانی عیراق.

بە ڕواڵەت ڕژێم زاڵ بوو. هەر کەس و تاقمێ ڕەخنەی لێ بگرتایە تەفرەوتونای ئەکرد. وەکو نارازیبانی ئێرانی ئەیانوت: «تیرور و ئیختیناق» باڵی بە سەر ئێران دا کێشا. هەندێ تاقم دروست ئەبوون بەڵام ساواک بە توندی سەرکوتی ئەکردن. هەزاران کەسیان لە زیندانەکان ئاخنی بوو، هەزاران کەسیان بە لێدان لە زیندانەکان دا و لە سەر جادە کوشت. ناوبانگی سیاسی ڕژێم لە دنیادا دا زڕا بوو. وەکو یەکێ لە نمونەکانی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ سەیری ئەکرا. خوێندکارانی ئێران لە دەرەوە «کونفیدراسیون»یکیان دروست کرد بۆ چالاکییەکی زۆری ئەنواند بۆ ڕیسوا کردنی شا و ساواک و ڕژێمی ئێران.

ئیمام خومەینی لە نەجەف وەکو دوژمنێکی سەرسەختی شا ناسرا بوو، بەڵام چالاکییەکی ئەوتۆی نەئەنواند تا ڕێککەوتنی جەزایری ٧٥ کە ئیتر پەیوەندی عیراق - ئێران ئاسایی بوەوە و، هاتوچۆی نێوان دانیشتوانی هەردوو وڵات گەرم بوو. هەزاران ئێرانی ساڵانە ئەچوون بۆ «زیارەت»ی شوێنە پیرۆزەکانی شیعە لە نەجەف، کەربەلا، کاظمیە... و، سەدان قوتابی بۆ خوێندن لە مزگەوتەکانی دا ئەمانەوە. ئەمە هەلێکی گەورەی بۆ ئیمام خومەینی ڕەخساند پەیوەندی خۆی لە گەڵ دامەزراوی دینیی شیعە لە ئێران تازە بکاتەوە

و، یەکیەتە هانتدان و سازدان و جولاندنی. ئێران لەو کاتەدا زیاتر لە ٨٠ هەزار مزگەوت و ١٨٠ هەزار مەلای شیعەی تێ دا بوو.

یەکێ لەو تاکتیکە تازانەی ئیمام خومەینی دای هێنا: «شۆڕشی کاسێت» بوو. خومەینی وتارەکانی خۆی لە سەر شریتی کاسێت تۆمار ئەکرد و شاگرد و لایەنگرەکانی بە ناوی «گۆرانی و مۆسیقای شەرقی» بەوە ئەیانبردەوە بۆ ئێران و لە مزگەوتەکان دا لێ یان ئەدایەوە و، لە تاران و قوم و شارەکانی تر لە دوکانی تسجیلات تۆماریان ئەکرد و ئەیان فرۆشت. جگە لەمەش کتێبەکانیان ئەبردەوە بۆ ئێران.

نارەزایی لە ناو ئێران دا تا ئەهات زیادی ئەکرد و لە بەرامبەر ئەوەدا ئیرهاب و ئیختیناق تا ئەهات زیادتر ئەبوو. فەساد لە هەموو بوارەکانی ژیان دا: فەسادی ئیداری، مالی، سیاسی، ئەخلاقی.. قوڵتر ئەبوو. بنەماڵەی سەڵتەنەتی (خوشک و برا و کچەکانی شا) ڕیبەریی ئەم فەسادەیان ئەکرد. چەندەها قومارخانە و شوێنی ڕابواردنیان لە سەرانسەری ئێران دا دامەزراند بوو. ئەشرەف سەرپەرشتی تۆڕی ناوخۆ و جیهانی بازرگانیی هیرۆیینی ئەکرد. بنەماڵەکەی شا کە کاروباری ئابووری خۆیان لە «بونیادی پەهلەوی» دا ڕێک خست بوو، بوو بوو بە گەورەترین دەوڵەمەندی ئێران و، لە هەموو سەودا و پرۆژە ئابوورییە قازانجدارەکان دا بەشیان هەبوو.

شا بە بۆنەی تێپەڕبوونی ٢,٥٠٠ ساڵ بە سەر دامەزراندنی ڕژێمی شاهەتی لە ئێران دا ئاهەنگێکی گەورەی گێڕا و، خۆی بە میراتگری ئەو ٢,٥٠٠ ساڵەی شاهەتیی ئێران دانا. بودجەیەکی گەورەی بۆ ئەم ئاهەنگانە تەرخان کرد بوو. ئەم ئاهەنگانە لە باتی ئەوەی جێگای شا لە ناو ئێران و دنیادا قایمتر بکا کردی بە نیشانەی تیری ڕەخنە و نارەزایی.

بۆ ڕوونکردنەوەی بیروڕاکانی خۆی شا کتێبێکی بە ناوی: «بە سوی تمدن بزرگ» بڵاو کردەوە. ئەم کتێبە وەرگێڕدرایە سەر هەموو زمانە گرنگەکانی دنیا. هەژاری موکریانی پێش کردی بە کوردی. هەرچی ئەم کتێبەی خوێند بووەوە لایان وا بوو شا تووشی نەخۆشی میگالومانیا «جنون العظمه» بووە. شا وای بڵاو ئەکردەوە کە لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا ئێران ئەکا بە هێزی ئابووری پێنجەمی دنیا و، وای دەرئەبڕی کە لە ناوچەکەدا ئێران «جەزیرەی ئارام» ە و، نموونەیەکی دیموکراسی ئەوتۆیە لە ڕۆژئاواش دا وێنەی نییە.

شۆڕشی کاسێت تا ئەهات کاریگەرتر ئەبوو. ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی کە تا ئەوسا ڕیبەرێکی دیار و هەڵکەوتوویان نەبوو سەرکردایەتییان بکا دژی شا و «ڕژێمی سەڵتەنەتی» خەریک بوو سەری دەرئەهێنا.

دوای ۱۲ ساڵ سەروکایەتی وەزیران لە ۱۹۷۷ دا، شا عەبباس هوەیدای لی خست و جەمشیدی ئاموزگاری داتا بە سەروەزیران. ئەم گورینە کاری لە بزوتنەوەی نارەزایی نەکرد. ئەویش هیچ گورینیکی لە ژیانی سیاسی دا ئەنجام نەدا. حیزبی «رەستاخیز» تەنیا حیزبی ریگا دراو بو. ئەویش حیزبیکی شاپەرست بو، ساواک پیکی هینا بو، خەلکیان بە زور لی کو کرد بوەوە.

هەندی لە سیاسیە ناسراوەکانی تەهران وەکو: د. کەریمی سنجابی، مەهدی بازرگان، شاپوری بەختیار، داریوشی فروهەر، مەتین دەفتەری... کەوت بونە جموجول. پاشماوەکانی «جەبهەی میللی» سەردەمی موصەددەق و هەندی لە حیزبەکانیان ریک خست بوەوە و، بوبون بە ناوەندی ئوپوزیسیونی شارستانی و دیموکراتی.

مەهدی بازرگان، «کومیتەی دیفاع لە ئازادی و حقوقی بەشەر» ی دروست کرد بو. بلاوکراوەی لە سەر مافی مروڤی تەهران دەردەکرد.

تاقمی لە قانونییە ناسراوەکانی تەهران کەوتنە دەرکردنی بەیاننامە سەبارەت بە دەس تی خستنی حکومەت لە کاروباری دادگاکان و، تاقمی لە نوسەرانی ناسراوی تەهران کەوتنە بەیان دەرکردن داوای ئازادی دەربرین و نوسین و لابردنی سانسوریان ئەکرد.

بە نهینی پش سەدان بەیان و بلاوکراوە دژی شا و ساواک دەرئەچو.

شا لە ژیر گوشاری بەریوەبەرایەتی سەروکی ئەمەریکی کارتەر دا بەرنامەی «فضای باز سیاسی» راگەیاند کە گویا بەرەو لیبرالیزم ئەچی.

سەرەتای سالی ۱۹۷۸ لە «قوم» خوپیشاندان دەستی پی کرد. دلوپەزگای ئاسایشی شا بە توندی لی یان دا و، چەند کەسی کوژرا. لە چلەی ئەم رووداوەدا لە تەوریز خوپیشاندانیکی گەورە ریک خرا. خەلک هیرشیان کردە سەر بارەگاکانی حیزبی رەستاخیز، سینەماکان، بانکەکان. دەزگاکانی ئاسایش لەم خوپیشاندانەش دا ۳۰ کەسیکیان کوشت.

بو چلەی کوژراوەکانی تەوریز پیشەوایانی شیعە داوایان لە خەلک کرد خوپیشاندان بکەن. لە تاران و ئەسفەهان و زور شاری تری ئیران خوپیشاندانی گەورە کرا و، لە هەندی جی بو بە پیکدادان لە نیوان خوپیشاندەران و پولیس دا.

یادکردنەوەی چلەی کوژراوەکان بو بە یەکی لە تاکتیکە سەرکەوتوەکانی سازمانی خەلک بو خوپیشاندان. بەلام خوپیشاندانەکان تا ئەهات زیاتر رەنگی دینیان ئەگرت و، مەلاکان ئەهاتنە مەیدانی کارەوە. دەوری سەرکردە نادینییەکان کەمتر ئەبوەوە.

روژی هەینی خەلک لە مەیدانی ژالەی تاران کوبونەوە بو یادی کوژراوەکانی

سەرەتای ئەیلولی ٧٨ بەڵام داوودەزگاکانی ئاسایش گوللەبارانی خۆپیشاندانەکەیان کرد و نزیکەی ٥٠٠ کەسیان لێ کوشتن. ئەم ڕووداوە بە ناوی «جومعەی سیاه» ناوی دەرکرد. ئەم کوشتارە شەپۆلی نارەزایی و توندوتیژی لە سەرانسەری ئێران دا زووتر کرد و، بوو بە سەرەتای قۆناغێکی تری پڕ لە تەوژمی بزووتنەوەی دوژمنایەتی شا.

خۆپیشاندان و مانگرتن پەرەی ئەسەند، شوێنەکانی وەکو: مزگەوت، زانستگا، بازار، کارگاکان... و، چینە جیاوازەکانی کۆمەڵ وەکو: ڕووشنبیر، بازرگان، چینی ناوەڕاست، کرێکاران... و، ڕێبازە سیاسییەکانی ڕاست و کۆنەپارێز و، و چەپی پێشکەوتنخوازی وەکو: دینی، کۆمۆنیست، مارکسی، دیموکرات، نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری... ئەگرتەوە.

شا بۆ ئەوەی نارەزایی خەڵک دامرکێنێتەوە هەندێ ئاڵوگۆڕی کرد. جەمشیدی ئاموزگاری لابرد و، شەریفی ئیمامی بە سەرۆکوەزیران دانا و، جەنەراڵ نەعیمیری لە سەرۆکایەتی ساواک لابرد و جەنەراڵ موقەددەم ی دانا بەڵام ئەم ئاڵوگۆڕانە شتێکی ئەوتۆ نەبوون هەڵومەرجی داگیرساو بکوژێننەوە. دروشمی «مرگ بر شاه» کەوتە بوە سەر زمانی هەموو کەس و، خەڵک بە گشتی ئەیانویست شا بڕوات و ڕژێمی شایەتی بڕوخێنرێ.

شا، جەنەراڵ ئوەیسی دانا بە «فەرماندەری نیزامی تاران»، ئەویش کەوتەوە و خۆپیشاندانی قەدەغە کرد. بەڵام جوڵانەوەی نارەزایی تاکتیکی خۆی لە خۆپیشاندانەوە گۆڕی بۆ مانگرتن. ڕۆژانی پرسە و ماتەمی کوژراوەکانیان ئەکرد بە ڕۆژی مانگرتنی گشتی. دوکان و بازار دائەخرا و، زانستگا و خوێندگاکان ئەبەستران، کرێکاران دەستیان لە کار ئەکێشایەوە و، دائیرەکان دەوامیان نەئەکرد.

شا لە کۆتایی حوزەیرانی ٧٨ دا لە گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانی دا بە هەواڵنووسێکی ئەمەریکایی وت بو: «هیچ کەسی ناتوانێ من لابەرێ، چونکە ٧٠٠ هەزار سپایی و، هەموو کرێکاران و، زۆرایەتی خەڵک پشتیوانی منن».

خومەینی بوو بە دوژمنێکی ڕاستەقینە و هاندەری جوڵانەوەی نارەزایی لە ئێران دا. دروشمە ڕیفۆرمیستییەکانی سیاسییەکان و مەلاکان، کە ئەیانویست لە چوارچێوەی قانونی ئەساسی ئێران دا ئازادییەکان دابین بکەن، بە جۆرێکی بنەڕەتی گۆڕی بە دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمی شایەتی.

گۆڕانی دۆخی سیاسی ئێران کاری لە چارەنوسی ئێمەش ئەکرد، لە بەر ئەوە بو ئێمە جێگەی دڵخۆشییەکی بێ ئەندازە بو؛ ڕژێمی شا وەکو دوژمنی نەتەوەی کورد بە گشتی و، وەکو دوژمنی یەکێتی نیشتمانی بە تایبەتی و، وەکو پاڵپشتی بنەماڵەی

بارزانی و ئەم، تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی قووڵی لە چارەسەرکردن نەهاتن هات بوو. لە دوورەوە بە وردی چاودێری ڕووداوەکانمان ئەکرد.

بڕیارمان دا بۆ پشتیوانی لەم جوڵانەوەیە مامجەلال بە ناوی شۆڕشی کوردستانی عێراقەوە چەند نامەیەک بۆ سەرکردە ناسراوەکانی بنووسێ و، ئامادەیی یەکێتی دەربڕێ بۆ هەر جۆرە هاوکارییەکی ئەوان بە چاکی ئەزانن.

مامجەلال نامەی بۆ ئیمام خومەینی و، ئایەتوڵڵا شەریعەتمەداری، ئایەتوڵڵا حسێنعەلی مونتەزیری و، چەند کەسێکی تر نووسی. نامەکەی ئیمام خومەینی مان نارد بۆ ڕێکخستنی ئەوان بە دەستێکی ئەمین دا بۆی بنێرن. نامەکانی تریش ساعید و جەعفەر ناردیان بۆ هاوڕێکانی خۆیان لە ئێران پێی یان بگەیەنن. ڕێکخستن کەسێکی شایستەیان دۆزی بووەوە نامەکەیان پێدا نارد بۆ نەجەف بۆ خومەینی، ئەویش داود حسێن، باوکی شەهید سەلمان، لە ڕێکخراوی «هەڵۆی سوور»، کە تازە لە بەغدا ئیعدام کرا بوو. باوکی سەلمان کەسایەتییەکی ناسراو بوو لە ناو کوردە شیعەکان دا، خەڵکی مەندەلی بوو، بەڵام لە بەغدا دائەنیشت.

ئێران و عێراق لەو کاتەدا هەردووکیان کێشەی ناوخۆیان هەبوو لاکەی تر ئەیتوانی بە کاری بهێنێ؛ ئێران کێشەی خومەینی و، عێراق کێشەی کورد. هەردوولا ئەیویست لاکەی تر ڕازی بکا بۆ ئەوەی باری بەم ئاگرە نەکا و، یارمەتی جوڵانەوەکە نەدا. ڕژێمی شا جوڵانەوەی کوردی عێراقی گەمارۆ دابوو، هاوکاری لە گەڵ کاربەدەستانی عێراق ئەکرد بۆ دامرکاندنەوەی. ڕژێمی بەعسیش هاوکاری ئێرانی ئەکرد بۆ گەمارۆدانی ئیمام خومەینی.

کاربەدەستانی عێراق بەری چالاکی خومەینییان گرت و، ڕێگەیان گرت لە لایەنگرەکانی سەردانی بکەن. بەمەش دانەکەوتن. وەزیرانی دەرەوەی عێراق و ئێران کە چووبوون بۆ کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕێک کەوتن خومەینی لە عێراق دەربکەن. ئەمە لە ئێران دا دەنگی دایەوە و بوو بە هۆی شەپۆلێکی تری مانگرتنی گشتی لە تاران و شارەکانی تردا. عێراق گوێ ی نەدایە نارەزایی خەڵکی ئێران خومەینی دەرکرد. خومەینی ماوەیەک لە سەر سنووری کوێت مایەوە هیچ دەوڵەتێک ئامادە نەبوو بیگرێتە خۆی. سەرەنجام فەرەنسا ڕێگای دا. ٦ ی تشرینی یەکەمی ٧٨ خومەینی گەیشتە فەرەنسا. لە «نوفل لو شاتو» لە نزیک پاریس بارەگای دانا.

ساڵی ١٩٨٤ لە کاتی گفتوگۆکانی بەعس - یەکێتی دا، سەعدون شاکر، وەزیری ناوخۆی ئەوسای عێراق، ڕووداوی دەرکردنی ئیمام خومەینی لە نەجەف و لە عێراق بۆ گێڕایەوە، وتی: «کە پێمان وت تۆ لە عێراق دالدە دراوی بۆت نیە دەس بخەیتە

کاروباری ئێرانەوە. لە وەڵام دا وتی: «مەسەلەی ئێران تەواو بووە من پەیامم هەیە بۆ هەموو جیهان». وەزیری عێراقی، کە ماوەیەکی درێژ سەرۆکی دەزگای «موخابەرات» ی عێراق بو، دانی پێدەنا تا کە هەرگیز بە بیریان دا نەئەهات، ئەم ئاخوندە پیرەی لە نەجەف کەوت بۆ دەسەڵاتێکی شاردراوە و نهێنی وەها گەورەی هەبی و، ببی بەم ڕیبەرە تەلیسماتییە. بێگومان ئەگەر ئەوسا بەعس ئەوەیان بزانیایە هەرگیز نەیانئەهێشت لە دەستیان دەرچی.

ئەگەرچی نۆفل لو شاتۆ لە ڕووی جوگرافییەوە، لە چاو نەجەف دا، لە ئێرانەوە دوورتر بو، بەڵام بۆ ئیمام خومەینی لە ڕووی پەیوەندی کردنەوە بە ئێران و بە لایەنگرەکانیەوە لە دنیا دا ئاسانتر و، ئازادی جوڵان و قسە کردنی زووتر بو.

دەستەی نوێنەرایەتی یەکیتی کە پێک هات بو لە: د. فوئاد مەعصوم، عادل موراد، ئەحمەد بامەرنی، دو جار لە نۆفل لو شاتۆ دیداری ئیمام خومەینیان کرد. چارەنوسی شۆرشەکە هێشتا دیار نەبو. د. ئیبراهیم یەزدی یش لە دانیشتنەکەدا ئامادە ئەبی. نوێنەرانی یەکیتی لەم دو دیدارەدا:

پشتیوانی تەواوی یەکیتیان لە شۆرشەکە دەربڕی بو.

ئامادەیی یەکیتیان پیشان دا بو کە هەمو هێز و توانای خۆی بخاتە خزمەتی شۆرشی ئێرانەوە.

ئامادەیی یەکیتیان دەربڕی بو بۆ مەشقدانی لایەنگرەکانیان و گوێزانەوەیان، بۆ گوێزانەوەی چەک و تەقەمەنی و، لە کاتی پێویست دا خەریککردنی ئەرتەشی ئێران بە شەڕەوە لە سەر سنورەکان بۆ ئەوەی نەتوانی هەمو هێزەکانی لە سەر ئەوان کۆ بکاتەوە.

ئامادەی یەکیتیان دەربڕی بۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی ئەوان داوای بکەن و پێمان بکرێ.

ئیمام خومەینی سپاسیان ئەکا و، ئەڵێ ئێمە ئێستا بەم ڕیگایە شەڕی ڕژێم ئەکەین، ئەگەر ئەم ڕیگایە سەرکەوتو نەبو، ئەوسا پەنا ئەبەینە بەر چەک و، پێویستیمان بە هاوکاری ئێوەیش ئەبی. ئینجا لێ ی پرسی بون: ئێوە چیتان لە ئێمە ئەوێ؟

نوێنەرەکانی یەکیتی وت بویان: ڕوخانی شا بۆ ئێوە چەند گرنگە، بۆ ئێمەش ئەوەندە گرنگە. ئێمە تەنیا سەرکەوتنی ئێوەمان ئەوێ!

*

لە کاتێک دا سەرانسەری ئێران گڕی گرت بو، کوردستانی ئێران هێشتا لە خامۆشییەکی وەکو خامۆشی گورستان دا بو، ئەمەش ئەگەڕایەوە بۆ چەند هۆیەک، لەوانە:

١. دانیشتوانی کوردستان بە تایبەتی کوردەکانی ئوستانەکانی کوردستان،

ئازەربایجانی غەربی، بەشێکی کرماشان سوننەن و، مەلاکانیان هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان لە گەڵ دامەزراوی دینیی شیعەدا نەبو. بانگەوازەکانی خومەینی و پێشەواکانی تری شیعە نەیئەتوانی کاریان تێ بکات و بیانبزوێنێ، بە تایبەتی چونکە پێشینەیەکی دوورودرێژی چەوسانەوەی مەزهەبی سوننەی ژێردەستە لە لایەن شیعەی دەسەڵاتدارەوە، لە بیری خەڵک و پێشەوا دینییەکان دا مابو.

٢. لەوەش گرنگتر کوردستان بۆشاییەکی سیاسی گەورەی تێ دا بو. هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی تێ دا نەبو، خەڵک ساز بدا و ڕێگە بخا و ڕێبەریی بکا بۆ دەس پێ کردنی بزوتنەوەیەکی سیاسی دژی شا و ساواک. ئەوسا «کۆمەڵە» ڕێکخراوێکی بچوک بو پێک هات بو لە ژمارەیەکی کەم کادر. هێشتا خۆی ئاشکرا نەکرد بو. ئەویشی ئەوەست توشی زەرەر بێ. «حیزبی دێموکراتی کوردستان» یش لە ناو تیهران دا ڕێکخستن یا نفوزی نەبو. سەرکردە و کادر و ئەندامەکانی دور بون لە کوردستان و ڕوداوەکانی ناو ئێران. هەندێکیان لە بەغدا و هەندێکیان لە ئەوروپا بون. دەنگوباسەکانیان لە رادیۆکانی دنیاوە ئەبیست.

*

ئەو ماوەیەی لە دەرەوی گەوێزی بوین لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەم دا چەند کەسێکی ناسراو هاتنە ڕیزی پێشمەرگەوە لەوانە: سەید سەلیم، شەهرکۆی شێخ عەلی، ئیبراهیم جەلال.

ئیبراهیم جەلال لە سەرکردایەتی ناوخۆی ڕێکخستنی کۆمەڵە بو. لە قەلاتوکانەوە کە هات بو لە ڕێگا لە گەڵ هەندێ لە پێشمەرگەکانی مەنگوڕ دەمیان لە یەک گیرا بو. کێشەیەکی زلی لە سەر دروست بو مامجەلال بو پشتیوانی لە ئیبراهیم بە توندی چو بە گژیان دا و سزای دان. برایم لە سەرکردایەتی مابەوە بو بە ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە.

شەهرکۆ خۆی بە هیچ لایەک دا ساغ نەکرد بوەوە. پێش ئەوەی بێت بێ بە پێشمەرگە لە سلێمانی مەحمودی مەلا عیزەتی دی بو، مەحمود ئامۆژگاری کرد بو بێتە لای من و پاش گفتوگۆ ئەنجا کارێک بگرێتە ئەستۆ. شەهرکۆ لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕش دا ئەندامی قم بو تەسلیم بوبوە. باوەڕی بە پارتی نەبو. لە کارەساتی هەکاری دا، ناڕازی برای کە لە گەڵ کاک عەلی پێشمەرگە بو، کوژرا بو. چەند ڕۆژی لای ئێمە مابەوە بە ناوی سەردانەوەی ناوچەکەی خۆیان خواحافیزی لە ئێمە کرد. چو بوە لای رەسوڵ. ڕەسوڵ کرد بوی بە مەسئولی بزوتنەوە لە دۆڵی جافەتی.

سەید سەلیم لە ڕێکخستنی بزوتنەوە بو، سەردانی ڕەسوڵی کرد بو، ڕەسوڵ زۆری

قسە بو کرد بو لە دژی مامجەلال و یەکیتی، کە هاتە لای ئیمە ئەیویست باری سەرلێی
هەردولا لە یەک نزیک بکاتەوە. لە گەڵ خوی چەند پیشمەرگەیەکیشی هینا بو.
یەکیکیان ئەورەحمان سەعید بو. رەحمان برای مەحمود سەعیدە بو. مەحمودی برای لە
سەرەتای دەس پی کردنەوەدا فەرماندەی کەرت بو لە بالەکایەتی. پیاویکی هەلکەوتوی
قارەمان بو. بە زوری ئەم پەریندەوەی پیشمەرگەی لە پردی ناوەندە داپین ئەکرد. ئەو کاتەی
ئیمە لە برادوست بوین شەهید بو. مەحمود هاوری ی کومەلە بو.

سەید سەلیم دانرا بە فەرماندەی هەریمی ۱۲ ی رەواندز و، داناى ئەحمەد مەجید بە
رابەری سیاسی هەریمەکەی. پیکەوە رویشتن بو ناوچەی کارەکانی خویان. بەلام سەید
سەلیم کە تورە بونی مامجەلالی لە مەنگورەکان بینی، زوری پی ناخوش بو ئیتر دلی
رەنجا.

*

لیپرسینەوە

سەید کاکە و قادری مامەند ئاغای پشدەری هەردوکیان لای ئیم لە دیوی تورکیا
دەس بە سەر بون. هەلیان بو هەلکەوت بو هەلات بون. بە دوقولی لە دیوی تورکیاوە
خویان کرد بو بە بادینان دا و بە چەند روژی بە ناو کوردستانی عیراق دا گەیشتنەوە
لامان. سەید کاکە ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە و، یەکیتی و، فەرماندەی هەریمی ۸ ی
دەشتی هەولیر بو. قادرئاغاش فەرماندەی هەریمی ۱۲ ی پشدەر بو.

سەید کاکە لە شورشی ئەیلول دا سەرلق بو بو، سەرەتای ئەم شورشەش کاک خالید
قسەی لە گەل کرد بو لە گەل خوی هینا بویە دەرەوە. کابرایەکی نەخوینەوار بو بەلام
زیرەک و فیلباز و قسە خوش بو. لە سەردەمی پاشایەتی دا چەند جاری لە سەر دزی گیرا
بو. لەم شورشەش دا خوشکیکی خوی کوشت بو لە سەر ئەوەی بی رەزامەندی ئەم شوی
کرد بو.

ئەو کاتەی ئەوان هاتنەوە نەیوانی بزوتنەوە لە گەل یەکیتی تا ئەمجات ساردتر ئەبو.
عەلی سلیمان برینپیچ بو و، خوی بە کادری بزوتنەوە دائەنا. بو تیمار کردنی هەندی
نەخوش چو بو بو ناو هەواری مەنگورەکان و، هەندی قسەی ناشیرینی لە دژی کومەلە کرد
بو. قسەکەمان پی گەیشتەوە زورمان پی ناخوش بو. مامجەلال لە هەمومان زیاتری پی
ناخوش بو. نامەی بو بزوتنەوە نوسی لە سەر ئەو قسانە لی ی بپرسنەوە. گوی ی خویانیان
لی خەواند. مامجەلال گلەیی کرد. سەید کاکە سەری رەسول و ئەوانی دا و هاتەوە. سەید
کاکە بە مامجەلالی وت: «بوچی شکات لە عەلی ئەکەیت چونکە قسەی کردوە و گلەیی لە

رەسول ئەکەی چونکە لی ی ئەپرسیەوەتەوە!»
مامجەلال وتی: «ئەی چی لی بکەم؟»
سەید کاکە وتی: «وەکو من محاسەبەیان بکە!»
مامجەلال وتی: «چون!»
سەید کاکە وتی: «لە شورشی پیشودا سەرلقیکم هەبو زو زو لە لای بارەگای بارزانی شکاتی لی ئەکردم. چەند جاری ئاموژگاریم کرد شتی وا نەکا کەلکی نەگرت. روژیکیان هات بو بارەگای بەتالیون. منیش چومە مالەوە چەک و فیشەکدانەکەم دانا. داریکی ئەستورم هەلگرت لە کەندیک دا شاردمەوە. چومە بارەگا لە بەر چاوی هەمویان بە گەرمی بەخیر هاتنی کابرام کرد و ئەم لا و ئەو لایم ماچ کرد. پاش نەختی وتم ئیشم پیتە. لە گەل خوم بردم بو کەندەکە. هەتا توانیم دارکاریم کرد و پیم وت هەرچەند شکاتم لی بکەی لەمەولا وەهات لی ئەکەم. چومەوە بو مالەوە و لەویوە چومەوە بو بارەگای بەتالیون. کابرا کرد بوی بە هەرا کەوا من لیم داوە. وتم درو ئەکا بە بەرچاوی هەموتانەوە من ریزم لی گرتوە و، ئەویش لە من بەهیزتر و قەلافەتی گەورەترە چون ئەتوانم لی ی بدەم. کابرا ئیتر ئەمی بو بیرای بیر شکاتی لی نەئەکردم.
توش پیویستی نەئەکرد شکات لە عەلی سلیمان بکەی. بانگت بکردایە بو ئیرە بتوتایە دەرمانغان بو هاتوە وەرە بەشت بدەم. کە هات لە بەر چاوی هەموان ریزت بگرتایە و نەختی دەرمانیشت بدایەتی. ئینجا بتبردایە بو کەندی لە پەناوە تیروپر دارکاریت بکردایە. کەس نەیئەزانی و عەلی یش ئەمی ئەبو»
*
کە چوینە ناو پایزەوە ئیتر ئەمانتوانی بلیین: لە تیشکانی هەکاری هەستاوینەتەوە.
- لە روی سیاسیەوە:
گەلەکومەکی ی دەولەتانی ناوچەکە بو تیکشکاندنی شورشەکە و، پیلانی ئەم بو تیکشکاندنی یەکیتی، ناوبانگی یەکیتی بەرز کرد بووەوە و، ناوبانگی بنەمالەی بارزانی و ئەم ی زیاتر دابەزاند بو. خەلکی کوردستان بە هاودەردییەکی قولەوە سەیری یەکیتی و، چالاکییە سیاسی و پیشمەرگەییەکانی ئەکرد. لە خوبرانی پیشمەرگەکانی لە شاخەکان دا و، جموجولی فراوانی ئەندامەکانی لە شارەکان دا و، ئازایەتی بی وینەی گیراوەکانی لە زیندانەکان دا، جیگای ریزی هەمو کوردیکی دلسوز بو. ئەمەش زەمینەی گەشەکردنی ریکخراوەیی و پیشمەرگەیی یەکیتی خوشتر کرد بو.

- لە ڕووی پێشمەرگایەتییەوە:

هەمو هەرێمەکان بوژاپونەوە و، هەندێ هەرێم و «قوەت» ی تازەش دروست کرا بو.
هەرێمی ١ ی هەوراسان (هەڵەبجە)، مەلا بەختیار. هەرێمی ٢ ی کەرکوک، صەلاح چاوشین. هەرێمی ٣ ی شارباژێر (چوارتا)، مستەفا چاوڕەش. هەرێمی ٤ ی جافایەتی (دوکان)، جەمالی عەلی باپیر. هەرێمی ٥ ی قەرەداغ، سیروان «لەیسەڵ تالەبانی».
هەرێمی ٦ ی پشدەر (قەڵادزە)، حاجی حاجی برایم. هەرێمی ٧ ی بالەک (چومان)، زیروی عەبدوللا رەوی. هەرێمی ٨ ی هەولێر، سەید کاکە. سەرەرای ئەمانەش هەرێمێکی تازە لە بەری ناسوس بو قادرئاغای میراودەلی، بە هاوکاری صەدرەدینی شێخ حەسەن و هومەری بابەکراغای پشدەری و، هەرێمێکی تازە بو جەلالی حاجی حسین لە پێنجوین و، هەرێمێکی تازە بو سەید سەلیم لە ڕواندز - شەقڵاوە.. دروست کرا.
«هەرێمی پارێزگاری» کە پاراستنی بارەگاکانی سەرکردایەتی لە ئەستو بو گەیشت بوە ١٤ کەرت. هیچ کەرتێکی لە ٤٠ پێشمەرگە کەمتر نەبو. زوری پێشمەرگەکان بە پارەی خویان چەکیان کری بو، بو ژیانیش کەسوکاریان پارمەتییان ئەدان. پارمەتیەکەی مەکتەبی سیاسی، بو ئەوان، شتێکی کەم و رەمزی بو.

- لە ڕووی ڕێکخراوەییەوە:

گەشەکردنێکی زور بە سەر ڕێکخستنە نهێنییەکانا هات بو. «کومەڵەی سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخو» بە سەرپەرشتی جەمال تاپەر دەیان کومیتە و شانەی تازەی لە شارەکانی سلێمانی، کەرکوک، هەولێر، بەغداد... دامەزراند بو و، «کومیتەی ڕاپەڕین» یش بە سەرپەرشتی حەسەن کوێستانی سەدان تێکوشەری نوی یان لە گەڵاڵە، چومان، ڕواندز، هەریر، شەقڵاوە، ڕانیە، هەولێر... هێنا بوە ریزی ڕێکخستنەوە. جگە لەمان دەیان ڕێکخستنی جیا جیای پچوکمان لە شارەکانی کوردستان دا دروست کرد بو.
لق و ناوچەکانی یەکێتی یش لە دێهاتەکان دا ڕێکخستنی فراوانیان دروست کرد بو. زوری ناوچەکان بوژا بونەوە و، کادرەکانیان بە ناوچەکان دا بڵاو بوبونەوە.

*

لەمڕوژانەدا بیست مان هێزێکی قم لە تورکیاوە بە ناو ئێران دا هاتونەتە ناوچەی سەردەشت. ووریای ڕەوف سەعاتچی، یەکێ بو لە مەسئولەکانیان، هومەری بابەکراغای میراودەلیمان لە گەڵ بو. هومەراغا پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە کارساتی هەکاری دا گیرا بو، ئەم یەکێ بو لەوانەی چو بوە ریزی قم وە. هێزێکمان لە سەر کوکردنەوە و، «یادداشتێکی نارەزایی» شمان بو حکومەتی ئێران نوسی. من چومە سەر سنوری ئێران

